ناو کتێب: گەنجینەی بەیتی کوردی - سەرجەمی بەرهەمەکانی قادر فەتاحی قازی
کۆکردنەوەی: قادر فەتاحی قازی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٥٩٠
دەرهێنانی هونەری ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
دەرهێنانی بەرگ: حەمید ڕەزا ئازموودە
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی لە هەولێر ژمارە (٥٣٠)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

## ١

هەوڵی دەقینەی[١] حەزرەتی غەوس ئەگەر چووە بەغدایە، کوتی: ڕەئیسی[٢] ئەولییام. تەواوی شێخان قەبووڵیان کرد.

شێخی سەنعانێ حەوت هەزار مریدی بوو، ساحێب دەستیش بوو، زۆریش پیر و ئیفتادە[٣] و ڕدێن سپێ بوو؛ زۆریش پیاوێکی حەقیقی و خوداشوناس بوو. کوتی: قەبووڵت ناکەم بەڕەئیسی ئەولییا.

حەزرەتی غەوس دەروازەی بەحەشتی پێ نیشان دا بەحوکمی باتین. بەحەشت هەشت دەروازەی هەیە، دەروازەی «مەرحەبا»ی پێ نیشان دا. شێخی سەنعانیش دەروازێکی دیکەی پێ نیشان دا. حەزرەتی غەوس کوتی: ئەمن ڕەئیسی ئەولییام. ئەویش هەر قەبووڵی نەکرد.

جا ئەگەر شێخی سەنعان چۆوە تاییفێ، خەڵکی تاییفێ بوو؛ لەگەڵ حەزرەتی غەوس نیزاعیان لێ پەیدا بوو.

پادشایەک بوو، پادشایەکی فەڕەنگ، نێوی شاڕوخ شا بوو. پادشایەکی زۆر سەقەت[٤] بوو. کچێکی زینهار[٥] لە پشتی بوو؛ یەک جوان بوو تەواوی فەڕەنگییان وەخت بوو گیانیان بۆی دەرچێ.

حەزرەتی غەوس هێنایە سەر ڕەنگی باڵندە[٦]، پیشانی شێخی سەنعانی دەدا. ئەوە هیممەتی حەزرەتی غەوس بوو. ئەگەر سێ چوار جاری چاو پێ کەوت، بۆ شێخ شێت و شەیدا نەبوو!

٢

بیسمیللا هێز ڕەحمانی
بەهیدایەتی سوبحانی
هیممەتی غەوسی گەیلانی
چی کرد لە شێخەکەی سەنعانی

٣

شێخێک لە شاری سەنعان بوو
بەدەفە و زیکر و قورعان بوو
هەچی دەیکوت هەر چونان بوو
دوژمنی نەفس و شەیتان بوو
عاشق بەکیژی گاوران بوو.

٤

عاشق بوو، دڵی سووتاوە
شەو و ڕۆژ لە دڵی قاوە قاوە(٧)
هۆش و ڕەهبەتی(٨) نەماوە
جەماعەتی لە مریدان تێک داوە.

٥

ئێوارێک(٩) وەختی سەڵاتە
قامەتیان(١٠) کرد شێخ نەهاتە
قامەتیان کرد شێخ دیار(١١) نییە
مرید کوتیان: عیللەتی چییە؟
هەڵبەتە شێخ بێکار نییە.

٦

مریدێک هات لە دووی، کوتی:

کردوومانە زیکر و سوبحانە

ئەلحەمدولیللا و ڕەببانە

قامەت و تەواو ئەرکانە

شێخ بۆ دیار نییە بۆ نێو ئەوانە؟

٧

شێخ جوابی داوە، کوتی:

شەوێ، وەختی نیوەشەوێ

دیم شمقاڕی[١٢] چاپک ڕەوێ[١٣]

بۆیە جەرگ و دڵم ناسرەوێ[١٤]

بە نچیر سەنعانی دەوێ.

٨

دیم شمقاڕی چاپک ڕاوە

عاقڵی پوختی کردم خاوە

ڕەهبەتی دینم نەماوە

بۆم هەڵدێنێ گۆشەی چاوە

کۆخ و هەنجیر تێک ڕژاوە

یەگجار مەیلم بەوی داوە.

٩

هیچ عاقڵ و هۆش نییە لەسەرم

ئەمن هەر بۆ وی نۆکەرم

هەمیشە من عەمر بەرم

باغی وەنەوشە و گەوهەرم.

١٠

دیم شمقاڕی چاپک ڕەوێ
سینگی خەزێنەی خەسرەوێ
بە نچیر سەنعانی دەوێ.

١١

دیم شمقاڕی پەڕ بەڵەکە[١٥]
خاڵی جووتە و زوڵفی یەکە
حاجییان دێنێ لە ڕێی مەکە
دینی شێخان زەبوون دەکا.

١٢

دیم شمقاڕی ڕەنگ عاسمانی
تاق و جووتن خاڵانی
کزە کزمە[١٦]، جەرگم وەک بریانی[١٧]
مرید بەدەردی من نازانی.

١٣

دیم شمقاڕی خوش ئەحواڵە
قۆڵی بازی بەندی[١٨] لاڵە[١٩]
دینی من بۆ وی بەتاڵە
هاشا لەو دەفە و بەرماڵە[٢٠]
عەشقی[٢١] من کچی قەڕاڵە.

١٤

هاشا لە متیع و مریدانە
بە نار دەسووتێنم قورعانە

عیلاجم نەکەن جانانە
دەچمە سەر دینی کافرانە
کیژ وا خۆی داوم نیشانە.

١٥

کوڵمەی وەکو شەڕابی ئەخلەرە(؟)
خاڵانی ئەمبەرە و بەرە
جووتن وەک ئاغا و نۆکەرە
گەردنی حەوزی کەوسەرە
پێم نەماوە هیچ حونەرە
بۆ وی دەبم دەربەدەرە
ئەمنی کردووە سەوداسەرە.

١٦

عاقڵ لە بەدەنمدا نەماوە
جەرگ و دڵم بۆ وی سووتاوە
یەکجار زۆر ممتاس و لاوە
دوێنێکە ئاوڕێکی[٢٢] داوە
بەو ئاوڕەی جەرگم بڕاوە
شێخایەتیم[٢٣] هیچ پێ نەماوە.

١٧

پێم نەماوە هیچ ئیمانە
هیچ تاقەت و فکر و تووانە
وام دیوە من خاڵی دانە
لە کوڵمەیە و لە لێوانە
زولفی دەکا پەرێشانە
سنگی[٢٤] یاقووت و مەرجانە

وەکو دەفەی دەروێشانە
پێم نەماوە ڕوح و گیانە.

١٨

بەنەزەر گە[٢٥] تێی دەفکری
بەبرۆیان وەکو سەقری
چاو جەللابن، ڕادەبری
بەلەنجە[٢٤] دەڕوا کۆتری
لێم تێک چوو عاقڵ و فکری
ئیحتیڕازم لێ نەگری
دەچمە سەر دینی گاوری
بۆ خاڵی سوور و مسری(؟).

١٩

جەرگی بڕیوم، زولفی خاوە
لەسەر کوڵمەی ڕاوەستاوە
سانیان گرتووە بەهەنگاوە
وەک ڕیحانە تێک چڕژاوە
کە هەڵ دێنێ گۆشەی چاوە
قرچەم دێتن لە هەناوە
ڕەهبەتی دینم نەماوە
خانەقا دەکەم بڵاوە
ئەو دەفە و زیکرەم تێک داوە.

٢٠

کە دەبینم وردە خاڵی
لەگەڵ قەدێکە شمشاڵی

جەرگ و دڵ بۆ وی دەناڵی
ئەمن دەچم بە عەبداڵی[٢٧]
تۆ نەتدیوە کیژێ کاڵی
نۆ جەوانە، نۆ منداڵی.

٢١

با پێت بڵێم بە بێ دەنگی
نایناسی کیژی فەڕەنگی
تازە کە لیر[٢٨] دەکا سنگی
ئەمنی وا کردووە مافینگی[٢٩]
خاکەسار و بە دڵتەنگی
چاوی دوژمنە دەکا جەنگی
من دەکوژێ بە بێ دەنگی
خۆی پیشان دام بە سەت ڕەنگی.

٢٢

مریدان هەچی دەکەن، زوو کەن
ئیدی بەس گفتوگۆ کەن
بەکیژێ گاورانم شاد کەن.

٢٣

ئەو نەگەیوە، ئەو کیژە کاڵە
وەهای دەرد کردووم حەواڵە
بەعومری ئەو چاردەساڵە
چەند شیرنە لەچکە و دەسماڵە
تێکەڵ دەبن لەگەڵ خاڵە
لە قۆڵی بازنە و خڕخاڵە.

٢٤

هەچ جارێکی دەمدوێنێ
لە لێوان زەردەخەنە[٣٠] دێنێ
تیر لە جەرگم دەچەقێنێ
ڕەهبەتی دینم نامێنێ.

٢٥

نامێنم لەسەر ئیختییارە
لە ئەو شیرنە تۆق و گوارە
قورعان دەسووتێنم بە نارە
دەفە دەکەم پارە پارە
لە پشت دەبەستم زینهارە
سەبارەت بە چاوی یارە.

٢٦

گە عیلاجم دەکەن مریدان
بیستووتانە گورگی کەنهان
خەجاڵەت بوون کە وێسپیان[٣١] خستە زیندان
بەگورگانیان دەکرد بوختان
کوتیان وێسپ گورگ خواردیان
بەوێسپ و یاقووبی کەنهان
ئەوان ڕەسووڵ بوون ئەی ڕەحمان
کیژێ خۆی وا داوم نیشان
زولفی بۆ کردووم پەرێشان
دیومە گۆیەک لە نێو سنگان
سنگی وەکو تەختی سوڵتان

لێم تێک چووه دین و ئیمان
پەرچەمی وەک گوڵ و ڕیحان
ئاورِ دەداتەوه سەر شان
بە لەبز دەکا عەتر پەخشان
بەمن دەڵێن شای دەروێشان
ئەمن بەو دەفرۆشم ئیمان.

٢٧

دەستی منو بێ بە دامانە
جەرگم وەک سیخی بریانە
دڵ بۆ سۆ و پڕ ئەلئەمانە
گە دەبینم ئەو چاوانە
وەکو دەلیای[٣٢] بێ ئامانە
لێی هەستاندووم ئیمانە.

٢٨

خەیاڵم وەها بڵاوە
زولفی وەک ئاوریشمی خاوە
تاق و جووت وەهای ڕۆناوە
کەمەندە لە گەرنم کراوە
زاری و ئاوم دێن لە چاوە
دەروون پڕ خوێن و زووخاوە[٣٣]
نازانن چەند شۆخ و لاوە.

٢٩

ئەگەر دەپرسن لە درۆغ
دەبینم باغی هەنجیر و کۆخ.

٣٠

قەستەم بەوەی بێ مەکانە
بەقودرەتی دونیای دانا
زولفی دەکا پەرێشانە
خاڵی ئەسکەری ڕۆمیانە.

٣١

هەتا زووترە، لە ڕەنگی بازی
ئەبرۆی دەکا تیرئەندازی
خەبەرم بۆ بزانن، دڵ نابێ ڕازی.

٣٢

مریدەکە هاتەوە، کوتی: نوێژی خۆتان بکەن، شێخ ئاگای لە خۆی نییە.
دەبینێ کیژێکی چاو بەنگییە
خاڵی جووتە و پەڕ سپییە
مەیلی وی دڵی گەزتییە
ئیختیاری شێخایەتی نییە.

٣٣

شێخ هات کوتی: سەلام دەکەم لە هەمووانە
لەگەڵ ئێوەمە جانانە
لەگەڵ ئەنگۆم زۆر کردووە عەزیەت کێشانە
شەو بێداری و سوبحان سوبحانە
پێم ڕۆژی دەست لێک بەردانە
من دڵم زۆر پەرێشانە
دیومە کیژێکی جانانە
شل و مل و لەبەر دڵانە.

٣٤

ئەگەر سەر دەبەمە سەر سەڵاتە
لێم تێک دەچێ جەماتە
چاوی وەک پیاڵەی حوکماتە
کیژێ دایمە ڕوحم لە لاتە
دواندنی تۆ لە کن ئەمن قاتە
کوڵمەت وەک شانەی نەباتە
سنگت وەک تەختی حوکماتە
سەفەرم هات و نەهاتە.

٣٥

ڕاوەستن دەستە و دوعایە
عیلاجی دەردی من نایە
سنگی وەک کارگی کەمایە(٣٤)
یەگجار بۆی بووم گیانفیدایە.

٣٦

ناکرێ من عیلاج و چارە
دیومە دوو چاوی بەغومارە
ون دەبێ مانگ و ستارە
وەک ئەتڵەس و وەک چەتارە(٣٥)
لەنگۆ ونە و لە من دیارە.

٣٧

پاکو بن گیانفیدایە
ڕاوەستن دەستە و دوعایە
دەنا دینم چوو بە زایە.

٣٨

دیم کیژێ نەشمیلانە
لەبەر دڵی من تەڕلانە
جەرگم پڕ ناڵە و ئامانە
هۆشم نییە بخوێنم قورعانە
لێم تێک چووە ڕێگای شێخانە
دەردی من یەگجار گرانە
مردن خۆشترە لەو ژیانە.

٣٩

سەبر و هۆشم هەڵگیراوە
لێم حەرام بووە خواردن و خاوە[٣٦]
یەگجار مەیلم بەوی داوە.

٤٠

گە دێتە پێش چاوانم
ناممێنێ ڕوحی ڕەوانم
لەبەر کیژی خان و مانم
پێی دەڵێم قەزات لە گیانم
سەحاتێک ببی بە میوانم.

٤١

گیر نابێ، کاری وی نیو سەحاتە
عەمر و ڕوحی من بە با دە
لە دڵم داد و فریادە
پێی دەڵێم چارشێوت لادە
قەولی ئەسەحیم پێ نادا.

٤٢

مریدەکان کوتیان: دەبێ چی لێ قەوما بێ؟

حەز دەکەم بمدەن ئیجازە

کیژی گاوران زۆر بەنازە

ئەو لە ڕەنگی کۆتر و بازە.

٤٣

بچمەوە ماڵێ، وەختی کارە

نەبادا بێ ئەو نازدارە

جەرگی کردووم پارە پارە

بەو جووتە مەمکە هەنارە.

٤٤

مرید دەگەڵی هاتن، کوتیان: شتێکی بەسەردا هاتووە، عیلاجێکی بەڵکو بکەین. شێخ هاتەوە ماڵێ. لە دەلاقەوە[٣٧] فڕڕەی باڵی داعبایەک هات. هاتەوە سەر ڕەنگی ئینسانی و دانیشت. ئەژنۆی بەئەژنۆیەوە نا و کوتی:

٤٥

چاکت لە دنیایە زانی

دەبێ بێی لە کن بابم بکەی شوانی

تەرخ بکەی موسوڵمانی

بکەی بەرازەوانی

زۆر بە دڵ و بە جانی

جا ئەو وەختی شتێک دەزانی

لە دڵت کەم دەبێ ژانی.

٤٦

کوتی: ئەرێ کیژەکەی نازەنینە
لەو تەرکیب و لەو جەمینە[٣٨]
قیمەتی خاڵانت نینە
قسەت بۆ من جەرگ بڕینە.

٤٧

ملکی ئیسلام و کوفارە[٣٩]
دەبێ بۆت بدرێ بە گوارە
زۆر شۆخ و شەنگە ئەو یارە
جەرگم یەکجار بریندارە
چ دەڵێی دێمە سەر ئەو کارە.

٤٨

کچەکە بە شێخی دەڵێ:
حەز دەکەی بگەی بە نازان
بێیە سەر دڵخوازان
دەبێ بچیە بەر بەرازان.

٤٩

قورعان بسووتێنی بە نارە
دەفە بکەی پارە پارە
لە پشت ببەستی زینهارە
سەبارەت بە چاوی یارە.

٥٠

بڵاوکە مرید و خانەقا
ئەو جەرگەت وا لەت لەتە[٤٠]
حەز دەکەی دڵت بەمەخسود بگا
بێیە سەر مەخسود و شادی
تۆ دەگەڕێی لە مرادی
دینت دەبێ بچێ بە بادی.

٥١

عەمرت چۆتە سەت ساڵانە
ئەرێ پیرەکەی زورهانە[٤١]
بەدبەختی، دەردت گرانە
بڕوانە گۆشەی چاوانە
غەدەنگی جەرگ و دڵانە
من لێت دەکرم ئیمانە
دەبێ ببیە بەرازەوانە
گیر نەبی لەو جێ و مەکانە
دەتبەمە فەرەنگستانە
تا دە ساڵ عەزیەت کێشانە
دنیا مردنە و ژیانە
ئەگەر مای پاشی دە ساڵانە
قسمەتت دەبێ جانانە.

٥٢

ئەو حەلە من دەبم بە ئی تۆ
لە دەروونت دەبرێ بۆسۆ[٤٢]

بۆت هەڵدێنم چاو و برۆ
ئاخ لە بانی ئاخ ڕۆ لە بانی ڕۆ.

٥٣

شێخ دەیکوت: بەوەی کەم کردگارە
نامەوێ دین و ڕەفتارە
لادەچم لەسەر ئەو ئاکارە
لە پشت دەبەستم زینهارە
سەبارەت بە چاوی یارە.

٥٤

دەیکوت: پەلە مەکە سبحەینێ تاو هەڵاتە
ئەگەر کەشتێک بۆ بەحرێ هاتە
دڵی خۆت بخە زوڵماتە.

٥٥

مەیکە بەدرەنگ و زووە
ئەو کەشتییەم من ناردووە
خانەقات پێ چۆڵ بووە
ئیمانت لە دەست دەرچووە.

٥٦

ناتمێنێ دین و ئیمانە
لێت تێک چێ تەخت و مەکانە
بە ناز بۆت هەڵدێنم چاوانە
بەشەرت لێت دەستێنم ئیمانە
دە ساڵت دەکەم بە شوانە

دەبێ ببیە بەرازەوانە.
جا ئەوە قەولی پێ دا.

٥٧

شێخ کوتی:
پیرم عومرم زۆر ڕابردووە
کار لە کاری تەجاواز کردووە
تیری دەستی تۆم خواردووە
ئیمانم لە بیر(٤٣) چووە.

٥٨

هەچەند هەڵدێنی ئەو چاوە کاڵە
من حاڵم دەبێ بێ حاڵە
لە دڵم دێ داد و ناڵە
سەبارەت بەو خەت و خاڵە.

٥٩

سەبارەت بەو زولفە خاوە
هەڵدێنی گۆشەی چاوە
تیرە لە جەرگم دراوە
ئاورێکە وا هەڵکراوە
بەهیچ کەس ئەو ئاورە نەکوژاوە
ڕەهبەتی دینم نەماوە
تاقەتی ئەژنۆم شکاوە
بە تیرەندازی ئەو چاوە.

٦٠

حازرم بۆ فەرەنگستانە

شەرتت لەگەڵ دەکەم دەبمە شوانە

نامەویٚ ئیستیراحەتی شەو و رۆژانە

سەبارەت بە چاوی جانانە(٤٤).

٦١

سبحەینێ دێن دەیبەن. کچەکە سنگی بۆ ئاواڵە کرد، وای لێ دەکا هۆشی دە کەللەیدا نەمێنێ.

کوتی: هانێ بتدەمێ نیشانە

ببینە مابەینی سینە و مەمکانە

میسلی تەختی پادشاهانە

جێ حوکماتی شا و سوڵتانە

با دەردت پێی ببێ گرانە

بەوەت لێ دەکرم ئیمانە.

٦٢

ببینە ئەبرۆی بەیداغکار

وەدەری خست مەمکی هەنار

شێخ پێی نەما عیلاج و چار.

دەستی دەبرد لە بۆ هەنار

دەیکوت: با عومرم ببێ قوتار.

٦٣

بە مەخسودم رەهایە

تیرت لە جەرگم دایە

بەکەس عیلاجی نایە
کوڵمەت میسلی چرایە.

٦٤

زولفت ئاوریشمی خاوە
کوڵمەت قەنداوە، تازە تێ کراوە
ئەگەر بێتو بڵێن قومێکی[٤٥] لێداوە
عومری ڕابردووم دەگەڕێتە دواوە.

٦٥

نامێنێ پیری و زورهانی
سنگت وەک شەربەت و کانی[٤٦]
عیلاجی دەردی نیانی[٤٧]
بۆ من حەکیم و لوقمانی
سەت جارت من ببم بەقوربانی.

٦٦

حۆری بەهەشتی یان ئیٔ ئەو دنیایە؟
پێم وایە عیلاجم نایە
وەهات بۆ بووم مفتەلایە
ئیمانت بردم بە زایە
سنگت باغی دونیایە
قیامەتم چوو بە زایە.

٦٧

دوو ماچی دایە و پێی کوت:
ئەمن هەم باز و هەم شەهێنم
بەزۆر دینت لێ دەستێنم

ببینە ئەگەر کوڵمەت بۆ دێنم
ئەوە ڕوحت لێ دەڕفێنم.

٦٨

شێخ هاتە نێو مریدەکانی، کوتی:
براله لێم تەڵخ بووە ئەحواڵە
لێم تاڵ بووە ماڵ و حاڵە
نامەوێ ژن و منداڵە
ڕەهبەتی دینم بەتاڵە
سەبارەت بەو چاو کاڵە.

٦٩

مریدان دەردم گرانە
شێخ مەڵێن شێتە و دێوانە
بەخودای کاری سوبحانە
لێی تێک دام تەخت و مەکانە
زیکر و دەفە تا قورعانە
لە بیرم نەماوە ئەوانە.

٧٠

هاشا لەو ماڵ و منداڵە
ئەمن حاڵم زۆر بێ حاڵە.

٧١

نەڵێن شێتە و عاقڵی نییە
زولفی کیژێ پای بەستییە
ئیختییار و عاقڵم نییە

وام دیوه خاڵی کونجییه[٤٨]
بۆیه ئاگام له خۆم نییه.

٧٢

پاش ئەمن ئەڵڵا ئەڵڵا کەن
ئێوه ڕوو له دەرگای خودا کەن
واسیدێکم[٤٩] بۆ پەیدا کەن
بەکیژێ گاورانم شاد کەن.

٧٣

ڕێ و شوێنم لێ گۆڕاوه
عاقڵم له سەریدا نەماوه
ئەو عاقڵه پوختەم بووه خاوه
من مەیلم به کیژێ داوه.

٧٤

دەگەڵم کردووه شەرت و قەراره
له دەروونم گڕەی[٥٠] ناره
سەبارەت بەو چاو بەغوماره
ئەو پیرییەم لێ وشیاره.

٧٥

وەکو حالاتی جوانی
عەمری چارده سالانی
زەفەری پێ بردووم نەفس و شەیتانی
پێی تەرخ کردووم سوبحان سوبحانی
ڕوحیان بردووم به نیانی
دەچمه بەرازەوانی.

٧٦

بۆیە وا دەردم گرانە

ڕوحیان بردووم بۆ بوتخانە

مایەی زولف و چاوی جوانە

زەحمەتە فرۆشتنی ئیمانە.

٧٧

هێند مەحبووبە ئەو یارە

چاوی هێند مەست و بەغومارە

چاوی قاسید و وشیارە

ئەمن دڵم بریندارە

من مەستم ئەو ئیغیارە

بۆ ئیمانم خڕیدارە.

٧٨

بەحوکمی چاوی شەهێنێ

کوڵمەی ڕەنگاوڕەنگی دێنێ

ئەو ئیمانم لێ دەستێنێ.

٧٩

دەنا زۆر پیر و هیلاکم

پەنا بەخودای بێ باکم.

٨٠

پێم ناکرێ فکر و ڕەوانی

لێم تێک چووە مەعنای قورعانی

سەبارەت بە چاوەکانی

میسلی ئەستێرەی بەیانی
کە هەڵدێ شەو و ڕۆژانی.

٨١

ئەستێرێکی شوعلەدارە
لە پیر و مرید ڕا دیارە
ئێوە نەودیوە ئەو چاوە بەغومارە
دەنا ئەنگۆش لادەچن لەسەر کاروبارە.

٨٢

نەودیوە ناز و نیم نازە
ئەبرۆی یەگجار تیرەندازە
وەک شەهێنە، میسلی بازە
دڵی بردووم بێ ئەندازە.

٨٣

هاشا لە ملّک و ئەملاکم
لە زیندەگانی تا خاکم
چیدی من حوکمەتێ ناکەم
ڕوح بەکیژێ گیانفیدا کەم
خزمەتی بەرازان دەکەم.

٨٤

خانەقا بکەن بڵاوە
کاری ئەنگۆ بووە تەواوە
شێخو لە نێودا نەماوە
شێخ مفتەلا بە دوو چاوە.

٨٥

مفتەلام زۆر دەردەدارم

لێم تێک چووە کاروبارم

سبەینێ ونم ئەورۆ دیارم.

٨٦

شێخ چووە گوێی بەحرێ، لەوێ دەگەڕا، چاوەڕێی کەشتی بوو.

ڕۆژ سەری دەهێنا دەرە

شێخ مفتەلا و دەستە و نەزەرە

زەخمی هیلاکی دەستی خەنجەرە

دێوانەیە و سەوداسەرە

نەما ڕەهبەت و جەوهەرە

کەنگێ کەشتی دێتە دەرە؟

شاد بم بەدیداری دولبەرە.

٨٧

بڕوانمە مەوجی دەلیایە

چاوەڕێم، بۆ کەشتی نایە؟

ئیمانی بردووم بە زایە

بۆچی لە هانام نایە؟

٨٨

من ڕاوەستام مونتەزیری

من بە زورهانی و بە پیری

وەکو حەبس و موقەسیری

سنگی وەک تەختی وەزیری

کوڵمەی وەک شکۆفەی هەنجیری
بۆ دیار نییە بەرێ پیری؟

٨٩

دڵی منی پڕ لە ژانە
بۆ دیار نییە نەشمیلانە[٥١]؟
کۆخ و هەنجیر تێک هاڵانە
یانی زنجیرەی زولفانە
بردوومی ڕوحی ڕەوانە.

٩٠

کچەکە چووە کن بابی، پێی گوت: ئەمن ئازارێکم بەسەر هاتووە. حاڵ و موقەددەری بۆ گێڕاوە. بابەکەی کوتی: کچێ هەی نەبێ، شێخی سەنعان گەلێک لە ئێمەی کردۆتە موسوڵمان، ئەگە وابێ ئێمە لە لای وێوە ئاسوودە خاتر دەبین. پادشا ئەگەر وای زانی کەشتی نارد بۆ وێ.

٩١

شێخ ئەگەر دڵی بەندە
دی کەشتێکی نوقرە بەندە
زانی ئی کیژێ ڕەند و مەندە.

٩٢

گە دی کەشتێکی نەشمیلانە
کەشتی هات بۆ سەر بەحرانە
زانی ئی کیژی گاورانە
ڕاستە شەرت و قەرار و متمانە[٥٢]
شێخ پێـی فرۆشتووە ئیمانە

شێخ فکری بوو پەرێشانە
با سەرپشک(٥٣) بم لەو دووانە:
خۆشترە لەزەتی جیهانە
یا نە ئی ڕۆژی پەنهانە؟
ئەما کوشتوومی ئەو چاوانە
خاڵی گە ڕاست و چەپ دانا
نەشتەری جەرگ و دڵانە
ئەمن دەمەوێ جیهانە
سەبارەت بە جانانە.

٩٣

وێنەی کچەکە بەپێش کەشتێکەوە بوو، ڕووی تێ کرد، کوتی:
من لێت دەکەم سەلامە
لێت هەڵگرتم عاقڵ و فامە
عالەم دەڵێن: پیر و عەوامە
لێت بدینم کاو و کامە
دایمە ڕەنگت لە لامە
لێم حەرام بووە سوبح و شامە
عاقڵم نەماوە، لێم خامە.

٩٤

سڵاوی لە عەکسەکە کرد و چووە دەکەشتێوە. کەشتێکە لە حاست خۆی گەڕاوە. گەیشتنە فەڕەنگستان. پادشاش دەگەڵ وەزیران هاتبووە قەراغ بەحرێ. شێخ دابەزی بە سەت ئیحتیڕام، هاتە کن پادشای، بە پادشای کوت:

٩٥

لەگەڵم بکە شەرت و قەرارە
چبکەم، من چارم بێ چارە

قەرارم کردووە لەگەڵ یارە
لە پشت ببەستم زینهارە
کاری من بەر بەرازانە، دیارە
ڕوحم پیر و ئیختییارە.

٩٦

لوتف و مەرحەمەتی شایە
زینهارێکی ئەوە دایە
دەبێ ببینی دەرد و تەقەلایە
ئەو خەیاڵەی لە دڵت دایە.

٩٧

ئەوە شا قەولی پێ دا ئەگەر شێخ لە دین وەرگەڕێ کچەکەی داتێ. شێخ کوتی:
کوڵمەی وەک گوڵی گەشە
چاو شەهێنە و ئەبرۆی ڕەشە
پادشا ئەو پیرەی سپی ڕیشە
کچی خۆتی پێ ببەخشە.

٩٨

شا کوتی:
لەگەڵت کردووە شەرت و شوێنە
لە قۆڵت بکە دەستبێنە(٥٤)
برۆ مێگەلی بەراز بێنە
بە خزمەت کیژێم لێ بستێنە.

٩٩

خزمەت بکە بەئیخلاسی
تەرخ بکە خوداشوناسی

کیژ لە قامکی دایە ئەڵماسی
خۆ تۆ چاک کیژێ دەناسی.

١٠٠

ئەی پیرەکەی زورهانە
پێم بکە باوەڕ و متمانە
گە بچیە بەر بەرازانە
بفرۆشی دین و ئیمانە
دامێی کیژێ مەرزینگانە.

١٠١

دامێی کیژی چاو بەڵەکە
خاڵی جووتە و زولفی یەکە
حاجییان دێنێ لە ڕێی مەکە
دینی شێخان بەتاڵ دەکا
قەتڵی بێ تاوان ئەگەر دەکا.

١٠٢

ببینە وەک مانگی تابانە
تەمەشای زنجیرەی زولفانە
خاڵی ڕەش نەخش و نیشانە
تاق و جووت لە کوڵمەی دانا
گە بچیە بەر بەرازانە
پێم بەخشی کیژی نۆجوانە.

١٠٣

کوتی:

نەمویستووە ماڵ و منداڵە

دنیام لە خۆم کردووە تاڵە

ڕەهبەتی دینم بەتاڵە

سەبارەت بەو چاوە کاڵە.

١٠٤

حەز دەکەم کیژ بمدوێنێ

با ڕوحم لێ بستێنێ

بیری وەتەنم نەمێنێ.

١٠٥

شا کوتی: بڕۆن کچەکە بانگ کەن، بێتە کن شێخی قسەی دەگەڵ بکا.

بەکیژێ بڵێ بێ بیدوێنێ

جەرگ و دڵی ڕابوەشێنێ

بەناز ئیمانی لێ بستێنێ

هۆشی مریدانی نەمێنێ.

١٠٦

ئەوە کچەکە لە قەڵا و باڵەخانەی دێتە خوارێ. هاتە کن شێخی، پێی دەڵێ:

ئەگەر تۆ دەکەی متمانە

ئەرێ پیرەکەی زورهانە

دەبێ بچیە بەر بەرازانە

شەو و ڕۆژ ڕوحت هەراسانە

سەبارەت بە جانانە.

١٠٧

سنگم وەک باغی شەدداده
دین و دنیات دا بەباده
له دڵت واوەیلا و فریاده
سنگم وەک ڕێگای جاده.

١٠٨

وەها ڕوحت دەستێنم
ئیمانت بۆ خۆم دێنم
میسلی باز و شەهێنم
وا به نیو ناز دەتدوێنم.

١٠٩

شەرت و شوێنمان تەواوه
من قەولم به تۆ داوه
تۆ بەرماڵت فڕێ داوه
خانەقات له خۆت تێک داوه
گە شەرتت ببێ تەواوه
دەبینی تۆ باغی ساوا.

١١٠

پیری عومر سەت ساڵانی
گەلێک عەبله و هیچ نەزانی
دەبێ تۆ بچیه شوانی
خزمەت بکەی تا دەتوانی
سەبارەت به چاوانی.

١١١

شێخ ڕۆژێکی بەرازەکانی دەڕۆیین. شێخ بازی دا، پەلێکی[٥٥] وەلاقی کەوت. ئەگە هاتەوە لاقی ئەستوور ببوو، دەشەلی. کچەکەش دەرکی پەنجەرەی کربۆوە. شێخ کوتی:

١١٢

ئەرێ کیژێ چاو بەنگییە
سنگت وەک بەفری سپییە
بەژنت وەکو شەنگەبییە
من بەتۆم فرۆشتووە دینییە
بۆ ئاگات لە دەردی من نییە؟
لە کەندالێم باز بردییە
پەلێکم لە لاق هەڵ چییە
حاجەتم بە تۆ دەرزییە.

١١٣

ئەرێ کیژەکەی چاو کاڵە
وەهات دەرد کردووم حەواڵە
لە بیرم چووە ماڵ و منداڵە
ڕەهبەتی دینم بەتاڵە
کوڵمەت وەکو دوڕی لاڵە.

١١٤

ڕۆینت وەکو خاسە سییە[٥٦]
گەردنت زێڕی سپییە
لەعلی ڕوممان و فەرەنتییە[٥٧]

بۆ ئاگات لە حاڵی من نییە؟
حاجەتم بە تۆ دەرزییە.

١١٥

کیژ ئەوە بە زەردەخەنە
پرچی بەمیسلی قۆپەنە(٥٨)
وەک مانگی چاردە ڕۆشەنە.

١١٦

هات دەنگی زێڕ و گوارە
کرمەک و گوارە و قەتارە
سنگ وەک بازاڕ و شارە
چاوی مەست و بەغومارە
دەیکوت: پیرەکەی بێچارە
کوا لاقت بریندارە؟

١١٧

دەیکوت: کیژەکەی وەک هەنجیر و هەناری
تیرت لە جەرگم بووە کاری
عەترت لە زولفی دەباری
وەک وەنەوشەی نەوبەهاری.

١١٨

بولبولم، سەرم شێواوە
عاقڵی پوختم بووە خاوە
من مەستم بۆو جووتە چاوە
خەدەنگێکت کێشاوە

وەهات لە جەرگم داوە

برینی کۆنەم کولاوە

بۆ من زۆر کام و کاوە

ئەگەر بڵێن: کیژ ئەو دڕوەی دەرهێناوە.

١١٩

ڕانی وەکو دۆشەگی نەرمە

نەختێک کیژۆ پێی شەرمە

ئەما شێخ دڵی گەلێک گەرمە.

١٢٠

سنگ وەک شەربەت و کانی

لاقی بردە سەر ڕانی

بۆ شێخ بووە زیندەگانی

کیژ پەلی لە لاقی دەرهانی[٥٩]

١٢١

شێخ ئەوە دەپاڕاوە

ئەرێ کیژەکەی نۆلاوە

خاڵ و پەرچەم تێک چرژاوە[٦٠]

دوڕوت لە لاقم دەرهێناوە

ئەوە لێم خۆش بوو هەنگاوە

ئەوجار ماندووم حەساوە

سەبارەت بە مەستی ئەو دوو چاوە

پێم وایە وەختم تەواوە

عەزیەتم گەلێک کێشاوە.

١٢٢

کیژ کوتی: تۆ نازانی
نەخۆشی، زۆر دەرد گرانی
خەرفاوی، پیر و زورهانی
ئەتۆ تازە حەو سالانی
ئەگەر بەرازەوانی
عاشق بە دوو چاوانی.

١٢٣

دەبێ ببینی دەردەداری
نەخۆشی و ئینتیزاری
جا ئەو حەلە دەگەی بە یاری.

١٢٤

کوتی: کیژەکەی بۆت بووم ئینتیزار
من مەستم، نابم ئیغیار
عەترت لە چاوی هاتە خوار
بوو بە باغی هەنجیر و هەنار
دین و مەزهەبت کردم قوتار
لە ئاهم نابی ڕزگار.

١٢٥

زەحمەتە، دەردم گرانە
سنگت تەختی سوڵتانە
دوو فینجانت لێ دانا
کوشتمی مەستی چاوانە.

١٢٦

باڵا بڵند و نامداری
بە پیری و بە هەژاری
بە مەستی و دین قوتاری
هەر چونکە تۆم یاری.

١٢٧

ئەو عەترەی لێت دەبارێ
ئەمنی کردە وشیارێ.

١٢٨

پێک هاتووە کاروبارم
کیژێ سیمین عوزارم
باغی کۆخ و هەنارم
یەگجارت پێ منەتبارم.

١٢٩

دوو کەس لە مریدانی وەفادار و بەدینی شێخی سەنعان، چوون خۆیان دەدەرگای حەزرەتی غەوس هاویشت. دوو ساڵان خەریکی خزمەت و دەرگا ماڵین بوون. حەزرەتی غەوس دەیزانی ئەوانە بۆچی هاتوون و مەنزوور و مەتڵەبیان چییە و چییان دەوێ؛ ئەما خۆی تێ نەدەگەیاندن.

دوو ساڵە ئەگەر تەواو بوو، بانگی کردن؛ کوتی: لەوەیدا ئەنگۆ مەتڵەبو چییە ئەو خزمەتە دەکەن؟ کوتیان: شێخ چاک لە دەردی ئێمە حاڵییە؛ ئێمە مریدی شێخی سەنعانین. ئێستاش کە شێخی سەنعانی وای لێ هاتووە، ئێمە ئەوەی لە تۆڕا دەزانین. ئەلعانیش ئێمە شێخی خۆمان لە تۆ دەوێتەوە. دەمانەوێ لە دەرگای خودای تەوەقو(٦١) بکەی شێخ بێتەوە سەر حاڵ و ڕێ و شوێنی جاران.

حەزرەتی غەوس سەری داخست، بڕێک موراقیب بوو، پاشان سەری هەڵێنا و کوتی: شێخایەتی و دەرەجەی ئیرشادو ئەگەر دەوێ بودەمێ، دەست لەو کارە هەڵبگرن و باسی ئەو قسەیە مەکەن. مریدەکان کوتیان: غەیرە مومکینە. ئێمە لە دەرگای تۆ ناڕۆین، شێخایەتیشمان ناوێ. ئێمە شێخی خۆمان لە تۆ دەوێتەوە. تەمەننامان هەر ئەوەیە ئەگەر شێخ ئەو کارەمان بۆ پێک بێنێ و شێخی سەنعان بێنێتەوە نێو خۆمان.

ئاخر مریدەکانی شێخی سەنعانی دەستیان هەڵ نەگرت. جا ئەگەر حەزرەتی غەوس وای زانی، تەوەقوی بۆ شێخی سەنعان کرد و بۆی پاڕاوە. جا کوتی: براله خودا ڕوحمی بە شێخی ئێوە کرد. ئەنگۆش بڕۆن مریدان هەڵبگرن، بچنە قەراغ دەریایە، ئاڵقەی زیکرێ بگرن. لەوێ شێخی سەنعان دڵی ئاگا دەکا و دێتەوە سەر ڕێ و شوێنی ئیسلامەتێ و دەگەڕێتەوە نێو خۆتان.

مریدان چوونە سەر بەحرێ، دەستیان بەزیکرێ کرد. شێخی سەنعانی لەوێ گوێی لە دەنگی مریدەکانی بوو. سەری هەڵێناو پاڕاوە لەبەر خودای. هۆش و عاقڵی هاتەوە بەر خۆی. خاچ و زینهاری فڕێ دا و هاتە سەر بەحرێ. زۆر پاڕاوە لەبەر خودای، شادیمانێکی بەحەقی هێنا و شەیتانی بە لەعنەت کرد.

١٣٠

شێخ هەمیشە بەرماڵی بەشانێوە بوو. لەبەر خولای پاڕاوە، بەرماڵەکەی هاویشتە سەر بەحرێ، بۆی بوو بە کەشتی و سواری بوو. شێخ سەری هەڵێنا و کوتی:

یاڕەب هەر ئەتۆی ڕوحبەر و ڕوحدەر
زۆر پەشیمانم خودای بانی سەر
بێ بەشم نەکەی لە ئاوی کەوسەر
بەعومری تۆ بوو خراپەم هاتە بەر
چیدیکە ئەمن نەکەی دەربەدەر
ماڵم خرابوو، ئەی خۆڵم وەسەر.
ڕوحمت زۆرترە لە دای و باوان

هەر تۆ دەمێنی بیناهی چاوان.
پەنام هەر ئەتۆی ئەی حەیی دانا
بەکفله کونێک تۆ دنیات دانا
ئەمنت شێت کردبوو کەوتمە کێوانە
پیری بێ چارە زۆر پەشیمانە.
کچەکەش چاوی لەو کارە بوو، هاتە سەر لێوی بەحرێ، کوتی:
یا خودای شێخی سەنعانی
کیژ چیدیکەی نەزانی
ڕووی کرد لە دەرگای سوبحانی
کوتی مەدەد یا خودای سەنعانی.
چارشێوەکەی هاویشتە سەر بەحرێ، بۆی بوو بە کەشتی و سواری بوو. بەدوایدا ڕۆیی؛ گەییشتەوە شێخی. ئیمانی هێنا و موسوڵمان بوو.
تێکڕا چوونەوە خزمەت حەزرەتی غەوس. شێخ خۆی هاویشتە پشتی. حەزرەتی غەوس دڵی دەگەڵ چا کردەوە و بەخشی. کچەکەشی لێ مارە کرد.

پەراوێزەکان:
١- دەقینە، ئەم وشەیەم لە ئاخافتنی خەڵکدا نەبیستووە و فەرهەنگی مەهابادی گیوی موکریانیش تۆماری نەکردووە ماناکەی بە پێی زەمینەی ڕێکەوەندەکە جار و دەفعە و سەرەتای کارە.
٢- ساحێب دەست، واتە دەست ڕۆیشتوو و بەدەسەڵات.
٣- ئیفتادە، واتە پیر و لەکارکەوتە.
٤- سەقەت، لێرەدا واتە بە هێزو توانا.
٥- زینها= زنار
٦- باڵندە، واتە باڵدار. داعبا، لێرەدا واتە باڵندە، فڕندە
٧- قاوە قاوە واتە هەراهەرا و زەنازەنا
٨- ڕەهبەت بەواتای هۆش و ئیختیار و ترسە
٩- ئێوارێ یان ئێوارە
١٠- قامەت، دەستپێکردن و کردنی نوێژ
١١- دیار، سپەیداو ئاشکرا

١٢- شمقارِ، شنقار، بڕوانە پێشەکی ئەم کتێبە

١٣- ڕەو، بەمانای هێرش و بەتایبەت هێرشی هەرەوزی ئاژەڵان.

کورد دەڵێ: « تـوتکەکەش ڕەوێ دەبا » واتە تولەکەش وێڕای سەگەل هێرش دەگاتە سەر دوژمن یان گورگ.

١٤- ناسرەوێ، ئارام ناگرێ

١٥- بەڵەک، ابلق، ڕەنگی ڕەش و سپی

١٦- کزە کز، بەوتای هێور و ئارام و بریتییە لە هەردەنگێکی ئارام

١٧- بریانی، چەوەندەر یان کوولەکەی لە ئاگردا بریان کراو

١٨- بازی بەند، هەمان بازوو بەندە

١٩- لاڵ، هەمان لەعل

٢٠- بەرماڵ، ئەو راخەرەی نوێژی لەسەر دەکەن

٢١- عەشق، لێردا بەواتای مەعشووق هاتووە

٢٢- ئاوڕ، نیگایەکی بەرەو دوا کە تێکەڵ بەمیهر ومەحەببەت بێت.

٢٣- ایەتی» پاشگرێکی چاوگ سازە، وەک: دۆستایەتی، جحێڵایەتی

٢٤- سنگ، یان هەمان سینگ و سینە. بەیت بێژ ئەم وشەیە بەشێوەی «سنگ» بێژ دەکات.

٢٥- گە، کورتکراوەی گەر و ئەگەرە.

٢٦- لەنجە، بەناز بە ڕێگادا ڕۆیشتن وەک کۆتر

٢٧- عەبداڵ، ئاوارە و سەرگەردان.

٢٨- لیر، هەڵمسانی پێست کاتێ جڕوجانەوەر پێوەی دەدەن، لێرەدا بەواتای قووتبوونەوەی مەمک بەکاردێت. وەک چاوگ دەبێتە لیر کردن

٢٩- مافینگی، بەواتای پەرێشانی و ئاوارەییە.

٣٠- زەردەخەنە، بەواتای پێکەنین، زەردەو بزەیش هەرئەم مانایەیان هەیە.

٣١- ووێسپ، بێژ کردنێکی زارگوت و عامیانەی وشەی «یوسف»ەبە

٣٢- دەلیا، هەمان دەریا. ئەم بێژکردنەم لە خەڵکانی تریشەوە بیستووە.

٣٣- زووخاو، ئەو چڵکاوەی لەبرین دێتە دەرێ.

٣٤- کارگی کەمایە، کارگێکە سپی و پان و بۆ خواردن دەبێت. دەڵێن، کەمان گیایەکە کە کارگ لەبنیدا شین دەبێت.

٣٥- چەتارە، ناوی پارچەیەک بوو.

٣٦- خاو، خەو

٣٧- دەلاقە، دەربیجە

٣٨- جەمین، وێدەچێ ئەم وشەیە لەبنەڕەتدا، جبین» بێت کە لە عارەبیدا بەمانای نێوچاوان و

تەوێڵە. لەبێژ کردنی زارگوتدا «ب» دەبێتە «م» وەکو «نەجیب» کە دەبێتە «نەجیم».

٣٩- لەوشەی کوفارە دا پیتی «ە» زیادنیە و تەنیا بۆ چێ کردنی سەروا پێ زیاد کراوە.

٤٠- لەت لەت، پارە پارە

٤١- زۆرهان بەواتای پیرو پەککەوتەیە.

٤٢- بۆسۆ، ئەو بۆنەی لە سووتانی پەمبە هەڵدەستێ بۆنی سووتانی پەشم «بۆ کرووز»ەو بۆنی سووتانی گۆشت و چەوری دەبێتە «بۆ چرووک»

٤٣- بیر، لێرەدا واتە یاد

٤٤- جانانە، مەبەست مەعشووق و دڵخوازە.

٤٥- قوم، واتە تۆزێک ئاو

٤٦- کانی، سەرچاوەی ئاو.

٤٧- مەبەست لەدەودی نییانیی عیشقە.

٤٨- کونجی، بە واتای ڕەنگ بەڕەنگ.

٤٩- واسیدە، بێژ کردنی عامیانەی «واسطە»یە.

٥٠- گڕڕە یان گڕ واتە بڵێسە ئاگر.

٥١- نەشمیلان، واتە جوان و لەبەردڵان.

٥٢- متمانە، باوەڕ

٥٣- سەرپشک بوون، واتە ئیختیار دار بوون- پشک لە فەرهەنگی وشەگەلی علمیانەی جەمال زادە دا بەم چەشنە مانای بۆ لێکدراوەتەوە: « جۆرە حسێبێکە بۆ دەسنیشانکردنی نۆبەی، پێش و پاش بۆ کایە.

٥٤- دەستبێن، هەمان دەستبەندە بریتییە لەو گوریسە کە شوان سەرێکی لە باسکی خۆی دەهاڵێنێ و سەرەکەی تری لە قاچی مەڕ شەتەک دەدات و بۆی دەخەوێ هەر کاتێک مەڕەکان تووشی مەترسی بێن و بیانەوێ ڕابکەن ئەو گوریسە دەکێشرێ و هەر بۆیە شوان لەخەو هەڵدەستێ و مەترسییان لێ دوور دەکاتەوە.

٥٥- پەل چەند واتای هەیە.١- بەواتای «پێ»یە وەک چۆن دەڵێن .چوار پەل قایم» ٢- بە واتای قەڵەمەیە (ئەم وشەیە لەفەرهەنگی عمید» دا بەم چەشنە مانا کراوەتەوە: لقی درەخت کە بەشکڵی قەڵەم دەیبڕنەوە و لە عەرزدا دەینێژن تا ریشە بکات و شین بێت.

٣- هەر چەشنە دارێکی نووک تیژی درووئاسا.

بابەتی دروو تێچوون لە پیی شێخی سەنعان لە نوسخەی ئاغای «ئەنیسی» شدا سەرنجی پێدراوەو قسەی لەسەرکراوە. لەو گێڕانەوەیەدا شێخی سەنعان لەم بارەیەوە بەم چەشنە کچی گاوری دواندوە:

کیژەکەی سوور و سپییە

سەری منت ببێ بەقوربانی سەرییە
شلک و نەرم و چاوبەنگیە
شێتم، ئاگام هیچ لە خۆم نییە
برک و ژانم لە دڵییە
لە کەنداڵێم باز بردییە
دڕوویەکم لە پای هەڵ چییە
حاجەتم بە تۆ دەرزییە

٥٦- سی، باڵندەیەکە شێوەی قاز دەدات ڕەنگی سپی مەیلەو خۆڵەمێشییە کە لە کەنار چەم و لەنێو ئاودا دەژیت و لە ڕاستیدا جۆرە قازێکی کێوییە « ناوی باڵندە لەزاراوەکانی کوردیدا.

٥٧- فەرەنتی، بەگوتەی بەیتبێژ ناوی بەردێکی بەقیمەتە.

٥٨- قۆپەنە، بە نێوقەد هێشوو دەڵێن.

٥٩- دەرهانی، واتە دەری هێنا

٦٠- تێک چرژان، واتە تێکەڵ بوون

٦١- تەوەقو، واتە چاوەڕاوانی، هەمان «توقع»

# پێشەکی

ئۆسکارمانی ئەڵمانی[1] بەیتی لاس و خەزاڵیشی لە کتێبە بەنرخەکەی خۆیدا (توحفەی موزەففەرییە) هێناوە.

مامۆستا هێمن توحفەی موزەففەرییەی هێناوەتەوە سەر ڕێنووسی کوردی و هەر بەیتەی پێشەکییەکی بۆ ڕازاندۆتەوە. مامۆستا لە پێشەکی بەیتی لاس و خەزاڵدا دەڵێ[2]: «بەیتی سێیەمی کتێبەکەی ئۆسکارمان لاس و خەزاڵە. ئەم بەیتە بەڕاستی شاکارێکی ئەدەبی بەرز و کەم وێنەیە. زۆر شتمان لە ڕێ و شوێنی کۆنی نەتەوایەتی گەلەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، دەپێشدا بەیت بێژ بەقسە باسی هاتنە دنیا و گۆڕان و لە دایکبوون و پێگەیشتنی لاس، قارەمانی چیرۆکەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە؛ ئەوجار شیعر دەست پێ دەکا. شیعرەکانی هەتا حەز بکەی ناسک و جوان و پڕ مانان؛ میسرەعەکانی زۆر زۆر درێژن، بەڵام وشە ڕەسەن و جوان و پڕ مۆسیقاکانی وا هەڵبژێردراون و لە تەنیشت یەک داندراون کە کێشەکە (وەزنەکە) دەپارێزن. جار جار نیوە شیعرەکان (میسرەعەکان) کورت دەبنەوە. شیعرەکان جاری وایە زۆر لەسەر قافیەیەک دەڕۆن و جاری وایە کەم. کورتی ببڕمەوە باری ئەدەبی بەیتی لاس و خەزاڵ بەبڕوای من زۆر باشە. بێ گومان ئەو بەیتە زۆر کۆنە، لە مەم و زینیش کۆنتر و لەمێژینەتر دێتە پێش چاو. لاس دارێکی سەخت و چڕ و دڕکاوییە. دیارە ئینسانی کورد پێش ئەوەی کۆخێکی بۆ خۆی دروست بکا، هەر لەو وەختەوە کە لە ئەشکەوت و زندۆڵ و لێڕەواردا ژیاوە، ئەو دارەی ناسیوە و ناوی لێ ناوە. چونکە دارەکە سەخت و دڕکاوی بووە، دوایە کوڕیان بەناو کردووە. ئەو ناوە کۆنە لە چیرۆکەکەدا هەر ماوەتەوە.

---

(١) ئۆسکارمان لە بیستی مانگی سەفەری ساڵی ١٣٣٦ هیجری، کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: کاوە، ساڵی ٢، دووی ڕەبیعی ٢، ساڵی ١٣٣٦ هیجری، لپ ٨.

(٢) توحفەی موزەففەرییە بەزمانی کوردی موکری، گرداری ئۆسکارمان، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی، هێمن موکریانی، بەشی یەکەم، لپ ٨٧.

ئەگەر ناوەکانی تر گۆڕاون، ئەگەر شتی تازەی هاتۆتە نێو، ڕیشەی چیرۆکەکە هەر کۆن و دیارە. بەلێکدانەوەی من، ئەو بەیتە لە زەمانی مێ وەجاغییانی لەو سەردەمەدا کە دەسەلاتی خێزان بەدەست دایکەوە بووە گوتراوە... لەو بەیتە دوو ژن مەزن و سەرۆکی عەشیرەت و عێلی خۆیانن و دامودەزگای مەزنایەتییان هەیە(١) و لە هەموو خۆشتر لەسەر لاوێک نێوان ناخۆشییان لە نێو پەیدا بووە... خەزاڵ مەزن و هەمە کارەی خێڵی مامودینانە(٢)... خانزادیش ئەگەرچی لاس بێ وەفایی دەگەڵ کردووە و بەجێی هێشتووە، یا باشتر بڵێم خەزاڵ لاسی لێ داگیر کردووە، دیسان هەر مەزن و دەستەلاتداری عێل و عاشیرەتی خۆیەتی.

باری دڵداری بەیتی لاس و خەزاڵ زۆر شیرین و جوان و تەواوە. باری حەماسیشی گەلێک بەهێزە...».

مامۆستا عوبەیدیللا ئەیوبیان وێکچوونی داستانێکی مەسنەوی مەولەوی و بەشێک لە بەیتی لاس و خەزاڵی، دیاری کردووە و قامکی لەسەر داناوە؛(٣) ئەو بۆچوونە و وێکچوونەش گەلێک گرینگ و بەکەڵک و بەنرخ و سەرنج ڕاکێشە.

ئەمن ئەو بەیتەم کە بەتەواوی مەعنا بەیتێکی خۆماڵییە (بێجگە لەو بەشەی کە قامکمان بۆ ڕاداشت) لە خوالێخۆشبوو مام ئەحمەدی لوتفی(٤) بیست.

لە ژمارەی بەهاری ساڵی ١٣٤٦ (ساڵی نۆزدەی نەشرییەی دانیشکەدەی

---

(١) یەکێک لەو ژنانەی کە لە تاریخی کورداندا سەرۆکی عەشیرەت و عێلی خۆی بووە و دامودەزگای مەزنایەتی بووە، خانزادە خانی سۆرانە کە دەگەڵ شا سەفی لە ساڵی ١٠٣٩ هیجریدا بەشەڕ هاتووە. خان ئەحمەد خانی ئەردەلان سەری ئەو ژنە ئازا و بەکارەی بۆ شا سەفی نەرم کردووە. بڕوانە: ذیل تاریخ عالم آرای عباسی. تألیف اسکندر بیگ ترکمان، بە تصحیح سهیلی خوانساری، ص ٣٣.

(٢) ئەو مەتنە بەنێوی عێلی مەلا داود و مەلا نەبی و سمایل عوزێری نێویان دەبا.

(٣) نشریەی دانشکدەی ادبیات اصفهان شمارەی یکم سال یکم (١٣٤٣)، ص٢٠٠. نێوونیشانی داستانەکەش ئەوەیە: اواخر دفتر پنجم، صفت کردن مرد غماز و نمودن صورت کنیزک، مصور در کاغذ و عاشق شدن خلیفەی مصر... هەروەها بڕوانە مأخذ قصص و تمثیلات مثنوی، چاپ دوم تألیف بدیع الزمان فروزانفر، دفتر پنجم، ص ١٩٠.

(٤) لە بەرواری ٦٢/١٠/٣ لە شاری سابلاغ عومری خوالای کردووە؛ لە گومبەزان نێژراوە.

ئەدەبیاتی تەورێز) دەستم بەچاپی ئەو بەیتە عانقا و مەزنە کرد. نۆ ژمارەی لێ دەرچوو؛ پاشان نەشرییە بڕیاری دا کە وتاری زۆر دوورودرێژ چاپ نەکا. لە ئاکامدا بەیتەکە بەناتەواوی ماوە.

مەتنی ئۆسکارمان و ئەو مەتنە دروست وەکو یەک نین. هەڵسەنگاندنی ئەم و ئەو دەگەڵ یەک کە نیزیکەی سەتساڵێکیان پێکەوە ماوە هەیە، کارێکی بەکەڵک و گرینگە. ئەو کەسانەی کاریان داتەقاندن و لە کەو و بێژینگدان و زرینگاندنەوەی قسەیە، لەسەریانە ئەو دوو مەتنە پێک بگرن و دەگەڵ یەکیان هەڵسەنگێنن و بەراوردیان بکەن و لەسەری بدوێن. ئەو مەتنە کە لە بەردەستی ئێوە دایە زۆر دوورودرێژترە لە مەتنی ئۆسکارمان؛ بۆ خۆی کتێبێکە. جا ئەوە ئێوە و ئەوە بەیتی مەزنی لاس و خەزاڵ، خوێنەری خۆشەویست بیخوێنەوە و پێت خۆش بێ.

تەورێز - قادر فەتتاحی قازی

# لاس و خەزاڵ

فەتاح بەگی درەیی بوو؛ گەورەی عێل بوو؛ پیاوێکی زۆر دەستڕۆییو بوو. ژنێکی بوو نێوی شازەمان بوو؛ لە خاڵخاڵی عەجەموستان ڕا هێنای. هات بەدەستی زۆر بەحەوت سەد سوار ڕەمکی و کامەریەوە هەڵی گرت.

میرحوسێن کۆنە بەگ بوو؛ مڵکی کەمێک لێ کەم ببوو. فەتاح بەگ پێی گوت: وەرە کن من. پیاوێکی زۆر ڕەشید بوو، تەواوی ئاغایان لێی دەترسان، خانەوادەش بوو.

چووە کنی. یەگجار زۆر پیاوێکی مەند بوو، لە لێقەومانیشدا پێنسەد کەس نەیاندەتوانی ڕێی پێ بگرن. هیچ کەسیش نەیدەتوانی هاتوچۆی خانم شازەمان بکا. فەتاح بەگ گوتی: پیاوی ڕەشید داوێن پیسیش نییە. ئەو دەیتوانی بچێتە کن شازەمان.

بابی ئەو کچە نێوی حەبیب بەگ بوو، میوانی فەتاح بەگ ببوو؛ دەعوەتی کرد. (فەتاح بەگ) چوو بەحەوت سەد کەسەوە؛ عاشقی شازەمان بوو. ڕێگای ئەوەشی نەبوو پێی بڵێ، هەڵی گرت و هێنای. فەتاح بەگ دوو حەفتە لەوێ میوان بوو.

میرحوسێن نیزیکەی دوو ساڵ هاتوچۆی وی دەکرد. وتووێژێکی مەخفی بوویایە، میرحوسێن لەکن فەتاح بەگەوە بەوی ڕادەگەیاند. عافرەتەکە یەگجار زۆر میرحوسێنی خۆش دەویست؛ نەک خۆشەویستی عاشقێنی، خۆشەویستی ئەمربەری ئی ئاغای خۆی.

شەوێکی بەفەتاح بەگی گوت، ژنەکە گوتی: ئەو کابرایە خانەوادەیە، کارێکی وا بکە لە حیسابی دنیاییدا مەحتەل نەبێ، مەنفەعەتێکی زیاد دەزگیری بێ و پێی بگا. فەتاح بەگ لە دڵی خۆیدا کوتی: کوڕە ئەو سەگبابە لەگەڵ ژنەکەم نێوانی خۆش نەکردبێ؟ ئەو ژنە هێندەی لەسەر دەڕوا هەڵبەت شتێک هەیە!. ئەوە ئەندازەی مانگێک خۆی لێ دەگرتن، دەیگوت: بزانم شتێکی لێ وەدی نایە، بیکوژم.

سبەینێکی «فەتاح بەگ» هات بۆ مەجلیسی خۆی. هەزار و چوارسەد کەسی لەگەڵ بوو، هەموو دەسکی خەنجەری ماهی بوو، هەموو قەزوێنکار بوو، جەوهەریان لێ دەڕژا. فەتاح بەگ هات بۆ مەجلیسێ، ئەگە هات شازەمان بەرگی ماڵێی دەبەردا

بوو، هێندێک وتووێژی کرد. پاشان بە میرحوسێنی گوت: بچۆ ماڵە من. ژنەکەی بەرگی گۆڕی، بەرگێکی جوانی دەبەر کرد، بۆ خۆشی دڵ پیسی لێ دەکرد، ئەوی نارد، بۆ خۆشی بەدوایدا هات لە حەرەمخانە خۆی لێ بگرێ.

ئەگەر هات، چاوی پێ کەوت. لەبەر خواجانەی پەنجەرە بوو؛ قسەی دەگەڵ دەکرد. ئەگەر هات، دەو بەرگەیدا دی. کەمبەرێکی بەدری بەحری سێ قوببەی لێ بەستبوو، هەموو عەکسی خۆی تێدا بوو. کراسێکی مەحمەڵ دارایی، ڕەنگ کۆتری شینی دەبەر کردبوو. جووتێک کەوشی دە پێ کردبوو، پانیەی بەڵکو کۆتری پێدا دەفڕی. ئاواڵ کراسێکی موشەجەری کارخانەی گاڵ گاڵی حاجی فەتاڵی بەگی دەبەر کردبوو. چارشێوشان ڕیشوە نیوگەزی، گوڵ تەشپی، مەگەر ئێکی وەک فەتاح بەگ بۆی هەڵ سووڕابا.

عەسڵ کارخانەی عەسڵە فەرەنگییە

گوڵ تەشپییە و ڕیشوە نیوگەزییە

کەسێک بیبینێ، دەڵێن: بێ عاقڵە و عاقڵی لەکن خۆی نییە

ئەگە شێخی ئیرشاد بیبینێ، دەکەوێتە کێوییە

بەو کەسەی کە دەیبینێ، پێی دەڵێن: شێتە، خێر بەنگییە

بۆیە بێ عاقڵە، شەو و ڕۆژ ئاگای لە خۆی نییە

دەسماڵێکی ڕەشی چقر ڕەنگی ڕەنگ کەژی مارییە

ڕیشوەی هاتبووە سەر سینگی سپییە

فەتاح بەگ باوەڕی بەخۆی نەدەکرد، باوەڕی نییە

دەیگوت: بڵێی ئەوە شازەمان بێ، یا حۆری عاسمانییە؟

یان ئەو حۆرییانەیە خوا دروستی کردوون لە بەحەشتی باقییە؟

لەسەری نابوو شەدێکی ئەڵوانی ڕەنگ عاسمانییە

خاڵ دەتگوت کۆترن ڕاست و چەپ لەسەر کولمەی، دەتگوت عەسکەری ڕۆمی و ئەفەندییە

جا دڵی غایلەی کرد، کوتی: ئەوە دەگەڵ میرحوسێن دەکەنەوە قسەی نییانی و مەخفییە

نمەک بەحەرام دەرچوو، جا ئەمن ئەو ژیانەم بۆ چییە؟

گەڕاوە، نەچۆوە شەوێ بۆ مەزڵی ئەو ژنە. سبەینێ بەدزی بەمیرحوسێنی کوت، کوتی:

بەتۆیان کوت پیاوێکی ڕەشید و ئازایە، کردیانە قسە و هەم هەمە

بۆچی بێ نمەک لەکن من خەڵات و بەراتت کەمە؟

دوێنێ بەنەزەر ڕاوەستابووی دەگەڵ شازەمانی، سەیرت دەکرد لەو خاڵ و پەرچەمە.

نەتدەزانی مێردی شازەمان ساحێب ئیختییارە؟

دەیتوێنمەوە بەندی کرمەک و تۆق و تەلەسم و گووارە

پێت خۆشە ئەوت دەگەرووی دەکەم، دەنا دەتدەمەوە لە بەندی سێدارە

ئەویش کوتی: ئاغام بەسڵامەت بێ، ئاغام ساحێب ئیختییارە

ئەمن حاڵی نەبم تاوانم چییە، لەبەرچی بەسەرمدا هاتووە ئەو کارە؟

ئێمە کردەوەی خوداین، هەمووی خوڵقاندین ئەو پادشای جەببارە

ئەمن بێ خەبەرم لەو کار و لەو ڕۆژگارە.

کوتی: خۆ ئەمن بوختانت پێ ناکەم، دوێنێ بەچاوی خۆم دەمدییە

شل و مل زەردەخەنەی دەهاتە دەر لە لێوییە

دەپێی نەکردبوو جووتێک کەوشی کودەری سەر نوقرە بەندییە؟

نەتدەڕوانی لە دەسماڵی کەژی ڕەشمار، ڕێشوویان هاتبووە سەر سینگی سپییە؟

کوتی: ئەتۆ ئەمربەری، کارت چییە؟

کاری تۆ چارەگە سەعاتێکە یان سێ سەعاتی ئەسەحییە؟

دەنا لە من وایە لە شازەمان بەولاوە دنیا کەسی دیکەی تێدا نییە

ئەمن بۆ خۆم دیم دەگەڵ تۆی دەکرد قسەی خۆشەویستی و مەخفییە

ئەمن سوێندم خواردووە بەوەی ئەزەلی و ئەبەدییە

خالقە و ئەگەر ئەو ئیلاهییە

کوشتن بۆ هەردووکتانە، هەر بەتەنێ بۆ تۆ نییە.

میرحوسێن جوابی داوە: ئاغام زۆر پڕ خەیاڵە
ئەمن بۆ کەوچکێک خوێن ناپاڕێمەوە و ناکەمەوە لاڵە
ئەما ئاغام زۆری پەرتە ئەو خەیاڵە
فکرت زۆر پەرێشان و گەواڵ گەواڵە
ئەمن بەخوشکی دای و بابیم داناوە، ئەمن نەختێک گەڕاومەوە، ئەو منداڵە
جا چۆن بۆ من دەبێ ئەو هەناری نەگەییشتوو، ئەو هەڵووچە کاڵە؟
ئەو ڕەنگی گەندمی و ئەو بەژنی شمشاڵە
خوداوەندی میری مەزن قیسمەتی ئاغامی کردووە، بەشی ئاغامە و هەر بۆ ئاغام حەلاڵە
دەسەلاتت هەیە، بەلام بەخولای خەیاڵت بەتاڵە.
قەستەم بەوەی کە ئەبەدییە
ئەمن ئاگام لە خراپە نییە
دامناوە بەخوشکی لە دای و بابییە.
کوتی بیگرن. گرتیان. حوکمی سێدارەی کرد. ناردی دوو قەرە زولفی لە پشتی شازەمان کردەوە. شازەمان کوتی: خراپەم چییە؟ ئەوە بۆیە ئاغا شەوێ نەهاتبۆوە. ژنەکە دەستی کرد بەگریان. کوتی: خودایە بۆ خاتری یەد و قودرەتی خۆت ئەو کارە ئاشکرا بکەی، خەمی ئەوەمە خانەوادەی من و مێردی منی پێ سووک دەبێ، دیارە ئەمن دەهیچ کاری خراپیش دانیم.
دوو زولفیان لە پشتەوە بڕی، قاقەزی کوشتنیان لە سینگی دا، حازریان کرد دەگەڵ میرحوسێن بۆ کوشتن. ئەوێ شەویش نەهاتەوە کابرا، هێند ساحێب نامووس و پیاوەتی بوو. لەبەر فکری خۆی خەوی لێ نەدەکەوت، ئەگەرچی کەم کەسیش زانیبووی. فەتاح بەگ ئەگەر خەوی لێ کەوت شەوێ، هەڵیان هەستاند. کوتی: ئەوە کێیە ڕامدەوەشێنێ؟ تازەم خەو لێ کەوتووە. قەدەغەیە هاتن بۆ کن من. ئەگەر هەستا کابرایەکی مبارەکی چاو پێ کەوت، هیچ دڵی لەبەری نەلەرزی. پێی کوت: عەزیزم قەتڵی بێ تاوان نەکەی. ئەگەر لە من دەپرسی ئەمن خدری زیندەم. قەستەم بەزاتی خودای شیر چلۆن پاکە، میرحوسێن و شازەمانیش ئاوا پاکن. پاشان

شتێکی دەرهێنا وەکو ئاوێنە، کوتی: ئەگەر باوەڕیش ناکەی، فەرموو تەمەشای ئەوە کە. فەتاح بەگ ئەگەر سەرنجی دایە، بە حەشتی دەو ئاوێنەدا دی. جا حەزرەتی خدر دەستێکی بەپشتی داهێنا و بیسمیلایی کرد. ژەنگاری لە دڵی دەرچوو. کوتی: بیبەخشە، پیاوی وات وەگیر ناکەوێ. دەستبەجێ فەتاح بەگ دڵی گۆڕا و دڵی هاتەوە سەرەخۆ.

ئەو سەعاتەی ئەو ڕۆیی و دەروازەی بەحەشتی پێ نیشان دا، شازەمان کوتی: بچم، چاوم پێی بکەوێ. هەستا چووە کنی. کوتی: لێم ڕۆن کەوە لەسەر چی ئەمن دەکوژی؟ فەتاح بەگ کوتی: بەخشیمی. جا کوتی: حاڵ و موقەدەراتی وا ئەوی ڕۆژێ بەرگی نوێت دەبەر کردبوو، ئەمن هاتمەوە ماڵێ و ئەتۆم دەگەڵ میرحوسێنی دی کە قسەت دەکرد. شازەمان کوتی: میرحوسێن پیاوێکی ڕەشیدە. ئەگەر نێوانمان بایە، دەگەڵی دەڕۆییم. ئێستاش هەر برامە. فەتاح بەگ کوتی: شتێکت پێ بڵێم، هەستە بچۆ کن میرحوسێن، دڵخۆشی بدەرە؛ بڵێ: کوشتنی ئێمەی لە دڵ بردە دەر. کوتی: جا بەو شەوە بچم؟ کوتی: هەر ئەلعان بچۆ. هەستا چوو. کاتێک لە میرحوسێن وەژوور کەوت و سلاوی کرد، میرحوسێن سلاوی هەستاندەوە و لەبەری هەستا و مەمکی ڕاستەی گرت و مژی. یانی وەک دایک و خوشکی خۆمی. فەتاح بەگ کە بەدوای شازەماندا هاتبوو، دەو حاڵەدا چاوی بەوان کەوتبوو، ئەگەر وایزانی بەجارێک دڵی پابۆوە.

قەلای فەتاح بەگ ماوە، لە بن ڕەواندز لە دەشتە دیان دایە. جا ئەگەر زانی بەخوشکی خۆی داناوە، کوتی: ئەوە کۆنە بەگ بووە، بیست و یەک پارچەی ملک لە خاکی باڵەکان دایە بە ملکایەتی بە قەباڵە. دەبێ لەوەی بەولاوە زۆری دەگەڵ چاک بم، نەیەڵم دڵی بێشێ. پێ چوو نیزیکە شەش مانگ. ڕۆژێک فەتاح بەگ چوو بۆ ڕاوێ، سەد و بیست کەسی دەگەڵ بوو.

سەد و بیست کەسی دەگەڵە، ئیشتیای لە ڕاوی چۆلییە
هەموو خەنجەری نۆ دوو پشکی زێڕە و دەسکی خەنجەری ماهییە
هەمووی تواوەتەوە، کارخانەی وەستا سمایلە، ئەما دەسکاری وەستا نەسیرییە
بڵێی، قیمەتیان لە هیچ دەوڵەتان نییە

بێ قیمەتن، قیمەتیان لە کن کەس نییە

هەر سەد و بیستیان کوڕەیان مەستە چاوە، چاو مەڕییە

عەسڵە سم تەبەقی شێر خەزاڵییە

پێش بڵند و پاش کورتی گەردن مارییە

پاکی سەقاو جڵەوی ئەشرەفی و مروارییە

ئاوزەنگی لەعلی ڕوممانە و مەتای بەحرییە

بڵێی ئەو ماڵە لەسەر زەمین و لە کارخانەی کەسدا نییە

هەموو حازری کرد کەمەند و ڕێ و شوێنی ئابدارییە

هەموو ئێکی چل و پێنج تیری هەڵگرتووە؛ زەڕ نیشانە، سەرمکارە، ئاو دراوە بە ژەهری مارییە

لەبەر ڕۆژی تەنگانە و لێقەومان، نە وەک کەسێک دەگەڵی بیبێ دوژمنایەتییە

ئەو نۆکەری ئەو هەیەتی ڕەشیدن، هیچی ناترسن لەو ڕۆژەی ئەگەر سەر بەر ئەوە بن بارستی گڵییە

چونکە عاقیدەیان هەیە، دەڵێن بەبێ ئەمری خودای ئەجەل نییە

پاکی مەتاڵی عەسڵ چەرمی گاکێوییە

گەوەزنە و کودەرییە و دەباغییە

هەریەکەی لەبەر ڕۆژی لێقەومانێ، دەباغەڵیان دایە حەوت سەد مەجیدییە

بەبێ ژومار بۆیان هاتووە لە خەزنەخانە زێڕی سپییە

چون پیاو ڕۆیین بەخۆیەتی، هاتنەوە بەخۆی نییە

پیاو قسەی پێ ناکرێ دەگەڵ قەزای عاسمانییە

ئەوە لە میللەتیان دەکردەوە خوداحافیزییە

بیست و حەوت شەو، شەو و ڕۆژ بەئەمری خودای تەم بوو. دەو بەینەشدا هیچ شتیان کەم نەبوو. بەڵام سەراسیمە بوون، ڕێیان لێ شێوا بوو. جا ڕۆژێکی لە سبەینێوە تا ئێوارێ تووشی ئاو نەبوون؛ ئاویش حەیاتە، پیاو بێ ئاو ناژی. پاش بانگی ئێوارێ ڕێگایان کەوتە سەر ئاوەدانێک. ئەگەر هاتن، عافرەتێک دەتگوت

قورینگە، دەگەڵ چەند کچان لەسەر کانی و ئاوێک بوو. ئاوەکە کەم بوو، ئەو عافرەتە بەسەررِا دەگەیشت. بەدەستندە ئاویان دەبرد. فەتاح بەگ ئاوی ویست.

کیژ ئاخێزی کرد، شەدەی بەستەوە
جامی جەوهەررِێز گرت بەدەستەوە
شۆخی شۆخ شیرن، ئەو کیژی لاو
ئەو بۆ میوانان دەبوو بەسەقاو
کوڵمەی بەوێنەی شووشەی گوڵاو
بەدەن بەوێنەی گوڵی نەژاکاو
کوڵمەی بەوێنەی خوساری بەهار
سینگی بەوێنەی تەڵای دەستەوشار
قورینگان لە هەنیەی دەکەن نارە نار
بە لەنجە دەهات، وتووێژ جار جار
قابیل بەوییە ئەو رِێ و شوێن و کار
جار جار دەخرۆشی وەک رِەعدی بەهار.

ئەوە ئاوی دانێ، هەتا گەیشتە سەر میرحوسێن. لە پشتەوە رِا ئاوەکەی دایە. ئەگەر ئاوەکەی دایە، کوتی: دەلیلی ئەمن لە هەمووان پەرِ بەسەرترم وا بە بێ کیفایەتی ئاوم دەداتێ؟ جا کوتی:

کیژێ زولفت لەسەر هەنیەت رِاست و چەپ رِاوەستاوە
دوو نارنجی سینگت دوو قامک لێک بڵاوە
چاوت دەڵێی ئەستێرەی رِۆژێیە و تازەکانە گۆشەی کێشاوە
بەژنت دەڵێی توولە نەمامە و بەئەمری خودای خوڵقاوە
ئەبرۆت دەڵێی کەمەندی زۆهرابە و لە دەستی رِۆستەم بەجێ ماوە
ئەمن زۆرم زگ بەخۆم دەسووتێ، زۆرم دڵ بەخۆم ماوە
بۆ زێدە لە هەمووان بەبێ کیفایەتی بەمنت دا ئاوە؟
قەستەم بەوەی کەم ئەگەر بیناهی چاوە
بەکفلەکونێک ئەو دنیایەی داناوە

ئەو کارە زۆری تێدا بەستەیە، ئەمن عاقڵم لەو کارە مەحتەل ماوە
ئەگەر نەمردم، سەفەرم خێر بوو، گەڕامەوە دواوە
پرسیارێک دەکەم، بزانم کێ ئەو ڕێ و شوێنەی بۆ تۆ داناوە؟
ئەوە کچەکەش پێی کوت، کوتی:
سوارەکەی سواربووی لە وڵاغێکی عەسڵە شێر خەزاڵییە
نێو چاوانت گنجە، پیاوی وەک تۆ مەرد و مەزبووت لە دنیایەدا نییە
شەرمم لێ کردی، بە کەمم دانەنای؛ چونکە تۆ هاتووی بەمیوانییە
ئەمن کوتم ئەگەر بێتو چاوی لێ بکەم، چاوی من شەهێن و بازە، مەبادا مژانگم لە دڵی بکاتەوە تیر هاوێژییە
لەوە زیاتر، هیچ مەبەستی خراپم دەگەڵ تۆ نییە
دەنا لە هەمووانم پێ مەردتر بووی، ئەتۆم هاتە پێش چاو بەپیاوەتییە.
کوتی: کیژێ، کیژی کێیە
سەری منت بێتەوە بەقوربانی سەرێیە
حاکم و حوکماتت ببێتەوە بەقوربانی زنجیرەی زولفێیە
ئاخر مانگی پاییزێیە و کوڵمەت دەڵێی زەردە بێیە
حاڵیم بکە ئەتۆ، ئەوە کیژی کێیە؟
کوتی: هەوری عاسمانێم گەواڵ گەواڵە
دڵت بریندار نەبێ و نەکەوێتە ناڵە
ئەو پرسیارە ئەتۆ دەیکەی بەو حاڵە
چاوت بڕیوە لە داو و دەلینگی حاجی حوسێنی و بەژنی شمشاڵە؟
کۆتر ڕێگای ئاوەدانی و بورجە، شاخ و کێو جێ هێلانەی داڵە.
ئیدی کچەکە گەڕاوە. ئەگەر گەڕاوە میرحوسێن لە بارەی ئەو کچە پرسیاری کرد، پێیان گوت: کچی قادر بەگە، نێوی سۆسەنە. عەسڵ مەمکین، دایکی خدر مامەسێنەیە.

هەرچەند قادر بەگ و خزمەکانی ناردیان فەتاح بەگ میوان بێ، کوتی: ناوەڵڵا لە دەستم نایە. ئەوە هاتنەوە بۆ جێ و ڕێی خۆیان.

چا شەوێ میرحوسێن چوو دەفکرەوە، کوتی: مەگەر خودا بەقیسمەتی نەکربم، دەنا شەرت بێ ئەمن ئەو عافرەتە بخوازم. هەتا بەدەستی خۆی دۆخینم نەکاتەوە، ئەمن تخوونی نەبم.

چا وەختەکەی ئازادی بوو، فەتاح بەگ کاری پێ نەبوو. میرحوسێن هەستا چووە کن فەتاح بەگ، کوتی: ئەگەر ئیجازەت لەسەر بێ، سەفەرێکی چل شەویم لەبەرە. فەتاح بەگ کوتی: «دەرکەوتی» کار نەزانم؟ کوتی: لە پاشان «دەرکەوتی» کار بۆ ئەمیر ئاشکرا دەبێ. بەبێ دڵی ئەمیر ئەمن هیچ کارێک ناکەم، میرحوسێن ئیجازەی وەرگرت. میرحوسێن وەنەبێ کابرایەکی بێ نێوبانگیش بێ، هەموو کەس دەیزانی خانەوادە و ساحێب نێوە. هەستا بەمیوانی هاتە ماڵە قادر بەگ.

قادر بەگ بەخێرهاتنێکی زۆری کرد و گەلێکی ڕێز لێ گرت. کوتی: بەوەی کە میوانی من بووی، سەربڵیندت کردم، بەهەر نیازێکی هاتووی ئەوەندەی لە توانای من دابێ بفەرموو هەتا بۆت جێبەجێ بکەم.

میرحوسێن لە جوابدا کوتی: وەڵڵا قسەکەم شتێکی وایە کردنی دەبێتە ئیراد. لە پاش زۆر قسە کوتی: هاتووم ئەگەر سۆسەنم بدەیەی، چاوم پێی کەوتووە کەڕەتێک. قادر بەگ کوتی: ئەگەر کچەکە مێردت پێ بکا ئەمن پێم خۆشە، حەز بەخزمایەتی تۆ دەکەم. قادر بەگ بەژنەکەی کوت، کوتی: میرحوسێنی باڵەکی داوای سۆسەنی دەکا سۆسەن بێتە مەجلیسێ، ئەگەر مێردی پێ دەکا، چارشێوەکەی بسووڕێنێ و پشت دەخەڵکی بکا، قسە نەکا، ڕابوەستێ. ئەگەر ڕووی لە عالەمێ بوو، دەزانم مێردی پێ ناکا.

قادر بەگ زۆر بەتایەفە بوو. گەلێک کەسیش بەهەویای سۆسەن بوون.

قادر بەگ کوتی: سۆسەن بێ، چاویان پێک بکەوێ، بەشەرع دروستە، چل کەسیشی میوان بوو، کچەکە شەوێ هات.

دەمرم لەبەر ئەو خەتە لەبەر ئەو خاڵە
تاوسان بەچەتر، بولبول بەناڵە
ئەما شمقارە و ساحێب گەواڵە
دنیای ڕۆناکم لە پێش چاو تاڵە

هێندە بەناز هات ئەو قەد شمشاڵە
لێوی بەوێنەی تافتەی ئاڵە
چاوی بەوێنەی فەغفوور و پیاڵە
گە دەردەدار بی و حاڵت بێ حاڵە
دەستبەجێ شفات دەبێ حەواڵە
بەنەرم و هێدی ئەو بە نیانی
دەرکی کردەوە، مەجلیسی خانی
وەکو گەوهەری لەسەر دوکانی
وەکو قوبەی زێڕ ئی شان سوڵتانی
چاوی وەک جەللاب لە حوکمڕانی
سینگی ساقییە و شەربەت و کانی
ئەگەر بیبینی تۆ بەنیانی
بۆت پەیدا دەبێ ژین و ژیانی
عەتر و عەبیرە، شووشەی گوڵاوە
سومبول و گیاخاو پەلکیان بڵاوە
هەڵاڵەی کاڵە و تازەی گوڵ داوە
دەرکی پەنجەرەی دیوان کراوە.

هاتە ژوورێ، لێیان پرسی، کوتیان: ئەگەر مێردی پێ دەکەی، پێمان بڵێ، ئەگەر مێردی پێ ناکەی خاتر جەممان کە.

ئەبرۆی دڵی پیاوی دەگەزێ
وەک تووڵە نەمام دایم دەلەرزێ
کەسێک بیبینێ بەژنی دەتەزێ.

جا عافرەتەکە چاوی بەمیرحوسێن کەوت، دەستبەجێ سووڕا و چارشێوەکەی لە خۆی هاڵاند. لە چەپڵەیان دا و کوتیان: پیرۆز بێ؛ لێیان مارە کرد. میرحوسێن کوتی: برالە ئەمن بە شک هاتبووم، ئەمنیش بەپیاوەتی دەنیگوێزمەوە. فەتاح بەگ ئەو

هەواڵەی بیستەوە، هەشتا کەژاوەی سەر ئەتڵەسی بۆ نارد. جا دوو سەد عافرەت لە چاردە تا بیست و یەک ساڵە بۆ بووک هێنانی میرحوسێن ساز بوون. گوێزتیانەوە بەسەد ڕێز و قەدر و حورمەت. ئەوە بووک هات. ئەما ماڵە بابی زۆریش لەوی دوور بوون.

سێ ساڵە وەختی لە کن بوو، ئەبەدا دەو سێ ساڵەدا بەدەستی نەگرت. ڕۆژێکی ژنومن دەگەڵی کەوتنە قسان لێیان پرسی: عەجایەب سۆسەنی جوان چاک ئەتۆ زگت پڕ نەبووە؟ دەبێ لە کێهەتان بێ ئەو وەجاغ کوێرییە؟ پێی عەیب بوو بڵێ: تخوونم نەکەوتووە و هەر مۆرم.

سۆسەن پێی وابوو میرحوسێن پیاو نییە، کوتی: لە کنی بڕۆم و تەڵاقی لێ وەرگرم، بەو جۆرە بۆم ناشتە سەر و ناتوانم ڕایبوێرم؛ ئاخر دنیا بەنەوس و هەواوە خۆشە.

جا قاقەزێکی بۆ ماڵە بابی نووسی: ئەمن خەیاڵی هاتنەوەم هەیە. بۆ میرحوسێن بنووسن ئیجازەم بدا ئەگەر بگەڕێمەوە، گەلێک ئارەزووی ئێوە دەکەم.

خزم و کەسوکاریشی هەموو داغیان بەجەرگەوە بوو بۆ سۆسەن. لە ماڵە بابی ڕا قاقەز هات. میرحوسێن کاغەزەکەی خوێندەوە، کوتی: دەگەڵ خۆم دەتبەمەوە. سۆسەن خۆشحاڵ بوو، لە دڵی خۆیدا کوتی: تازە نایەمەوە. میرحوسێن سۆسەنی ساز کرد. تەواوی بەدەنی جەواهێرات بوو. بۆ خۆشی دەگەڵی هات، بەتەواوی تەدارەک و چەک و ئەسلەحەوە.

تەیموری سەر تەریدە باشی بوو؛ ڕێگر بوو؛ ڕێگای دەگرت. تەریدە و دز دەشاری دابوون؛ ئەگەر زانییان میرحوسێن وەڕێ کەوت، خەبەریان بۆ برد. کوتیان: وەڕێ کەوت، ڕووتی دەکەین، بەسمانە. ئەوەی لەوی وەگیرمان دەکەوێ، بەشی دە ساڵانمان دەکا، هەر دەگەڵ کەسێکی پێ دەکرێ.

چوون خۆیان قایم کرد، میرحوسێن بەسەریاندا کەوت؛ ڕێیان پێ گرت. میرحوسێن کوتی: ئەو ڕێیە بەردەن، خواردنی ئەنگۆ نیم؛ ئەمن میرحوسێنم پێ دەڵێن. دزەکان دەگەڵی بەشەڕ هاتن. ژنەکەش ئەلحەق دەستی کردەوە دەگەڵی. زەمانی ڕمب و کەمەند و مەتاڵ بوو. خودا میرحوسێنی وا دروست کردبوو، زۆر ئازا

بوو، نەیدەزانی ترس چییە. خودا یاریدەی دا، هەر پازدەی گرتن، چەک و ئەسلەحەی لێ هەستاندن، ئێکی گوێیەکی بڕین، کوتی: جارێکی دیکە نەچنە سەر ڕێگای کەسێکی دی. نەیکوشتن، کوتی: بڕۆن، ئەوە تەمبێ و بێ، جارێکی دیکە لە خۆتان زیاتر ڕێ بەکەس نەگرن.

میرحوسێن ئەو پەنجەی ژنەکەی گرت، کوتی: لە ماڵە بابت باسی نەکەی. پیاو نابێ سوڕی خەڵکی ئاشکرا بکا. نابێ لێت ببیەن. زۆری دەوەیدا پەند پێ دا. هاتن گەیشتنە جێ. میرحوسێن دە پازدە بیست شەو لەوێ ماوە. لێیان پرسی لە سۆسەنی: ئەدی بۆ زگت پڕ نەبووە؟ کوتی: هەر مۆرم.

دایکی سۆسەنی بەقادر بەگی کوت: حەیفە ئەو توولە نەمامە دەگەڵ ئەوە پێوە بووە. کوتیان: ئەگەر میرحوسێن پیاو نەبێ، عافرەتەکە مارەیی بەتاڵە. میرحوسێن ڕۆییەوە؛ بەجێی هێشت. دایان نا بەوەعدەی دوو مانگان بێ بیباتەوە.

ئەگەر میرحوسێن گەڕاوە، بابەکەی ناردی لە دووی؛ لێی پرسی، کوتی: ئەو کابرایە پیاو نییە؟ کوتی: خێر قادر بەگ. کوتی: ئەمن دەتدەم بەموعجین بەگ ئەگەر ئامۆزای خۆتە. مارە و تەلاقی کەست بەسەرەوە نییە؛ ژن لە ژنێ مارەی نایە.

موعجین ئەو خەبەرەی زانی، ناردییە کن مامی. قادر بەگ لە جوابدا کوتی: ئەگەر سۆسەن مێردی پێ بکا، دەیدەمێ. سۆسەنیش هەرچەند میرحوسێنی خۆش دەویست، چونکە پیاوێکی یەگجار زۆر بەدەمار بوو، کوتی: مێردی پێ دەکەم. کوتیان: حەدیە و مەدیەی ناوێ، هەر مارەی نەهاتووە. لێیان مارە کرد. بەپەلە پەل، هەتا میرحوسێن نەیزانیوە، بۆیان گوێزتەوە.

وەختێکی ئەگەر بۆیان گوێزتەوە، شەوێ لە پشت پەردە، بەربووک و خەڵک چاوەڕوان بوون. موعجین هات بچێتە کن بووکێ، مشکێک هاتە دەر لە خانووەکە. لینگە کەوشێکی بەمشکەکە دادا و کوشتی. جا کوتی: ئامۆزای خۆشەویست! ئەمن غەنیمی خۆم ئاوا دەکوژم، دەڵێن: میرحوسێن وا و میرحوسێن وا، بەخوڵای میرحوسێن ئاوا دەکوژم ئەگەر چ قسە بکا.

سۆسەن بەو قسەیە تووڕە بوو، کوتی: ئەتۆ وەک چڵکی سەی لە من حەرامی. کوڕە بەدبەختی ناپیاو میرحوسێن پازدە کەسی گرت هەمووی جەوهەری لە ڕمبی دەتکا،

کوتی: لە ماڵە بابت دەنگێ نەکەی! شەرت بێ پیاویش نەبێ ئەمن خۆم لە مستی ئەوە نەنێم. هەستا وەدەر کەوت.

هەرچەند دایک و باب حەولیان دەگەڵ دا بەجێیەک نەگەیشت، کوتی: دنیا و عالەم سەرلێک دا بەمێردی خۆمی دانانێم؛ چون بەکوشتنی مشکێک هەڕ و گیفی لەسەر کردم. موعجین ئەگەر وایزانی، تەلاقی دا؛ ئەگەرچی مارەشی نەهاتبوو. قسەکەیان شاردەوە.

دوو مانگ پێ چوو میرحوسێن هاتەوە. قادر بەگ بەدزی تەگبیری بەخەڵکی کرد، کوتی: ئەو کچەی من بێ مێردە، ئەو کابرایەش ئەوە هاتۆتەوە؛ دیارە بە ژنی خۆی دەزانێ و دەستی لێ هەڵناگرێ، چۆن کارێکی وا بکەین ئەو کابرایە ببەتڵێ و ئەو ژنە ئازاد بێ؟

کوتیان: ئێمە بینێرینە مێشەی مۆلەکە؛ شێرێک هەیە ئەگەر وەدەرکەوت بە سەت کەس عیلاجی ناکەن. وەدەست شێری ڕەش بکەوێ، دەیکوژێ؛ کچەکە نەجاتی دەبێ. لە مەجلیسێدا قادر بەگ کوتی: ئێمە ڕێگایەکمان لێ بەستراوە، چاردە ساڵە هاتوچۆی پێدا نییە. میرحوسێن کوتی: لەبەر چی؟ کوتیان: شێرێکی لێ یاغی بووە، کەس ناوێرێ هاتوچۆی ئێرە بکا بەو ڕێگایەدا.

میرحوسێن کوتی: شێر جانەوەرە، بنیادەم دڕندەترە. چۆن شێرێک ئەو یاغیگەریەتیی دەکا؟ کوتیان: وایە وا چەند کەسی بەتلاندووە. جا کوتی: ئەمن سبەینێ بۆ ئەو مێشەیە دەچم. شەرت بێ هیچ کەس دەگەڵ خۆم نەبەم. ئەگەر شێرەکە ئەمنی بەتلاند، دیارە ئاو و گڵی ئێرەم بە نسیب بووە، ئەگەر شێرەکەم بەتلاند دیارە ئەنگۆ شل بزووتوونەوە.

ماڵە بابی کچەکە پێ خۆشحاڵ بوون. دایکی کچەکە زۆری پێ خۆش بوو. کچەکە دەدڵی خۆیدا کوتی: حەیف بوو! فێڵیان لێ کرد؛ وەڵڵاهی شێرەکە دەیبەتڵێنێ.

میرحوسێن هەستا چووە مێشەکە، تازە گەیشتبووە قەراغ مێشەکە، شێری ڕەش لێی وەدەرکەوت. چونکی شێرەکە زۆر یاغی و بەهێز و نەترس بوو، ئەگەر میرحوسێنی دی هەڵی کوتا سەری. مێشەکەش زۆر چۆڵ بوو. میرحوسێن دەگەڵ شێرەکە هاتە شەڕ، بەڕمب و بەشمشیر شێرەکەی کوشت.

جا کوتی: ئەگەر ئەمن کەوڵی ئەو شێرە نەبەمەوە، باوەڕم پێ ناکەن. شێرێکی زەلامی ڕەش بوو، تیسکی بستێک درێژ بوو. شێرەکەی کەوڵ کرد. کوتی: پێستی ئەو شێرە دەکەمە خەفتان. میرحوسێن زۆر هیلاک و ماندوو بوو، مەتاڵی کرد بەسەرین و لەسەر کەوڵی شێری ڕەش خەوی لێ کەوت.

سۆسەن، ئەگەر میرحوسێن نەهاتەوە، ڕۆحی وەک تەیری تیژ باڵ لەسەری دەگەڕا، کوتی: دەچم با شێری ڕەش تێکم بشکێنێ. جا خۆی دزییەوە، ئەوە هات بۆ جەنگەڵ. جەنگەڵ بۆنی خوێنی لێ دەهات، جێگایەکی زۆر چۆڵ و هۆڵ و بەسام بوو. سۆسەن بەڕوانین هاتە پێشێ، گەیشتە ئەو جێگایە کە میرحوسێن شێرەکەی لێ کوشتبوو. دیتی میرحوسێن شێرەکەی کەوڵ کردووە و لەسەر کەوڵی شێرەکەی کەوتووە. پێی وابوو شێرەکەش میرحوسێنی بریندار کردووە و میرحوسێن بەبرینەکە چووە و زیندوو نەماوە.

جا کوتی: ئەوە حەیف پیاو نەبووە، دەنا ئەمن ڕۆحی خۆمم هەمیشە دەسەری دەگێڕا. لێی چووە پێشێ، کوتی: دۆخینەکەی بکەمەوە، بزانم پیاوە یان پیاو نییە؟ دۆخینەکەی کردەوە. میرحوسێن لە خەو هەستا، سەری هەڵێنا و کوتی: سۆسەن ئەوە هاتی؟ قسەی من کەلێنی پۆلایە، بەئاسن جۆش ناخواتەوە. شەرتم کرد هەتا بۆ خۆی دۆخینم نەکاتەوە، تخوونی نەکەوم؛ ئەوە دۆخینەکەت کردەوە.

لەسەر پشتی شێری، کاری جێبەجێ کرد. دەستبەجێ نوتفەی لاس لەسەر پشتی ئەو شێرە گوورا. جا میرحوسێن کوتی: حەز ناکەم ئەوشۆ بچینەوە.

ماڵە بابی کوتیان: سۆسەن وەدوای میرحوسێن کەوتووە، بەتڵاوە. سبەینێ هاتنەوە بەکەوڵی شێرییەوە. بەپیریانەوە چوون. سۆسەن هات بەدایکی کوت، کوتی: مادەری شاهانە ئەو کارە خێری منی تێدا بوو. وەڵڵا پیاوە و پیاوی وەک خۆشی نییە. ئەگەر چووم شێرەکەی کوشتبوو؛ لە کچی دەرچووم. ئەلعانیش مێردی خۆم بەتەواوی دنیا ناگۆڕمەوە.

جا ئەوە میرحوسێن کەژاوەی زیو و زێڕی بۆ ساز کرد و هێنایەوە بۆ ماڵە خۆی. جا لاس لەسەر پشتی ئەو شێرە گوورا، بۆیە سوورچی و زوراری و ڕەمکی و سمایل عوزەیری و هەمەوەند و بەرمەکی هیچیان پێ دەگەڵ نەکرا. ئەگەر لاس بوو، کوڕ بوو،

میر فەتاح دە حاڵی حەیاتدا بوو، کوتی: ئەو نەسل و خانەوادەیە نابێ بکوژێتەوە. کوتی: نابێ هەتا سێ گۆچی[1] بدەنێ، دەمەوێ شیری پڵنگم بۆ پەیدا کەن. شیری پڵنگیان بۆ پەیدا کرد، دەگەڵ شیری گامێش تێکەڵیان کرد. میر فەتاح کوتی: دەبێ بەوە گۆچ بگرێ. پاشان دایکی مەمکی بداتێ. شەش حەوت ساڵ پێ چوو، میر فەتاح مرد. وەرەسە و پاشەکەوتی میر فەتاح ئەگەر گەیشتنێ، میرحوسێن کوتی: پاش میر فەتاح، ئەمن دەگەڵ ئەوانە بەرێ چوونم نابێ. هاتەوە خاکی باڵەکان، لە کنیان ڕۆیی. لاس تەمەنی نۆ ساڵان بوو، میرحوسێنیش مرد. لاس وا هەڵکەوت یەکە پیاوی دنیایە بوو. دایکی مابوو، سۆسەن بانوو خانم. عێلی حەریر دوازدە هەزار ماڵ بوون. برای میرحوسێن بەسەر ئەو عێلە ڕادەگەیشت، کچێکی بوو بەنێوی خانزادە خانی حەریری[2]. یەکجار چازان و عاقڵ و تێگەیشتوو بوو.

زۆریش جوانچاک بوو. پاش بابی، ئەو کچە بەسەر عێل ڕادەگەیشت. لاس کەمێک لەو دوور بوو. عافرەت کاروباری دوازدە هەزار ماڵ حەریری پێ هەڵ ناسووڕێ. خانزادە خان بۆ دیتنی لاس هات. ئەگەر هات، عێلی حەریری چەند دەگەڵ بوو. عێلی حەریری عێلێکی ڕەنگین بوو؛ سێ ڕۆژ ماوە.

لە پاشان گەورەی عەسر لاسیان حاڵی کرد، کوتیان: ئامۆزای خۆتە، ئەگەر بێتو دەست بدا مارەی ناکەی؟ لاس کوتی: ئەگەر هاتوو مێردم پێ بکا دەیخوازم، دەمەوێ. بەخانزادە خانی حەرییریان گوت: ئەتۆ عافرەتی، عافرەت ئەگەر شێر بەگوێیان بگرێ، هەیبەتی پیاوی نییە؛ مێرد بە لاس بکە.

عافرەتەکە کوتی: مێردی پێ دەکەم. ئەوە دەستبەجێ پێداویستەکانیان بەجێ هێنا. خانزادە خانی حەرییریان لە لاس مارە کرد.

جا لاس کوتی: جارێ عاقڵ و هۆشی وام نییە، تازە حەد و سەدی شەیتان پێکەنینمە! پاش سێ ساڵی دیکە دەیگوێزمەوە. بچێتەوە سەر عێلی حەریرێ، پاش سێ ساڵ خەریکی تەدارەک دەبم، دەیگوێزمەوە. نێوی مالیک بوو، ئەوە لەقەبێتی لاس.

---

(١) لە «هب»دا بەوێنەی «گوج» هاتووە.

(٢) لە مێژوودا ناوبانگی هەیە.

لاس خانزاده خانی بەڕێ کردەوە. خانزادە خان پێی خۆش نەبوو هەر لاقی بڕوا، یەگجار زۆر لاسی خۆش دەویست. ئەوە خانزادە خان کاروباری خلاس بوو، لاس ناردیەوە سەر عێلی حەریرێ. کابرایەک بوو لاس، ئیشتییای لە ڕاو و لە شاخان بوو.

عێلێک بوو لە سەرحەدی ئێرانێ. مەلا داود و مەلا نەبی کە گەورەی ئەو عێلە بوون، بۆ هێمنی و عاقڵی وێنەیان نەبوو. دەبوو پادشا تەگبیریان پێ بکا. ئەوانە گەورەی عێلێکی بیست و چوار هەزار ماڵی بوون، ئی سمایل عوزەیرییان. ئەوانە چافن، بەعومری خولای تەعالا هیچ نێرینە و کوڕیان نەبوو هەرکیان.

مەلا نەبی کچێکی بوو خەزاڵە شۆڕیان پێ دەگوت. چاوی ماسی دەریایەی بەتیر دەردێنا. شێر لە لانێ هاتە دەر چ نێر و چ مێ. جوانچاکی و لایەقیشی وا بوو هەرکەس چاوی پێی بکەوتایە دێوانە دەبوو، وە کێوان دەکەوت. ئەو عێلە بەسەر عێلی لێتان و کاسەوەندی و بەختیاری و سوورچی و زوراری و گێلانگێسییەوە بوو.

ئەحمەد خانێک لە سوورچی و زوراریيان هەڵکەوتبوو، برایم خانێک لە لێتانی هەڵکەوتبوو، ئەوانە زۆر بەکار و ئازا بوون.

لە دیوەخانێدا بەمەلا نەبییان کوت: ئەتۆ زۆر دەوڵەمەندی، کەس نییە ماڵ و دەوڵەتی تۆ بپارێزێ. ئەحمەد خان بەمەلا نەبی کوت، کوتی: ئەگەر بێتو خەزاڵ بدەی بەمن، ئەمن دەستت بەسەر دەکێشم.

مەلا نەبی کوتی: عافرەت ئیختیاری لە دەست خۆی دایە، ئەگەر بێتو مێردت پێ بکا دەتدەمێ. بەخەزاڵیان گوت. خەزاڵ کوتی: ویستی مێردکردنم نییە، نیشانەم بکا ئەمما ئەوڕۆ خۆی لێ مارە ناکەم، ڕابوەستێ.

ئەحمەد خان گەردن لغێکی دایە، شۆڕابەی هەموو دەهاتە سەر پشتی. سەرپاک جەواهێرات بوو. کەمبەرێکی سێ قوبەی یاقووتی عەبدولحەسەنی دایە، سەری نەقیبی کەمبەرەی، ئەڵماسی سپی بوو. خەراجاتی مەملەکەتێک بوو. ئەوە نیشانەی کرد[1].

لاسیش ئەوە بۆ ڕاوێ چل کەسی دەگەڵ خۆی هێنا و هات. هێند غروور و مەست و

---

(١) جا ئەوە کێشە و هەرا لێرەوە ماکەی گرت و هەوێنی تێ کرا. خەزاڵ نەدەبوو ئەحمەد خانی بەهەویا کردبا. بگرە لە ترسان پێی باش نەبوو بە یەگجاری جوابی بکا.

ئازا و ڕەشید بوو تای نەبوو. ئەوە لە جێگەی خۆی ڕاهات بۆ نیزیکی عێلی مەلا نەبی بۆ ڕاوێ.

لەم کاتەدا بەعومری خودای دەبوو خەزاڵ دەگەڵ بێرییان بێ؛ بێری، خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییان پێشەنگ بوو. ڕۆژ کلا ببوو، کەوتبووە پاش نوێژێ. لاس جەیرانێکی هێنا خوارێ لە گەوەڕی[1] شاخی.

تیرێکی هاویشت وە پاشووی کەوت، بەسێ لاق هەڵات، بەسەر بێرییاندا هات. خەزاڵ کوتی: بیگرن. شوان کەمەندیان هاویشتێ و گرتیان. لاسیش گەیشتێ لەوێ سەری ولاغی ڕاگرت.

خەزاڵ ئەگەر چاوی پێ کەوت، کوتی: ئەو نێچیرە ئی ئەو سوارەیە، دەزانێ ژنین بۆیە نەهاتە نێومان. جا خەزاڵ بەو بەندە دواندی و کوتی:

سوارەکەی شەو و ڕۆژ دەکوتی ولاغت لە چۆلی و لە بەڕییە نازانم نە مەستی و نە ئیغیاری، هیچ ئاگات لە خۆت نییە

ئەتۆ دەگەڵ جەیرانی پێ بەخاڵت کردووە تیرەندازییە

نێچیری مێردان ئی خۆیەتی و ئی هیچ کەسی دیکە نییە

بۆ بەولاغت وچان گرت و تەمەشای خرخاڵ و بازنان دەکەی، نەهاتیە نێو عێلی مەڕییە؟

سوار بووی لە ولاغێکی ڕەش کوێتی نێو چاوان سپییە

لە تۆ وایە ئەو دنیایە چۆلە، لە تۆ زیاتر کەسی دیکەی تێدا نییە

چونکە هێندە پیاوی ڕاوەستاوی لەسەر عیسمەت و ڕێ و شوێنی پیاوییە

چەلەنگی گوارە زێڕ، بە من دەڵێن: خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە

سوارە نابەڵەدی، پێم وایە بەڵەدیت بەو مەملەکەتە نییە

حەزێ دەکەم لە من ببیەوە بەمیوانە، هەتا بزانم عەسڵ و نەسەبی تۆ چییە؟ باب و باپیری تۆ کێیە؟

---

(١) گەوەڕ: خوارەکە و پێچەکەی شاخی. قەد لاپاڵی کێوی. وێدەچێ «گەوەڕ» لە «گەو» وەرگیرا بێ. گەو یانی پێچ و هەڵقە. گەوەڕ لە «ئەفسانەی چیای ئاگری» یەشار کەمالدا هاتووە، ل ١٧٥.

چونکە ئەتۆم چاو پێ کەوتووە بەجوانی و بەپیاوەتییە
لە نێچیرت نەپرسی، ئەگەرچی نێچیرێک ئەوتۆی بۆ نییە
فەرموو بەولاغت بگرەوە وچانە
بۆ خۆت لە من ببەوە بە میوانە.
ئەوە لاس بانگی کرد، کوتی:
ئەرێ کیژەکەی چاو بەنگییە
سەری منت ببێتەوە بەقوربانی سەرییە
مژانگی برۆت بوو بە تیر، داومی لە جەرگییە
دێشێ، ژان دەکا، ژانی هێدی نییە
ئەگەر تۆ برۆی، ئەمن لە کێ میوان بم؟ هەوالم دەیە بەئەسەحییە
خەزاڵ پێی گوت: بەمن دەڵێن خەزاڵ و خەزاڵەشۆری مەلا نەبییە
نامزەدی ئەحمەد خانی سوورچی و زوورارییە
شێست کلّفەتم هەیە، پاکی کەمبەرەی پیرۆزەی لە پشتییە
ئەگەر هاتی ون نابی، مەلا نەبی خاوەن ناوە، قەت نەترساوە لە نانییە
ئەو نێوە نێوە لەوی نێو بەدەرەوەتری تێدا نییە.
خەزاڵ دووبارە بانگی کرد، کوتی:
سوارە چاکمان تێ دەفکری و ڕادەمێنی
ئەو تیرەی لە جەرگت دراوە دەبێ دەری بێنی
لێم دووری، چاوم پێت نەکەوتووە، دەبێ خۆت بنوێنی
ئیدی من ڕۆییم، ئەتۆ سەرت لێ نەشێوێ و بەجێ بمێنی.
لاس کوتی: کیژێ لە خۆت داوە شیرمەشکێکی خاسە ڕەنگی بەیدی بەیدییە.
نازانم نە چەرمی گەوەزنە و نە چەرمی گا کێوییە،
نە دەباغکارە و نە کوودەرییە؟
حەیف نییە تۆ خۆت ماندوو دەکەی، دەژاکێ بەدەنی سپییە!
دوو سەد کەست دەگەڵن، هەمووی زنجیرەی زولفیان هاتۆتە سەر سینگییە

ئەمن باوەڕ ناکەم میوانی تۆ بم، متمانەم پێت نییە
ئێرە چۆلییە، ئاوەدانی نییە
ئیجازە بدە بتبینم، بکەین وتووێژێکی بەڕاستییە.
ئەوجار خەزاڵ دەڵێ:
لاوژە ولاغت تەکان بدە و وردە وردە وەرە خوارە
جار جار بەڕۆیین برۆ و جار جار بیکە بەنەرمە غارە
لە بن سێبەری گوێیاندا، هەتا بۆت وەدەر بخەم کرمەک و گوارە
هەتا زولفی سێ بەنگیت بۆ بکەمەوە جووت جووت و تاق تاق و تار تارە
هێندێک بڵێن: قافڵەیە، کاروانە، هێندێک بڵێن: نەخێر! ئەوە سوارە، قەتارە.
هەتا بازنە و خرخاڵان باوێژمەوە ئەستوورایی دەستییە
هەتا تۆ مەست بی، بڵێن: هیچ شەرابی پێویست نییە
تا ئەوڕۆ دنیا کیژی وەک خەزاڵی تێدا نەبووە، خەڵک دەڵێن: حۆری بەهەشتە و
ناوەڵڵا مەلەکی عاسمانییە -
ئەتۆ خاوەن فریشتەی، پێم وایە فریشتەت دەگەڵە بەسوارییە
دەنا خەزاڵ ئیشتییای لە دواندنی هیچ سەردار عێلێک نییە
ئەوە تۆم هاتۆتە پێش چاوی بە پیاوی و بە پیاوەتییە
جا من دڵم تۆی خۆش دەوێ، نازانم خودا نەزەری لەسەر چییە؟
ئەوە لاس دەیگوت: ئەمن بۆ ڕاوێ هاتووم، دارای چل سوارم
خاوەن عێلم، لە مەملەکەتی خۆمدا نێو دیارم
هەڵبەتە خوداوەندی میری مەزن پێکی دێنێ کاروبارم
ئەمنیش سەردار عێلم، خاترجەم بە ساحێب ئیختیارم
بەو میوانی شل و مل و سایە گەردن ئەمن منەتبارم.
ئەتۆ بڕۆوە، ئەمن لەسەری کێلەک ، بناوان کەمێک دەکەمەوە ڕاوێ
ئەما لەبەر گەردنی زەردت مرم، ئەگەر سبەینان لێی دەدرێتەوە وردە خوناوێ
سنگت بەمن بمێنێ بە بەفری جەبەل و ئەسحاب، ئەگەر وێی دەکەوێ تیشکی تاوێ

ئەگەر چوویەوە ماڵێ لە بیرم نەکەی، لە دڵی خۆتم دەرماوێ
هێندە بەناز قسەم دەگەڵ مەکە، هێندە تیرم بۆ ماوێ
قسەی تۆ بۆ من دەبێ بەتیر و کارم دەکا لە جەرگ و هەناوێ
هێندە تام خۆشی، لە زارت دێتە دەرێ بۆنی عەتر و عەبیر و شووشەی گوڵاوێ
ئەوە تۆ میوانیت کردووم، ئەمن لەوە چاتر لە دنیادا چیدیکەم ناوێ
لەبەر بەندووکانت مرم ئەگەر لە پشتەوە تێک هاڵاون دەگەڵ زنجیرەی زولفان وەکو ڕەشە ڕێحانە و قۆپەنی پیرە لاولاوێ.
ئەوە قەول و قەراریان دانا. خەزاڵ چۆوە. ئەویش ملی لە ڕاوێ نا.
خەزاڵ بیست و دوو کورسی، ڕاست و چەپ، داری عوود دانا
کلّفەتی بانگ کردن: لە خۆتان دەن تۆق و تەلەسم و زێڕ و سنجەق و گوارە و کرمەک،
ببێتە شۆرابەیان جەواهێرات و وردەزەنگیانە
بیست و دوو ئەنگوستەکی زیادی وەبەر چادر بدەن بەدەستووری شاهانە
بنی ئادەمی هەر سەعاتە لەسەر ڕەنگێکە، ئەو سەعاتە دڵم زۆر پەرێشانە
ئەو سوارەی بانگێشتنم کردووە و ئەگەر لە من بۆتەوە بە میوانە
ئەمن نەمدیوە، بیستوومە، بەڕێ و شوێنی دەڵێی وێسپی کەنهانە
خۆی هاویشتۆتە سەر ڕاستەی ڕکێفی، دەست و جڵەو هەر لەوی جوانە
یەکجار پیاوێکی وێ چووە، هەر دەڵێی قارەمانە
داخولا چ سەردار عێلێکە، نێوی خۆی پێ نەکووتوم، پێی نەکووتوم نێو و نیشانە
ئەگەر بێتو میوان بێ، هەر کڵفەتەی دەیدەمێ چل شەکی یەک ددانە
قەتم نەدیوە، بەلام پیاوێکی فەسیح و بەلیغ و چازانە
باڵدار ئەگەر برسی بێ، هەر دەفڕێ زوو بگاتەوە لەوەڕ و دانە
حیسانیش ئەگەر وەختی شەفافی عومری بوو، بڵێن ئەو جحێڵ و جوانە
هەر چاوەڕێی ئەوەیە بزانێ دڵی لە کێ دەگرێتەوە وچانە
ئەو سوارە تیخێکی بێ ڕوحمی وا لەسەر جەرگی من دانا

ئەمن بۆ پشووێکیش لە دڵم دەرناچێ، دڵم لە هێش و ژانە
دیتنی وی بۆ من بووە بەهات و هاواری دڵ، بەپیرییەوە بچن ئەگەر هات و لە من بۆوە بەمیوانە
سوبحانەڵڵا! خودا وای خوڵقاندووە، دەڵێی شێری گەرمەلانە.
ئەوە خەزاڵ دەستوو و ڕێ و شوێنی دانا، ئاخر دەسەڵاتی کوڕی بوو. تەواو دەسەڵاتی عێل و عاشیرەت بەوی بوو.
کێ بوو لە لاس و لە شەنگە لاسی باڵەکییە
دەیگوت: ڕاو بەتاڵ بێ، چیدیکەم کار بە ڕاوێ نییە
ئێمە بانگ کراوین، بۆمە کراوە میوان و میوانییە
ئێمە میوان دەبین لە عێلی مەلا داود و مەلا نەبییە
دەردم زۆر گرانە، کیژێ بەلەک زەرد تیرێکی داوم لە جەرگییە.
مەڵێن شێتە و عاسمانییە، نەخێر! کاری پەرییە.
لاس دەیگوت: لەو سەعاتەوە ڕاو بەتاڵە
ئەمن عاشقم بەدوو چاوی ڕەش و لێوێکی ئاڵە
خاڵی، وەکو هەوری عاسمانی، گەواڵ گەواڵە
دەبێ مابێ لەسەر قەول و قەرار و لەسەر ئەو حاڵە؟
کوڕینە تەگبیرێکم بۆ بکەن، ئەمن هیچ ئاگام لە خۆم نییە
تیرێکی لێ داوم، هەر دەڵێی تیری غەیبییە
بڵندە، تام خۆشە، لە گوێن کەس نییە و کەسی لە گوێن نییە
بریا سەفەرمان خێر بوویایە، ئەو کیژەم بەچاوان هەر نەدیبایە، لەگەڵم نەگرتایە ئاشنایەتییە
ئەگەر هات و ئاشنایەتیت دەگەڵ کرد، پیاو جەرگی دەسووتێ. قسەی دیکە لازم نییە
ئەما ئەو تەیری تیژ باڵە، مەعلووم گرتنی بۆ نییە
کارێکی گەورە و گرانە، دەیگوت: دەزگیرانی ئەحمەد خانی سوورچی و زوورارییە

ئەحمەد خان دایمە نۆ سەد کەسی دەگەڵ سوار دەبێ، هەمووی لە خوێنی نەکردو خوێنی دەتکێ لەسەری ڕمبییە
ئەشەدوبیللا هەر باسیان کردووە بەپیاوی و بەپیاوەتییە
ئەحمەد خان ناشکێ، پیاوێکی وا نییە، شکانی بۆ نییە
نێوی کوردان مردبوو، ئەحمەد خان خستێوە سەر زیندەگانییە
جا ئەوە دەزگیرانی وییە، ئەمن چارەم چییە؟
ئەما تیرێکی وەهای داوم لە جەرگییە
خۆ من پێم نییە بچمەوە نێو عێل و عێلی دە باڵەکییە
ئەگەر پێو خۆشە ئاغاتان ڕوو سوور بێ و دەربچێ بە ڕووی سپییە
ئێمە ناشارەزاین، لەو وڵاتە شارەزاییمان نییە
هەموو دابەزن، توند بکەن تەنگەی ئەسپییە
سەقاو جووت بێ، خرڕەو بێ لە ئاوزەنگییە
هەموو مەرد بن، با تەماشامان نەکەن بە نامەردییە
ڕاستی دانێن پەنجەی پڵنگ ئاساییە
لەسەر دەسکی خەنجەری دم ڕەشی دەسک نێرۆییە
لە شانی ڕاستانی باوێن ڕمبی دم ڕەشی هەژدە قەفییە
جلەو ڕێز بن، با بماننناسن، بڵێن: ئەوە پیاوێکی مەردە، نامەرد نییە
هەمووتان ترووسکەو بێ لە چەکمەی وەستا نەسیری سمایل بەگییە
ڕاستی دابنێن، بەڵکو لێی بن عێلی سوورچی و زوورارییە
ئەوڕۆکە من لەو عێلەدا ناسیاویم بەکەس نییە
با بڵێن: چۆل نییە مەملەکەت و وڵاتی باڵەکییە.
ئەوجار ئەوە خەزاڵ بانگی کڵفەتان دەکا، دەڵێ:
لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە ژان و چەندی لە هاتوچوونە
کوێستان بۆنیان خۆش بووە، هەڵاڵە، شلێرە، گیا خاوە، بەیبوونە
لە پشتی خۆتان ببەستن کەمبەرەی لەعلی ڕوممان و یاقووتی عەبدولحەسەن و ئاڵتوونە

ئەوە تۆزی سواران دیارە، حەوت شەکی یەک ددانی بۆ بکەن بەگاو گەردوونە.

ئەوە لاس هات. حەوت شەکیان لە پێش سەر بڕی. لاس دابەزی. ئەگەر لاس دابەزی، بە پەلە ئەو چل سوارەی لەگەڵی بوو دابەزین، ولاغەکەیان لێ وەرگرت. ئەوە خەزاڵ بەپیرییەوە چوو. خەزاڵ لە دوای چەند کەسی نارد، کوتی: بێن میوانم هاتووە. ئەگەر هات و دانیشت، خەزاڵ شەرتی عافرەت ئەوەیە، ئەو لەسەر کورسیێکی جەواهێربەند دانیشت، لە مەجلیسێ نەدەچووە دەرێ. ئەوە مەلا نەبیش، بابی خەزاڵ، هات بۆ مەجلیسێ.

ئەوە هاتە ژوورێ مەلا و مەلا نەبییە

کەیخودایەکی کۆنە ساڵ و ڕدێن سپییە

دەیگوت: من فەخر دەکەم ئەگەر تۆ لە من بووی بە میوانییە

ناتناسم، ئەتو عەسڵ و نەسەبت کێیە؟

لاس دەیگوت: میوان لازمیەتی قەدر و پەزێراییيە

بەمن دەڵێن: لاسی باڵەکییە

هیچ کار ناکرێ دەگەڵ قیسمەتی هەق دەستی ئیلاهییە

ڕێم لێ ون ببوو لە جێگای چۆل و بەڕییە

ئەگەر چاوم کەوت بەعێلی مەلا داود و مەلا نەبییە

جاری وا پیاو پشت دە چۆلی دەکا، ڕێی بنی ئادەمی ئاوەدانییە.

مەلا نەبی یەکجار زۆری پەزیرایی و بەخێرهاتن کرد، پاشان پێی گوت، کوتی:

دەگەڵ تۆمە ئەرێ لاوە

سوبحانەڵلا! دەڵێی شێرە و خوڵقاوە

میوانی وەکو تۆ لە دەرکی کەس نەبووە پیاوە

قەدەمت ڕەنجە کرد، خێرت بۆ ئێرە هێناوە

ئەمن هیچ کوڕ و تایەفەم نییە، ئەو کچەم لە جێگای کوڕ داناوە

ئیرادم لێ مەگرە، مەڵێ: بۆچی لە دیوەخانێیە و بۆچی کورسییان لە مەجلیسێ بۆ داناوە؟

شێست هەزار کەس عێل و عێل باش داد و بێداد و چاک و خراپەیان لەکن وی دەبێتەوە تەواوە

فەسیحە، بەلیغە، ساحێب عەقڵە، لە عاقڵدا زۆر تەواوە

بۆیە ئەمن لە جێگای کوڕانم داناوە.

وردە وردە مەجلیسەکە چۆل بوو. ئەودەم لاس پێی گوت:

کیژێ کولمەت بە من بمێنێ بە سێو، ئەگەر لێی دەدرێ نەرمی خوساری

ئەوە هاتمە ماڵە تۆ، بەمیوانی و بەمیوانداری

مەمکت بەمن بمێنێ بەشەمامەی حەوت ڕەنگ، ئەگەر سبەینان وردە وردە زوقمی لێ دەباری

ئەمن عەیبە چیدیکە لێرە دانیشم بەبێ قسە و بەبێ کاری

ئەما پێم وایە ڕۆژی قیامەتی گیرۆدەی منی، نەجاتت نابێ بە ڕزگاری

چومکە تیرێکت لە جەرگی داوم، جوانم، ژانی ناشکێ تا ئەو کاتەی دەمبەنەوە

گۆڕ و گۆڕخانە، دەکەومەوە بەر حوکمی جەبباری.

کیژێ تیری دەستی تۆ ئەوەندە بەژانە

چونکە هاتۆتە دەرێ لە نێو قەفی دەبازنانە

سەر نەوزەڕێیە و بەپەیکانە

ئەو تیرە ژانی ناشکێ هەتا ئەو ڕۆژەی لە بنی گوێم دێن دەنگ و خرمەی پاچ و پێمەڕانە

ئەگەر دەڵێن: ئەوە مردووە و، دەمبەنەوە بۆ گۆڕخانە

ئەو وەختی کە خوداوەندی میری مەزن، سەحرای مەحشەرە و دەگرێ گۆشەی دیوانە

هەرکەس بەخێر و شەڕی خۆی نامەی دەدرێتێ و کاری وی دەبێتەوە پەنهانە

ئەو ڕۆژە ئەمن شکایەتێکی گەورەم لە تۆ هەیە، بەهیچێ ئەمنت دەردەدار کرد و کردتمەوە سەرگەردانە

دەبەر دوو چاوی ڕەش بەڵەکت دەمرم کە دەڵێی بازە و لێی ون بووە هێلانە

دەبەر هاتوچۆت دەمرم کە دەگەڕێی و دەسووڕێی، دەڵێی بەرخە کۆرپەلەی دوای مێگەلانە

هەچەندی کە تۆ پێدەکەنی بۆ من دەبێتەوە بە دەرمان و بە پڕ دەرمانە

لەسەر جەرگمی بنێ بەڵکو بشکێ ئەو هێش و ژانە

دەبەر زەرد مەمیانت دەمرم، دەڵێی فینجانن لەسەر تەختی سوڵتانی ڕۆمێت دانا

دەبەر وردە ددانت دەمرم، دەڵێی سەدەفە و چەسپیان کردووە لە دووکانە

دەبەر خاڵی هەنیەت دەمرم، تاق و جووتن وەک ئەستێرەی عاسمانە

ئەو سەعاتە کە من لە تۆ میوانم، هاتوومە کن تۆ، دەڵێن: میوانە

لەبری ماندوو حەسانەوەم، دەردی گرانت لەسەر سنگم دانا

ئەتۆ ڕێگای حیسابیت لێ گیراوە؟ ڕێ و شوێنێک بۆ من دانێ جانانە

دەبەر ناز و نیم نازت دەمرم، دەڵێی خاسە کەوی بەهارێی کە دەقاسپێنێ لەبەر شوبای پیرە کوێستانە

هەرچەندی زولفت لە شانت داو داو دەکەی، دەبن بە قابیز و لە من دەستێنن ڕۆح و گیانە

دەبەر تەختی سنگت دەمرم، کە بۆ من بۆتە سێدارە و خەڵک دەڵێن: عومری تەواوە و وەختی لە سێدارە دانە

دەبەر بەژنی بێ خەوشت دەمرم، دەڵێی بورجە و بێ پلیکانە

ئەما خوداوەندی میری مەزن جووتێک هەناری خڕی لەسەر سنگی ئەو کیژە دانا

مەبەستت ئەوە بوو: ئەمن بمرم، دەوەختی شەفافمدا نەژیم بەژیانە

بۆیە ئەو قەول و قەرارەت دەگەڵ من دانا

ئەمن نەمزانی گوڵ وەختی پشکوتنیانە

نەمزانی شکۆفەی گوڵە و وەختی گوڵ پشکووانە

ئێرە بۆ من میوانییە یان حەفسە و حەفسخانە

چاکەت دەگەڵ کردم کۆت و زنجیرت لە ئەستۆم دانا

بۆ ئەمن مەجروومم شێت ببم، بچم لە بۆ کێوانە

یا نە کاکە مەمم ئەگەر بەهیچی خستیانە زیندانە
خـوار و ژوور و تاق و جـووتت کردوون لەبەر گەردنت یاقـووتی عـەبدولحەسـەن و لەعلی ڕوممانە
بۆ خۆت گەنجی خەزێنەی خوسرەوی، بەینەڵڵا بە قیمەت گرانە
دەڕۆم، دەترسم چاوم پێت نەکەوێتەوە، وەختی دەست لێک بەردانە
بریا من حافز بوومایە، تۆم نەدیایە بەچاوانە
ئیدی دیتنی تۆ بۆ من بوو بە قنیاتی ئێوارە و سبەینانە
دیتنی تۆ ئەوڕۆکە بۆ من بوو بە پەژارە
چاوێکت لێ کردوومە مانگ و ئێکت لێ کردوومە ستارە
زولفت لێ سێ بەنگی کردووم، چاوت ئەوەندە مەست و بەخومارە
بە زمان هێندە فەسیح و بەلیغە، زمانت هێندە وشیارە
شل و مل و تۆق لە گەردن، مەمکت دەڵێی هەنار و گوڵی هەنارە
ئەی خۆزگە بەو کەسە کا ئەگەر بەتۆ دەباتەوە زەفەر و چارە
هەچەندی ئەگەر غەریبم، میوانم گۆشەی چاوانت هەڵدێنی
ئەتۆ مۆتەی، دڵی من دەسینگمدا دەڕفێنی
بەجـۆرێک مەست دەبم لە من وایە برای دایی و بابیم بەدەستی خۆت دەکوژی و لە منی دەمرێنی
هەچەند بەلێوێکی مبارەک زەردەخەنە و وردەپێکەنین دێنی
عەترە، عەبیرە، لە مەجلیسی ئاڕەحمان پاشای بەبەی دەپرژێنی
هەچەندی گەردنی زیراح وەزنت(!) هەڵدێنی
هەچەندی فەرماییشت دەفەرمووی دەڵێی کەوی دەقاسپێنی
سەرگەردان و دەست لێک بەردانم، ئەمن هیچ عاقڵم پێ نامێنی.
ئەتۆ ئەگەر دانیشتووی لەسەر سەندەڵێکی فەخفووری
لاجەنگت بنی سپییە، تەمەشای سەر کوڵمت دەکەن بە سووری
هەچەند فەرماییشتێکی دەیفەرمووی حاکم دەستووری

هێندە فەسیح و بەلیغ و عاقڵمەند و جوری
ئەمن بە جێ دێڵی بەماڵوێرانی و بە خانە خشتوری
ئەو وەختەم خۆش دەوێی ئەگەر خاڵ لە گەردنت ڕوو دەدەن و دەبنەوە زهوری.
ئەرێ کیژەکەی سنگ سپییە
سەری منت بیێتەوە بەقوربانی سەرییە
ئەگەر لە خۆت دابوو شیرمەشکێکی کودەرییە
ئەو حەلە دڵم لێت ترسا، کوتم: غەیبییە یان پەرییە؟
هەچەندی لەنجەت دەکرد لە پێشی بێرییە
هەنگاوت هەڵدێنا کۆترییە
ئەمن حەزێ دەکەم ئیجازەم بدەی، لە کن تۆ مەتڵەبم خوداحافیزییە
قەت ڕێم نەکەوتۆتە ئێرە و نەهاتوومە ئێرە بەمیوانییە
چونکە ئەتۆ دەزگیرانی، نەبادا لێت بکەنەوە شۆفاری و شەیتانییە
بەڵام تیری دەستی تۆ ژانی ناشکێ، هەتا ئەو سەعاتەی قابیزم دێتە سەری لێم وەردەگرێ ڕۆحییە
بەڵام لە شتێکدا کێشەم دەگەڵت هەیە
ئەلعان هەموو کەس بە من دەڵێ: لاس مەستە، ئیغیار نییە
دەبێ من مەتاڵێکە خاسەڕەنگ باوێژمە سەر ملییە
بڕۆم بەمەلوولی و بە ماتییە
وەکو کەسێکی تازەیان مردوو هەڵگرتبێ لەبەر دەستییە
ئەما ئەو دەردەی ئەتۆ پیشانی منت دا دەرمانی نییە
مەگەر دەمت لە نێو دەمی بنێم لە بری کامورەواییە
بووی بەتیرەنداز لە دڵی من، خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە
گەرووم تاڵە، دەرخواردی منت دا ژەهری مارییە
ئەمن دەزگیرانێکم هەیە، پێی دەڵێن: خانزادە خانی حەریرییە
ئەگەرچی چاو بەنگییە، سوور و سپییە

وێنەی ئەو حۆریانەیە ئەگەر خودا دروستی کردوون لە بەهەشتی باقییە
لێم مارە کراوە، ئامۆزامە، تازەکانە شەرت بێ نەی هێنمە عەرووسی خۆم بە حەلاڵییە
جا لە ئاهی خۆم و خانزادە خانی حەریرییە
ڕۆژی قیامەتێ جواب و تەکلیفی تۆ چییە؟
کێ بەتۆی گوت بڕۆت بکە بە کەوان بۆ تیرەندازییە
کەسێک غەریب و دڵشکاو بێ تیری بدە لە جەرگییە
بۆ خۆت نێوبانگت بیستووە، دەزانی ئەو تیرە دەرمانی نییە
ئێستاش داوخوازی من لەکن تۆ خوداحافیزییە.
خەزاڵ دەڵێ: لاوەکەی غەریبی هیچ خانەخوێت نییە
سەری منت ببێتەوە بەقوربانی ڕمبێکی دەم ڕەشی هەژدە قەفییە
منداڵی، دەڵێی بێ عاقڵی، هیچ عاقڵت نییە
ئەلعان بڕۆی، خەڵک دەڵێن: شێتە، دێوانەیە، بەنگییە
نەبادا شێت ببی، بکەوییە کێوییە
هەتا سێ ڕۆژ لە کن منی بە میوانییە
پاشی سێ ڕۆژی دی دەتدەمێ خەبەری بەڕاستی و بەئەسەحییە
ئەو سەعاتە دەگەڵتە چل سوار، هەمووی خۆی لەسەر دوو ڕاستەی ڕکێفێ
ڕادەگرێ، سواری وا بەدوای کەسەوە نییە
ئەگەر من تۆم دی سوار بووی لە وڵاغێکی نێوچاوان سپییە
مەگەر جارێکی لە جاران دیبێتم ساز دەبوو بۆ خەزایە خاڵندی بنی وەلییە
حەفتا و دوو لفکەی دەهاتنەوە بۆ سەر عەرزییە
ئەوە لفکەی مبارەکی و ئی شۆخییە.
خاترجەم بە، قەستەم بەوەی کەم بێ مەکانە
ئەمن دەسەڵاتی ماڵە بابی خۆم هەیە، بەدەست منە حوکم و حوکمڕانە
دەستێکت بۆ دەکەم بە سەرین و زولفت بۆ دەکەم بە باخچەی ڕەشە ڕێحانە

ئێستا تۆ ماندووی، لە بری ئەوەی بڵێن: وەختی ماندوو حەسانە
چ وەختی ڕۆینە ئەرێ بێ عاقڵی هیچ نەزانە
ئەتۆ دەزانی ئەمن بە چاوبازم بە ئەبرۆ سەقرم
بەبۆن، هەڵاڵە و بەیبوون و عەترم
ئەمن بەخۆڕایی ڕێگا بەکەس ناگرم
ئەگەر مەبەستێکم نەبوایە، میوانی وەک تۆ ڕاناگرم.
نێوبانگی من لە نێو عێل و عێل باشاندا وەک خانزادە خانی سۆرانە
جا کێ دەتوانێ لە ماڵە من دابەزێ و ببێتەوە بە میوانە؟
ئەمن گوڵم ئەتۆ بولبولی لەو جێگا و مەکانە
بۆیەم هێناوی: عەتری گوڵ بەری بۆ مەملەکەتی باڵەکانە.
تا سێ ڕۆژ میوانی و مەرەخەسیت نییە
تام خۆشی و بۆن خۆشی و کەوتوویەوە بەر دڵییە
تا بزانین موقەددەری هەق دەستی ئیلاهی لەسەر چییە؟
خەزاڵ کوتی: ئەوانە غەریبن، تا سێ ڕۆژ میوانی ئێرەن، چادرێکی بەجوێی بۆ لاس هەڵدا. کوتی: هەر پیاوێکت بێڵەوە، ئەوانی دی بنێرەوە بۆ مەملەکەتی باڵەکییان. لاس تەواوی ناردنەوە، هەر پیاوێکی هێشتەوە. پاش بەڕێکردنی پیاوەکان لاس بەخەزاڵێ دەڵێ:
لە دڵێکە من گەڕێ چەند لە هێشە و چەندی لە ژانە و چەندی لە واوەیلایە
سنگت لە من دەڵێی کارگی کەمایە
خوداوەندی میری مەزن خەڵقی کردووی، دەڵێی غەڵفی بێ گەڵایە
کوڵمت لە من ورینگان دێنێ، دەڵێی شەوچرایە
گەردن باغێکی بەقیمەت گرانت لە ملی دایە
زەبەرجەدە، بێجادەیە، ئەشرەفییە، نێوە نێوە کارەبایە
شەپۆلی چاوت دەڵێی شەتی بەغدایە
دەجا ئەمن چۆن کوێر نەبم ئەگەر بۆم بێتەوە خەبەری کاولە نوحسایە

ئەمن بەتاقە سوارێکەوە لێرە بم، خەڵکی دەڵێن: فەقیرە، شوانە، گەدایە، بێ دەسەڵاتە و هیچی لە دەست نایە

نازانن دوو چاوی بەنگی و کوڵمێکی لاڵ ئەمنی کردووە شێت و موفتەلایە

هەچەندی کەمبەرەت بەپشتت دادێنی، شێتم دەکەی و دڵم شەیدایە

هەچەندی گۆشەی چاوانت هەڵدێنی، مزگەرەمە، لە من وایە دەردی موفاجایە

هەر دەڵێی پۆڕی بەڵەکن ئەگەر دوعایان لێ خوێندوون ئەولیا و ئەملیایە

هەچەندی تۆ هەناسە هەڵدەکێشی و لە بنی گوێیانم دێ وردە سەدایە

هێزی ئەژنۆم نییە، وەڵلاهی چبکەم هەنگاوم لەدو نایە.

ئەوجار، خەزاڵ کە چادرێکی بەجوێی بۆ هەڵدا، کوتی: ئەوە میوانە، نۆکەری دەکا، لە کنمان بێ بۆ پێ ڕاگەییشتنی ملک و مەڕ و مالات.

ئاگری عیشق وای لە جەرگی ئەحمەد خان کار کردبوو، شەو و ڕۆژ دەگریا؛ جاری وابوو خۆی دڵخۆشی دەداوە، دەیگوت: دیارە نیشانەی من دەملی بەرازیش کەی، کەس ناتوانێ پێشی پێ بگرێ؛ دەڵێن: ئەوە نیشانەی ئەحمەد خانی دەمل دایە زیانی و بەدفەڕێش بکا قەیدی نییە.

ئەوە ئەحمەد خان بەحەوت سەد کەسەوە هات بۆ ماڵە مەلا نەبی. خەبەریان دا، کوتیان: ئەحمەد خان و ئاڕەحمان خانی لێتانێ دێن. ئەوانە ئامۆزا بوون. خەزاڵ لە دڵی خۆیدا کوتی: چابوو لەوەیدا خۆشم لێ مارە نەکرد. حەوت ڕۆژ بوو لاس لەوێ بوو. خەزاڵ هەچی دەسەڵاتی خۆی بوو لە بەردەستی لاسی دانا بوو. ئەحمەد خان هات؛ عالەم بۆی هەڵ پشکوت. ئەلحەقی وەنەبێ پیاوێکی کەم بێ، یەگجار دەست ڕۆییو بوو. جاران ئەگەر ئەحمەد خان دەهات، خەزاڵ دەچوو جلەوی دەگرت، ئەو سەفەرە نەچوو. کوتیان: نامزەدی تۆ ئەحمەد خان هات. کوتی: هات بەخێرێ.

ئەحمەد خان چاوەڕێی بوو، خەزاڵ لێی وەدەر نەکەوت؛ لە دڵی گران هات. حەوت سەد سواری دەگەڵ بوو، پاکی سەقاوی زێڕ بوو. ئەحمەد خان هات دانیشت لە مەجلیسێ. مەجلیس گوڵی کرد وەکو مەجلیسی سوڵتان ئەحمەدی بێنارێ. ئەحمەد خان زۆری چاوەڕێ بوو. پەشمێکی ڕەشیان بە سەندەڵی خەزاڵێ دادا بوو؛ خەزاڵ نەهات. ئەحمەد خان عەجایەب ما، زگی بەخۆی سووتا.

خەزاڵ خەبەری بە لاس دا: بچۆ مەجلیس دابنیشە. ئەتۆ بچۆ ئەمنیش دێم، دڵی خۆم دەکەم بەسەرپشک. ئەوە لاس هات، ئەحمەد خان قەتی نەدیبوو. خەزاڵ بەخزمەتکارانی گوتبوو: لە شانی ئەحمەد خانی سەندەڵی بۆ دانێن، کورسییێک سەرتر. ئەگەر کورسێکەیان دانا، خەفتانی پڵنگیان بەکورسێکە دادا. ئەحمەد خان لە دڵی خۆیدا، کوتی: دەبێ میوانی ئەو کورسییە کێ بێ؟ ئەوەندەی زانی لاس وەژوور کەوت. خەزاڵ گوتبووی: ئەگەر هاتە ژووریٚ بێ گریٚ لەبەری هەستن. دەگەڵ ئەحمەد خان پەنجەیان لە پەنجەی یەکتری دا، لاس بەخێرهاتنی شەهلیاری کرد. ئەحمەد خان پێی گوت:

سوارەکەی جوندییە
سەری منت ببێتەوە بەقوربانی سەرییە
بە ڕەنگ شێرە و دەڵێی هەژدیهای یاغییە
قەتت بەخزمەت نەگەیشتووم، ناسیاویم پێت نییە
ئیرادم لێ مەگرە، پرسیار عەیب نییە
ناسیاوی خۆتم بۆ دەرخە، کێی هاتوویە نێو عێلی مەلا داود و مەلا نەبییە؟
ئەلحەق پیاوێکی بە وەجی، شکاندنی پیاوی پیاو، هیچی تێدا بەستە نییە.

ئەوە لاس جوابی داوە، کوتی:

با ئەمن مەتڵەبت پێ بڵێم، ئەتۆ بکەمەوە حاڵییە
نازانی ئەو دنیایە بەتاڵ نییە، دنیا بێ شێری بەخەبەر نییە؟
ئەگەر لە ئەحواڵی من دەپرسی، بەمن دەڵێن: کورتە لاسی باڵەکییە
باب و باپیرم گەوەزن پۆش بوون، پێیان دەڵێن: سمێڵ سپی کامەرییە
ئەمن کوڕی میرحوسێنم، کەس لە حاستی وی نەیدەتوانی بکا یاغیگەرییە
ئەمنیش ڕەئیسم ئەلعان لە عێلی شەمامک و لەیلک و باڵەکییە
سەهوە پیاو قسە بکا لە قسمەتی هەق دەستی ئیلاهییە
قسمەتم ئێرە بوو، هاتمە ئێرە بەمیوانییە
شەرت و شوێنێکمان بۆ هەیە، بەڵام ئێستا ئەسەحی نییە.

ئەحمەد خان ئەگەر تەماشایەکی وی کرد و تەماشای خەزاڵی کرد، لە دڵی خۆیدا کوتی: شەقڵی ڕوومەتی شکاوە، وا وێ دەچی دەستیشی دەسینگ و بەرۆکان گێڕاوە. ئەحمەد خان بانگی خەزاڵی کرد، کوتی:

کیژێ کوڵمەت بەمن بمێنێ بەتەختی خونکاری، تازەکانەیان دەفتەری شا لێ داناوە

سنگت بەمن بمێنێ بەباغچەی وەنەوشە، تازەکانە ئەوە گوڵی داوە

شاکەزیەت بەمن بمێنێ بەقۆپەنی هەلاڵە، تازە وردە بۆنی تێکەڕاوە

شەهێن و باز چاوەڕێی بۆنن، مراوی لەسەری دەکاتەوە ناڵە ناڵ و قاوە قاوە

بولبول عاشقی بۆنی گوڵە، ناوێرێ بێتە باغی، ئەلعان مەحتەل ماوە

ئەو گوڵانە ئی دەست تێوەردان نین، بەلام پێم وایە: پاش گەل و پێش گەلی مەڕی، شەگەلی کەوتۆتە نێو و شەقڵی شکاوە

چاوت بەمن بمێنێ بەئەستێرەکەی ڕۆژێ، مەلای ماوەران دێ بۆ بانگێ و گۆشەی کێشاوە

کوڵمەت بەمن بمێنێ بەشەمامەی حەوت ڕەنگ، ساڵ درەنگە، شەختەی پایزێ لەسەری داوە

خۆزگەم بەو کەسە کا، سبەینان و ئێواران لێت دەبینێ کام و کاوە

پێم وایە بێ ئیلتیفاتی، مەیلی دە شەو لەوەی پێشت نەماوە.

لێم بوویە سوورە قورینگێک کە دەنیشێ لە دەم بەستێنێ

هەچەندی هەناسە هەڵدەکێشی، بۆنی عەتر و عەبیر دێنێ

چ تەیرێکە وا تیژ باڵە، خەریکە شەرتت پێ بشکێنێ

پێم وایە بەرهەڵستێک وەدی هاتووە، ئەگەر بتوانێ و دڵت لێ بڕفێنێ.

کیژێ! ئەرێ کیژەکەی چاو بەنگییە!

ئەمن بێ عاقڵم، چاک ئاگام لە خۆم نییە

گەرنت بەمن بمێنێ بەگەرنی شەنگەسییە

نەت بیستووە ئەگەر شتێکیان لە کن پیاوی دانا بەئامانەتییە

ئامانەت نابێ دەگەڵی بکەی غەیانەتییە؟
من هالاوی جەهەندەمم پێ خۆشترە لە تانەی عەبدییە
تەواوی سەردار عێلان، دەڵێن: هەڵبەتە خەزاڵ بەئەحمەد خانی سوورچی و
زوراریان قایل نییە
ئەمن زۆر پەرێشانم بەو ڕەنگی شێواو و بێ مەیلییە، مەیل کەسرییە
هیچ ئیلتیفات و عەتربەخشی جارانت نییە.
ئەمن مەحتەل ماوم؛ نازانم کاری تۆ بۆ بۆتە کێشە و واوەیلایە
بۆ بێ وەعزی، دەنگی تۆق و تەلەسم و گوارە و کرمەک و ئاودەنگی و خەبەرچی و
بەربەنانت نایە؟
ئەمن لەوەیدا وەختە بگرم دەردی پێ مردن و دەردی موفاجایە
لیمۆی ئامانەتیت پێم وایە چیدیکە بۆ دەستی من نایە.
کوڵمەت دەڵێی شەمامەی چوار بێستانە، خاڵ خاڵ سوور بووە
مژۆڵت جووتە، هێندێک دەڵێن: عاشقە، هێندێک دەڵێن: شێت بووە
ئەمنیش پێم وایە وەک جاران نەماوی مەیلت کەم بووە
چاوت دەڵێی کەوە، تفەنگچی دیوە، کەوتۆتە هاتوچووە
ساڵێ جارێک یان دووجار نێوەڕاستی هاوینێ و نیوەی پایزێ دەڵێن: گەلاوێژ
ئەنگوتووە
ئەتۆ بەبێ تاوان و بەبێ موقەسیری، دڵی منت حەفس کردووە
گە دڵخۆشیم دەیەوە و زەردەخەنەت لە لێوان بێ، لە من وایە دوو سەد ساڵم لە
عومری ڕابردووە.
کیژێ! بۆ سەر هەڵناهێنی، بۆچی وا بەعینوانی
سەری منت ببێتەوە بەقوربانی مابەینی هەرتک زەرد مەمکانی
زولفت لێ هاویشتووم ئەوشان ئەوشانی
دەڵێی جەللابی، حوکمی شات لەسەرە، هاتوویە خوێن ڕژانی
هەڵبەت لە قەول و قەرار و یادگاری خۆت پەشیمانی.

کیژێ! سبەینانم پێ خۆشە، ئەگەر دەڵێن: مابەینی شەو و ڕۆژانە
جاران ئەگەر ئەمن لێرەکانە دەبووم بەمیوانە
زولفی سێ بەنگیت بۆ دەکردمەوە پەخش و پەرێشانە
سنگت بۆ دەکردمەوە بەبازاڕ و بەدووکانە
حازرت دەکرد جووتێک زەرد مەمکانە
دەتگوت: تازە وەختی دەست لێدانە.
بەڵام ئەلعان تیرەندازی، تیری دوژمنایەتیت داوم لە جگەرێ
بەدەردی تۆوە دەمرم، نازانم چم بەسەرێ
ئەگەر بێتو بترازێنم بۆستەی خەنجەرێ
خۆم بکوژم بەهیلاک دەچم، بێ بەش دەبم لە ئاوی حەوزی کەوسەرێ.
خەزاڵ ئەوە جوابی داوە، کوتی:
نازانم نە شێتە و نە جیننییە
گەورەی عێلی ڕەمکی و سوورچی و زوورارییە
پێم ئەو سەفەرە هاتووە بۆ شەڕ و بۆ شەڕاڕەتییە
سەفەرەکەی هیچ خێر و سەعادەت نییە.
ئەوە برایم بەگی لێتانێ کوتی:
هیچ نییە ئەو قسەیە بەزۆریان دانا
عێل لە دەرێیە، جەنگەی پیرە کوێستانە
کەسێک خەفەت بێ، شوبای کوێستانی بۆ وی دەرمانە
ئەحمەد خانی سوورچی و زووراری قسێکی بێ جێ دەکا دەڵێ: خەزاڵ پەشیمانە
بابی بەردەستە، بۆ خۆی هیچ نەزانە
کێ دەتوانێ دەست درێژ کا بۆ دەسکی گوڵانە؟
لە ئەحمەد خان واتر بۆ خەڵکی سندانە، ئازاری سەرەتانە
کەسێکی شتێکی پێ قوت نەدرێ، بڵێن: ئەوە لەسەر زاری دانا
ژەهری مار جەرگی دەبڕێ، دەیکاتەوە بێ ڕوح و بێ گیانە.

ئەحمەد خان نازانێ قسە بکا، قسەی ڕادەبرێ
کێ دەتوانێ هاچەری دەرکی خەزێنەی تۆ وەرگرێ
دەبێ قەبر بۆ خۆی هەڵکەنێ، دەستبەجێ دەمرێ.
ئەوە دیسانیش هەر برایمی لێتانێ دەڵێ:
خەزاڵە شۆڕی چاوبەنگییە
ئەمنت دەمرمەوە دەبەر کوڵمێکی سوور و سپییە
ئارامی دڵان، حۆری بەهەشتی باقییە
بۆ دەگەڵ ئەحمەد خان ئەوڕۆکە هیچ سەروڕووت خۆش نییە؟
بیستوومە لە غەیری و لە بێگانە و لە ڕدێن سپی عێلی مەلا نەبییە
دەڵێن: کابرایەکت ڕاگرتووە بەمباشیری و دەسەڵاتت داوەتەوە دەستییە
هیچ کەس لەسەر عێلی مەلا داود و مەلا نەبی هەقی نییە
هەتا سلامەت بێ نێوچاوانی ئەحمەد خانی سوورچی و زوراریيە
هیچ کەس ناتوانێ لەو عێلە زوڵم بکا و بکاتەوە ملهوڕییە
مباشیر و دەسەڵاتدار بۆ تۆ زەروور نییە
کەسێکی بێتە کن تۆ بە نۆکەرییە
سەری لە بەردی داوە، وەبزانێ ڕوحی پێ نییە.
ئەوە لاس وەجواب هات و کوتی:
هەک ڕەبی لە یەخەی کراسی خۆمدا نەمێنم
هەچ کەسێک قسەی کاڵ بەمن بڵێ دەپێش هەموو شتێکدا خوێنی دەپڕژێنم
بەخەنجەری دەسک نێرۆیی جەرگی دەردێنم
کاری کەمیش گەورە دەکەمەوە و کار لە کار دەترازێنم
ئامانەت و ئارامی دڵی لێ دەستێنم
یان ئەمن سەری خۆم دەدۆڕێنم
یان عێلی سوورچی و زوراری و لاتانان دەسووتێنم
یان سۆسەنی دایکم بۆ سەر شینگای قەبری خۆم دێنم

جا با دایکم بۆم بگری، بڵێ: فرمێسک هەڵدەوەرێنم
خۆم دەکوژم، با لە پاش لاس نەمێنم.
کەسێکی پیاو بێ، دەبێ ڕکێف بدا لە مابەینی عەسڵە بەحرییە
لە کەلەکەی بدا قەرەبینایەکی وەستا داودییە
شیرێکی کالان زێڕینی کارخانەی ڕۆمییە
دوازدە تیری قەتڵ کردەی پەڕ داڵییە
جێگای کێشە و نیزاحی پیاوان چۆلییە، ئێرە ئاوەدانییە
هاتووم بەعینوانی دیانەتی و میوانییە
شەرت ئەوەیە پیاو کزەی نەیە لە دڵییە
نەپارێتەوە بۆ کەوچکێک خوێنییە
خەزاڵ با شەرمیش بکا، خێر پێت قایل نییە
ئەمن بەندی دڵی خۆم دەبەستم بەشلێری خاوی دەستی خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە.
تەمایان بوو مەجلیس بشڵەقێنن، بێتە برەم برەمی خەنجەران و سەحرای مەحشەر.
خەزاڵ کوتی:
قسێکی زۆر ناخۆش لەو مەجلیسەدا ڕابردووە
زۆر عەیبە بۆنگۆ، هەڵبەت تەماحو لە ماڵە مەلا داود و مەلا نەبی کردووە
سبەینێ دەبێتە شۆرەت، دەڵێن: ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری ماڵە مەلا نەبی تالان کردووە
قسەی ناخۆش تاڵە، لە پێش دڵی هیچ کەس شیرن نەبووە
ئەو مەجلیسە بۆ دانیشتن نابێ، مەجلیسەکەمان تێک چووە.
ئەگەر بەرامبەری یەکتری بخوێنن باز و تەڕلانە
بکەونە شەڕ و جەنگ و لێکدانە
وێران دەبێ ئەو دەور و مەکانە

مەجلیس تێکدان خەتای برایم بەگی لێتانە
تەحتیلی کەن چونکە ئەو مەجلیسە تێیدایە شوبر و شەیتانە
هەمووی سەردار عێلن، هەمووی نەڕڕەشێری ڕۆژی مەیدانە
نەبادا کەلاک بکەوێ لە گۆڕ و لە گۆڕخانە
ئەمن، ئەحمەد خان بەمنی داوە نێو دەگەڵ نیشانە
گەردن لغێکی جەواهێرات بەند و دەگەڵ کەمبەرێکی سێ گۆی یاقووتی
عەبدولحەسەن و لەعلی ڕوممانە
هەروە بزانێ ئەمن ئی ویم، نێچیری بازان ناکەوێتە دەست بێگانە
وەختی ئەوە نییە عێلان عێلباشان، لە تەواوی دونیا دەکەوینە سەر قسە و بوختانە.
ئەوە ئەحمەد خانی سوورچی و زورری کوتی: کەوشان بێنن، ولاغان بێنن، هەتا بڕۆین.
جا کوتی:
بەوەی کەم ئەگەر ئاگا و موبینە
دڵی من گەلێک لە هێش و لە ژان و لە تینە
نابرژێتەوە قەت ئەو برینە
سەت لەعنەت لە خۆت و سەت لە عنەت لە مەلا نەبی ڕدێن شینە
ئەوە بازی ئاسکە، دڵخۆشی دانەوەی بەدرۆ چی تێدا بەستەنینە
پاش سێ ڕۆژی دیکە، ئەگەر دڵت فرۆشبێ، بەدوو چاوی ڕەش دەکەی گریان و بە پەنجەی شمشاڵ دەکەویە خۆپچڕینە
کابرایەکی دێوانەی شێتی، هیچ مەزڵی ئەسەحی نینە
ئەوە ئەسەریاتی وییە لە دڵی تۆی هاویشتووە گەرمە برینە.
سەت لەعنەت لە خۆت و سەت لە ئاکارت
چۆن نەماوی لەسەر قەول و قەرارت؟
خودا بەختی تێکدای و لێت تێکچوو کاروبارت.

مەگە لە دنیایەدا چاردە سەعات لەسەر یەک نەمێنم
بەجورێک عێلی مەلا نەبی و مەلا داود بشێوێنم
ڕیشەی بنەماڵەی هەزار ساڵە دەرێنم
بەڕمبی بێ ڕوحمی، دڕوی مەرگ بۆ تایفە و نەژادت داچێنم.
ئەمن هیچ نیمە خوداحافیزییە
خوداحافیزی من خوێن ڕژتن و دوژمنایەتییە
قەستەم بەوەی کەم بێ مەکانە و ئەزەلییە
بەکەس لاناچێ قەڵەمی هەق دەستی ئیلاهییە
گلێییت لێ ناکەم ئەوەش موقەددەری عاسمانییە
جا بەدڵی پڕ ئەسرین دەبێ دانیشی لەسەر مەیت و کەلاکی لاسە شۆڕی باڵەکییە.
جا لاس دەڵێ:
ئاغای چەلەنگ قسان مەدۆڕێنە
بە شەماڵ بڵێ: چەپکی گوڵم لە دەستی مەڕفێنە
ئەگەر کەسێکی پیاو بێ، بڵێن: مەردە و لە مەیدانێدا خوێن پڕژێنە
دەبێ لە بیری نەچێ ئەتکی بەژنێکە باریک و دوو چاوی شەهێنە
ئەلعان ئەگەر ئەتۆ پیاوی بەخەزاڵ بڵێ: چۆڕێکم ئاو بۆ بێنە
ئازای لێی بپاڕێوە، بڵێ: ژەهری تێ مەکە و دڵم مەپسێنە
شمقاڕیان قەت نەداوە بەقەل، شمقاڕ خواردنی شەهێنە.
خۆ دنیا پێک نایە بەدەوڵەت و بەماڵ و سوار، لە پشتەوە دەبنەوە سوارە
زەینی خەزاڵ دە، لە خۆی داوە گوارە و کرمەک و قەتارە
ئەملاک بەکار نایە، وەبزانە سووالکەری ئەگەر دەگەڕێ کووچە بەکووچە و شار بە شارە
لە کیست چوو ئەبرۆی کەمەن کێش و دوو چاوی بەخومارە
تا ئەوڕۆکە قسەت دەڕۆیی، ئازای لەوەی بەولاوە بڵێ: خەزاڵ بەمن یارە.
ئەحمەد خان گەڕاوە، خەریکی ئەوە بوو کێشە بکا، کەیخودا و ڕدێن سپی کەوتنە

نێوانێ، نەیانهێشت بەشەڕ بێن. ئەحمەد خان بەزیزی ئەوە ڕۆیی. ئەگەر چۆوە، دەگەڵ برایم بەگی لێتانێ تەگبیری کرد، هەرکیان کوتیان: بەسەریان دادەدەین، ماڵە مەلا نەبی تالان دەکەین و خەزاڵیش بەئێخسیری دێنین. جا ئەوە هێز و لەشکر و تەدارەکی خۆیان ساز کرد.

لەولایەشەوە، لە سمایل عوزەیریان حەوت سەد کەس چوونە کن مەلا نەبی، کوتیان: ئاغا! ئەتۆ سەرداری ئێمەی. کابرایەک کەس نازانێ لە کوێڕا هاتووە، لەسەر وی نێوانی مە ئەوە دەگەڵ ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری تێک چوو. بەخودای کوڕی خاڵیشمان دەکوژێ و ماڵیشمان بەتالان دەبا. دڵ گۆشتە، پیاو ئەگەر قسێکیان لە کن کرد، دڵی دەگۆڕێ.

مەلا نەبی خەزاڵی بانگ کرد، لاسیشی بانگ کرد، کوتی: عەزیزم! خۆ ئەتۆ گورگ نەبووی بێی دەکۆزی ئێمەوە! ئەتۆ بەهەویای خەزاڵی، خەزاڵ بۆ کەسێک دەبێ وەک ئەحمەد خان ساحێب نێوونیشان بێ. ئێستاش کارێکی وا مەکە بەئاوری دەستی تۆ لە سۆنگەی تۆدا عێلێکی هەزار و پێنج سەد ساڵە ببەتلێ. ئەتۆ دەبێ بڕۆی. مەجبوورم ئەمن خۆم باوێمە ماڵە ئەحمەد خانی، تا میللەتەکەم بێ چەقە و هەرا و شەڕوشۆڕ دانیشن.

لاس کوتی: ئەمن هاتم ئەتۆ لە ژێردەستی خەڵکی دەرهێنم. دڵت تۆقێ! ئەحمەد خان دەتوانێ چ دەگەڵ تۆ بکا؟

مەلا نەبی بەدزی لاس خەزاڵی دی، کوتی: قەدیمیان کوتوویانە لەعنەت لەو کەسەی ئەگەر سوڕی خۆی لە بەردەستی عافرەت و ژن دەنێ! ئەمن دەسەلات و سەنتەنەت و تەواوی هاچەری دڵی خۆم دا بەتۆ، ئەتۆ هیچ عەیبت نەکرد نەدیو و نەناسیو کابرایەکت دیوەتەوە حەزی لێ دەکەی؟ ئەمن سبەینێ چ جوابی ئەحمەد خانی بدەمەوە؟

سوورچی و زوراری و لێتان و گێلانگێسی، بێجگە لە نۆکەر، هەزار و نۆ سەد سواریان هەمووی ئاغا و سەردار عێل هەیە. هەم ئابڕووم دەچێ ئەتۆ ئێخسیر دەکەن، هەم تەواوی ئەو عێلە تالان دەکرێ و بێ کیفایەتمان دەکەن. هەچی زووترە ئەو کابرای باڵەکی جواب کە، با بڕوا. ئەمنیش خۆم دەماڵە ئەحمەد خانی داوێم

ئەگەر دۆستایەتی نویّ بکەینەوە. خەزاڵ بەدڵ پێی ناخۆش بوو، بەزار کوتی: بەڵێ.
لاسیش خەیاڵی بوو بڕوا. کوتی: خراپم کرد ئەو چل سوارەم لە دەستی خۆم کردەوە. ئەوە لە پێنج سەعاتەی شەوێ خەزاڵ چووە کن لاسی، بانگی کرد:

سوارەکەی سوار دەبی لە ئەسپێکی شێرخەزاڵییە
دەڵێی ڕۆستەمی مازندەرانی، دەچی بۆ شەڕی دێوی سپییە
دەڵێی سوڵتان سەید وەقازی کەوتوویە تیرەندازییە
مەگەر ڕۆژێکی لە ڕۆژان دیبێتم ئەگەر سوار دەبوو بۆ خەزایە ئیمامی عەلییە
ئەو غیرەت و تانوتەی لە نێوچاوانی تۆ دایە، لەوان زیاتر، دەنێوچاوانی کەسی دیکەدا نییە.
ئەوە ترسای لە قرمەی خەنجەری ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری و خان قۆچی خانی گێلانگێسییە؟
خاترجەم بە! کە بچیەوە نێو عێلی باڵەک و باڵەکییە
بەقسە پێیان قەرزداری، دێنە سەرت بۆ قەرزییە
سەر بێ ئەجەل ناچێتەوە بن بارستی گڵییە
ئەمن لە تۆ زیاتر ژیانم نییە
خۆت لەسەر ڕاستەی ڕکێفێ ڕابگرە، چاو لە ئەبرۆی من بکە و دەست بکە بە تیرەندازییە
وەبزانە سامی نەریمانی لە گوڵستانی ئێرەمێ هاتوویەوە، دەچیە سەر ئەفراسیاب بە دوژمنایەتییە
قەرە زولفت بۆ دەکەم بەکەمەند بۆو ڕۆژەی ئەگەر شەڕە و کەس ئاگای لە کەس نییە
ئەمن دەپاڕێمەوە لەبەر ئەو کەسەی ئەگەر ئەزەلییە و ئەبەدییە
تاو لە خوانی زینت نەدا، کەس دارت نەکێشێتە سەرباریییە
تازەکانە میراتە سنگ و بەرۆکی من، بۆ تۆ دیانەتە و دیارییە
هەموو کەس ئەگەر سەرزەنیشتم دەکا، دەڵێن: بێ عاقڵ بوو خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە

نازانن تیری دەستی تۆ بەکەس دەرنایە و بەکەس عیلاجی نییە
دەبڕۆ بەوەت دەسپێرم ئەگەر دنیای دانا سەبارەت بەنەبییە
خوسارت لەبەر بلێسەی گەروەشینێ لە سمێڵی نەکەوێ، باسکت لەنگ نەبێ لە
ڕۆژی دوژمنایەتییە.
کوڕە نەکەی لەوەیدا، دەستی منت ببێتەوە بەدامانە
نەکەی بەقسەی مەلا نەبی، ئەگەر بەمن بابە و باوانە
بێ غیرەتە، هیچ غیرەتی نەماوە لە نێوچاوانە
نەکەی بکەوینە ئەو ڕۆژی دڵهێشان و دەست لێک بەردانە.
ئارامی دڵم هەتاوەکو ئەو سەعاتە لە لامە
بەبێ تۆ، شەرت بێ حەڵاڵی دنیا لە من حەرامە
ئەمن دەبێ دەگەڵ تۆ ببینم کاو و کامە.
نەکەی بەیەخسیر بدەی دوازدە هەزار ماڵ سمایل عوزەیرییە
ئەمن دابنیشم بەڕووڕەشی و بەڕووزەردییە
خاترجەم بە ئەمن یەخسیر دەکەن، دەمبەن بەیەخسیرییە
جا تۆ بمری باشترە، ئەو ژیانەت بۆ چییە؟
لەبەر تۆ نەبایە، ئەمن نەمدەکرد جوابی ئەحمەد خانی سوورچییە
ئەدی بۆ دەڵێن: گوڵی دێڵەبەبا باکی لە کەس نییە.
سبحەینێ ئەبرۆت بۆ دەکەم بەکەمەند و سنگمت بۆ دەکەم بەسپەری قەرەبینایە
مەترسە، بەو زووانە لەشکری ئەحمەد خانی سوورچی و زورزاری نایە
هەچ کەسێک چاوی لە گۆشەی چاوی من بێ، وەبزانە نوشتوی خدر و ئەلیاسی
لە گەردنی دایە.
هەزار جارت ئەمن بمرمەوە لەبەر دوو گۆشەی چاوە
خۆت نەکەی بێ غیرەت و بەدناوە
دەڵێن: لە ئەحمەد خانی سوورچی و زورزاری ترساوە
بەبێ عومری هەق دەستی ئیلاهی، هیچ کەس ڕوحی نابێتەوە تەواوە.

زەینێ خۆت دە زنجیرەی زولفان، لەسەر خاڵی شین هاتوچۆیانە
تەواوی عێلی سوورچی و زورای دەگەڵ تۆیانە
ئەلعان فکری شەڕ و هەڵلا و گۆگۆیانە.
ئەوە لاس پێی دەڵێ:
کیژێ! خەزاڵە شۆڕی لە جێی ڕێگای غەریبیم، ئەمن ناسیاویم بەکەس نییە
ئەمن میوانم لە بەژنێکە باریک و دوو چاوی بەنگییە
تیری تۆیە لە جەرگم کردوویە کارییە
لەسەر ئیلتیفاتی تۆ مەحتەلم، ئەگەر لە سنگی تۆ بڵند بێ بۆنی هەڵاڵ و بەیبوون و بڵاو بێ بۆنی عەترییە
ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری لە کن من پیاو نییە.
چاوێکتم بۆ بکە بەئەستێرەی گەلاوێژ و ئێکم بۆ بکە بەمانگ وەختێ ئەگەر دەگرێ پەنایە
خەڵک چاوەڕێن، دەڵێن: ئەوشۆکە بۆ مانگ هەڵنایە؟
شەیتان غەڕڕەیی کرد، حەول و قەوەت بەدەست خودایە
مەترسە، لاسە شۆڕی باڵەکان لەبەر دوازدە هەزار سوار هەڵنایە
زولفی تۆ کەمەندە، چبکەم لە گەردنم دایە
حەفسیم، گیراوم، دەستبەسەرم، چارەم نایە
شەرت بێ کارێک بکەم بیگێڕنەوە لە تەواوی دونیایە
مردن میوانی هەموو کەسە، کەس لەبەر مردنی هەڵنایە
یا فەتح و نوسرەتم وەگیر دەکەوێ یان ڕۆحم دەبەمەوە بادی فەنایە
یان ڕۆژێک دەمبینی بەفەتح و نوسرەت یان لەسەر قەبرم دەکەیەوە شین و گریان و واوەیلایە.
خەزاڵە شۆڕ دەڵێ:
قسەی وا مەکە، کەو ئەگەر عاشق دەبێ بە کەوێ
حەوسالان ئەمن مەرگم وەپێش مەرگت کەوێ

چبکەم ئەمن بەخۆم نییە، دڵم تۆی دەوێ
دڵم بریندارە، شەوێ لە تاوی تۆ ناسرەوێ.
لە نێوان مەدا ئەحمەد خان سەرەتانە
سەری منت هەزار جار ببێتەوە بەقوربانە
ئەگەر بێتو لەو کارە فەتح و نوسرەتت وەگیر کەوێ و بکەویە بەر دڵانە
قەرە زولفت بۆ دەکەمەوە بەقەرە سۆرانە
سنگت بۆ دەکەمەوە بەشانەی هەنگوین، ئەگەر نەخۆش بی، لوقمان بەتۆ بڵێ:
شیرنی بۆ تۆ دەرمانە
ئەو جووتە مەمکەت بۆ دەکەم بەفینجان و بەئیستیکانە
قوڵکەی گەردنێت بۆ دەکەم بەمەیخانە
فەرموو ئەگەر برادەرت هەیە، بڵێ: ڕۆژی ئەوەیە لێم ببن بەمیوانە
زەردەخەنە و عەتری لێومت بۆ دەکەم بەکۆمەگ و پشتیوانە
لە بۆ ڕۆژی شەڕ و بڵێسەی گەروەشین، بۆ تۆ ببێتەوە پشتیوانە
خاڵی گەردنم بۆنیان لێ پەیدا بێ، وەک سبەینان ئەگەر بۆن دەدا ڕەشەڕێحانە
گوارە و کرمەکانت سەبرێک بۆ ببزێوم، بکەونە حەڕەکەت و جۆلانە
هێندێک بڵێن: سەحرای مەحشەرە، هێندێک بڵێن: ئاخری زەمانە، هێندێک بڵێن:
خێرا شەڕە بەرانە
هێندێکیش بڵێن: خێر، ئەو ڕۆژەیە، دنیا بۆیە وا بەتەمە، مەنسوری هەللاجە
کەوتۆتە کێو پەڕە دانە
ئەمن هەنیەت بۆ دەکەم بەمێهمانخانە
سبەینێ تاو هەڵنەیە و، پاش بانگی ئێوارێ، لێی بکە قەدەم لێدان و سەیرانە
باسکت ئاوێزانی گەردنی بکەم، بڵێن: ئەوە ئاشقە و ماشقەی مارن وا بوونەوە ئاملانە
گراویە بابم، ئارامی دڵم، بەبێ تۆ ڕەبی سەرم بەرمەوە گۆڕ و گۆڕخانە
هاشا لە جەننەتی ڕۆژی باقی، نەوەکو پێم بڵێن: لاس بەدەستی ئەحمەد خانی

سوورچی و زوراری هاتۆتە ڕۆژی مردن و دەست لێک بەردانە
پیاو کە بێ دەسەڵات بوو چی پێ ناکرێ، پیشەی هەر واوەیلا و داد و پاڕانە لە دەرگای حەییی دانا
واهیمە نەتگرێ، دەمانچەی دانسقە، قەرەبینا، بیان هاویژەوە سەر ملانە
ئەو کارە خاترجەم دەبێ، دانەنیشم بە سەرگەردانی و بە بابان خشتوری و بە بابان وێرانە
تەمەنا دەکەم لەو خودایەی، ئەگەر بێ گیان بووین ئەمن و تۆ، خستووینییە سەر ڕووح و گیانە
هەڵکشاو بی، پەڕ بەسەر بی، لە نێو عێلی سوورچی و زوراری و گێلانگێسیانە
حەزرەتی جوبرائیلی عومربەر، چونکە هەمیشە مەعموورە بەعومری سوبحانە
ئاگادارت ئەو بێ، بۆ خاتری ئەو خودایەی ئەگەر بەکفلەکونێک ئەو دنیایەی سەرانسەر دانا
خودای نەکەردە ئەتۆ شتێکت لێ بێ، بەهیلاک دەچم، دەبێ ژەهری مار بکەمەوە نۆشی گیانە
لە پشتی وڵاغت بکە زینێکی مورەسسەعی پێش بە گۆی مەرجانە
تەنگەی توند بکێشە، ڕوو بکەوە لە دەرگای سوبحانە
عەشیرەتی زۆر بەکارت دوژمنن، سێلاون، بێ ئامانن، هەمووی دەڵێی شێری گەرمەلانە
موقەددەری هەق دەستی ئیلاهی ڕەد نابێتەوە بەکەس، ڕەد نابێ و نابێتەوە پەنهانە.
نەڵێی بێ کەسم و کەسم لە پشت نییە
بروت بۆ دەکەم بە تیر، پێی بکەوە تیرەندازییە
قەرە زولفت بۆ دەکەم بە کەمەند، لە نێو زنجیری زولفاندا سوارانم بۆ بکەوە بەندییە
ئەوە مژانگی چاومت بۆ دەکەمەوە بە ڕمبی دەمرەشی هەژدە قەفییە

وەستا دروستی نەکردووە، کاری خولایە، ڕمبی وا لە شانی کەسدا نییە
وەبزانە لە دوات دەڕۆن دوازدە هەزار سواری سمێڵ سپی عەسڵە کامەرییە
عەتری وردە خاڵت ڕەگەڵ دەخەم، لەکنت بێ لەبری خۆراک و ئابدارییە
ئەتۆ دەڵێی بێ ترسم و ترسم لە کەس نییە
مەگەر موقەددەری خولای بمکاتەوە حەفسی و بەندییە
فەرموو لە کوڵمێکە ناسک دوو ماچ وەربگرە، لە بری نانە شەکرینە و لوقمە قازییە
هەتا حەوت ڕۆژ برسی نابی، تێشووی خۆت پێیە، ئەوە لە ئابدارخانەی کەسدا نییە
لیمۆی کاڵم بژاکێنە، تەمەن کورتیش بی، بۆ تەمەن درێژییە
ئەگەر بکەویە شەڕێ، زولفت بۆ دەکەمەوە سێ بەنگییە
نەڵێی بێ یارمەتیم، بێ کەسم و یارمەتیم نییە
گەر خەزاڵت لە پشت بێ، وەبزانە دەگەڵتە عەسکەری عەبدولحەمید و تەواوی
لەشکری پیرە ڕۆمییە
گەردنت بۆ دەکەم بە بەیداغ، بۆ تۆ پشتیوانە، گەر شکست بی، وەرە بن گەردنم، هیچ
کەس ڕاگەییشتنی بەوێ نییە
ئەگەر بێتو ئەمن وردە خاڵت بۆ وەدەرخەم و سبەینان بڕۆم بە لەنجە و بە کۆترییە
مەست دەبی، هیچ ئاگات لە خۆت نییە
وا دەزانی تیرەندازیت لە پشتەوە دەکەن چل سوارەی غەیبییە
لەسەرت دەکاتەوە ئیشەڵڵا ئەلیاس لە بەحرێ و خدر لە چۆل و بەڕییە
بەئاواتم بۆت دەستەودوعا بێ نوحی نەبییە
لە پاش تۆ بەجێ نەمێنێ خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبی و خانزاد و خانزادە
خانی حەرییرییە
هەزار جار سەری منت ببێتەوە بەقوربانی سەرییە
هەتا ئەجەل نەیە، سەر میوانی گڵی نییە

دەست و دڵت بگرێ، لە خۆت حەلاڵ کە سنگێکی سپییە
سنگ و بەرۆکی من تەختە، ئەو تەختە لە بن هیچ پادشایەک نییە
ئاخ! ئەوەندە نەمردووم پێکەوە دانیشتباینایە بەبێ سۆز و بەئازادییە
جا ئەمن وردە وردە بۆ تۆم گێڕاباوە قسەی غەریبی و غوربەتییە
تەماشای گەردنێکی بەخاڵ کە، هێندێک دەڵێن: سییە، هێندێک دەڵێن: ماهییە
کوڕە! ئەتۆ ئەگەر خەزاڵت دۆست بێ خەمت چییە؟
بەڵام کەس لە موقەددەری خولای نازانێ قەزا و قەدەر غەیبییە
بڕۆ بێ ئەندێش بە، خەیاڵ ماوێژە بەردڵییە
حەول و قەوەت بەخولایە، لە خودای واوە، کارسازی دیکەت نییە.
ئەوجار ئەوە لاس دەڵێ:
ئەمن مەستم ئیغیار نیم، کەمم بۆ هەڵێنە ئەو دوو چاوە شەهێنە
بەسم عەتری وردە خاڵت بەسەردا بپڕژێنە
بەسم بۆ ئەمبەر ئەوبەر بکە ئەو ئەبرۆی پەڕی پیرە شەهێنە
کەمم بۆ پەنجەی شمشاڵ دەست بۆ سنگی بێنە
بەس ئەسرین و وردە فرمێسک لە چاوان هەڵوەرێنە
بەمن ناوەستێ دوژمن، ئەتۆ لە دەستت کردووم دەستبێنە
ئەمن بەتۆ دەست بەستراو دەبم، خۆت عێجز نەکەی، خۆت مەشەمزێنە.
سبەینێ ڕۆژی دڵهێشان دەبینی، ئەو وەختی نیازە
کە جوکلی هەمەوەند سوار دەبن، دەڵێن ڕاوە بەرازە
ئەگەر تۆ نسحەتم دەکەی بەو ناز و نیمنازە
مەستم، بەخۆم نییە، ڕەگی بەدەنم پاکی لەبەر یەک ترازا
جا ئەو حەلی دەبینی، دەڵێی: لەشکری دوژمن کۆترە و لاسی باڵەکان بازە
بەس لە سنگ و بەرۆکت، بڵند کە و لە تۆق و تەلەسمان، دەنگە دەنگ و ناڵە ناڵ و ئاوازە
هێندێک کەس دەڵێن: قەتارە، هێندێک دەڵێن: قورینگە، ئیدی کەس نازانێ خەزاڵە

وا بەنازە
ئەگە هاتوو جەنگ قەوما، نەیکەی بەتیرەنداز ئەو دوو چاوە شەهێنە
ئاگام لە خۆم دەبڕێ، قەڵەمی دەست و پێم مەشکێنە
بڵێن: لاس مەست بوو، ئیغیار نەبوو، دوژمن جەرگی دەرهێنا
عەتر لە سنگ و بەرۆکت بەس بپرژێنە.
سبەینێ ئەگەر سوار دەبن بۆ گۆشەی مەیدانێ کوڕە کوڕە و یەکە یەکە
ئەتۆ خۆت نەدیو کە، گەردنت دەڵێی فەلەکە
ناز و نیمنازت هێند لە بەردلانە، دەڵێی شەکە
تا بزانین چۆن ڕادەبرێ و خودا چ دەکا.
یا ڕەبی خودا قەت ڕۆژێکی وا نەکا ئەتۆ بڵێی: لێم قەوماوە
دایک و ماڵ و کەس و قەوم و کار چاوەڕێمن، دەڵێن: داخولا کەنگێ لاس
دەگەڕێتەوە دواوە
دوعام بۆ بکە و ئەو خەبەرەیان بۆ نەچێ، بڵێن: لاس سەری لە بن بارستی گڵی
ماوە
ئیدی نازانن بولبول ئاشقە، مانگی گولانە، بولبول چۆتەوە شەوڕاوە
ئەلعان ئەو سەعاتە، عێلی حەریری لە چیایە مەغلوبیان و کۆسرەتی شاڵە بەگیان
چادر و خێوەت و خەیمەی هەڵداوە
شل و مل و سایە گەردن کولمەیان دەڵێی شووشەی گولاوە
شەوێ دەنگی بازە، شەهێنە، قاسپەی کەوە، مراوی و سۆنە دەکەنەوە قاوە قاوە
خانزادە خانی حەریری دایمە لەسەر خەیاڵە، دەڵێ: لاس چوو بۆ ڕاوێ،
بۆ نەگەڕاوە؟ ئامۆزاکەی پشتیوانم چی لێ قەوماوە؟
سنگت دەڵێی بەفری کوێستانییە، تازەی بەفر لەسەر لاچووە و گوڵ شکۆفەی داوە
بولبول لەبەری دەخوێنێ، هیچ ئاقڵی لە کەللەیدا نەماوە
سنگت دەڵێی شانەی هەنگوینە، ڕەواقی دەنێودا ماوە
چاوت دەڵێی جەللابە و خوێن لە پەنجەی پرژاوە

ئەبرۆت دەڵێی کەمەندە جوکلی هەمەوەندە لە شانی خۆیان داوە
ڕۆژی شەڕێ نەیەی بۆ کن مەیدانێ، شەڕکەریان زۆرە، نەبادا بترِفێنن، بڵێن:
خەزاڵ لە دەستی لاس ئێخسیر کراوە
ئەو دەم دەمرم لە داخان. جا خەبەر دەچێ بۆ دای و بابانم، دەڵێن: لاس نەماوە.
کێ بێ لە ئەحمەد خان و کێ بێ لە ئەحمەد خانی سوورچی و زوراریيە
لە شانی ڕاستەی برایم خانی لێتانە و لە ئی چەپەی خان قۆچی خانی
گێلانگێسییە، لە پێشی عەبدول قادر خانی بەبەیە
دوو سەت کەسی لە پێش ڕاوەستاون، هیچی مووی نەهاتووە لەسەر لێوییە
هەمووی دەستی لەسەر خەنجەری دەمرەشی دەسک نێرۆییيە
هەمووی بنی کەوشی تیغە پشتی هەژدیهایە، تازە هاتۆتەوە لە دەباغکارییە
هەمووی گیانفیدایە، هیچی ترسی لە مردن نییە
گرمە گرمە، عاشیرەتێکی قورسە، نیوەی کەیخودا و زانا و ڕدێن سپییە
لەبەر نێوچاوان گرژی ئەحمەد خان هیچ کەس زمانی دە زاریدا نییە
دەیگوت: پاکو ئەسپو ساز کەن، سواری پیرە حدودان مەبن، تەمەنی ولاغو زیاتر
نەبێ لە سێ ساڵییە
لە پێشی زینو بدەن، دەباغکار بێ، نێوچاوانی شێرییە
پێشی ڕانو ڕکێفو ئاتەگی زینتان بڵێن: پێستی پڵنگی کێوییە
یەک بەیەک لە ڕمبو بڕوانم، دمرەش بێ، سێ سووچ بێ، لەوی عەسڵە نەگین
کارییە
ئەگەر هێندێک کەس بڵێن: هیچ وەستایەک ئەوەی پێ دروست ناکرێ، هێندێکیش
بڵێن: خێر، ئەوە نەوزەڕییە
چون بەژەهری مار ئاودراوە، تک تک لێی بتکێ ژەهری مارییە
ئەگە وابێ لە ڕێزەی پیاوان نیم، دەبێ لەسەر شانی خۆم دانێم بەندۆکە و خشڵی
ژنییە کابرایەکی بێ کەسی نێوونیشانی نییە
قەت بووە لە عێلی سوورچی و گێلانگێسی بکاتەوە کەڵەگایی و کەڵەزەڕییە

ئەمن خەزاڵم نیشانە کردبوو، هیچ فەرقی نییە دەگەڵ مارەکردن و مارەییە
ئەلعان دەڵێ: هەقت بەخەزاڵ و خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبییانەوە نییە
شەوێ دێوانەم، ڕۆژێ هیچ ئاگام لە خۆم نییە
دوژمن کەم مەگرن، پیاوی وا بەکار لە دنیایەدا نییە
شەرت بێ بەخوێنی وی نێوچاوانی ولاغ بکەمەوە کەسک و سوور و لاجیوەردییە
مەلا نەبی لە کلکی ولاغان بخەم، ڕدێنی بکەوێتە سەر عەرزییە
خەزاڵ بێنم بەدەستی زۆر بە یەخسیرییە
جا پاشان بچمە سەر عێلی باڵەک و باڵەکەتییە
بزانم ئەو کابرایە شێتە یا بەنگییە؟ وا هاتۆتە عێلی مەلا داود و مەلا نەبییە.
دەبڕۆن و ڕامەمێنن
سەرە تیر و سەرە پەیکان و شیری کالان زێڕین بێنن.
خەزنەدار دەرکی خەزنە ئاواڵە کا، بێتە دەر عەبوتۆپ و مەجیدی و زێڕی سپییە
ئەگەر لە دنیایەدا پشتیوانە و ئەوەش بۆ خەرجییە
دەجا با بچێتە پێش خەزنەخانە قەتارە
قەبزی خەزنەم بدەوە، نەیکەی بە حیساب و بە ژمارە
وەدەرخە: ئەشرەفی و ئاڵتوون و ئەوی سکە لە بیست و چوارە
بەرگێڕەوەیی کەس مەکە، بدە بەفەقیر و دەست تەنگ و هەژارە
زێڕ و زیو لە کن من بەخەشە و بە جەواڵ و بە خەروارە
سوار گەردنی ولاغیان هەمووی دەڵێی گەردنی مارە
بیست و دوو ئالای هەژدیها سوڕەت، با دەی شەکێنێ، دەبێ بە هاوار هاوارە
دەڵێی ئەوی ڕۆژێیە: جەنگی ڕۆستەم و ئەفراسیاب، ئەگەر ڕۆستەم لە پشتی ڕەخش دەبۆوە سوارە
چۆن ئەمن وام لێ هاتووە، بڵێن: ئەحمەد خان چاری بێ چارە.
لێم بە یەخسیر بگرن بەژنێکە باریک و شەدێکی کوڕە کوڕ حوسێنی، ئەگەر دەیبەستی لارە

چاوی خەزاڵ دەڵێی ئەستێرەیە، ئەگەر جار جار دەکەوێتە بن هەوری، جار جار دەڵێن: ها ها! وەدەرکەوت، ئەوە دیارە

جا ئەوە ئەحمەد خان لەشکری ساز کرد. دوو سەد کەسی بەگزادە و باب نۆکەر دەگەڵە.

شاڵی خانە و یاقوب خانە

ئەمجەد و فەرمان فەرمانە

خاترجەم بە، خاڵ جانانە

هەمووی سازە وەک یەکانە

ئەوە عێلی سوورچییانە

خانم و خاتوون و نۆ جوانە

پاک دەستیان کرد بەگریانە

چ قەوماوە لەو زەمانە؟

کێیە لەگەڵ ئەحمەد خانە؟

وا ساز بوو ئاخری زەمانە؟

دڵهێشان و خوێن پڕژانە

دەپسان بەندی لەرزانە

ئارەق دێتە نێو مەمکانە

پیاو دەکەن شێت و دێوانە

بازنە دەشکان لە دەستانە

لەبەر خەم و لە خۆدانە

دە لاقیان کردووە پاوانە

پاک مەتای بە قیمەت گرانە

لەشکر ڕۆیی بە فەرمانە

خانم و خاتوون بە جێمانە

خالق هەر ئەتۆی لەسەر

ڕەبی هەر ئەتۆی لەسەر
دنیات دانا سەرانسەر
کێوت لێ کردنە لەنگەر
هەچی ئیرادەی تۆ بێ، چ بکا بەندەی خۆڵ وەسەر؟
بەیتێکم هاتە سەرزار
قەتم نەکوتووە چ جار.
بۆو بگێڕمەوە ئەوجارە
تۆ شیعرم بۆ ڕەوان کەی، موقەددەری جەبارە
ئەو کارێکی ئەو دەیکا، هیچ کەس پێی نابا چارە
نە شێخ و نە مەلایان، نە پیر و نە ئیختیارە
پێنج هەزار سواری جەنگی، لە پشتی ڕکێف سوارە
چەند کەس تێیدا هیلاکن، چەند دەبن گرفتارە
بارانی مەرگ دەبارێ، هەمووی هات و هاوارە.
خالق هەر ئەتۆی سوبحان
ڕەبی هەر ئەتۆی سوبحان
بەیتێکم هاتە سەرزار، ئەوجار بۆم بکەی ڕەوان
ئەتۆ ڕووزەردم نەکەی، دانەمێنم لە قسان
نەمکەیە سەرکۆنەی دوژمن و دۆست و پیر و جوان
قسمەتی خودای وابوو: کورتە لاسی باڵەکان
بەعینوانی ڕاوێ هات، قسمەت وا بوو ئی ڕەحمان
چەند کەس ئەجەلی هاتبوو، چەند کەس لێی دەبێ بێ گیان
بۆیە ڕێگای لێ گۆڕا، نەچۆوە نێو باڵەکان
قسمەتی هات بۆ ئەوێ، بۆ قەرقەش و شیر لێکدان
قەل و داڵ تا خەنی بن، خوێن بباری وەک باران
دەیلەم دەیلەمی سواران، لەبەر ڕۆژی دڵهێشان.

لاس بێ خەبەر بوو، لەبەر مەستی خەزاڵ و هێندە عاشق بوو، دێوانە بوو. بە سەر عێلیان دادا، هیچ بەشەری خولای دەستی نەکردەوە. خەڵک دەیگوت: سەرم دەرکەم، ماڵ پرسیارە

گە دڵهێشان پەیدا بوو لە عێلی لێ نەقەوماو
چادریان پاکی تێک دان، هەڵبڕان ئاوریشمی خاو
مەڕوماڵیان تێکەڵ کرد، بوو بەکاڕە و قاوە قاو
تۆز بەری عاسمانی گرت، هیچ کەس هەڵی نایە چاو
لەبەر شێلینگی سواران، بوو بەکێشە و بەند و باو
کوا سەرداری ئەو عێلە؟ هەتا لێی بستێنم گیان
ئەو بەخەزاڵی دەگوت: بۆتان دەبمە پشتیوان
دوژمن پێتان ناوەستێ، دوژمن من دەکەم بێ گیان
لە بەرگی پیاوان دایە، یان پۆشی بەرگی ژنان؟
یان وەختی هەڵاتنیە، وەک ئەفراسیاب و پیران
ئەوە جوانی مەرگی بوو، دەستی برد بۆ زنجیران
ئەوە بۆ ڕۆژی ئاخری، پێی قایم دەکا ئیمان
بوو بە باعیسی عالەم: لە بۆ قەتڵ و خوێن ڕژان
خەزاڵ بەیەخسیر دەبەم، قەڵات دانێم لە کەللان
عێلو وا لێ تێک بدەم، بگەڕێن وەکو فەقیران
باب کوڕی خۆی نەناسێ، لەبەر ترس و خۆفی گیان.

دەنگ بڵاو بوو. حەوت پۆڕ چادر تاڵان کران، هەر جێگایەی سەت سەت.

چ وەخت بوو؟ وەختی ئەگەر ڕۆژ لە نوێژی نیوەڕۆیە وەردەگەڕێ
شل و مل و سایە گەردن ئەگەر زولفیان لە مابەینی چاو و برۆیان دەکەنەوە شەڕێ
گە تاق و جووت ڕادەوەستن خاڵ لە کوڵمان وەکو گوڵی سێوەڕێ
ئەگەر هەڵاڵە، عەتری لە مابەینی گوڵی دەگەڕێ
بێری دەهاتنەوە لە بانەمەڕێ.

تەگبیریان دەکرد بە فکر و بە فەرمانە
ئێمە مەڕومالّمان هەمووی چوو بەتالانە
سەبەب لاس و لاسە شۆڕی باڵەکانە،
کێ بێ لە کیژێک ئەگەر نەترسێ لە دای و بابانە؟
ڕاست و چەپی بکا لە گوێچکەی قەیتانە
پێی ببەستێ بەندی گوارانە
دەنگ نەیە لە تۆق و لە تەلەسم و لە لەرزانە
وێک نەکەون یاقووتی عەبدولحەسەن و مەرجان و لەعلی ڕوممانە
نەترسێ لەو ڕۆژەی ئەگەر ئەکەوێتەوە سەر ڕۆژی دڵهێشان و قسانە
ئەو چادرەت دیوە پێشی بەداری عودە و ئەنگوستەکی سەر بەئەڵماس و دوو پەیکانە؟
غەملیوە پێشی خێوەتێ، دەڵێی باغی شەدداده و گوڵ بەخشانە
لە دەرکی خێوەتێ خەبەرێک بەرێ بۆ دیو و بۆ دیوەخانە
هەرچەند خراپە پیاو ببێ بە باعیس و باعیسکاری دڵانە
خەبەرێک بەرێ بۆ خەزاڵ و خەزاڵە شلکە شۆڕی مەلا نەبییانە
تۆ بووی بە باعیسی دوازدە هەزار ماڵ عێلی ڕەمکی و سمایل عوزەیرییانە
تالان بردنە، خوێن ڕژانە، لە دنیایە لە خەڵکی تاڵە دانیشتن و ژیانە
نامەردت کەن ئەلعان وەختی ئیسڕاحەت و ژووانە؟
ئەو کابرایە هاتووە کەس نازانێ دەروێشە، شوانە، گاوانە، گوڵ چنە یان باغەوانە؟
مەتڵەبی خەزاڵە، ئێمەش ماڵمان بچێ بەتالانە.
ئەوە کیژ جار جار دەهات بەوێڵغار و جار جار بەڕۆین و جار جار بەسەد نیمناز و بە ناسەوری
دەیگوت: خەزاڵ ئەبرۆت بەمن بمێنێ بەتیژە پەڕی سەقری
ئەوەی عاشقی تۆیە، بۆ زیندووە و بۆ نامری؟
لە کۆسرەتێ شاڵە بەگیان تا دەچتەوە هەوار خدری

ئاوری دەستی ئەو کابرایە، دوژمن تالآن و ماڵمان لێ وەردەگری.
ئەتۆ هەر خەریک بە عەترت لێ بێتە خوارێ لە وردە خالآن
گژنیژی پەرەنگت بێتە خوارێ لە بازنە و تۆق و تەلەسم و خڕخالآن
ئێمەش ماڵ و دەوڵەتمان با پاکی بەرن بەتالآن.
سبەینێ دەبینی لە زەوی نادا گزینگی پیرە هەتاوە
دوازدە هەزار کچی شل و مل و سایە گەردن هەمووی دەڵێی سومبولە و ئێستا شوبای
شەماڵی لێ نەداوە
دەڵێی شاگوڵی نێرگزە و ئێستا نەژاکاوە
هەموو سنگی دەڵێی بەفری کوێستانە و خوێنی لێ پرژاوە
عالەم هەمووی شێواوە، دەڵێی قافڵەیە و جەردە لێی داوە
ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری دوازدە هەزار سواری گێلانگێسی و سوورچی و
زوراری هێناوە
مەڕوماڵی هەموو تێکەڵی یەکتری کرد، گاڵە گاڵە، قاڕە قاڕە، کاوە کاوە
ئەدی ئەتۆ ئەو کابرایەت لەبەرچی هێناوە؟
هەمیشە دوگمەی سنگ و بەرۆکت بۆ وی ترازاوە
ئەلعانیش ئێمە مەڕوماڵمان قەت بایە دینارێک نەماوە.
پڕ هونەرێک، کارەکەرێک، عومربەرێک دەڵێ: کیژێ دڵت گەرد نەگرێ، تیری
ئەجەل کەس بۆ عەمرت ناوێ
چاوت دەڵێی ئەستێرەی زۆرە و موشتەرییە، تازە دێنێتەوە وردە خوناوێ
ڕەبی تیری مژانگی تۆ وە دڵی کەس نەکەوێ، بەڕوحم بە، تیر بۆ خەڵکی ماوێ
قەتڵی ناهەق کەم بکە، کەمتر دڵی خەڵکی دە زیندان باوێ
ئەگەر تۆ هەڵبەت خەبەر و باسی دنیایەت ناوێ
بەو کەسە بڵێ ئەگەر لە سنگ و بەرۆکت دەبینێ کام و کاوێ

ڕانی ڕکێفێی شکێ، ڕەبی لەبەریەکی بترازێ دەستی لغاوێ
سوڵتان سەید وەقاز تیرەندازی لێ بکا و تیری بۆ باوێ
وەک ئێمەی خستە سەر دوژمنایەتی و کاری قەت نەکراوێ.
دەپێی بڵێن ئەگەرچی دەباران ڕا هەیە و چی دەباراندا نییە
تالان کرا عێلی بەبە و سمایل عوزێرییە
بەتالانیان برد جەڵەبی مەلا داود و مەلا نەبییە
بۆچی خەزاڵ ئاگای لە دەرد و عەزیەتی خەڵکی نییە؟
ئەگەر گوێی لەو حیسابە بوو، هەک کوتی لاس بەزیندەگانی لە دونیایەدا نەمێنێ
حەزرەتی قابیزە - عومرم تەواوە - خەبەری مردنم بۆ دێنێ
یان خەزاڵە لێم زیز بووە و جەرگ و دڵم ڕادەوەشێنێ.
پیرێژنی نۆ جار سی ساڵ زاو دەستیان کرد بەگریان و لەخۆدان و سینگ کوتان، دەڵێن:
ڕەبی دانیشی بەهەناسە ساردی و بەڕەنجەڕۆیی
ڕەبی گول بی، دانیشی بەپەنجەی کۆڵ و بەچاوی شڵەقاو، بەبێ بڕۆیی
ماڵمان تالان کرا، مەڕوماڵمان هەمووی بەتالان ڕۆیی
ئێمە دەبێ دانیشین بەهەناسە ساردی و بەبێ نانی و بەبێ دۆیی.
ڕەبی مردووت لە پێش چاوی بەرنەوە بۆ گۆڕخانێ
تابووتت ببینین، بیهاوێنەوە بۆ سەر شانێ
خۆی شێت کردووە یان ناوێرێ یان بەخەبەر نازانێ؟
ئەوە لاس خەبەردار بوو. ئاخر ئەگەر پیرێژن دەستیان بەچەڵتە چەڵت کرد، عیلاج پەزێری ناکرێ.
بۆم دەرکێشن ولاغێکی ڕەش کوێتی سم تەبەقی گوێ تەڕی عەسڵە بەحرییە
دووسەت تیری لەب سورخی شازدە مشتەیی، عوقاب ڕەنگی، لە قەتڵی نەکردوو لێیان
پتکێ دڵۆپی خوێنییە

حازری بکەن ڕمبێکی عەیزەرانی غەڵفبڕی عەسڵە میراتی فەتاح بەگی کامەرییە
شیرێکی کالان زێڕینی جەوهەری دەڕژێتە سەر عەرزییە
میراتی شا سەلیمە و ئەو لە لا تەنیشتی کەسدا نییە.
لاس دەغەزری ئەگە وایزانی
ئاوری بەربوو لە هەرتک چاوانی
کزە کزی لە جەرگی دێ وەکو بریانی
وەکو شێری بریندار ئەگەر دێتەوە سەر گەرمەلانی
ئەوە پێی دەڕکێفێ دەنا، سوار دەبوو بەعومری ڕەببانی.
عێلی جاف و سمایل عوزێرییە
دووسەت کەسیان، لە عەمری چاردە ساڵەیی زیاتر پازدە ساڵەیی تێدا نییە
دەیانگوت: ئێمە هاوڕێی لاس دەبین، سەر بەبێ ماڵ بۆ چییە؟
هەموو لە خۆیان دا تانوت و هونەرییە
خۆیان غەرق کرد لە ئەسپاب و هاچە و چەکییە
پاکی نێوچاوانی گرژ کرد، هەمووی شێرییە و پڵنگییە.
ئەوە بۆ شەڕێ ساز دەبن. دەردێکیان دەداتێ قەت گورگ بەبێچووە جندۆکەی نەدابێ
جا دەبێ تۆز بگرێ بەری عاسمانە
پێی دادەوێ ئەو حاشییە دانانە
وەکو ئەوێ ڕۆژێ ڕۆستەم، ئەگەر پێی دەڵێن ڕۆستەمی زەمانە
ئەگەر دەچوو بۆ شەڕی کەکی کۆهەزاد لە ئەفغانستانە
ئەوە لاس دەیگوت: دەگەڵ منن، هیچ کەس نەگەڕێتەوە بۆ دواوە
کاری وا پێنج و دوو ڕۆژێکە، هەر پێنج و دوو ڕۆژێک دەڵێن کار قەوماوە
ڕانی ڕکێفێو شل نەبێ، توندی بکەن دەستی جڵەو و لغاوە
دەنگی مەرکەبی دەدا، چاڵ و بڵند و نەوی و زینوی لە پێشی نەماوە
جار جار بەوێڵغار دەڕۆیی، جار جار توندی دەکرد، دەیکردەوە بەپڕتاوە

وەکو ئەو ڕۆژی خەبەریان بەڕۆستەم دا، کوتیان: کەیکاوس نەماوە
ئەوڕۆکە بەند و باو ئی ئەفراسیاوە
لە قسان تەختی مەداییندێ گیراوە
جا ڕۆستەم ئەو وەختی تەمی دەهاتن بەسەر هەرتک چاوە
دەیگوت: کەسێکم لە پێشەوە بڕوا، نووری چاو و هێزی ئەژنۆم نەماوە
ئەمنیش وەک ئەوێ ڕۆژێی ڕۆستەمم لێ قەوماوە
لەوەتی هاتوومە عێلی مەلا نەبییان ئەبەدا ماندووم نەحەساوە
لە لاس داد و فریاد فریادە، لە دڵی ناڵە و قاوە قاوە
پیاو ئەو کەسەیە دوژمن لە پێشی بیتۆقێ زەندەق و زراوە.
هەک نەژیم بەژیانێ
دەبێ لەبەر کەم بەرگی ژنانێ
مەڕوماڵی مەلا نەبی، بابی خەزاڵێ، چۆتەوە بەخەنیمەت و بەتاڵانێ
قەرەسۆرانی بەڵەدی دەگەڵ بوون، سەربڕ ڕۆیین.
پێشی لە لەشکری ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری دەگێڕاوە
دەتگوت گورگە و بێچووەی خوراوە
ئاوازی تیر و شەققەی هانیشک و دەنگی سمی ولاغی وا دەبۆوە بڵاوە،
هێندێک دەیانپرسی: عاسمان ڕووخا یان ئاوە، سێڵاوە؟
ئەو هەیبەتە زەلزەلەیە یان عاسمان ڕووخاوە؟
لەبەر هازە هازی تیر، هیچ کەس غیرەتی لە سنگیدا نەماوە
چل و حەوت کەسی پەڕ بەسەر و گەورە گەورە و ئەختەر و باب نۆکەر و ساحێب
نێوونیشان لەسەر پشتی ڕکێفێ فڕێ دەداوە
دەتگوت ئەسفەندیاری تورکە و دەگەڵ ڕۆستەمی مازندەرانی لێ قەوماوە
ئاخر پیاوی وا ساحێب غیرەت و ساحێب نێوونیشان نییە، پیاوێکی دەست
ڕەشە، لە حاستی وی هیچ کەس غیرەتی لە سنگیدا نەماوە
چۆک داکوتانە، پێشی مەڕوماڵی دەگێڕاوە.

دەبۆوە بەشەڕە ڕمب و بەتیرەندازییە
ڕەبی کەس بەئاوری دەستی لاس نەسووتێ، چومکە عاشقە ئیغیار نییە، خەڵکی
دەترسێ لە ڕۆژی مردن، ئەو ناترسێ و خەبەری لە مردن نییە
زنجیرەی زولفی خەزاڵ بەندی دڵی وی وا قایم کردووە، شێرە، هەژدیهای
جەنگییە.
هەچ کارێکی سەری ڕکێفی و پێشی لەشکری دەگێڕاوە
جارێ چل کەس، یان دەیانگوت کوژراوە یان بەکەمەند گیراوە یان لە بن
پێی ئەسپاندا کەللەی بووە پەرێشان و بڵاوە.
کێ بێ لە مەلا داود و کێ بێ لە مەلا نەبییە
وایان دەگوت بەعێلی کاسەوەندی و سمایل عوزێرییە
ئەگە دەیانزانی لاس وا بەغیرەتە و پیاوی وا لە دنیایەدا نییە
دەیانگوت: واجبە دەست کردنەوە، ئەو کابرایە بۆ ئێمە هاتووە بەپشتیوانییە
خاترجەم بن وەدەستی دەکەوێ فەتح و لەگەڵ شادمانی و خۆشییە
ساز بن بە پانەوە، تازە کاری ئێمە چیدیکەی تێدا بەستە نییە
ئەوە تەواو عێل ساز دەبوو، بوو بەشەڕێک وەک ئەوێ ڕۆژێ ئەگەر ئەسفەندیار و
ڕۆستەم دەکەوتنە مەغلوبە و تیرەندازییە
ئەحمەد خان پرسیاری دەکرد: چ بووە، چ کراوە، بۆ پێشی قلپەی سواران و تالان
و ماڵ گەڕاوە، حالیم کەن بۆچی گەڕاوە؟
ڕۆژی قیامەتییە یان تەرازوو و میزان داندراوە
کێیە و دەڵێی شەهێنە و ئیشتییای لە شەوڕاوە
یانە دەزگیرانی خەزاڵە ئەجەل بۆ ئێرەی هێناوە؟
جا کێ بوو لە کورتە لاسی باڵەکییە
سنگی یەک تەختەیە و پەراسووی تێدا نییە
ڕاستە، لەسەر دوو ڕاستەی ڕکێف و خووانی زینییە
وە پێش سنگی خۆیدا مەتاڵێکی زەردی کودەری عەسڵی میراتی ڕۆمییە

هەژدە زنجیری قەفداری عەسڵی پێستی گەوەزنی گاکێوییە
دەیگوت لەبەر شێلینگی سواران لێم مەعلوم نییە
لەبەر کورمەی مەرکەبان و لەبەر دەنگی تیران و لەبەر بۆنی خوێن ئەگەر دەچێتە سەر عەرزییە
سەردار عێل چاک ناناسم، پێ نیشانم دەن، چومکە ڕۆژی دڵهێشان و گەروو تاڵییە
ئەحمەد بەگی سوورچی دەڵێن پیاوی وا لە دنیایەدا نییە
ئەمن مژانگی خەزاڵم پێیە، هەتا بەو تیرەی دەگەڵ بکەم تیرەندازییە
سبحەینێ خەزاڵ نەڵێ: بەسەهوو چووم، بێ کیفایەت بوو، پیاوەتی بۆ نییە
هەک نەمێنم! خەزاڵ نیگەرانە، خۆشی و شادیانەی لە دڵیدا نییە
ئەمن خەمی ڕۆحی خۆمم نییە، دەترسم خەزاڵ خەمناک بێ و بگری بەدوو چاوی بەنگییە
فرمێسکی بێتە سەر سنگی، هێندێک دەڵێن: دوڕی لاڵە و هێندێک بڵێن: یاقووتە و هێندێک بڵێن: مروارییە و ئەشرەفییە
ئەو فرمێسکە هێندێک بڵێن: بەقیمەت گرانە، ئەتڵەسە، گەوهەرە
بەئارەقی سنگی بڵێن: خێر، ئەوە ئاوی کەوسەرە
ئەلعان لەو شەڕ و لەو جەنگە بێ خەبەرە.
لەو شەڕە زۆر ماندوو بووم، چۆڕێکی لەو ئارەقە دابامایە ئەگەر لە سنگی دەبێتەوە جارییە
لوتفی مەرحەمەت کردبایە، بیکوتبا: شەربەتێک بدەن بەلاسی، لاس زۆر تونییە
جا بۆ من دەبوو بە شانازی و بە زیندەگانییە
چل برینم لە بەدەنی بویایە، بییان کوتبا: لاس بریندار نییە
چون بۆ من دەبێتە ئاوی حەیات ئەو ئارەقە، هەتا زەمانێکی دوور دەگێڕم زیندەگانییە.
عەرزی بەخزمەتت دەکەم پیاوی بێ غیرەت ئەگەر زانی کاری لە پێشە؛ وەخۆ

دەکەوێ. بەجارێک ئەو عێلە دەستیان دا ڕمبی. هەر چۆنێکی بوو ئەحمەد خانیان نەجات دا. فەتاح بەگی زەمبوری و نیزیکەی چوار سەد کەسیان لێ ئێخسیر کرا.

جا لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە و چەندی لە برینە

ئەوە خانم و خاتوونان دەگەڵ خەزاڵ دەگریان، تێکەڵ ببوو گوارە و کرمەک و بەندۆکە

لەگەڵ ڕیشوەی قەرەپۆشینە

تێکچوون هەمووی زولف، وەک سوارە تیپ تیپ و چین چینە

خەزاڵ دەگری، هێندێک دەڵێن: مەلەک ڕیحانە و هێندێک دەڵێن: خاتوو زینە

هێندێک دەڵێن: حۆری بەهەشتییە و هێندێک دەڵێن: خێر، عاسمانینە و پەرینە

کەسێک بیبینێ ئەو زولفە کە داو داوی کردووە، چین چینە

ئەو کابرایە شێت دەبێ، دەڵێن: عاسمانینە

دەیگوت: داخولا لاس ماوە، لە مردن نیزیکترە یان لە ژینە؟

زوو خەبەرم بۆ بێنن هەتا پێشی زنجیرەی زولفان لەسەر کووپەڵەی خمخانە بکەمەوە شینە

زمانم لاڵ بێ، چاوم بەکوێری هەڵێنم، خودا نەکا لەسەر مەیتی لاس بکەمەوە داد و فیغان و گەرمەشینە.

هەچ کەسێکی خەبەرێکم بۆ بێنێ، بڵێ: لاس لە فەتحێ دایە

ئەمن سێ سەد ئەشرەفی دەدەمێ، پێی ڕاببوێرێ ڕۆژگاری دنیایە

لاس بەعیشقی منەوە گیر بوو، دەنا باڵەکینە، میرە، بەگلەرە لە کاولە نوحسایە

دەک هەرتک چاوم کوێر بێ، ئەوڕۆکە چوار ڕۆژە دەنگی ئاوزەنگی و خڕخاڵ و سمی مەرکەبی لاسە شۆڕی باڵەکییان نایە

بەبێ وی نەژیم، خودا بۆم حەواڵە کا دەردی موفاجایە

ئارامی دڵمە، زیندەگانی ڕۆژگارمە، چ بکەم کەسی دیکەم پێ شک نایە

کەسی دیکە بۆ ئاملانی من نابێ، بۆ کەسی دیکە ئەمن نابم دڵ لە ژان و جانفیدایە

کەس وەکو لاسم دە شەوگوردی نایە.

خەبەرداره و کێ بێ لە خەبەرداره

بۆ توندت کردوون، ئاوازت نایە لە کرمەک و گوارە
بۆ وردە گژنیژت بەستوون و خرینگەت نایە لە قەتارە
بۆ لە سەریەکت داناون دوو چاوی بەڵەک و بەخومارە
بۆ مژانگت تاق و جووت کردوون دەڵێی پیادە و سوارە
بۆ داتخستووە دەرکی ئەو دووکانە، سنگت دەڵێی بازاڕ و شارە
ئەحمەد خان شکا و ڕۆیی، چوار سەد کەسی لێ کوژراوە و چوار سەد کەسی لێ بریندارە
لە خودام تەڵەبە لاس بەدوور بێ لە دەردێ لە بەڵایە لە ئازارە
ئەوجار عێلی سمایل عوزێری لەسەر هەموو عاشیرەتان فڕی سوارە.
خەزاڵ دەیگوت: کڵفەتان بڕۆن بۆ دەرکی خەزنەخانە
بۆی بێنن عەبوتۆپ و مەجیدی و مەتای بە قیمەت گرانە
مزگێنی بدەنێ، قسەی ئەوم زۆر پێ لەبە دلانە
بکوژنەوە، خێرە، خێراتە، سەد شەکی یەک ددانە
تا ئەوڕۆ زۆر دەترسام، دڵم حەفسی بوو، ئەوە هاتە دەرێ لە زیندانە
بڵێن بەشل و مل و سایە گەردن، شەنگەبێری، ئەو ناسکە کچانەی مەمکیان وەختی دەست لێدانە
کچ بەکچی باڵی هەیە، دەفڕێ، شل و مل لە خۆیان بدەن لاو و لەرزانە
بەپیر لاسییەوە بچین، ئەو ئەستاندییەوە ئەو مەڕوماڵ و تالانە
سەرم دێشێ، ئەوڕۆکە دڵم زۆر لە هێش و بیابانە
نازانم نە ڕاستە نە بە من لە قەستی دەڵێن ئەو قسانە؟
ئەدی بۆ دەنگی ولاغی لاسم لە بنی گوێیان نایە، کوڕڕەم کوڕڕەمی مەرکەبی، بۆ خۆی ڕاست و چەپ ڕمب باوێژیتە مابەینی هەرتک شانە؟
بزانم سمێڵێکە خورمایی پڕیشکە خوێنی وێ کەوتووە یان ساغە سەلیمە ئارامی دلانە؟
کەسێکی زوو، هەچی زووترە، بڵێ: هاتەوە، خەبەرێکم بۆ بێنێ

جەواهێراتی ملم خەڕاجاتێکە، لە ئەستۆمی دەرێنێ

ئیدی ڕانەوەستێ لەسەر من، لە ئەستۆمی بپسێنێ.

خەبەریان دەدایە، دەیانگوت: بڕوانە سەری کوێستانان ئەوبەرە و بەرە، ئەڵوەند و مۆڵەبەرانان

سوار ببینە وەکو ڕۆژێکی ئەگەر سوار دەبوو لە پشتی ڕکێفێ سانی نەریمان و قارەمان

دەجا ئەمن واجب بوو لەسەرم سنگمی بۆ بکەم بەبازاڕ و بەدووکان

باغی ڕوحەفزای بۆ بکەمەوە وەکو خەرامان

بەڵکو بحەسێتەوە ماندووی، ئەوە هاتەوە لە جەنگ و لە شەڕ و لە عەزیەت کێشان

ئەگەر مانگ هەڵات مەعلوم دەکا لە هەموو دونیایە چومکی شۆقی دەڕوا بۆ هەموو دەور و مەکان

مەلا نەبی بەپیرییەوە چوو، کوتی: ئەوە خەزاڵم پێشکێش کردی، دوژمنی قەویت بۆ نەوی کردم. بەگەرمی پێشوازییان لێ کرد. ژنێک بوو لە قەدیمەوە هەم تایەن هەم سەرسپی هەم تەگبیرکەری خەزاڵ بوو، پێی گوت: خەزاڵ! ئەو دەزگیرانەی تۆ هەتە کەماڵ و جەماڵی یەکترگیرە، دەزانم ڕۆڵە زۆرت خۆش دەوێ، ئەویش بۆ تۆ ڕوحی خۆی وەبەر ئاوردا تا ئەحمەد خانی شکاند و لە هەموو دونیا باسی دەکەن، نسحەتێکت دەکەم بەقسەی من بکە:

مەجومعە ئەگەر خوانی زۆر هاتە سەرێ،

کابرا بۆژۆی لێ دەکا و دەڵێ: وەرن ئەو مەجومعەیە بەرنە دەرێ

خواردن ئەگەر زۆر بوو پیاو پێی نابا هێز و زەفەرێ.

ڕۆژێک دەبێ، خانەخوێی بانگ دەکا، دەڵێ: خۆراک بێنن، لە ماڵێ دەڵێن: کەمەو نییە

کابرا ئەو خۆراکەی زۆر پێ خۆشە و هەمیشە چاوبرسییە

ئیدی هەموو ڕۆژێ بۆی پان نەکەیەوە سنگێکە سپییە

هەموو حەفتان جارێکی دەگەڵ بکە مەرحەبایی و ڕاز و گلێییە

دەرمانی مەرگ گرانە، قاتییە، لە کن هەموو کەسێک نییە

ئەتۆ ئەو دەرمانەی ئەگەر خۆتی لێ ون کەی و هەموو ڕۆژێ نەچییە کنی بۆ دیانەتییە.

ئەو دنیایە، ئەو خاکە، پڕ لە جوان و جوانمێرە

لە عالەمی عەدەبدا، حەفتەی جارێکی لە دوو بنێرە

چاوێکی بۆ بکە بە مانگ و چاوێکی بۆ بکە بە ئەستێرە

قەرە زولفێکی بۆ بکە بەگیابەند و خاو، یەکی بۆ بکە بە کەنێرە

هەموو ڕۆژێ با پەنجەی ڕاو نەکا لەو مەمکی ناسک و لەو سنگە زەنوێرە

ئەوە شێری لە لانێیە، ئەو هەمیشە بەباغی گوڵان فێرە.

مەکە وەکو بولبولی تونی، هێندە عاشقە هەمیشە گوڵ دەکا گێرە

کەسێکی عاقڵی بەکارێک نەشکێ نسحەتی خێرە.

ئاخر مانگ بوو، گە دێتەوە وەختی ئاخر مانگی بەهارێ

لە جێگای لانووا و فێنک عەتر لە گوڵان دەبارێ

شکۆفەیان داوە گوڵی هەنجیر و، تێکەڵ بوون دەگەڵ گوڵی هەنارێ

وەختێک بوو، هاتبووە وەختی فێنکی ئێوارێ

ئەگەر لاس هاتەوە گوارە و کرمەک و گۆ و قۆیتاس بە سنگی خەزاڵدا دێنە خوارێ

وردە وردە و فێنک فێنک ورینگەی نەبات و ئاوازی عەتری لە کوڵمانی دەبارێ

بەکەیفە، زەردەخەنەیە، دەقاسپێنێ وەکو کەوی لانسارێ

خانم و خاتوونان دەگەڵی هاتن، تێکەڵ بوون سوور و سپی و توتوفحە(؟) و سیمین عوزارێ

ڕۆژی ئەوەیە کەسێک بچێت بۆ دیتن، خەمناک بێ، دەردەدار بێ، ئەو دەردە چیدیکەی نەداتەوە ئازارێ.

ئەوە خەزاڵ بەندێکی بانگ کرد:

سوارەکەی هاتوویەوە لە سەفەری هات و نەهاتییە

دەک سەری منت ببێتەوە بەقوربانی ولاغێکی ڕەش کوێتی سم تەبەقی عەسڵە شێر خەزاڵییە

سەحاتێک دەبێ بۆ منیان هێناوە شادیانە و مزگێنییە

ئەتۆ هاتوویەوە بەفەتح و نوسرەت و خۆشییە
دوژمنت بێ ڕوحە و لە حاستی تۆ ڕوحی لە قالبیدا نییە
ڕەبی عومری منت بگەڕێ دەسەرییە
دنیا، ئەگەر پیاو دەستبەسەر بێ، هیچ نییە
ئۆخەی وەدەستی من و تۆ کەوت شادمانی و ئازادییە
دوعام بۆ نەکردی، کوتم: کۆمەگتە چل سوارەی غەیبییە
بۆ خۆم لەوێ نەبووم ئەما ڕوحم لەسەرت وەک تەیری تیژباڵ دەگەڕا بەقاسیدییە
ئەتۆ لە شەڕێ دابووی، ئەمن دانیشبووم بە زیزی و بە خەمناکییە
ئەوەی تۆ کردت لە تاقەتی هەموو کەسدا نییە
ئۆخەی ئاوی حەیاتم، وەگیرم کەوت زیندەگانییە
ئەگەر دەڵێن خەڵک مردووە، ئی وا هەیە زیندووشە، زیندەگانی بۆ نییە
چومکە ڕوحی گیراوە، زیندانییە، حەفسییە
ئەوە ئەوجار وەگیرم کەوت خەبەری تۆ بەئەسەحییە
ئاوی حەیاتم حەسامەوە، بۆ من بووی بە شەربەت و بە کانییە.

ئەوە بەسەت ڕێز لێگرتن هێنایانە ژوورێ، پێشی شەرم بوو زۆر دەگەڵ خەزاڵ قسە بکا. چادرێکیان بۆ هەڵدابوو، لەسەر هەشتا ئەنگوستەکی سەر بەئەڵماس دەسووڕا، جا ئەوە لاس هاتە ژوورێ. سمایل عوزێری و کاسەوەندی هەموو هاتن بۆ دیتنی لاس. هەتا هەفتەیەک لەبەر ناڵە ناڵی سواران و لەبەر دابەزینی کوڕە کوڕە و یەکە یەکە و گەورە گەوران کەس ئاگای لە کەس نەبوو.

ئەوە لاس ناسیاوی لە هەموو تایەفە پەیدا کرد و قەبووڵیان کرد بەسەر عێلی ئەوان ڕابگا و ئاگای لێیان ببێ، لەبەر ڕۆژی قرقەش و گێرە و دڵهێشان، با دوژمنی زۆردار بەسەریاندا زاڵ نەبێ.

ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری ئەگەر چۆوە، بەو حاڵە داخیلی عێلی خۆی بۆوە، پرسیاری کرد:

ئەمن قەت بەعومری خۆم وام نەدیوە و وام لێ نەقەوماوە

وا پێشی لەشکر و قۆشەنم لێ نەگیراوە
ئەو کابرایە، سانی نەیرومە و سەری لە خاکێ دەرهێناوە
یان ڕۆستەمی مازندەرانە و لە زیندانی شوخاڵی گەڕاوە دواوە
یان تەیموری دێوبەندە و پەنجەی لە تیری کێشاوە
یان ئەفراسیابی تورکە لەسەر خوانی زینی مەرکەبی ڕەش ڕاوەستاوە
پێشی شەش هەزار سواری سوورچی و زوراری چلۆن گێڕاوە
دەستوبردی ئەو کابرایەم وا دی، تیری هیچ بە خەسار نەداوە
پڵنگ و شێری دەشت و کێوان هیچی لەو ئارامە و لەو مەڵبەندە نەماوە
دەبێ ئێمە بەفێڵ ئاقڵی پوختی بکەین خاوە
ئەگەر بێ عاقڵی نەکەین، ئەو کابرایە شێرە و بەتەنافی هیچ کەس ناگیرێ و نەگیراوە
مژانگی چاوی خەزاڵ وا لە دڵی دراوە
ئەو نازانێ ترس چییە، ئەگەر خولا مردن و کوشتنی بۆ ئۆمەتی خۆی داناوە
جا تەگبیرکەران تەگبیرێک بکەن بە چ جۆرێک بیهێنینە سەر کوشتن و داوە
کوڕە نامووس زۆر شتێکی گەورەیە، ئەو سەحاتە ئەمن هیچ نامووسم پێ نەماوە
یەکێک نامووسە بۆ من، دەڵێن: خەزاڵی لێ هەستاندراوە
یەکێک شۆرەتە، دەڵێن: چوار سەد سواری لێ کوژراوە
جا ئەگەر تەگبیرێکم بۆ نەکەن، ئەمن سەرم لەو کارە مەحتەل ماوە
لە ماڵە کوژراوان گریانە، شینە، واوەیلایە، چەند کەس شان و ملی دەقوڕێ ناوە
هیچ کەس لەبەر داد و واوەیلا ئاقڵی دەکەللەیدا نەماوە
ترسە ترسە، ڕۆ ڕۆیە، گریانە، بناغەی خمخانە داندراوە
مەرکەب هەمووی لە مەیتەرخانە پاش بەند و پێش بەند کراوە
ئافەرین لە ئازایی لاس پاکی کلک و یاڵی لە خمێ نراوە
مەگەر ئەو ڕۆژەم پیاوی وا دیبێ، ئەگەر دەڵێن: ڕۆستەم لە ڕودابە خوڵقاوە.
ئەوە پێ چوو پازدە شەو بیست شەو، لاس شەوێ سێ کەڕەت ڕادەپەڕی لە خەوێ

بەحەسرەتی خەزاڵەوە.

سبەینێکی خەزاڵ بیست و یەک کڵفەتی داو و دەلینگ حاجی حوسێنی نۆ ڕەسیدەی ساز کرد. کوتی: گوڵی سبەینان، پێش تاو هەڵاتێ، دەبێ ئێمە بچین عەتری لێ بگرین. ئەوەندەشی زانیبوو لاس کوتبووی: وەڕەزم، دەچم بۆ ڕاوێ.

لاس ئەگەر بەوێدا ڕۆیی و چاوی بە خەزاڵ کەوت، ئەبەدا خەزاڵ نە تەماشای کرد نە خۆی تێگەیاند. نسحەتی پیرێژنی نۆ جار سی ساڵ زاوە. لاس زانی خەزاڵە و حەمییەتێکی پێ نەدا جا دەڵێ:

بریا من ئەنگوستیلەیەکی قەف ئاڵتوونی سەر ئەڵماس بوومایە

وردە وردە خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییان گوڵی پێ چنیبامایە

جار جار لەسەر پەلکی گوڵان بوومایە

جار جار وە عەرزی بکەوتمایە

بیزانیبا قوڕاوی بووە ئەو ئەنگوستیلەی بەقیمەت، جار جار خەزاڵ لە لاجانگی بخستایە.

بریا بەرهەڵبێنێک بوومایە بیخستمایەتە سەر ئاڵ و واڵە

گرێی بەرهەڵبێنەی توند بکردبایە لەو قەدە شمشاڵە

ئارەقەی بکردبایە، جار جار بەرهەڵبێنەی هێنابا سەر ئەو خەت و خاڵە

جار جار هەڵی کوشیبا بە لکی بەرهەڵبێنە دوو چاوی کاڵە

جا ئەو جار سەری هەڵێنابا بیکوتبایە: ئەو سوارانە چن هەمووی بەگورز و بەشیر و بەمەتاڵە؟

بیزانیایە ئەگەر ئەمن لاسم، ڕاو هیچ نییە، ڕاو بەتاڵە

دڵم بۆ خەزاڵ ماندووە، وا دڵم هیلاک و عەبداڵە

شەو و ڕۆژ دڵم لە فکردایە، لەبەر دڵانمە، هەمیشە ئەوم لە فکر و خەیاڵە

نێوچاوانی دەڵێی هەوری بەهارێیە لە من بۆتەوە تاق و جووت و گەواڵ گەواڵە

بیست شەوە لێت بێ خەبەرم، بۆ لێم ناپرسی حاڵ و ئەحواڵە؟

هەیاران بڵێ: ئەوە شوانە یان فەقیرە یان گەدایە یان عەبداڵە

نازانی من دڵم زۆر لە هێشە و زۆر لە ژانە و زۆر لە ناڵە ناڵە؟

هەمیشە مەستم، ئیغیار نیم و خۆراکم لە زاری تاڵە
ئارامی دڵەکەم، چەپکێکم لەو گوڵانە بۆ بکە حەواڵە
تا بۆنی ئەو گوڵە ببێ بە بژیوەی دڵم، بەسەر ڕاو بڵێم: ڕاو بەتاڵە.
خەزاڵ سەری هەڵ نەهێنا، ئەوە نسحەتی پیرێژنە، کوتی: با چاک لە پێش چاوی شیرن بم.
لاس کوتی: بریا ئەمن کراسێکی کیمخوای تەنەک ڕەنگی موشەجەجەر بوومایە
سبحەینان خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییان لەبەر خۆی بکردمایە
جا لەسەر ئەوەوە گم گم و خاتر و(؟) پەرێشانی بکردبایە ڕیشوە سایە
ئەوەندە حەسرەتەم نەبردایەتە بن گڵی، بیکوتبایە: ئاخر دنیا لاسی تێدایە
نەختێک زگی پێم بسووتابایە، بیکوتبایە: عاشقە، شێتە، موفتەلایە
بۆ سەری هەڵ ناهێنێ بزانێ ئەمن چم لە دڵی دایە؟
هیچ سەری هەڵ نەهێنا ئەبەدا خەزاڵ. لاس ئەوە بەندێکی دیکەی بانگ کرد، کوتی:
بۆ نابی بەتیرەنداز، تیرێکم بدە لە جەرگییە
جەرگی منت بڕیوە و بۆ خۆت ئاگات لە دەردی بریندار نییە
هەڵبەت دەڵێی پەشیمانم، وا لاست لە کن مەتڵەب نییە
ئاخر من زگم بەخۆم دەسووتێ، هاتوومە ئێرە بەغەریبییە
نەتبیستووە «کەڵ بەمەوتەن شەڕ دەکا» خۆ ئێرە مەوتەنی من نییە
لەگەڵتن بیست و یەک کڵفەتی پانیە خڕی داو و دەلینگ حاجی حوسێنییە
عومریان چاردە ساڵانە، هەمووی دەڵێی پەرییە و حۆرییە
گەورەی وان ئەمنی شێت کردووە، گەردن کەشانە و چاو بەنگییە
شۆڕابەی سایە و لەعلی ڕوممانی جار جار دێنەوە سەر سنگی و جار جار دەچنەوە سەر عەرزییە
دەڵێی لەشکری سوڵتان عەبدولحەمیدە، فەرماندارە و والییە و ئەفەندییە
گەردن کەچە و یاقووتە و ئەشرەفییە و زێڕی سپییە
بەقیمەتن لەبەر دڵی من، خشڵی وا لە گەردنی کەسدا نییە

ئەمن قەتم بە تۆ نەگوت وا بەعینوان بە و لە دڵم بکە تیرەندازییە
لێم ببێت بەئازار و بڵێن: دەرمانی لە کن کەس نییە.
سەری هەڵ نەهێنا، لاس نەختێک لەوەیدا تووڕە بوو. ئەوە لاس دەڵێ:
کیژێ، کیژی کێیە؟
هەڵبەت ئەمنت بەمەجرووم داناوە و خۆت بە لەیلێیە
ئارەقی سبحەینێت هاتۆتە سەر کوڵمێکە زەردە بێیە
دەڵێی مەلەک ڕیحانی مزگێنی خاتوو زینت پێیە
ئەمن دەگەڵ تۆمە، جواب نادەیەوە، دەنا گوێت لێیە.
کێ بوو لە لاس و لە لاسە شۆڕی باڵەکییە
چۆن بەقای ژنان وایە؟ هیچ شەرت و شوێن و بەقات نییە
ئەمن بۆ ژنێک لە دڵی خۆم ناوێژم خەم و خەمناکی و نیگەرانییە
ئەمن ئەوە ڕۆییم، خوداحافیزیشم لەگەڵت نییە.
خەزاڵ وەکو ئاوری تێ بەردەی ئاوا بوو. خەزاڵ بانگی دەکا:
ئەرێ سوارەکەی سوار بووی لە وڵاغێکی ڕەش کوێتی مەحکەمی
خۆزگەم بەو کەسەی ڕۆژێ دوو سەعات دەمت دەنێتە نێو دەمی
بەڕاسانت دەڵێی زۆرابی ڕۆستەمی
نازانم ئەتۆ نە پەروانەی و نە شەمی
نە ئاوی حەیاتی و نە ئاوی زەمزەمی
بۆ وا زوو قەڵس بووی ئەتۆ؟ ئارامی دڵەکەمی.
لاس ڕۆیی، ئەوە خەزاڵ وەدوای کەوت. خەزاڵ دەڵێ:
بریا ئەمن دیوەخانێک بویایەم
بەرەو قوبڵە شوعرەی[1] منیان بکێشایە
پەنجەرەی سێ دەرییان لە پێشی من لێ بدایە
ئێوارە و سبحەینان لێی بدرایە شوبایە

(١) شوعرە: شوورە، دیوار. «ف. خاڵ».

کەسێکی ماندوو بوویایە و عێجز بوویایە
بیکوتایە ئەوە جێگای ئیسڕاحەتگایە
لاس و کورتە لاسی باڵەکان لەو دیوەخانەی میوان بوویایە
گەردنم بۆ دەکرد بە بەیداغ، قەڵغان و مەتاڵی لەوێ دانابایە
بیکوتبایە: زۆرم پێ خۆشە ئەو ئیسڕاحەتگایە.
ئەوجار، هەر ڕۆیی، نەگەڕاوە. خەزاڵ بانگی کرد، کوتی:
سوارەکەی چۆل و بەڕییان، لێی ناگری وچانە
لەبەرت دایە خەنجەرێکی جەوهەر ڕێژی عەسڵە دەببانە
هێندێک دەڵێن: کاری وەستا خدری میسرییە و هێندێک دەڵێن: خێر قەرەخۆراسانە
چەپکێکت پەڕی تاوس لەسەر ناوە گەواڵ گەواڵیانە دەگەڵ هەوری دەعاسمانە
مەرکەبت وەها توند کردووە نرکەی دێ وەکو یەکانە
قەراری عاشقان ئەوەیە لە پێشدا ناز و نیم ناز بکەن، جارێک بەخۆشی و جارێک لە یەکتری بگرن بەهانە
جارێک قسەیان لێک هەڵبەزێ و جارێک دەست بنێنەوە نێو مەمکانە
ناڵێن: مانگ و نیوێک پاییز چوو، دەڵێن: مەڕ وەختی ئەوەیە و بەران تێبەردانە
خۆ شەک بۆ بەران ڕاناوەستێ، شوانان دەیگرن، نایەتە گیرانە
کەو ئەگەر عاشق دەبێ، مێیەکەی ناچێتەوە سەر هێلانە
هەرتک لایان دەخوێنن، ناز و نیم ناز و گفتوگۆ ئارامی دڵانە
زۆر خۆشە ئەو گفتوگۆیەی جار جار دەبێتە ڕاز و گلێیی و قسە بەزۆران دانا
پیاو نەشەی کەللەی دەبزوێت، دڵ دەکەوێتە تەکان دانە
ڕوح دەبزوێت، دەکاتەوە جووڵە و جۆلانە
ئەمن بێ عاقڵیم کرد، ئەتۆ بێ حەوسەلەی، لە تۆ وایە ڕۆژی دەست لێک بەردانە؟
کوڕە وەگەڕێ، هەزار جار دەستی منت ببێ بە دامانە
با لێمان حاڵی نەبن دۆست و دوژمن و بێگانە.

ئاشقی وا خۆشە، جار جار کابرا دەستی بێنێ و کیژ لەبەر دەستیدا خۆی ڕابپسکێنێ
بەوە عیشق دەبزوێ، جەرگی پیاوی دەسووتێنێ
کەللەی عاشق نەشە دێنێ
هەتا باڵندە تا سوورە قورینگ ئەگەر دەنیشێ لە دەم شەتاوان و لە دەم بیستێنێ
ئەگەر ماشوقەی خۆی بەسەریدا دەناڵێنێ و دەخوێنێ
ئەوە نازە، جار جار باڵی خۆی دەلەقێنێ
دەفڕێ، لەو جێگایە نامێنێ
ئاخیری بەسەت ناز و نیم ناز مەڕامی دڵی خۆی و کامی خۆی دەستێنێ.
بۆ لە تۆ وایە دووکانی حەتارییە، ئەتۆ بچی، بڵێی: کڕیارم
ئەو بەعزە شتومەکەم بۆ بێنە، ئەمن ئەوە لەسەر پووڵ ئەژمارم؟
ئەمن گەلێک لە تۆ زیاتر چاوەڕێ و دڵ بریندارم
ئاشقێنی پێی دادەوێ، دەبێ لە شەوگوردی بکشێی ئەرێ یارم.
پێم وایە ئێستا ئەتۆ بەڕاستیت نییە، لەسەر شکی
بۆ لە تۆ وایە عاشقێنی جوانوماینی زین کراوە پێ لە ئاوزەنگی نێی و خۆی باوێیە سەر پشتی
ئێستا گزینگ لەسەرانی نەداوە، هاتوویە سەر ئەمن بەهەناسەبڕکە و بەکوشتی کوشتی.
عەزیزم، ئارامی دڵەکەم، ڕێی خۆی هەیە، بەمیهرەبانی
دەبێ بێیەوە جێگای جێ ژوان و قسەی نیانی
خۆ ئەمن گەدایەک نیم، ئەمن خەزاڵە شۆڕم، با هەموو کەس بەسوڕی من و تۆ نەزانی
هەتا جانەوەر دەبێ بۆی چۆل بێ سەراو و دەراوی کانی
ئاخر بولبول عاشقی گوڵە، تێنەگەیشتووە و هیچی لە دنیایەدا نەزانی
لە هەوەڵی ئێوارێوە دەخوێنێ تا دەکەوێتەوە بەری بەیانی

وەختی گوڵ دەپشکوێ، بۆنی گوڵی وەگیر کەوێ، ئەو حەلە خەوی لێ دەکەوێ،
بۆنی گوڵ دەکەوێتە دەستی شوبایە زریانی.
ئەو کارە بەعاقڵ دەبێ، هەزار جارت سەری من ببێتەوە بە قوربانی پەنجانە
ئەگەر سوارە دەبی لە مەرکەبی شێر خەزاڵی، بەدوور بی لە دەرد و لە بەلایە، لە قسانە
بەشان و شەوکەت ڕۆستەمی مازندەرانە
بۆ شۆخی و جوانی وێسپی کەنهانە
ئەمن جووتێک شەمامە و شەمامە ڕەنگینم لە بن کراسێکی مەحمەڵ دارایی دانا
قسمەتی کەس نییە، بۆ تۆم ڕاگرتووە بەئامانەتی و کردوومە بە پنهانە
زۆرم پێ مەگرە سەرگەل و بن گەلی مەڕی، زۆرم حوکم لێ مەکە بۆ چاوپێکەوتن و بۆ جێ ژووانە
نە ئەتۆ سووک بی لە پێش چاوی خەڵکی، نە من خەجاڵەت بم لە دای و بابانە
هەنگوین وەختێک خۆشە ئەگەر زۆرت ئارەزوو بێ، بیبەیە سەر لێوانە
وەختێک ئاو خۆشە تونی بی، جەرگت پڕ لە هالاو بێ و دەروونت بێتە سووتانە
بڕۆ بەئەسپت بگرەوە وچانە
بۆ خۆت ئیستیڕاحەت بکە و بخۆ پارووێک نانە
دیتنی خەزاڵ بۆ تۆ هاسانە
لە دڵی خۆتی نەکەی بەحەسرەت، بڵێی: بۆ من گرانە
خاترجەم بە بۆ هیچ کەس بەئیلتیفات هەڵناهێنم گۆشەی چاوانە
بەوەختی خۆی سنگمت بۆ دەکەمە باغی نمرود، قەرە زولفت بۆ دەکەمە ڕەشەڕێحانە
لاجانگت بۆ دەکەم بە شەم، دەجا تۆش ببە بە پەروانە
دڵت بۆتە چەقەنەی ئاشی، دایمە هەڵدەبەزێ و خۆ لە ئاشدانە
ئەو کەسە گۆ لە مەیدانێ دەباتە دەرێ ئەگەر بەحەوسەلە و بەوچانە
خاترجەم میراتی تۆیە بەژنێکە باریک و خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییانە

ئەمن چۆن لە بیرم دەچێ دوژمنێکی قاتڵی خانەوادەی، گەورە و گرانە
بە دەستی تۆ چوار سەد سوار شەهلییار و کوڕڕە کوڕڕە و یەکە یەکە بوونەوە بە بێ گیانە
ئەلعان مەنشوورە لە ئێران و لە توورانە
خەزاڵ بۆ لاسە شۆڕی باڵەکان دەزگیرانە
ئیدی لازم ناکا ئەو دڵتەنگی و دڵت کەوتۆتە تەکانە
هەزار جار سەری منت بێتەوە بە قوربانە
گنجت هاویشتۆتە نێوان هەرتک چاوانە
کەم کەس دەڵێن لاسە، دەڵێن: سانی نەریمانە
وچان بگرە، لە کیست ناچێ دوو چاوی بەڵەک و کیژی مێهرەبانە.
لاس کوتی: بەقسەی خۆش لە لەبزت دێتە دەرێ عەتر و شووشەی گولاوێ
کەم بەو ئەبرۆیانە تیرم بۆ مابەینی جەرگ و دڵان باوێ
پاش دوازدە ساڵی دیکە تەشەن دێنێ، لە جەرگم دێنێ خوێن و زوخاوێ
وەڵڵاهی من خەیاڵی ڕۆینم بوو، بەزەردەخەنەی لێوت و بەمژانگی تیری ئەبرۆت لێت شل کردووم هەنگاوێ
چاوت بەمن بمێنێ بەئەستێرەکەی ڕۆژێ ئەگە تازە هەڵدێ پڕیشکان داوێ
بەژنت بەمن بمێنێ بەچووزەی پیرە لاولاوێ
سبحەینان تاو لێی نادا گوڵی لاولاو گەشە، نیوەڕۆیان هیچ کەس لێی نابینێ کام و کاوێ
قسەی تۆ کاری کردووم لە جەرگ و لە هەناوێ
پێم وایە خاک و گڵی ئێرەم بەقسمەت بووە، لازم ناکا ئەو ناز و نیم ناز و زەردەخەنەی تۆی پێ ناوێ
بەو قسەی ئەگەر جوابت نەدامەوە، لە دڵت هاویشتووم ژان و هێش و کاوە کاوێ
پازدە شەو بوو ولاغم نەهێنابووە دەرێ لەخاوێ
هەوەڵین ئارەزووم دیتنی تۆ بوو، لە دوایە بچم نەرمە نەرمە بۆ خەمناکی خۆم

بکەمەوە ڕاوێ.
کوتی: دەگەڵ تۆمە لاس و کورتە لاسی باڵەکییە
سەری منت بێتەوە بەقوربانی سەرییە
مەچۆ ڕاوی کەروێشکان، ئێک ڕیخۆڵەن و گرتنیان لە بۆ نییە
لە دوای ئەوان خۆت ماندوو مەکە، بچۆ ڕاوی شەنگەسییە.
ڕاوی کەروێشکان مەکە، ئێک ڕیخۆڵەن و گرتنیان لە بۆ نینە
ولاغێکە ڕەش کوێتی شێر خەزاڵی کەفەڵ پانیان لە دوا مەپسینە
بچۆ، لە دەشتەکەی خورمالغ و سیکەنە و سەر خان و چیایە مەغلوبییان خاسە
کەوی لێن، باڵێک دەفرن و دوا باڵ فرینیان بۆ نینە
دووان لەوان بگرە، تۆ خەم و پەژارەی خۆتیان پێ بڕەوینە.
گراویە بابم! ئیشتییات لە ڕاو نییە، ئەو قسەیە قەت بۆ تۆ ناکرێ پینە
ڕاوی کەو و کەروێشک و جەیران و ئاسک و ئاهو بۆ تۆ چییان تێدا بەستە نینە
ئەگەر حەزێ دەکەی دڵت بحەسێتەوە، سمێڵت لەسەر کوڵمێکە ناسک بکەوە بە پەرژینە
ئەو حەلی ئەتۆ ببەوە بە کاکە مەم، ئەمن دەبمەوە بە خاتوو زینە
دەستێکت داوێمە سەر ملان و، باسکی چەپەت بۆ دەکەمەوە بەسەرینە
ئەو وەختی کام و کاوی خۆت ببینە
با مەڵحەمی وێ بکەوێ، لوقمانی بێتە سەری، عیلاجی بکرێ ئەو برینە
ئەمن لە تۆ بریندارترم ئەما وەکو تۆ بەپەلە و شێت نیمە.
لاس دەڵێ: غەریبم خەزاڵ، خانەوادەی من لە کاولە نوحسایە بەجێماوە
ئەو تیرەی ئەگەر ئەتۆ لە جەرگی منت داوە
قەرە زولفت بەمن بمێنێتەوە بەقۆیەنی وەنەوشەی ساوا
کوڵمەت بەمن بمێنێ بەشەمامەی وەردێ، بای شەماڵ تۆزێکی تۆز وەسەر داوە
سنگت بەمن بمێنێ بەتەختی خونکاری، مەجلیس ئاوەدان بۆوە، تازەیان ئەو تەختە داناوە

چاوت بەمن بمێنێ بەئەستێرەی بەیانی لە پێش مەلای ماوەراندا ئەڵڵا
ئەڵڵا و نەسرومینەڵڵای داناوە
کاری خولایە، هونەری تۆ نییە، دڵی من ڕەگێکە لە بەدەنی تۆ هەڵکشاوە
وات جەرگ بڕیوم، لێت شل کردووم هەنگاوە
لەو ڕۆژەوە ئەگەر ڕووحی لاس و لاسە شۆڕی باڵەکان خولقاوە
خودا ئەو تەرکیب و ڕووح و بەدەنەی بە من داوە
دایکم لە مەملەکەتی کاولە نوحسایە مەمکی لەسەر زاری من داناوە
ملک و ماشم لە پێش چاوی کەوتووە، وات شل کردووم هەنگاوە
ئەو تیرەی ئەگەر لە کەلەکەی ڕاستەمت داوە
نەهاتۆتە دەرێ، ئێستا لە مابەینی گۆشت و پێستدا ماوە
زۆر ساحێب عاقڵ و عیلم بووم ئەو عاقڵی پوختت لێ کردووم خاوە
ئەو سەعاتە هەچەند تێ دەفکرم، کەڵکی پیاوەتیم بۆ هیچ جێگایەک نەماوە
قەرە زولفی تۆ بووە بەزنجیر، دەست و لاقم بەزولفی تۆ زنجیر کراوە
جا لازم ناکا، ئەوەی مەرامی دڵم بوو ئەوە تەحویلی تۆم داوە.
لاوە قەستەم بەوەی کەم نە لە گوێن کەسە و کەسی لە گوێن نییە
ئەو ئەزەلییە و ئەو ئەبەدییە
مابەینی من و تۆ قەڵەمی هەق دەستی ئیلاهییە
گراویە بابم ماڵە تۆیە دوو چاوی بەنگی و سنگێکە سپییە
با خەڵک نەڵێن لاس شێتە یان حەواییە
تیری لە جەرگی دراوە یان بەنگییە
دەست باوێژە مابەینی سنگ و بەرۆکان با بچی دابنیشی بەخاترجەمی و بەئاسوودەییە
با دڵت بەس بکاتەوە هاوار و ژان و بەیدی بەیدییە.
لاس دەیگوت: شەربەتێکم لە کوڵمەت بدەیە، با بۆ من ببێت بەدانیشتن و بە خاترجەمییە
نەبادا خزم و قەوم و کارم بڵێن: لاس بێ عاقڵە و هیچ عاقڵی نییە

خەزاڵ ڕایگرتووە وەک قەرە سۆران، پێی دەکێشێت کێشکی عێلی مەلا نەبییە.
وەرە کیژێ مەرزینگان لە کوڵمێکە ناسک ماچێکم دەرێ
خەڵکی لە قیامەتێ بەهەویایە، با من لە دونیام وەگیر بکەوێ قومێک ئاوی کەوسەرێ
ئەو تیری لە جەرگت داوم با برینی سارێژی بێ و لە جەرگم بێتە دەرێ
با بشکێ ژانی ئەو برینە، نەمێنێ ژانی خەنجەرێ
دنیا هەر ئەو سەعاتەیە پیاوی تێدایە، جا دوایە هەرچی بەسەرم دێ با بمهێتە سەرێ.
خەزاڵ دەیگوت: ئێرە جێی ئەوە نییە، ئەوە سەحرایە
ماڵ خراپ دڵت هێندە شێت و دێوانە و شەیدایە
هەچەند پێشگیری دەکەم عیلاجی ئەو دڵی بریندارت نایە
قەستەم بەوەی کەم ئەگەر بێ مەکانە و لایەزالە و ئەگەر خودایە
بەخوێنی حەسەن و حوسێن ئەگەر شەهیدن لە دەشتی کەربەلایە
قەستەم بەحەزرەتی نوح ئەگەر ئەو نەبییوڵڵایە
با بچینەوە چادر و چیغ و جێگای ئیستیڕاحەتگایە
ئەتۆ هەڵۆی، خەزاڵ کەوە، مەترسە لە دەستت هەڵنایە
دەنا ئەلعان خەڵکی بەغیلیت پێ دەبا، دەڵێن: ئەوی گفتوگۆی دەگەڵ خەزاڵ ببێ گەدا نییە و شایە
برۆ خاترجەم بە خەزاڵ ئەنگوستیلێکی زێڕە و دەقامکی لاس دایە.
جا ئەوە لاس لە خەزاڵی دەکردەوە خوداحافیزییە
دەیگوت: ئارامی دڵەکەم! ڕاوت پێ بەتاڵ کردم، ئیدی چیدی ئەو سەعاتە ئیشتییام لە ڕاوێ نییە
کە چوومەوە چاوەڕێی تۆم گە بۆم بنێری قسێکی بە ئەسەحییە
چومکە شێتم، عاشقم، هیچ ئاگام لە خۆم نییە
وەکو مرخێکی دەقەفەزی دەکەن چاوەڕێی دانە و تونییە و برسییە
چاوەڕێی لاسیش بەژنێکە باریک و کوڵمەیەکی مەڵحەمییە

خوداحافیز، ئینشەڵڵا دادەنیشین بەخۆشییە.
ئەگە خەزاڵ لە پشتەوە تەمەشای دەکرد و لاس دەگەڕاوە
وەک سوڵتان سەید وەقازی تیرەنداز و لەسەر دوڕاستەی ڕکێفێ ڕاوەستاوە
خەزاڵ، تونی بوو، بۆی دەبوو بە جامی شەربەت و بە بەفراوە
خودایە بەقیسمەتی وی کەی بەژنێکە باریک و دوو چاوی کاڵ و زولفێکی خاوە
ئەڵڵاهوممەسەللی عەلا محەمەد سوبحانەڵڵا، پیاوی وا کەمتر خوڵقاوە
بەینەڵڵا زۆریشی عەزیەت و عازاب و سەخڵەت و ساغاوی لەسەر خەزاڵە شۆڕی
مەلا نەبییان کێشاوە
لە پێشدا جوابم کرد و گەڕاوە
لە دوایەدا بەزەردەخەنە و بەکەماڵ و مێهرەبانی دڵخۆشیم داوە
بەوەی چا بوو بەقسە و گفتوگۆی شیرن ماندووی حەساوە
قسەی ناخۆش تیرە، ئەگەر کەسێکی ئەو تیرەی لە جەرگی دراوە
ژانی ئەو تیرە ناشکێ ئی قسەی ناخۆش هەتا دەڵێن: ئەو کابرایە ئەوە سەری
وەبن بارستی گڵی ناوە
چا بوو بەمێهرەبانی ئەوە قسەی خاترجەمیم بەوی داوە.
کێ بوو لە خەزاڵ و لە خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە
تام خۆش و بۆن خۆشە، بە بەدەن شەنگەبییە
جوانێکەی لەوەدا نییە، عیسانی وا عاقڵ و مێهرەبان نییە
سوبحانەڵڵا دەڵێی حۆری بەهەشتی باقییە
چلۆن بەسیاسەت کارێکی وا بکەم ئیرادم لێ نەگرن دوو سەعات لاس بانگ بکەم
بەمیوانییە؟
دڵی وا لێ بستێنم نەوەک کەڕەتێکی لەنەکاو بڕواتەوە بۆ نێو عێلی باڵەک و
باڵەکییە
خۆ لاس گەلێک لە من زیادە، لە قابیلەتی هیچ کەسدا نییە
بۆ خۆی نازانێ لە جەرگی منی داوە تیرێکی ئەبەدی و غەیبییە

کار بە پەلە ناکرێ بەتەگبیر و بەمراوەدە و بەعاقڵییە
بزانین سوڵتانی کەماڵ ڕێگای لاس لە کوێوە دەبێ لەگەڵی بگرم دۆستایەتی
بەیەگجاری و لەگەڵ ئاشنایەتییە
خۆ ئەو دڵی دوو لەتە و ئی من لە حەوت لەت کەمتر نییە
لە لاس وایە ئەمن بە فریوی دەبەم، نازانێ ئەمن زیاتر ڕوحم لە کنە خۆم نییە
یان ئی لاسم ئینشەڵڵا بەخۆشی و بەحەلاڵییە
یان ئەو سەرەم دەبەمەوە بن بارستی گڵییە.
ئەوە ئەگەر چۆوە لاس، هەر چاوەڕێ بوو. خەزاڵ لە فکریدا بوو، دەیگوت:
بۆم هەڵبکەوێ خەڵکی نەزانێ، شۆرەتم بەبەدی نەڕوا.
ماڵە برای دایکی چادریان لاپەڕ بوو، فکری کرد ئەمن دەچمە مەڕی، لەگەڵ
بێرییان دێمەوە، ڕێگای خۆم دەپەڕێنم، خاڵم لە ماڵێ نییە، بەخاڵۆژنیشی کوتبوو.
کڵفەتێکی نارد کوتی بە لاس بڵێ:
ئەو چادر و چیغەی دیوە ئەگەر لە خێوەتان دوورە و لە چادران دوورە و بەرەو
شەماڵ
سەری قەرە ڕەشماڵی هەڵداوە
پێشی بە کانی و کانیلکە و بە گۆم و گۆمیلکەی دەبەفراوە
سبحەینان زوو تاوی وێ دەکەوێ و ئێواران بانگی ئێوارێ سێبەری وەسەر کشاوە
وەبەریان داوە دوازدە ئەنگوستەکی سەر بەپەیکان بێجگە لە بەرچیغی تازە بڕاوە
ئەمن ئەوە دەچم بۆ پێش مێگەلی مەڕی، ئەورۆکە بەهانە دەگرم، دەڵێم: ئەو
ساڵەکە
ڕزق و ماڵی ئێمە بێ بەرەکەتە، دەستزەدە کراوە
لاس ئەگەر بێتە وێ، چوون مەشهور دەبێ لە هەموو کەس، دەڵێن: خەزاڵ شیر
مەشکی لە خۆی داوە
لاس بەدزی بچێتە وێ، خەڵک نەیبینێ، دەبێتە دەنگ و باس و قاوە قاوە
کوڕە ژووانی ئەمن و لاس سوعبەت نییە؛ گاوانێک، شوانێک، گەدایەک نییە ئەگە

بێتو کەس بزانێ وەبزانە سەری سەد کەس لە بەدەنیدا نەماوە
وەبزانە دوو سەد زرێی جووت ڕێزە لە خوێنی هەڵکشاوە
چومکە هەمیشە قەرەوڵمان هەیە، پیاو نابێ لە خۆی خاترجەم بێ، هەتا قسەمان
لێ ببێ بڵاوە
با سووک نەبین، نەکەوینە سەر بەندوباوە
ئەگەر کار بەنهێنی بێ چاکترە، نەبادا بڵێن: سەد قەتڵی لەسەر کراوە.
کڵفەتێک نێوی سۆسەنە و ئێکیان نێوی گوڵ بەدەنە
خەبەریان بۆ لاس دێنا:
لاس ئەگەر گوێی هەڵدەخست دەهات دەنگی گوارە و کرمەک و بەربەنە
جار جار دەچنە سەر سنگیان و جار جار دەبێتە شەڕە بەران، لاس دەڵێ: دڵ
ڕامەچەنە
خاترجەم خەبەری خەزاڵە، دڵم زۆر لەهێش و لەژانە
ئەوە هاتن بزانین چییە ئەو عینوان و مەکر و فەنە؟
هاتن بەلاسیان گوت:
خەزاڵ دەڵێ: لاس زۆر چاوەڕێیە، بێ لەوێ چاومان پێک بکەوێ
ئەگەر دەمێنێ سێ سەعات لە شەوێ
ئەگەر کەو دەقاسپێنێ و خەوی لێ ناکەوێ
چاوەڕێی مەعشووقەیەتی ئەگەر چاوی پێ بکەوێ
بۆیە وا شەیدایە دڵی ناسرەوێ.
ئەگەر وایان بەلاس گوت، لاس زۆری پێ خۆشحاڵ بوو.
ئەگە چاوی پێ کەوت ئەوە شەنگەبێری ساز بوون بچن بۆ پێش گەل و پاش گەلی
مەڕییە
نیوێکی خەزێم شۆڕە دەڵێی کچە کۆییە
نیوێکی هەمەوەند و نیوێکی زودییە
لە بن بەرەڵبێنەدا ون بووە کراسی مەحمەڵ دارایییە

هەموو چاوی دەسوورێ، دەڵێی کەوی برسییە
هەموو ڕاوەستاون لەسەر کەوشی پانیە کوڕەکییە
سێ بزمارە و ئەڵماس کارییە
پاکی گوارەی گوێ زێڕی بێ قیمەتە، قیمەتی لە خەزێنەی کەسدا نییە، پاکی زێڕی سپییە
خاڵی گەردنی هەمووی گەندومییە گژنیژییە
دەڵێی گەنجی خەزێنەی خەسرەوە، دەرکی خەزێنە کراوەتەوە و ساحێبی لە کن نییە
قەرە زولف هەمووی دەڵێی عەسکەری ڕۆمین، حوکمیان لەسەرە و
هەڵیانکێشاوە شیرییە
تاق و جووت وا ڕاوەستاون دەڵێی والییە و میرەڵەیە و ئەفەندییە
وەختێکی ئەگەر لە حوکمڕانی دابوون سەلاتینییە
هەمووی دەڵێی ئادەمی نییە و عاسمانییە و غەیبییە
پاکی زولفی خوار و جووت کردووە و کردوویە سێ بەنگییە
قۆیتاس و بەندۆکەی هاویشتۆتە پشت سەرییە
لە پشتەوە ڕیشوەیان دەچێتەوە سەر عەرزییە
ئەگەر بە لەنجە دەڕۆن، هێندێک دەڵێن: مراوییە
هێندێک دەڵێن: خێر ئەوە پۆڕی[1] شەنگەسییە
کەسێک دەردەدار بێ، حەکیمان بڵێن: بەهیچ شتێک عیلاجی نییە
ئەگە چاوی بەوان بکەوێ، ئەوە عیلاجی هات دەردی گران و کارییە
نەخۆشەکە چاک دەبێ، دەکەوێتەوە سەر زیندەگانییە
ئەگەر شێخی ئیرشاد بیبینێ قسە دەپەڕێنێ، ئەتۆ سوێند بخۆ، بڵێ: هیچ ئاگای

(١) پۆڕ: باڵندەیەکی گۆشت خۆشە، لە مریشک زلترە. (هب). ئەگەر لەباتی «پۆل» نەبێ، لێرە مەعنایەکی نییە، هەروەک شتێکی هاتۆتە سەر زاری. فارسی: دراج. (نامهای پرندگان در لهجەهای کردی، ص ٥١).

له خۆی نییه
هیچ کەس وا بەو ئەندازەیە نەیدیوە شادمانی و خۆشییە
چون ڕەئیسی وان خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە.
ئەوە هەموو وەلەنجە کەوتن، دەڕۆیین کۆترییە
هەمووی قەجەر بڕکراوە زولفی، عارەقیان دێتەوە سەر کولمەی لیمۆییە
هەمووی چاوەڕێی ڕەئیسیانن قەدەمی خێر بێ، ئەو ساڵ بەبەرەکەت دەبێ ساڵ
ڕەفیقی ڕێگامانە خەزاڵ و خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبییە.
ئەوە خەزاڵ هات و پاکی شل و مل و سایە گەردن شیرمەشکیان لە خۆیان داوە
پاکی دەڵێی پۆڕی بەڵەکە و سەری لێ شێواوە
پاکی دەڵێی وەنەوشەیە و شین بووە لەسەر جۆگە و جۆباری دەبەفراوە
پاکی کولمەی دەڵێی شەمامەی حەوت ڕەنگە و بای شەماڵی لێ داوە و ماتەی داوە
هەمووی چاوی دەڵێی مانگی چاردەیە، هەور نییە و ساوە
ئەوە لە بورجی منەووەر سەری دەرهێناوە
هێند بەخۆشی ڕۆیین بۆ پێش مەڕی، کچ لە چاردە ساڵەییدا بێ عاقڵە، هیچی عاقڵی لە کەللەیدا نەماوە
چون وەسەر هەموو کەس هاتووە، لە هەموو کەس قەوماوە
هەر کەسێ بەدڵی خۆی چاوەڕێی کام و کاوە
شەش سەد کەس بدزی لە سمایل عوزێری و لەو عێلە کوڕە لاوژان خۆیان دەدزێوە، پەنایەک بێ بەڵکو کیژان هەچ کەسێ ئەوی عاشق بوون و کیژ مەیلیان بەوان داوە
دەیگوت: بێری ڕۆیی بۆ بێرە مەڕێ، بەڵکو یاری خۆمان ببینین بەو دوو چاوە قاسپە قاسپە، پێکەنینە، قاوە قاوە
دەنگی تۆق و تەلەسم و زێڕ و زنجەق و گوارە و کرمەک و ئاودەنگی و خەبەرچی و قۆیتاس وا دەبوونەوە بڵاوە
قافڵە و توجاڕان لە سەفەری سەمەرقەندێ دەگەڕاوە

دەیانگوت: دەبێ چ خەبەر بێ، لە دونیایەدا چ قەوماوە
هەڵبەت ئاخری زەمانە و ڕۆژ گەڕاوە.
ئەوە لاسیش لە پێی دەکرد جووتێک چەکمەی سمایل نامەی وەستا نەسیرییە
بن پەپوولە نیشانی عەسڵ دەباغکاری وەستا نەسیرییە
لەبەری دەکرد خەفتانێکی پێستی کەرگەدەن، ئەگەر تیرەندازی لێ بکەن
تیری لێ ون دەبێ لە تووکییە
دوژمن دەڵێ هەڵبەت ئەمن تیرەندازیم لێ کرد کوشتم، تازە زیندەگانی بۆ نییە
نازانێ لە نێو تووکیدا ماوەتەوە ئەو تیرە، هیچ ئەسەر و زەرەدی بۆ وی نییە
ئەوە دەبەر خۆی دەچەقاند خەنجەرێکی دەمڕەشی پێنج بستییە
دوخی ڕاستە، خوارایی تێدا نییە
جەوهەرداره لە قەبرغەی هیچ کەسدا نییە
کەسێک بیباتە فرۆشێ ساحێب قیمەتە و قیمەتی نییە
ئەگەر لە ڕۆژی لێقەومانێدا هەڵی بکشێ، چاوی پیاوی لەبەر هەڵنایە، پیاو چاوی دیتنی بۆ نییە
وەکو تیشکی تاوێ جەوهەری دەڕژێتە سەر عەرزییە
بۆستەی خەنجەری عەسڵ شمقارِ ڕەنگی فەتاح بەگییە
دەسکەکەی شاخی گەوەزنە، دەڵێن شاخی گاکێوییە
کەمبەر زنجیرێکی ڕاست و چەپ دەکرد، شازدە قەد ئاوی خواردووە بەژەهری مارییە
لەبەر ڕۆژی لێقەومانێ ئەگەر کاری لێ نەکا شیر و تیری بێگانە و ئەوە بۆ ڕۆژی دڵهێشان و بەیدی بەیدییە
چەپکێکی پەڕی تاوس لەسەر ناوە، پەڕێکی ڕەشە و یەکی سوورە و یەکی سپییە
یەکی بنەوشە و ئەوی دیکەیان لاجیوەردییە
بڵێی قەت بایە پەناباتێکی لەبەر ئاتەشی عیشق ئاگای لە خۆی نییە
ئەوە بۆ خێوەتی ماڵە خاڵی ئی خەزاڵ هات بە دزی و بە مەبخییە

چۆن کەسێکی چاوەڕێی مانگ دەبێ کەنگێ هەڵدێ شۆقی ببینم بەئەمری ئەبەدییە
ئەویش ئەوەندە چاوەڕێی خەزاڵە کەنگێ بێتەوە لە ڕێگای مەڕییە
بەخولای عەینی عەیش و نۆشە لەگەڵ وی هەن دوو سەت و چل شەنگەبێرییە
ئەوە هەمیشە چاوی لە ڕێگای مەڕی و ڕێگای چۆلییە
بۆ خۆی ئەوە لەوێیە، دڵی لە کن خەزاڵ حەفسییە.

خەزاڵ دەستوور و عەمەلی پێ نیشان دان، کوتی: ئەمن کەمێک ناڕەحەتم، شتوشۆی چاوم لەسەر ئەو کانی و ڕووبارە دەدەم. دوو ڕمبیشی مابوو ڕۆژ ئاوا ببێ. بەغەیری دوو کڵفەتی خۆی کەسی دەگەڵ خۆی نەهێشت. ئەوە هەر کەسەی بۆ جێ و ڕێ و خانەوادەی خۆی ڕۆییەوە، بەپێش چاوی لاسدا هاتن، ئاخر کچ ئەگەر جوان بێ و ناسک بێ بۆ جوانێ هیچ شتێکی لە گوێن نییە. لاس لە پەسی چادرەوە زۆر چاکی چاو بەکچان کەوت، ئاوپرژێنی دڵی کرا. کوتی:

کیژان ڕۆینەوە، هەموو لاجانگیان، دەڵێی: زەردە بێیە
دڵی من هەمیشە وەک قەرەبینا لەسەر پێیە
لەم سەرە خەزاڵ ڕۆیی، ئەدی ئەلعان خەزاڵ دیار نییە، لە کوێیە؟

لەو عەینەدا کڵفەتان هاتن، تەفتیشیان کرد. جا ئەوە خەزاڵ بەسەد ناز و نیم ناز هات، لە تەنیشتی یەک دانیشتن، کڵفەتان چۆلیان کرد. هەرکەس بەلایەکدا ڕۆیی. لاس و خەزاڵ دەگەڵ یەک مانەوە.

ئەوە لاس دەڵێ:

خەزاڵ لە خۆی داوە شیرمەشکێکی خاسەڕەنگی بەدوو ڕێزە قەیتان کاری کراوە
پێشی گوڵینگەی ئاوریشمی خاوە
تازەکانە لە دەباغ هاتۆتە دەرێ ئەگەر دەباغی بۆتەوە تەواوە
هەر دەڵێی گوڵە لە کێلەک و بناوانان تازەکانێ ماتەی داوە
ئەمن ئەو وردە عارەقەم پێ جوانە ئەگەر لە نێو برۆی خەزاڵ ڕاوەستاوە
دەڵێی مانگە تازە لە بورجێ هاتۆتە دەرێ، ئەستێرەی سوهەیلی لە چنگی داماوە
زنجیرەی زولفان سەریان لێ شێواوە

لە نێوانی سینە و مەمکان تاق و جووت و داو داوە
تێکەڵ بوون، ڕێحانەیە، گوڵە، گوڵاوە، گیابەند و خاوە، هەڵاڵەیە، لاولاوە
ئارامی دڵەکەم بەمەخسوودی خۆم گەیشتم، قەدەمت بۆ خێوەتی ماڵە خاڵت هێناوە
جەحەندەم، با بڵێن: ئەو ڕۆژەیە سیاوەحش بەدەستی ئەفراسیاب کوژراوە
خۆ ئەگەر من بشکوژرێم پڕیشکەی خوێنی من دەپەڕێتە مابەینی ئەو دوو چاوە
خاترجەم دەبێتە خاڵ وەکو فینجانێکی بلێن: لەسەر تەختیان داناوە
ئەوە شانازییە بۆ من، لەبەر ئەو خاڵەی خوێنی من هەتا ئەتۆ دەمری نێوی من لە دنیایە نەکوژاوە
تا ئێستا تەیرێکی تیژباڵ بووی، لەنگەری باڵت لە بۆ ئارامی دڵی من بەرداوە
دەجا با تێکەڵ کەین سمێڵ و بسکان تا حەسرەت و خەم لە دڵم نەمێنێ، ناڵە ناڵ و کاوە کاوە
با شەکری لێومان هەتر و حەبیری ببێت بڵاوە
ئۆخەی ئەوە کامی خۆم چاو پێ کەوت و ماندووم حەساوە
هەتا سەعات و نیوێک لە شەوێ چوو، بەزنجیرەی زولفی خەزاڵ ئەوە لاقی لاس بەستراوە.
دەستێکە منت داوێن بێ یاری شۆخ و شیرینم
لینگێکی گوارەم دەیە دەبێتە موتمەئینم
من لە خۆم نیگەرانم درەنگت دەبینم
لەبەر خەیاڵی دڵم دەینێم لە ژوور سەرینم
ئاو پڕژێنی دڵمە وەختی لە خەو ڕاپەڕینم
بۆ قیامەتیشم چاکە، پێی قایم دەبێ دینم.
بەندێکی گوارەم دەیە هەڵیگرم بەیادگاری
با نەچمەوە بەماتی و بەمەستی و دڵ بریندای
خۆم وەک پادشایان دەزانم بە میری و بە سەرداری

پادشایەتی هیچ نییە، عاشقییە خونکاری
خەزاڵ ئەگەر پێکەنی شەکری لە لێوی باری
بەخولای پیاوێکی سەیری، زۆر فەقیر و ئیختیاری
دڵت زۆر پڕ لە خەیاڵە، جار جار پیادەی جار جار سواری
وەختێک مات و مەلوولی وەختێک مەرد و وشیاری.
ئەوە دیسان هەر خەزاڵ دەڵێ:
پێم وایە تۆ غەریبی، هاتووی لە سەمەرقەندی
جار جار توندە تەبیاتی، جار جار هێدی و ئەهوەندی
جار جار خۆت زۆر تاڵ دەکەی، جار جار زۆر ڕەند و مەندی
خاترجەم بە گیراوی تۆ بەداوی کەمەندی
ئەتۆ بەزولفی خەزاڵ، ئەتۆ حەفسی و دەست بەندی.
شەرت و قەرارێکم کرد من، سەوگەندمە بەخودای تاق
ئەمن هەتاکو ماوم شکۆفە نەدەم وەک مێلاق
ئەمن هەر بۆ لاس دەبم، ئیتمینانم گوت لە لات.
ئەوە هەر خەزاڵ پێی دەڵێ:
دەستی منت داوێن بێ با گوشاد بێ ئەو دڵە تەنگە
مەخسوودی خۆت وەربگرە لەو شەمامە حەوت ڕەنگە
ئێمە با مەرەخەست بین ئەوقاتی شەو درەنگە.
لەوڕۆوە تاکو سێ ساڵ من عاجز نابم لە یار
زیاتر عیشقم دەبزوێ، زیاتر قسەم دێتە کار
ئەلعان دڵم زۆر تەنگە، نەم ماوە عیلاج و چار
ئاخر خۆ من بێ کەس نیم، زۆرم هەیە قەوم و کار
نەبادا شکیان کردبێ، ئەوان لێم بکەن پرسیار:
«خەزاڵ ئەتۆ لە کوێ بووی» ئەمن چمە عیلاج و چار؟
لاس گە فکری لێ کرد لەو کوڵمە زەردە بێیە

قسەکەی لێ دەسەلماند، دەیگوت: قسەی بەجێیە.
هەرتک بەجووت ڕاوەستان بەبێ سوال و بێ پرسیار
وەختی عەیش و نۆشیانە باغی هەنجیر و هەنار
هەرتک خوداحافیزیان کرد، هەرتک دەستەو دوعا بوون وەکو پیر و وەک ئیختیار
ڕوویان لە عاسمان دەکرد: یا سەعید و یا جەببار
شەیتانان چاویان کوێر بێ، پێکمان بێنی کاروبار.
ئەوە لاس دەگەڕاوە، وەکو بازێکی برسی گەر شەوێ لە شەو ڕاوە
خەزاڵ زۆر شل و ملە دوگمانی ترازاوە
شەمامەی کاڵ و ڕەنگین بەدەستی لاس ژاکاوە
وەکو وەنەوشەی کوێستان گە بڵێن: سەری هەڵپساوە
سەرپاکی زنجیرەی زولف و هیچ لە جێی خۆی نەماوە
هەمووی بەباوەشی لاس ژاکاوە و تێک هالاوە
دەڵێی باغی هەنارە و تازەکانەی گوڵ داوە
هەچ کەسێ بۆ ماوەی خۆی هەڵیان هێنا هەنگاوە
هەرکیان لێک بێ شک بوون، کار لە کار ترازاوە
خورما گە پەیوەندت کرد، مەگە بڵێن: ئەو دارە شکاوە
دەنا پەیوەند ویشک نابێ، مەگەر بڵێن: بێ ئاوە.
جارێکانە بەبۆنی یەکتری مەست بوون هەتا دە شەو؛ جا پاشی دە شەوەی هەرتک لا دڵیان کەوتە فکر و خەیاڵ. ڕۆژێکی پاش بانگی ئێوارێ خەزاڵ لە قەستی ڕێگای خستە ماڵە خاڵی، چەپ بوو، سێبەری کێوان هاتبووە خوارێ. لاسیش ئەگەر چاوی پێ کەوت، ئەوە سوار بوو بەعینوانی ڕاوێ دەچێ ڕێگا بەخەزاڵ دەگرێ.
خەزاڵ لە دوو کلفەت سۆسەن و گوڵبەدەن زیاتر کەسی دەگەڵ نەبوو. لاسیش لە نۆکەر و خزمەتکاری خۆی زیاتر بێگانە و غەیری و قسە پەڕێنی دەگەڵ نەبوو، ئەوە لاس دەڵێ:
ئەوجاریشم ئەوە بەچاوی خۆم خەزاڵ دەدییە

بریا من دارێک بوومایە پێیان کوتبامایە دارە قەیسییە
شین بوومایە بەعومری باری تەعالوڵڵا لەسەر کانییە
سێبەرم بڕۆیبایە بۆ شەرق و غەرب و جنوب و شیمالییە
لە بن لکێکمدا دانیشبانایە شل و مل و سایە گەردن و داوو دەلینگ حاجی حوسێنییە
وەختێکی ئەگەر دەهاتنەوە ماندوو دەبوون لەمەڕییە
بیان کوتبایە با بچینە بن ئەو دارە قەیسییە بۆ فێنکییە
بهاتبانایە بنم پۆلێک شەنگەبێرییە
جا ئەو وەختی ئەمن دەگەز باڵام دەکرد، دەکەوتە دڵم شادیانە و شادمانییە
لە بن لکێکم دابنیشبانایە پۆلێک کچە کۆییە
لەگەڵ یەکتریان بکردبایە ڕاز و گلەییە
لە بن لکێکم دابنیشبانایە پۆلێک شەکرەژن، گەردنیان درێژ بویایە وەک گەردنی جانو
ماینی کاکلاغای گەردییە
بیانکردایەتە قاوە قاو و گاڵە گاڵ، یەکێک بیکوتبایە: لانکەی ساوام بەجێ هێشتووە. یەکێک بیکوتایە: قەیدێ ناکا مێردم لە ماڵ نییە.
لە ژێڵڵا تەمەشای لکیان بکردمایە، گەلاڕێزانمە، بەبرۆیان لە جەرگمیان کردووە تیرەندازییە
لانکی ساوایان بەجێ هێشتووە، جێگاکەیان ئیسڕاحەتگایە، بیانکوتایە: هیچ ئاگایان لە خۆیان نییە.
هەچی بهاتایەتە بن سێبەری ئەو دارە بەبۆن مەست بوویایە. بیانکوتبایە: مەستە و
ئیغیار نییە.
لە بن لکێکمدا دانیشتبایە پۆلێک کەیخودا و ڕدێن سپییە
چومکە کۆنەساڵن ئەوان، بیانکردبا باسی کاولە نوحسا و وڵاتی باڵەکییە
لە بن لکێکمدا دابنیشتنایە پۆلێک کچە سوورچی ئەگە بەرۆکیان پاکی

سەدەفكاری و قەیتانكارییە
دەروازەی سنگیان داخراوە بەعەبوتۆپ و مەجیدی و زێڕی قەدیمییە
لە بن لكێكم دابنیشتایە چاردە كچ خوێندەوار و بەعیلم و كوڵمە ئەتڵەسییە
تام خۆش و بۆن خۆش و ددان مروارییە
سەریان هەڵێنابایە تەماحیان لە لكم بكردایە، بیانكوتایە: ڕاست و بێ غەوشە ئەوە ماڵی كلكە تەشییە
لێیان ببڕیمایە، بیان هێنابا سەر وەستا كار، پێداویستییان چبوایە بیان هێنابامایە
بۆ سەر پێداویست كارییە
هەچ كەسێ بەدڵی خۆی ڕانک و چۆغەی پێ بڕستمایە، هەچ كەسێ بیناردبایە بۆ دەزگیرانی خۆی بەیادگاری و بەدیبانەتییە
ئەوان قوڵكەی گەردنیان شەربەتە، ئاوی كەوسەرە و كانییە
قسەی وان دەبێتە ڕاستە و خۆش نشینی بۆ شار و بۆ ئاوەدانییە
هەمیشە لەسەریان دەگەڕێ پۆلێک شمقاڕ، دەبێ تاریفیان بكەی بۆ جوانییە
لەسەر ئەو دارەی نیشتووە پۆلێک پەری، دیارە پەری زاهیری نییە و غەیبییە
جا ئەو وەختە ئەمن دڵم ساكن دەبێ، بۆم پەیدا دەبێ ئیستیڕاحەت و زیندەگانییە
خۆ من لە دنیایەدا بێ مەنزوورم، مەنزوورم كەس نییە
مەنزوورم خەزاڵ و خەزاڵەشۆڕی خاڵ گژنیژی و سوور و سپییە
ئەگەر خەزاڵ ئی من نەبێ بەتەما نیم بۆ جەننەتی ڕۆژی باقی و ئاخرەتییە
جا نازانم خەزاڵیش وەک من شێت بووە، ئیغیارە، یان وەحشییە
لە گەردنی وی جوانە پیرۆزە و ئاڵتوون و لەگەڵ تۆقێ ئەگەر لە گەردنی كەسدا نییە
هەچەند جاری دەیهاوێژێتەوە سەر خاڵی ڕەش و گژنیژییە
دەڵێی گەرمای نیوەڕۆیە و لە ئاوێ دوور كەوتۆتەوە و تونییە
چومكە داعبای ئاوێیە، لە ئاوێدا نەبێ زۆر مەخشوشە مراوییە
ئەمنیش بەبێ خەزاڵ هەمیشە مەستم، شێتم، شەیدام، لەبەر خەیاڵی خەزاڵ هیچ

عاقڵم لە کەللەیدا نییە
چومکە ئێستا قسەیە، وەگیرم نەکەوتووە خەبەرێکی بەڕاستی و بەئەسەحییە
ئەمن ئەگە هاتمە ئێرە بۆ غوربەتی و غەریبییە
ئاخر لەسەر خەزاڵ بوو پەیدام کرد خوێنرێژی و دوژمنایەتییە
دەبێ ڕۆژێ سێ جار بەمن بڵێ: پاداشتی ئەو کارەی تۆ چییە؟
پاداشتم دوو زولفی بەنگی و لێوێکی ئەتڵەسییە
جا مەگە ڕوو بکەینەوە لە دەرگای ئەزەلی و ئەبەدییە
جا لە خەزاڵ زیاتر ئەمن لەو دنیایەدا لە من وایە دایک و باب و ماڵ و دەوڵەت و
خانەوادەم نییە
ڕۆژێک دەبێ قۆڵی خەزاڵ بگرم بەشادمانە و بەخۆشییە؟
بچمەوە نێو عێلی حەریر و باڵەکییە
جا ئەو ڕۆژە بدەمەوە ئەمەگی دای و بابییە.
لە بن لکێکمدا دابنیشتبانایە پۆلێک ڕاوکەر: ئەو لکەی چاکە، ئێمە بیبڕین بۆ
سەری تیرییە، بیبەینە سەر وەستا کار بیدەین لە ڕەندە و کوشتەرییە
لەسەری کانیە قەمبەریان و هەواری بێریان و کۆسرەتی شاڵە بەگیان و لە دوهاچە
و بڵکیس پێی بکوژین نێرییە کێوییە
جا لە بن شالکمدا دابنیشتایە ئارامی دڵم خەزاڵ و خەزاڵەشۆڕی مەلا
داود و مەلا نەبییە
مەگە حۆری بەهەشتێ، دەنا دنیا جوان و لایەق و ممتازی وای تێدا نییە
جا من لەنجەی خەزاڵم دی، تازە من ژیانم بۆ چییە؟
ئەوە دەڕوا بۆ ماڵە خاڵی وردە وردە، کەتانی هاتۆتە سەر عەرزییە
جار جار ڕۆینی دەڵێی کەوە، جار جار دەڕوا کۆترییە
تیرێکی وای لە جەرگم داوە خاترجەم بە ئەو تیرە دەرمانی نییە.
ئەوە بەسەر تۆقان، تەلەسماندا خەزاڵ بەشانی ڕاستیدا ئاورێکی دەداوە
ئەویش دڵی ماندوو پڕ خەیاڵی بەدیتنی لاس دەحەساوە

خەزاڵ ڕووی تێ دەکرد و لێی شل دەبوو شەقاو و هەنگاوە.
ئەرێ سوارەکەی سوار بووی لە وڵاخێکە عەسڵە بەحرییە
لە شانی خۆت کردووە ڕمبێکی عەیزەرانی دەمرەشی هەژدە قەفییە
دەڵێی لە تۆ زیاتر کەسی دیکە لەو دنیایەیدا نییە
دەک سەری خەزاڵت ببێتەوە بەقوربانی ناڵچەی کەوشییە
هەنگاوێک وەرە خوارێ، ڕۆژ درەنگە وەختی فێنکەتییە
وەختی ناز و نیم ناز و ڕاز و گلێیی و چاک و خۆشییە
هەتا چاوێکت بۆ بکەمەوە بەپیاڵەی شەراب و گەردنت بۆ بکەم بەمەزە
نەوەکو بڵێی مەزە نییە
هەتا مەست ببی، چیدیکە ڕانەوەستی بەئیغیارییە.
ئەوە لاس یەک بەندی بانگ دەکا:
کوتی کیژێ ئەتۆ پۆڕی بەڵەکی، ئەمن شەهێنم
هەچەند دەکەم دڵم نایە بێم ئەگەر بتژاکێنم
تۆق و تەلەسم و بەندی ئاڵتوونان بپسێنم
ئیجازەی تۆی لەسەر نەبێ ناتوانم چەقەڵ پارێزت بۆ بێنم.
ئەوە خەزاڵ دەڵێ: نەوەڵڵا ئەمن بەدوو زولفی بەیداغ ڕەنگم بۆت دەکەم سەیران
لە دڵی خۆت دەراوێژە خەم و هێش و برک و ژان
خۆ عەمر درێژ نابێ ئەگەر بێتو خاڵ تەڕ نەکەی بەلێوان
کار بەدەستوبرد چاکە نەوەک ئەو حەسرەتە بەرینەوە بن قەبران.
جا ئەوە لەوەیدا لاسە شۆڕی باڵەکان لە وڵاغی دابەزی
هێندە بەسام بوو خەزاڵ، تەواوی بەدەنی لاس لەبەر سامی خەزاڵ دەتەزی
چومکە جێگاکەیان چۆلە یەکتریان چاو پێ کەوت بەدزی
ئەو بەدەنی خەزاڵی دەژاکاند، ئەگەر دەستی داویشتە سەر گەردنی وەک قورینگ
ئاوازی دەهات تۆق و تەلەسم و گۆ و قۆیتاس و دەرزی
دەنگی وەکو قورینگ دێ گۆ و قۆیتاس و دەرزی.

ئەوە بەکام و ڕەوای یەکتری گەیشتن.
خەزاڵ کوتی: خۆ شەرت و شوێن هەر ئەوە نییە قەدەکە شمشاڵ و بەژنێکە
باریک ڕادەوەشێنی
ئەمن کۆترم و ئەتۆ دەڵێی شەهێنی
ئەو دڵی ئەگەر مەخشوش و غەریب و عاشقم دەی هەستێنی و دەی ڕفێنی
ئەو قەرە زولفی ئاوریشمی خاو داو داو دەی پسێنی و دەی ژاکێنی
ئەگە چاوت بەمن کەوت شێتی، ئیغیار نی، بەگۆشەی چاوان مەستی و
قسە دەپەڕێنی
ئەگە بێتو من قسەیەکت پێ دەڵێم ئەگە ڕانەمێنی
بچی گوڵی کانی و کانیلان و چل پلەی حومامێم بۆ بێنی.
چومکە لە عەمری حەو ساڵان بووم ئەگە وام بیستووە
کەس ئەو تانوت و غیرەت و ئازایەتییەی نەبووە
کەس چاوی بەگوڵی چل پلەی حومامێ نەکەوتووە
جا نازانم کێ ئەو ڕێگایەی بەستووە و کێ ئەو ڕێگایەی گرتووە
دەڵێن زۆر عەتردارن ئەو گوڵانە، ئەوبەر ئەوبەریان گرتووە
هەڵاڵ و بەیبوون و شلێر و گیاخاو تازە پشکوتووە و سوور بووە
ئاشق ناردن تاقیکردنەوەیە و تا ئەوڕۆ کەس نەیتوانیوە و کەس نەچووە
ئەگە بێتو حەوت دەسکم لەو گوڵانە بۆ بێنی ئەوە مەتڵەبم غیرەتی تۆیە، نەڵێی:
خەزاڵ پەڵپی گرتووە
وا دەزانم هاتوومەوە سەر عومری چاردە ساڵەی، دیارە هەڵبەت دەڵێن:
کەس نەیتوانیوە و کەس ناتوانێ بڵێن ڕێگایان بە لاس گرتووە.
سەفەرت خێر بێ، حەزرەتی ئەلیاس ڕەفیقی ڕێگات بێ، خدری زیندەت دەگەڵ
بێ، نەکەویە سەر ڕێگای بەدبەختی و نەهاتییە
ئەگەر لەو سەفەرە هاتیەوە مەخسوودی خۆت بەکەیفی خۆت بگرە، ئیدی بەهانە و
گفتوگۆی دیکە بۆ من نییە.

لاس تێی فکری، دەستی شل دەبوو، هێزی کەم دەبوون لە دوو چاوە
دەیگوت: مەتڵەبت چییە، کێ ئەو تەگبیرەی بۆ تۆ داناوە؟
زولفی خەزاڵی دەگرت پرچێکی لە بن ڕا هەڵدەقەند و دەردەهێناوە.
دەیگوت: سەت لەعنەت لە خۆت و لەو کەسەی ئەگەر ئیعتیباری بە کیژ و بە ژنانە
چەن کەس بە مەکر و بە عینوانی وی سەری بردۆتەوە گۆڕ و گۆڕخانە
چۆن ئەتۆ دەمنێری بەهیلاکم دەی بەخۆڕایی، ئەمن دڵم بەئامانەتی لە کن تۆ دانا.
سەت لەعنەت لە شەرت و بەقات، شەرتی تۆ درۆیە و هیچی تێدا بەستە نینە
لەعنەت لە خۆت و ، لەعنەت لە مەلا نەبی ڕدێن شینە
ئەمن بەخۆڕایی لە دڵی خۆم هاویشتووە زەخم و برینە.
قەستەم بەوەی کەم ئەگەر بێ مکانە
ئەگەر دروستی کردووە عەرز و عاسمانە
بێ مەتلوب نی، ئەتۆ لە من دەگری بەهانە
دەمنێری بۆ چل پلەی حومامێ و بۆ مێرگە گردەڵە و بۆ مۆڵی ئاسکانە
ئەوە ئەمن شەرتم کرد بڕۆم بۆ چل پلەی حومامێ و بۆت بێنم مەڕامی دڵت، ئەگە بێمەوە سەر ڕۆژی گیان کێشانە.
خەزاڵ پەشیمان بۆوە. ئەما مستێکیشی لە سنگی کوتا. ئەوە لاس غەزری، کوتی: چاوم پێت نەکەوێ. تووڕەش بوو لاس.
هەتا سێ ڕۆژ خەزاڵ قاسیدی نارد. لاس کوتی: کارم پێی نییە، دەبێ کاری وا وەپێش من بنێ ئەگەر باعیس بێ بۆ سەرم؟ خەزاڵ مرد و سووتا، حەول و تەقەلای دا، لاس نەی دواند.
جا ئەوە لاس ساز بوو، تەواوی تەدارەکی جەنگی ساز کرد، بۆ هێنانی گوڵی چل پلەی حومامێ. پاش حەوت ڕۆژ، جا ئەوە لاس ساز بوو، بەتەدارەکەوە. کوتی: سەفەرێکم لەبەرە، جا نازانم لەوەیدا، موقەددەری حەق دەستی ئیلاهی، لەسەر چییە؟ ئیدی ئەگەر لاس وەڕێ کەوت، خەزاڵ حەیای لێ هەڵگیرا. هات ڕێگای پێ گرت.
خەزاڵ بەعومری خودای تەعالا دەڵێی چناری عەڕعەڕە و لە کێوی فرودی خوڵقاوە

گەردنی دەڵێی بەیداغی ڕۆمییانە، حەفسی قاتڵیش بێ، بچێتە بنی، پێی دەڵێن: ئیدی حەفسیت نەماوە

چاوی دەڵێی مانگی چاردە و پازدەیە، لەسەر جەبەل و ئەسحابی هیندوستان گۆشەی کێشاوە

لیمۆی بن کراسی مەحمەڵ دارایی، دەڵێی فینجانە و لە مەیخانە داندراوە

بێ عاقڵ بوو، لەو سەعاتەیدا هیچ عاقڵی لە کەللەیدا نەماوە

چون تیری عاشقی لاس وەها لە جەرگی دراوە.

ئەوە دەستبەجێ دەنگی لاسی دا، کوتی:

بۆ مەست نابی، بۆم هەڵێناوی جووتێک شەهێن چاوە

بۆ تەمەشای کراسێکی مەحمەڵ دارایی ناکەی، جووتێک شەمامە و شەمامە ڕەنگین

لەسەر سنگم خڕن ئەوان کراسیان هەڵداوە

بۆ زەینێکە خۆت نادەیەوە بەژنێکە شمشاڵ؟ دەڵێی: لاولاوە و لە قەدی دارێ هالاوە

بۆ تەمەشای پەنجانم ناکەی؟ سەفەری تۆم پێ خۆش نییە و وەبەر ئەژنۆم داوە

شمقارِ سەرێک ئەگەر ڕۆیی، سەری ئاخری ئەگەر گەڕاوە دواوە،

دەزانێ ڕاوکەر داوی ناوەتەوە هەڵدەفرێ و لەو دەور و مەکانە نەماوە

ئەگەر بێتو ئەتۆ ڕۆژێ دووجار نەبینم ڕووناکاییم دەبڕێ لە هەرتک چاوە

زیندەگانیم لێ هەڵدەگیرێ، ژانم دەکەوێتە جەرگ و هەناوە

با من قسێکیشم کردبێ، لە دڵی تۆ ناخۆش بووبێ، ئاخر چ بووە چ قەوماوە؟

هاشا لە بۆنی گوڵی کوێستانان، هەزار جار بەژنێکە باریکت لەبەر دەگێڕم، سەری خۆمت بەقوربان دەکەم، ئەو سەفەرە بگەڕێوە دواوە.

ئەتۆ زەینی من بدە، لەبەر ئەو سەفەرەی تۆ ڕوحم زیندانییە

زەینی باری لێوم کە، وردە خوناوکە دێنە خوارێ لە چاوی بەنگییە

کوڕڕەم کوڕڕەمی کوڕڕەتە، بۆ وا سواربووی لە وڵاغێکی شێر خەزاڵی گەردییە؟

بۆ وا تووڕەی؟ چاوت نابینێ عەرزییە

بۆستەی خەنجەرت ترازاندووە، دەڵێی هاتووی بۆ خوێنڕێژی و دوژمنایەتییە
لە شانت کردووە، ڕمبێکی دەم ڕەشی قەڵەمکاری هەژدە قەفییە
لە خوێنی نەکرد و لێی دەتکێ دڵۆپە دڵۆپی خوێنییە
قەرە بینایەکی ڕەشی گەردن مارییە
دەستت ڕۆناوە لەسەر خەنجەرێکی عەسڵە قەرەخۆراسانی تۆپاڵ بەگییە
نێوچاوانی خۆت لێ تاڵ کردووم، هەر دەڵێی نێوچاوانی شێری برسییە
تووڕەی، کەس ناتوانێ لە کن تۆ بکا ڕاز و گلەییە
دەسکێکت پەڕی تاوس لەسەر ناوە، گەواڵ گەواڵیەتی دەگەڵ هەورییە
دوژمن ئەگەر چاوی پێت بکەوێ، ئاوی چاوی ڕۆ دەڕژێ، دادەنیشێ بەکوێرییە
قاقەزی ئاخریت دەداتێ، دەڵێ: دوژمنایەتیم دەگەڵ تۆ نییە
ولاغت سمکۆڵێ دەکا، مەگە جارێک لە جاران ڕەخشی ڕۆستەم وا بووبێ، ئەگەر دەچووە شەڕی دێوی سپییە
گراویە بابم، پێم وایە ئەتۆ حەوت ڕۆژە لەبەر ڕق و تووڕەیی خۆت ئاگات لە خۆت نییە
فەرموو داببەزە، تا بۆت بترازێنم دوگمەی کراسێکە مەحمەڵ دارایییە
بۆت بکەم بەئیستیکان دوو کوڵمەی ناسک و ببێ بەمەیگێڕ دوو چاوی بەنگییە
بۆ دانیشتنت ببێ بەکورسی، دابنیشە لەسەر سنگێکە سپییە
بیکە بە بەندی گەردنت، دەیهاوێمە سەر ملانت دەستییە
خۆ دنیا لەززەتی دیکەی تێدا نییە، کام و ڕەوایی هەر عاشقییە.
لاس دەیگوت: نەحلەت لەو کەسەی ئەگەر ئیعتیبار دەکا بەوان شل و مل و سایە گەردن، بەعومر منداڵن تازە دەگەنێ.
پیاو ئەگەر چاوی پێیان دەکەوێ، دڵی ڕادەچەنێ
ئەمن زەینێ خۆم داوەتە سەری کوێستانان، داوێنی گردە کوڵکن و سەری زەهاوێ و فریاد فریاد و پێشی کوێستانی خاڵ خاڵ و جەنگی پیرە بەدەنێ
ئەتۆ هەموو ڕۆژێ سواعبەتم پێ دەکەی، پێم دەکەیەوە پەنێ

شەرت بێ ئەمن بچم بۆ گوڵی چل پلەی حومامێ، لێم مەعلووم بێ ئەو سەعاتە دەمبەنەوە ماڵۆکەی بەتەنێ
جا با پاش ئەمن شەمامە و شەمامە ڕەنگینی باغەڵت لە مابەینی سنگتدا بگەنێ
قسە ناخۆشە، وەکو جێگای دەمی مار پاشی حەو ساڵان لە پیاوی دێنێتەوە تەشەنێ.

ئەوجار ئەوە خەزاڵ دەڵێ:

خەزاڵ بەدڵ لە ژانە و بەچاوی لە گەرمەشینە
دەیگوت: پیاو ئەگەر تۆبەی کرد، بڵێ: پەشیمانم، بۆ پەشیمانی نینە؟
هەک زمانم لاڵ بێ، ئەمن ئەو قسەیەم بە ناز بە تۆ گوت، نەمزانی تۆ ئیشتییات هەستاوە، دەچییەوە نێو عێلی باڵەک و باڵەکینە
ئەگە هەر دەڕۆی، بابان وێران و قەلەندەرم، کەسم لە ماڵە باوانیدا نینە
ئەتۆ بێ ئابداری، فەرموو لە کوڵمێکە ناسک دوو ماچ هەڵبگرە لەبری لوقمەقازی و خۆراک و نانە شەکرینە
ئەلعان ئیجازەت هەیە، تەواوی قەدی خەزاڵ وەرە لە قەدی خۆتی وەرینە.
کوڕە کورتە لاس ئەمن سیرم خوارد و سووتا زمانە
هەزار جار دەستی منت بێتەوە بەدامانە
کەمم لە جەرگی بدە تیری سەر بەپەیکانە
کەمم لە سنگ و بەرۆکی گوارە و کرمەک و گۆ و قۆیتاسان بخەوە جۆڵلانە
بۆچی وەکو بزانی، من قسێکم کرد، ڕۆژی دەست لێک بەردانە؟
ئەمن نازم دەگەڵ تۆ کرد یان پێم گرتی بەهانە؟
دەجا ئەگەر هەروایە بەپەنجێکی ناسک دەست بۆو باغەڵە بەرە
فەرموو، کوڵمەی بۆ هێنا پێشێ، وەربگرە لەو قەند و شەکەرە
بۆ ڕەفیقایەتی ڕێگایەت، فەرموو ئەو گۆ و قۆیتاس و کەمبەرە و شۆڕابەی جەواهێرات دەگەڵ خۆت بەرە
وەبزانە کۆمەگە و ڕەفیقی ڕێگاتە و عەمربەرە و نۆکەرە

چون بۆنی ئەوانت بەسەر دادەچێ، مەست دەبی بەبۆنی عەتر و عەمبەرە
هەمیشە ئەگەر لە کنت بێ، وەبزانە ئاوی زمزمە و قەترەیەک ئاوی کەوسەرە.
جا لاس ئەوە ڕکێفی دێنا بۆ وڵاغێکە ڕەش کوێتی شێر خەزاڵییە
دەیگوت: دەبوو خوڵاحافیزیت لێ نەکەم، ئەما چ بکەم لەبەر بەژنێکە باریک و
قەدێکی شمشاڵ ڕەنگییە
مەجبوورم لێت دەکەمەوە خوداحافیزییە
سەفەری هات و نەهاتە، نازانم دێمەوە یان هاتنەوەم بۆ نییە؟
ئەوە تانوت نەبوو، ئەوە نەبوو بە ڕاز و گلەییە
ئەتۆ دەگەڵ ئەمنت داکوتاوە دیارە بناغەی دوژمنایەتییە
ئەمنت بمرمەوە لەبەر زولفێکی سێ بەنگییە
ئەو تانوتەی لە منت دا ڕاستم پێ بڵێ مەنزوورت چییە؟
قەرە زولفت لێ ڕاست و چەپ کردووم، قەفیان هاتۆتە سەر کوڵمێکە ئەتڵەسییە
چاوت ئەگەر بەناز هەڵدێنی، یەکت دەڵێی جەللابە و یەکت دەڵێی ساقییە
هەچ کەسێکی ڕۆژێ جارێک ئەتۆ ببینێ، مەستە و مەیخانە و شەرابی پێویست
نییە
ئەویش خۆ ئەوە هونەری خۆت نییە، قەڵەمی هەق دەستی ئیلاهی و ئەبەدییە
وەختێکی ئەگەر ڕوح دروست دەکرێ، خودا ئەگەر دروستی کردووی لە ئەزەلییە
وای دروست کردووی، دەنا هونەری خۆت نییە.
دەسووڕا لاس، سەری جڵەوی توند دەکرد و بەڕاستەیدا دەگەڕاوە
دەنگی سەری تیر و چەک و ئەسباب دەهات، گرمە گرمە، ناڵە ناڵە، قاوە قاوە
ئەوە سەفەری وەبەر گرت، دەیگوت: پەنا بەتۆ ئەی بیناهی چاوە
سەبارەت بەخەزاڵ عاقڵم لە کەللەیدا نەماوە
کیژێ سەت جاران دەوڵەت زیاد و ماڵ ئاوا.
جا ئەوە خەزاڵ دەگری و دەبارێنێ
لە دوو چاوی بەنگی وردە فرمێسک هەڵ دەوەرێنێ

سەلای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، کەسم لە ماڵە باوانی نەمێنێ
لاس ڕقی هەستاوە، کەس ناوێرێ بیدوێنێ
جا خۆ پاش لاس کەس ناتوانێ دەست بۆ شەمامە و شەمامە ڕەنگینی باغەڵم بێنێ
شەرت بێ پاش لاس هیچ کەس لێی کامورەوا نەبێ، دەبێ لە بن عەرزیدا گڵ بیرژێنێ
هەچ کەسێکی، کەسێکی دیکە وەبەر زەندی دڵی خۆی بێنێ، لە پاش لاس،
ڕەبی هەرتک چاوی بەکوێری هەڵێنێ.
ڕەبی ڕەفیقت بێ پادشای ئەزەلی و ئەبەدییە
ئاگادارت بێ خدری لە چۆل و بەرییە
حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل، ئەگەر ئیسماعیل حازریان کرد بۆ ڕۆژی قوربانییە
ئەگەر ئەوانەی لە هیچ کەس زاهیر نییە، کۆمەگت پێ بکەن چل سوارەی غەیبییە
عیسای بنی مریەم ئەگەر ئەلعان عاسمانییە
ئەو ڕۆژەی خودا دەکا دیوانێ گە دێتەوە سەر عەرزییە
حەزرەتی موسای کەلیموڵڵا ئەگەر گفتوگۆی دەگەڵ ئەزەلی و ئەبەدییە
ئەو ئاگاداری تۆ بێ. ئەگە ئەوانە کۆمەگت بن، کەس ناڵێ لاس کەسی دەگەڵ نییە
بابان وێران خۆم، زمانم بەبڕین چێ، خۆ کەس بەڵەدی بەچل پلەی حومامێ نییە
ئەمن ئەو پەڵپەم بۆ لە لاس گرت؟ دەترسم لە لاس ببمەوە بەدیدار ئاخرەتییە
جا ئەمن ئەو گولانە چ لێ بکەم، ئەو گولانەم بۆ چییە؟
ئەمن بۆچم وا دەگەڵ لاس کرد ڕاز و گلەیییە؟
ئەوە خەزاڵ دەیگوت: بەوەی کەم ئەگەر ئاگا و موبینە
ئەگە بێتو خەبەری لاس بە بەدی بێ، لفکەی کۆڵوانە و کراسێکە مەحمەڵ دارایی دەکەمەوە شینە
لە خۆم دەبڕم زیندەگانی و ژینە.
خودایە ئەمن لەبەر تۆ دەکەمەوە تەمەننایە

ئەگەر تۆ دروستت کردووە عەرز و سەمایە

ئەگەر بەردی سارد و گەرم وەبەر پێی لاس نایە(١)

ئەگەر لاس موقەدەرێکی وەسەر بێ، زووتر بۆ من بنێری دەردی پێ مردن و موفاجایە

لاس بۆ خۆی، ئەو بۆتە مەجرووم، ئەمنیشی داناوە بەشیرن لەیلایە

هەتاوەکو لاس دێتەوە، ئەمن خۆشیم بەدڵیدا نایە.

لە دوای لاس مردن خۆشترە لە ژینم

بابان وێران و قەڵەندەر و سەرشینم

دەجا با بوکلێتەوە، پڕ بێ لە زوخاو کۆنە برینم

ڕەبی ئەو چاوانەم کوێر بێ، چومکە بەبێ لاس دنیای پێ دەبینم

لە دوای لاس لە من حەرامە ئاواڵ و وێڵداشی سەر سەرینم.

لاس ئەوە ڕۆیی، جارێ بێ پرس ئاوەدانی چاو پێ نەکەوت هەتا پازدە شەو. ئیدی لاس بێ خەبەر بوو، بەسەراسیمەیی هات.

ئێوارێکی، نوێژی نیوەڕۆ کلا ببوو، هەوراز بوو، لە هەورازەکە وەسەر کەوت. ئەگەر تەمەشای کرد چیمەنە، مێرگ و مێرعوزارە.

تەمەشای کرد شەش هەزار خێوەت هەمووی قوبەی سەری ئاوریشمە، پاکی پێشی خێوەتی دوو بەرچیغی وەبەر دراوە، نێوەڕاستی بەرچیغ تۆقێکی تێکراوە. عێلی وا ڕەنگینی قەت نەدیبوو. دووریش بوو لێی. لاس کوتی: دەبێ ئەو خێوەت و بارەگایە ئی کێ بێ؟ لەمێژە ئاوەدانیم نەدیوە، ئەوشۆ میوانی ئێرە دەبم.

مەڕی نیوەڕۆیەش ئەوە چوو بۆ پشت چادرێ.

ڕەئیسی کوللی ئەو هەموو خێوەت و چادر و بارەگایە، خانزادە خانی حەریری بوو. ئەویش شازدە ساڵ بوو لاسی نەدیبوو، دایمە لە تاو لاس لێوی بەبار بوو. ئەگە خانزادە خان هاتە دەرێ، تەمەشای کرد بەندەنەکە بڵند بوو سوارێک هاتە خوارێ. چومکە دایمە بەموڕاوەدەی لاسەوە بوو، کوتی: بێو نەبێ دەبێ ئەوە لاس بێ.

---

(١) یانی نەیە.

مارەکراویشی بوو، ئێستا شەقڵی خەرمانی نەشکاندبوو، ئەگەر چاوی پێ کەوت، ڕەگی بەدەنی لە خۆشییان هەمووی کەوتنە بزووتنەوە، شادمانی و دڵخۆشی لێ پەیدا بوو، کوتی:

بەوەی کەم ئەگەر بیناهی چاوە

دونیا هەمووی بەقودرەتی وی خولقاوە

کەس نەیدیوە کەسێک ئەگەر مرد بگەڕێتەوە دواوە

ئەوەیان زۆرابی ڕۆستەمە سەری لە خاکێ دەرهێناوە

یان لاسە شۆڕی باڵەکانە، دەڵێی بازە و سەری لێ شێواوە

ئۆخەی حەسرەتم نەبردە بن خاکێ، ئەوجاریش ئامۆزاکەم، ئارامی دڵی خۆم دەبینم بەهەرتک چاوە.

ئەوە بانگی شوانەکەی کرد، کوتی: شوانە، دەستی منت بەداوێن بێ شوانە

جووتێکم شەک بۆ وەگێڕە، ئەو جووتە شەکی چاو ڕەش، ئەگەر گێڕاومەتەوە بۆ بەرانە

ئەو دوو شەکانەم بۆ سەر ببڕە، بیکوژەوە بەدەستووری پادشاهانە

حەساوە دڵی ماندوو و عێجز و پەرێشانە

پێم وایە ئەوشۆکە لاس و لاسە شۆڕی باڵەکان، مەخسوودەکەی دنیا و قیامەتم لێ میوانە

شەرت بێ بیکەم بەخێر حەوت سەت زێڕی لەوی بیست و چواری ڕەواجی شارانە و بەقیمەت گرانە

ئەوە نەزری شانی خۆم کرد، زەکات بێ، خێر بێ، خێرات بێ دوو سەت شەکی یەک ددانە

ئیدی دنیا خۆشی و بەشارەتی ئەوەیە: لەگەڵ کەسێک دابنیشی ئەگە دڵی ماندووت دەگەڵی بگرێ وچانە

پاشی شازدە سالان ئەوە چاوم کەوت بەشێری گەرمە لانە.

دەستبەجێ خەبەری دا، کوتی: ئەوە لاسە، بەپیریەوە بچن. بەپیریەوە چوون.

لاس کوتی: عەجایەب! ئەوە دەبێ چ میللەتێک بن؟ ئەوە جلەوی لاسیان گرت.
ناڵە ناڵە، خرمە خرمە، دەنگی تۆق و تەلەسم و زێڕ و زنجەقان وا دەبوو بڵاوە
هێندێک دەیانگوت: ئاوە، سێڵاوە
هێندێک دەیانگوت: دەلیایە خۆیان لێک داوە و کشاوە
هێندێک دەیانگوت: خێر ڕۆژی قیامەتە، هێندێک دەیانگوت: عاسمان ڕووخاوە
لاس لەو کارە سەری زۆر سوڕماوە و عەجایەب ماوە
ئەما کیژێکی شل و مل و داوودەلینگ حاجی حوسێنی نیشانەیەکی مانگ و
ڕۆژ نیشانی جەواهێرات بەندی لە مابەینی سنگ و بەرۆکی داوە
کوڵمەی دەڵێی شووشەی عەتر و گوڵاوە
وردە وردە نەرمە فرمێسکی دێنە خوارێ لە مابەینی هەرتک چاوە
کوڵمەی دەبێتە بەفر، فرمێسکی دەبێتە خوێن، دەڵێی بەفری کوێستانە و خوێنی
لێ پرژاوە
زنجیرەی زولفان تێک هاڵاوە
سەری زولفی دەڵێی ئاسکە و ڕاوکەری لە دوایە و سەری لێ شێواوە
کەسێکی ئەگەر قەتی نەدیبێ دێوانە دەبێ، عاقڵی پوختی دەبێ خاوە
عافرەتێکی عاقڵ و شل و ملە، دەڵێی شیری سافە و هەوێن نەکراوە
بەجۆرێکیان بەحورمەت هێنا چونکە، هەموو جارێ ئەو حوکمی دەکرد و ئەو
فەرمانی بەو عالەمە دەداوە
لاس دەیگوت: خۆ من پادشا نیم، میللەت بڵێن پادشا تەختی بەجێ ماوە
فەرماندار خەبەری دابێ، بڵێن ئەوە شا بۆ تەخت گەڕاوە
ئەمن دەبێ خەونە بیبینم یان ئاشکراییە، ئەو عالەمە ئەو حورمەتەیان لە
پێش ئەمن داناوە
تا هێنایانە دەرکی خێوەتێکی سەر بەئەتڵەسی پێش سیوانکاری جەواهێرات
کراوە
لاس دادەبەزی، ئەوە بۆ ئیسراحەت پاڵوپشتێکی موشەجەجەری قاقوم کاری قومری

ڕێزیان[1] بۆ دادەناوە

دوو سەت کەس دوعای بۆ دەکرد: قەدەمت خێر بێ، ئیشەڵڵا دەرد و بەڵامان لەسەر نەماوە.

چومکە لاس لەمێژ بوو ڕۆیی بوو، وە جەرگی کەوتبوو تیری غەیبییە
نەی دەناسییەوە، نەیدەزانی خانزادە خانی حەریرییە
چونکە زنجیرەی زولفی خەزاڵی وا هاتبووە سەر مل و دەستییە
لەو وابوو لە خەزاڵ زیاتر ئەو دنیایە کەسێکی دیکەی تێدا نییە
هەتا پێیان گوت، حاڵییان کرد بەئەسەحییە
کوتیان: ئێرە ماڵە خۆتە، بۆ تۆ غەریبی نییە
ئەوە خێوەتی خانزادە خانە، سنگی دەڵێی دوڕی سپییە
شازدە ساڵە لە سوێی تۆ ڕەشپۆشە، هیچ شادمانەی لە دڵیدا نییە
دانیشە بەئیسرِاحەت و بەخۆشی و بەشادییە
حەوت سەت کەس لە تۆوە، لە خانزادە خان وەردەگرێ خەڵات و دیانەتییە
حەوت سەت کەس لێی وەردەگرێ جەواهێرات و زێڕی سپییە
ئەوی لە پێشدا خەبەری دابێ، بەوە دەدەن مزگێنییە.

جا لاس وەکو لە بانی بەربێتەوە وابوو. زۆر چاک دەگەڵ خانزادە خانی حەریری کەوتنە ڕاز و گلێیی و قسان. خانزادە خان کوتی: عەزیزەکەی من ئەتۆ بیست و چوار هەزار ماڵت حەریر و باڵەکی بۆ بێ ساحێب کردووە، ئەمنت بۆ لە قەفەس کرد ئەگەر دەتزانی کابرایەکی شێت و دێوانەی؟ ملک و ئیختییار و خەزنە و جەلالی خۆم هەموو لە بەردەستی تۆ نا، بەسەری بەتاڵ و بە ملی بە کوێن لە عەمری چاردە ساڵەییدا خۆم لێ مارە کردی، ئەلعان عومری من بۆتە سی ساڵ.

بەسەرگەردت بم یاری پڕ هونەر
یەگجار کەم شەرت بووی، شەرتت نەچووە سەر
ئەمبازی یەکترن ئاڵتوون و گەوهەر

---

(١) قومری ڕێز (؟).

دەینەکەی منت هەڵگرت بۆ سەحرای مەحشەر؟
بەسەرگەردت بم لە گوێن کەس نییە
شێری دڵ بریندار عیلاجی نییە
لە کن منت هەیە بۆ قیامەت ئازادییە
ئۆخەی غەوغەوەم کەوتە دڵییە
ئەوشۆ لاس لە من هاتووە بە میوانییە
ئەوجار مەعلووم بوو پشتم چۆل نییە
شانازییە بۆ من، شادمانییە.

ئەوە کەوتنە ڕاز و گلێیی، پێکەوە دانیشتن. لاسیش کوتی: موقەدەری خودایە.
ئەو دەستەی لە قەبرغەی لاس دا - خانزادە خان زۆر جوان بوو - کوتی: پێم بڵێ: بە چ حیسابێک هاتوویەوە؟ لاس کوتی: دەردی دڵ بەپەلە پەل ناگەڕێتەوە، ئەوشۆ میوانم.

پاش هەموو قسان خەڵک دەورەی چۆل کردن. خانزادە خانی حەریری کوتی:
بۆچی لەسەر خەزاڵ ئەتۆ دەستت لە من هەڵگرت و کردتمە سەرزەنیشتی هەموو عالەم؟
لە تۆ وایە ڕاستە، بەڕاستی خەزاڵ ماڵی تۆیە و ڕۆحمی پەڕیوەتە سەر تۆ و دەگەڵ کەسی دیکەی قسە نییە؟
چون ئەمن دوازدە هەزار ماڵم عێلی حەریر لە بەردەستی دایە. دایمە من دانیشمەند و موفەتیشم لە کن تۆیە. ئەتۆ چ دەکەی؟ بۆ خۆشت نازانی. ئەمن زۆرم دڵخۆشی بەوە بوو ئەگەر بێی لە من میوان بی و چاکە و خراپەت لێ مەعلوم ببێ.
ئەمن دوێنێ قەرەوڵم هاتۆتەوە، ئەوە خەزاڵ بۆ تۆ ئەو لەنجەولارە دەکا و بەفێڵ ڕوحی لێ هەستاندووی، دوێنێ قەرەوڵم هاتۆتەوە، دەیگوت:
خەزاڵ لە پێی کردبوو جووتێک کەوشی پانیە درێژی هەمەدانییە
لە خۆی دابوو شیر مەشکێکی عەسڵە پێستی نێرییە
بەرەڵبێنێکی لە خۆی قایم کردبوو کەڕەجاوی گەز نیو دینارییە

ژەنگ و تۆز گرتبووی مابەینی سنگ و زنجیرەی زولفییە
دەهاتەوە لە بێر و لە بێرە مەڕییە
قاسیدی ناردبووە کنی ئەحمەد خانی سوورچی و زوراریيە
دەیزانی ڕێگاکەی بێ شکییە و لاس لە ماڵ نییە
دەیگوت: ئەمن ڕوحم زۆر بۆ خەزاڵ تونییە
پێرێکە قەولی ژووانی پێ دا، دەستی نابوو لە دەستی ئەحمەد خانی سوورچی و زوراریيە
دەیگوت: ئەمن نەمزانی کابرایەکی بێ کەس و غەریب و هیچ کەمبەر زنجیری پیاوانی لە پشتیدا نییە
شەرت بێ ئەگەر بێتەوە ئەمن بیدەمێ ژەهری مارییە
ئەمن خۆراکی لاس نیم، مەیلم بەتۆ داوە لە ڕۆژی ئی منداڵییە.
خەزاڵێکی بێ کەس، لە نێو عێلی مەلا داود و مەلا نەبییە
ئەتۆ چۆن دەتوانی دابنیشی لە کن وی بەبێ تاییفە و بەبێ نەسل و بەبێ کەسییە؟
ئاخری لە کن خەزاڵ ئەتۆ دەبیەوە بەناهومێد و دادەنیشی بەجوانەمەرگییە
بۆ من بەجێ دێڵی خاکەساری و مل بەکوێنی و بابان وێرانییە
ئیدی ئەگەر وای گوت پاڵی پێوە نا، کشاوە.
لاس کوتی: حورمێ بەو خودایە کەم ئەگەر ئەزەلییە و ئەبەدییە
ئەو قسەیەی تۆ دەیکەی نە ئی عەرزییە و نە ئی عاسمانییە
هیچ ئاگات لە کاروباری خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییان نییە
خەزاڵ لە عەینی بێ کەیفیدا، دەپێی دایە جووتێک کەوشی پانیە فەڕڕاشی سەر نوقرە بەندییە
لە پێی دایە جووتێک گۆرەوی گەم گەم کاری کەژ مارییە (؟)
لە پێی دایە ئاواڵ کراسێکی مەشەدکاری گوڵ گوڵییە، وەنەوشەڕەنگی پەڕ تاوسییە
لەبەری دایە کراسێکی موشەجەری کیمخوای عەسڵە مەحمەڵ داراییيە

سبحەینان ڕەشە، ئەگە تاوی وێ کەوت سپییە
ئەگەر لە پیاوی وەرگەڕا لیمۆییە
پشتێندێکی لە پشتی دایە، قیمەتی لە کن کەس نییە
هێندێک دەڵێن: پەڕی ڕەشە داڵە، هێندێک دەڵێن: بەعەمەل هاتووە و وردە تووکی قومرییە
لەبەری دایە کەوێیەکی، هیچ کەس ئەو پارچەی نەناسییە
سبحەینان گوڵ گوڵییە، ئێواران بێ ڕەنگە، کەس ڕەنگی لێ مەعلوم نابێ و ڕەنگی نییە
حەوت ڕەنگە و شەمامەی ون دەبێ لە تووکییە
بەسەری داداوە دەسماڵێک، سەر پۆیلەی خالانیەتی، دەڵێی قەدەمی هەوەڵ مانگی بەهارێیە، جار جار لیمۆییە، جار جار لاجیوەردییە
جار جار لە ڕەنگی خاسەسییە
خەزاڵ خاڵێکی لە مابەینی هەرتک لێویەتی نەخشی وا لە هیچ کەس نییە
خەزاڵ لەسەریەتی شەدێکی فەرەجوڵلای کۆر حوسێنی خدر بەگییە
هەر ڕیشوەیەکی لەبەر دڵی من تەواو خەراجاتی عێلی خانزادە خانی حەریرییە
پاسەبانی نێوچاوانیەتی با، مەگەر هەڵیان داتەوە لەسەر کوڵمێکە لیمۆییە
کلاوێکی لەسەر ناوە، فێستی تورمەیە و لێی چەسپ کردووە بەدری بەحرییە
لە شانیەتی چارشێو شانێک گەزی لە نۆ سەد مەجیدییە
بەچل کچان ڕۆژێ حەوت ڕیشوەیان لێ هەڵبەستووە، ڕیشوەی نیو گەزییە
ئەگەر بای شەماڵ لێی دەدا، تێکەڵ یەک دەبن. کەسێک بیبینێ، شێت دەبێ، دوای ئەو دیتنە ئیدی تازەکانە ئاگای لە دنیایە نییە
گەردن کەشانە، چاو بەنگییە، سورمەییە، گەندومییە
سبحەینان ڕەنگێکی دیکەی هەیە، سوور و سپییە
تەرحی ئەو حۆریانەیە ئەگەر خودا دروستی کردوون لە بەهەشتی باقییە
نازانی، تیرێکی لە دڵی من داوە بەدەستی تۆ دەرێنانی نییە

کەسێکی بوختان بەخەڵکی بکا بۆ خۆی دەبێتە نەهاتی و بەدبەختییە.
قەستەم بەوەی کەم ئەگەر بێ مەکانە
چومکە بەخەزاڵت کردەوە بوختانە
نە بەئەسپم چیدیکە دەگرمەوە وچانە نە بۆ خۆشم لە ماڵت دەخۆمەوە پەلکێک نانە
نە پەنجەشم لەسەر مەمیانت دەبێتەوە بەمیوانە
چومکی بەخەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییانت کردەوە بوختانە.
لاوژە من کردم تۆ نەیکەی، کورە ڕێی هات و نەهاتە ڕێی چل پلەی حومام و بەندی گەوەڕێ
ئەوە ناردوویانی بۆ گوڵی هەلاڵ و بەیبوون و شلێر و گیابەند و خاو، ئەگەر دەبێتەوە بە سەر پەلکی عەتری گولان (؟) سێوەڕێ
هەزار جار مەرگم وەپێشت گەڕێ، خۆ من دوژمنی تۆ نیم، یەخەت هەڵکردووە و هاتوویە شەڕێ.
نابەڵەدی، کەس نەبووە ئەگەر پێت بڵێ: ئەو ڕێگایە کەس نەچووە و کەس گوڵی لێ نەهێناوە
ئەوە دۆستایەتی نییە و پەڵپە لە تۆ گیراوە
ئەتۆ شێتی شەیدای یان پەرییان دەستیان لە دڵت داوە
ئەو کارە بۆ کەس نەبووە و نەبووە و نەکراوە
تەماتە بۆ خەزاڵ بکەویە سەر قسان؟ خەڵکی بڵێن: لاس بۆ ژنێک ڕوحی خۆی بە هیلاک داوە
چوار سەد کەسی تەریدە و دز، پیاوی وەک وەتمان بەگ لەوێ ڕێگری بونیاد ناوە
مامەڕەش شاگردێتی، وەکو ڕۆستەمی زاڵ خولقاوە
هەزار جار دەستم بەداوێنت، عارەقی سنگ و بەرۆک و مەمکان وەرە بەلێوان بماڵە،
ئەو سەفەرە بگەڕێوە دواوە
تا سبحەینێ خودا ڕەحیمە، کەریمە، با خەڵک پێم نەڵێ، بڵێن: لاس لە چل پلەی

حومامێی لێ قەوماوە

وەرە سنگت بۆ دەکەم بەباغی شەددادی، مەمکم بەمیسالی هەرمێ گولاوە

خۆ هەچ کەسێکی ئەگەر ئەمن ببینێ، خەڵکی دەڵێن: بۆ بێ عاقڵ بووە، بۆ سەری لێ شێواوە؟

ئامانەتییە، دییانەتە، بۆ تۆ هەڵگیراوە.

ئەتۆ زەینێکە خۆت دەوە گەوەڕی سنگ و بەرۆکان، دەڵێی کوێستانی عەڵەدینیانە و تازەی بەفر لەسەر لاچووە

ئەتۆ زەینێکە خۆت دەوە زەردە کوڵمان، دەڵێی سومبولە و تازە گوڵی سوور بووە

تەمەشای دوو گۆشەی چاوان بکە، دەڵێی بولبولی هەوەڵ بەهارێیە و عاشق بووە و شێت بووە

دەڵێی دووکان و بازاڕی خواجە حەسەنی موسڵێیە و ئاوپڕژێنیان کردووە و حازریان کردووە

کوڕە ئەو سەفەرە نەکەی، با نەڵێن: خانزادە خانی حەریری و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییانی لە کیس چووە.

مەگەر ئەتۆ زەینێ خۆت نەداوەتە چل پلەی حومامێ، داوێنی بەهەتاوە و سەری هەمیشە بەتەمە؟

تۆ بۆ گورگ ئاوڕێک نادەیەوە بڕوانی ئەو خاڵ و وردە پەرچەمە؟

خۆ یەگجار زۆر ئارەزوویەتی ئەما پەروانە لێی دوورە شەمە.

دەستی منت داوێن بێ، نەمکەیە سەرزەنیشتی مەست و ئیغیارە

چاوێکت بۆ دەکەمەوە بە مانگ و ئێکت بۆ دەکەمەوە بەستارە

لە پشتم دەبەستم کەمبەرەی سێ کۆی تەخت زێڕی ئەگەر لە هەمووی پەرەنگی بکاتەوە ئامان ئامان و هاوار هاوارە

هێندێک بڵێن: دەنگی هەورە و هێندێکیش بڵێن: خێر کوڕەم کوڕڕەمی لوزەوی سوارە

هێندێک بڵێن: قافڵەیە و هێندێک بڵێن: قەتارە

هێندێک بلّێن: خاسەسین سەریان لیّ شێواوە ئەو قاوە قاو و هاوار هاوارە
هێندێک بلّێن: خێر لە شاخی دیّ ئەوە دەنگی مارە
ئەتۆ بەدلّ تەمەشای کولّمێکی ناسک کە هەر دەلّێی سێوی خوسارە
ئاقلّ بۆیە شتێکی چاکە کەسی پیّ نابیّ بریندار و گرفتارە
ئاقلّ هەمیشە لە پێش پیاوێوەیە، دەبێتە وەستا و جلّەودارە
حەیفیّ پیاوی وەکو تۆ لە عاقلّدا کەمە و بیّ ئیختییارە
بۆت ڕابژێنم بەندی تۆق و تەلەسمان، جۆللانە بکەن گوارە و قەتارە
بۆت هەلّێنم دوو چاوی ڕەش و بەزەردەخەنە دلّت بکەمەوە بریندارە.
عەجایەب ئەتۆ چ عالەمێکی! ئەمن جەرگم بۆ تۆ کەبابە
ئەتۆ ئەلعان ئیغیاری ئەما ماچی کولّمەی من بۆ تۆ شەرابە
یار ناز و نیم ناز دەکا، ئەمن نالّیم: دەستت لەسەر زەرد مەمیانم لابە
خانە خراپ ئەمن چلۆن ئارەزووی تۆم هەیە، ئەتۆش دلّت بگۆڕیّ، ئەتۆش وابە.
زەینیّ خۆت دەوە چل پلەی حومامیّ جار جار بەتەمە و جار جار با لێی داوە
ئەو سەعاتە تەمی لەسەر نەماوە
خاترجەم بە ڕێگا بەندە و ڕێگا گیراوە
ئەتۆ دەبوو حەوسەد سوارت دەگەلّ بیّ، هەموو، بلّێن: ئێکی سەد و چل تیریان لەخۆ داوە
هەروەکو ڕۆستەمی مازندەران، هەمووی لە عومری بیست و یەک سالّەیدا بویایە،
بیانکوتایە: سوبحانەلّلا ئەو لەشکرە چلۆن خولّقاوە؟
جا ئەو وەختە نجومدار دەیانگوت: مومکینە لەوانە سەتی دووانیان بگەڕێنەوە دواوە
ئاخر لێرە ئەتۆ میوانی منی، ئەگەر بۆ بەدمەستیتە مەیخانەم بۆ تۆ داناوە.
هەزار جار دەستی منت داوێن بیّ، بیّ عاقلّییە
بەتەنیّ ئەو ڕێگایە ڕێگای تۆ نییە، ڕێگایەکی هیلاکەتییە
ئەمن لە بەردەستم دان دوازدە هەزار مالّی بالّەکی و حەریرییە

پیاو لەسەر خێرانە ئەگەر ڕابوەستێ لەسەر سەبرییە
ئەمن هەزار و پێنج سەد کەست بۆ ساز دەکەم هەمووی جوکلی هەمەوەند و لە عەمری چاردە ساڵەییە
دەسکی خەنجەری نیوێکی نێرۆییە، نیوێکی ماهییە
مەرگی منت وەپێش گەڕێ بەبێ بوار پیاو چۆن دەچێتە نێو بەحرییە
ئاخر بەشێتت دادەنێن چون گەمیە و پاپۆرت پێ نییە
پیاو ئەگەر بچێ دەبەحرێوە، بێ عاقڵییە، هیلاکەتییە
با لە کن خەزاڵیشەوە هاتبێ، بڵێن مەستە و ئیغیار نییە
ئاخر ئەمن ئەوە نسحەتم کردی بۆ عاقڵ و ئیغیارییە
زەینێ خۆت دە چل پلەی حومامێ، ڕێگای باڵندە کەو و باز و شەهێنە
وەرە مەرد بە بە قسەم بکە و دڵم مەشکێنە
شەمامە و شەمامە ڕەنگینی بن کراسێکە مەحمەڵ دارایی ئەوشۆکە بژاکێنە
ئاخر گراوییە بابم زۆرت ئینتیزار بووم، وەرە مەرد بە، ئەو ڕێگایە ڕێگایەکی خوێن ڕێژییە، ڕێگای مەرگە، مەیکە بەلاساری، سەری وڵاغت وەرگەڕێنە.
زەینێ خۆت دە چل پلەی حومامێ بەئاو و ڕووبار و کانی و جۆیە
حەڕەکەت بە وڵاغت مەدە، دوازدە هەزار ماڵ حەریری چاویان لە تۆیە
لە دڵەکەی من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە و چەندی لە بۆسۆیە
ئیدی جارێک لە جاران کوتوویانە لاس لە مەیدانی دەرکردووە گۆیە
ئەتۆ گورگ ئاوڕێک بدەوە، سنگ و بەرۆکی من وەکو سومبول ساحێبی بۆیە
ئاخر بەمیراتی بە جێ دێڵی، قسمەتی کەسی پێوە نییە و ماڵی تۆیە
پیاوانە بە نەزەر تەماشاکە مابەینی ئەو دوو چاو و برۆیە
چاوان هێندێک دەڵێن: ئەستێرەی سوهەیلە، هێندێک دەڵێن: خێر تەرازووە و کۆیە.
کێ بوو لە لاس و کێ بوو لە لاسە شۆڕی باڵەکییە
شێتە و دێوانەیە و مەستە و ئیغیار نییە
دەیگوت: کیژێ لە دڵێکە من گەڕێ گیراوە و حەفسییە

هەوەڵی ڕۆژێ ئی خۆم بەرداوە و چوومەتە بێگانە پەرەستییە
دەنا سێو بەدارێکەوە بن، هەرتک یەک ڕەنگ بن فەرقییان چییە
هەزار ڕەحمەتی ئەزەلی بێ لە قەدیمییە
ئەگەر لە خۆتدا مەوجود بێ، نابێ بچیە بێگانە پەرەستییە
زەینی کزەی جەرگم کە، هیچ عیلاجم نییە
تیخی بێ ڕوحمی وا داوم لە جەرگییە، شێتم، دێوانەم، ئەتۆ حەقتە پێم بڵێی: وەحشییە
سەفەری چل پلەی حومامێ بەمەرگیش تەواو بێ، ئەمن پێم هیچ نییە.
لاس دەیگوت: کیژێ بریا ئەوشۆ لێرە بوومایە، تۆ دەگەڵت کردم ڕاز و گلەیییە
قسێکی وات کرد لە خەزاڵی مەلا نەبییاندا مەوجود نییە
ئەمن هەمیشە ڕوحم ویشکە و تونییە
سنگی خەزاڵ بۆ من دەبێتەوە بەشەربەت و کانییە
ئەگەر خەزاڵ نەبێ لە من وایە ئەو دنیایە کەسی دیکەی تێدا نییە
جا نازانم نە ئەجەلم بەو کارە هاتووە یان موقەددەری هەق دەستی ئیلاهییە.
کیژێ لە سنگی خۆت داوە یاقووت و گۆ و دوڕ و مەرجانە
قەرە زولفت وەک ئاوریشمی خاو لێ کردووم پەخش و پەرێشانە
جووتێک شەمامە و شەمامە ڕەنگینت وا لەسەر سنگت دانا
حەقتە، خەڵک ئەگەر بیبینێ بۆی دەبێتە شێت و دێوانە
ئەما حەیفێ ئیرادم هەیە، بەخەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییانت کردەوە بوختانە.
ئیجازەم بدە، ڕۆژ درەنگە، ئەوە کەوتە سەر شاخان گزینگی هەتاوێ
بەئەبرۆی مەستت تیرەندازیم لێ مەکە، کەم تیرم بۆ باوێ
کەمم تیر باوێژە مابەینی جەرگ و دڵ و هەناوێ
ئارەقەت لەسەر کوڵمەی دەتکێ وردە وردە، دێنێتەوە خوناوێ
تازەکانە دەبێتە نامەردی، دەنا من ئەو سەفەری گەورە و گرانم ناوێ
دەبێتە تانوت بۆ کن خەزاڵ، دەڵێ: لێم نەدی کام و کاوێ

نەیوێرا بچێتە چل پلەی حومامێ، بۆم بێنێ گوڵی هەلاڵ و بەیبوون و سومبول لەگەڵ بەندی گیابەند و خاوێ

دەترسم ئەو ڕۆژە خەزاڵ دڵی بێشێ، لە دڵی خۆییم دەرباوێ.

ئەتۆ خەزاڵت نەدیوە ئەگەر سبحەینان خۆی ڕادەوەشێنێ

لە مابەینی زنجیرەی زولفان عەتر و عەبیر و گولاو دەوەرێنێ

چاوی چەپەی دادەگرێ ئەگە بەناز چاوی ڕاستەی هەڵدێنێ

ئەبرۆی دەبێتە مەعموور، سێدارەی قەتڵ دەچەقێنێ

هەزار جار عومری لاس و کورتە لاسی باڵەکانی بۆ نەمێنێ

بەژنی دەڵێی غەڵفی یەک ساڵەیە، سبحەینان ئەگەر با ڕایدەژێنێ

چاوی دەڵێی ئەستێرەی ڕۆژییە، جار جار دێتە سامالّی و جار جار لە هەوری دادەمێنێ

هەچەندێکی ئەگەر ئەمن فکری لێ دەکەم قابیزە و ئەو ڕوحی عەبداڵم لێ دەستێنێ.

ئەما ئێمە شەرتێکمان کردووە، ئەمن وەک تۆ بوختانکەر و درۆزن نیم، دەبێ شەرتی خۆم بەرمە سەرێ

چومکی بەجێم هێشتووە هەلاڵ و بەیبوون و قوڵکەی گەردنی بەمن بمێنێ بەئاوی کەوسەرێ

یان دەبێ ئەو ڕۆحە لە بەدەنی من بچێتە دەرێ یان دەبێ ئەمن لە خۆم بدەم تانوت و حونەرێ

گوڵی چل پلەی حومامێ بێنم بەحوکمی تیرەندازی و بەخرمە و قریوەی خەنجەرێ

جا ئیدی نازانم موقەددەری هەق دەستی ئیلاهییە هەچی بەسەرم دێ با لێم بەسەرێ.

خانزادە خان سەرسپێکی بوو، نێوی یایە سەلە بوو، سەلەی خاڵند بەگ، پێی گوت[1]، کوتی:

---

(١) سەلە بەخانزادە خانی گوت.

دەزانی ئەگەر ئەو کابرایە لە نێو ئێمە بڕوا بۆمە ئابڕووچوونە، بۆمە دەبێتە عەیب؟
هیچ گلێیی لێ مەکە دێوانە و سەوداسەرە
هێندە عاشق و عەمربەرە، دڵ پڕ لە ژانی نەشتەرە
عاشقی دوو لیمۆی گەوهەرە
نازانێ گەر باسی سەرە.

لە عێلی حەریریدا دوو سەد کچی وا هەیە لە تەمەنی پازدە ساڵەیدا، خودای بێ نەزیر جوان چاکی دروست کردوون.

چونکی ئەوە هێندە مەست و شەیدایە
تیری عیشقی لە دڵی دایە
بەقسە و گفتوگۆ چارەی نایە
خەزاڵ مێرە و ئەویش وەفایە
تەگبیری دەوێ ئەوی کەونەکێ کەونە دونیایە
چەند جوان دەستیان پێ گرتووە، چەند جوانمێر دەستیان لێ بەردایە
چەندی هاتوونە سەر تەخت سوڵتانان، قاقان و میر و جانفیدایە
ئەوانە هیچیان جێگایان دیار نییە، هەموو چوونەوە بادی فەنایە
مەگە تۆ نێوبانگی مەجروومت نەبیستووە ئەگە عاشق بوو بەشیرن لەیلایە
لەسەر عاشقێتی ئی لەیلێ مەجروومیش دەبۆوە موتەوەففایە
کەسێکی ئەگەر عاشق و دەرد لە دڵ بێ، بەقسە عیلاجی نایە
چون هەچەندی تۆ قسەی بۆ بکەی ئەو چرای عاشقێتی لە دڵی دایە
لە دڵی وی هەمیشە شین و گریان و هاوار و واوەیلایە.

با ئێمە ئەو دوو سەد کچە بنێرین بەڵکو نەڕوا و بگەڕێتەوە، ئەوە بەقسە لاسیان خافڵاند. لە بنەوە هەتا دوو سەد کچی خڕخاڵداریان ساز کرد. هەچەندی چاویان هەڵدێنا بنی ئادەمی بۆیان بەنگی و شێت دەبوو.

لاس ئەگەر گوێی هەڵخست، لە خانزادە خانی حەریری پرسی، کوتی:
ڕەئیسی سەرداری عێلی حەریری

دادەنگ بزانین ئەوە پێم وایە هاوارە
یانە سەرڕەوی لەشکر و سوارە
چاکم بۆ مەعلوم بکە و بۆم بکە ئەو پرسیارە
ئەو دەنگە دەنگ و ناڵە ناڵە دڵی پیاوی دەکاتەوە وشیارە.
کوتی: کورتە لاسەکەی باڵەکان، هیچ کەس بە تکا و ڕجا لە شەوگوردی تۆ نایە
ئەوە شل و مل و سایەگەردنی عێلی حەریرن، هەمووی بەژنی دەڵێی چوزەی شلکە بیزایە
ببینە مابەینی عەرز و عاسمانی گرتووە، خرینگە خرینگە، ناڵە ناڵە و سەدایە
هەر کیژەی خۆشەویستی خانەوادەی خۆیەتی، لە کورتە لاسی باڵەکان هاتوونە تکایە.
هەمووی دەزانن ئەگەر سەردار عێلیان خانزادە خانی حەریرییە،
عومری کەمێک ڕابردووە و کامڵە
ببینە لەنجەولاری کیژان هەمووی دەڵێی خەرمانی گوڵە
ئەمن دەڵێم: لاس پیاوێکی بێ هۆش و بێ دڵە.
زەینێ خۆت دە کیژی چەلەنگی گوارە زێڕ، تەمەشای چەند شیرنن، ئەو دوو سەد کەسە هەمووی لاوە
هەمووی دەڵێی ئەشرەفییە و تازە دەرکی خەزێنە ئاواڵە کراوە
هەمووی دەڵێی خاسە سییە تازە نیشتووە لە دەم شەتاو و گۆلاوە
هەمووی دەڵێی وەنەوشەیە و تازەکانەی گوڵ داوە
هەمووی دەڵێی ڕەشە ڕێحانەیە دەستی لێ نەدراوە و نەژاکاوە
پیاو دەبێ ئەڵلاهوممەسەللی بکا، ئەوە پاکی بەعومری باری تەعالوڵڵا بێ ناقیسی خوڵقاوە
ئەتۆ دەبێ شوکری خودا بکەی ئەگە خودا ئەو تەڕەقی و تەسەللوتەی بەتۆ داوە
ئەوانە هیچ کەس نەیدیون بەچاوە
ئەوە سومبولن هیچی تاوی لێ نەدراوە
هاتوونە تکای تۆ ئەگەر سەرت لێ شێواوە

بەتکای کیژان بکەی، ئەوشۆکە بگەڕێیە دواوە.
کەسێکی ئەگەر لە دونیایەدا دڵی خەڵکی بشکێنێ
ئەو کەسە لە دونیایەدا نەدامەتی دێنێ
زەینێ خۆت دە ئەو کیژانە پاکی قەرە زولفی ئاورینگان دێنێ
جەرگ و دڵی پیاوی لە نێو زگیدا ڕادەوەشێنێ
شەهێن لەسەر ئەوانە باڵی دەسووڕێنێ
هێزی باڵی دەشکێ هیچ عاقڵی پێ نامێنێ.
زەینی خۆت دە کیژان پیاو لێیان پەیدا دەکا عیشق و نەشەیە
هەمووی سوورە و سپییە و گەندومییە و توتوفحەیە (؟)
شوکر بەبەشی هەق تەعالوڵڵا ئەگەر ئەمن ئەو حوکمەم هەیە
ئەوە سەبارەت بەلاسی باڵەکانە، ئەو عێلە هەمووی دەزانن ئەگەر لاس لە گۆڕێ دایە
ئەگەر بەقسەی منیش ناکەی قسەی منت لەبەر دڵی گرانە
سەری منت ببێتەوە بەقوربانی ئاوزەنگی ولاغی، ئی خەنجەرێکی قەرە خۆراسانە
دوازدە تیری عوقابی ڕەنگی پەپوولە نیشانە
دڵ شکاندنی خەڵکی شتێکی خراپە، ئەگەر دەکەیەوە باوەڕ و متمانە
ئەتۆ دڵی من مەشکێنە، لەمێژە ئینتیزارم و دەردم گرانە
ئەگە بێتو نەگەڕێیەوە، ئەوە دەبێتە نامەردی، توخڵا جا ئەوە شەرتی پیاوانە؟
جا لاس دەیگوت کیژێ کیژێ کیژی کێیە
پێم مانگ لە عاسمانێ ئەوشۆ سێیە
سەری کوڵمەت ئەلفە و بێیە
ناسکە دەڵێی زەردە بێیە
شێتم، شەیدام، قسەم بێ ڕێیە.
ئەما کیژی مەرزینگانە
زۆر فەسیحە و زۆر چازانە

ئەوشۆ دەبم بەمیوانە
ئەمن برام و تۆ وەک خوشکانە
بۆ خەزاڵ دەردم گرانە.
بەقسەی دڵتم دەگەڵ مەکە
مەیکە بەناڵە و بەچەقە
ئەو سەفەرەم مۆڵەت بدە.
بانگی کچەکانی کرد لاس، کوتی:
کوڵمەو هەروەکو لیمۆیە
مەمکو خڕ بووە دەڵێی گۆیە
زۆر جوانن چاو و برۆیە
سنگو وەک کوێستان پڕ بۆیە
گەڕانەوەم خاتری تۆیە.
ئەنگۆ باز بن من سەقرم
ئەوشۆ خاتری ئەنگۆ دەگرم
تا عومرێکی ڕادەبرم.
ئەگەر بژیم و بمێنم
یان شەش پەڕان دەچەقێنم
یان سەری خۆم دەدۆڕێنم
یان شەنگم لە قوڕێ دەردێنم
یان گوڵی چل پلەی حومامێ دێنم
ئەنگۆ سوور و سپی تێک دەچرژێنم
هەچ کەسێ بەمەتڵەبی خۆی دەگەیەنم.
کێ بوو لە لاس و لە لاسە شۆڕی بەڵەک چاوە
ئەوە بەقسەی شل و مل و سایەگەردنان دەگەڕاوە
خێوەتێکی پێش بەئەتڵەسی سەر بەژەنگاریان بۆ هەڵدەداوە

ئەوە تەخت و مێز و سەندەڵی لەعلی ڕوممان و یاقووتی عەبدولحەسەنیان لێ دادەناوە
دەستبەجێ ئاویان هەڵدەبڕی، دەیانهێنا پێش خێوەتی وی گۆم و گۆمیلکەی دە بەفراوە
ئەوە مەڕامی دڵی خانزادە خانی حەریری بەجێ گەییشت، ئەوشۆ لاس میوانە، قسە و گفتۆگۆیان دەبێتەوە تەواوە
ئەما وەکو شێخان هیچ دەستی نەبزاوت و قامکی بۆ خانزادە خانی حەریری نەدەهێناوە
دەیگوت: ئەو ئامانەتییە وەردەگرم، با ئەو سەفەرە بگەڕێمەوە دواوە.
ئەوە لاس دەڵێ:
تۆ خەزاڵت نەدیوە، ئەمن عاشقی خەزاڵم، لە خودا زیاتر لە کەسم نییە باکێ
خەڵکی دەڵێن: لاس بێ عاقڵە، بۆ ڕوحی خۆی هاویشتۆتەوە سەر ڕێگای هیلاکێ؟
کەسێک لە دڵی منەوە خەزاڵی دیبێ، کار و کارمامزی سپی چاو ڕەشە، چێشتانان دەچێتەوە قەسر و ڕووبار و سەر چۆمەکەی شەمامکێ
ئێواران دەچێتە ڕووباری زودییان، سبحەینان پێدەکەنێ و ناز دەکا لە دوای دایکێ
خۆ من چۆن دەست هەڵبگرم لە بەژنێکە باریک و زەندێ پڕ لە بازن، هەتا سەری خۆم نەبەمەوە بن خاکێ
خۆ ئەمن ئەوێ ڕۆژێم پێ خۆشترە لە ژیانی ئەوڕۆ، ئەگەر لە بەردەستی خەزاڵم دادەنێن، دەڵێن: لاسە کوژراوە و کەوتووە لاشە و کەلاکێ
چانییە بەدوو چاوی بەنگی خەزاڵ لەسەرم دەگری، وردە فرمێسکی لەسەر کفنم دەبێتەوە بەخوناوکێ.
ئەتۆ نابەڵەدی خەزاڵی، ئەگە دادەنیشێ شل و ملە دەگەڵ پۆلێکە شەنگەبێرییان
خۆ ئەگە ئاویشی کەم بێ، ئەگە چوو بۆ مەڕی ئەو ئاوە زیاد دەکا، لە مبارەکی خەزاڵ ئی کانییە قەمبەرییان
ئەتۆ بەشل و ملی نەتدیوە ئەگەر دەچێتەوە پایزە هەوارێ، عێل هاتۆتەوە سەر

چۆم و ڕووباری زودییان
ئەو کوێستانانەم بۆیە پێ خۆشە خەزاڵ هاتوچۆ دەکا لەوان
باز و قورینگ و شەهێن چاوەڕێن، ئەگە ئەوان باڵندەن، وەحشییاتن، ئەگەر بێتو
خەزاڵ بچێتە کۆسرەتی شاڵە بەگییان
چون گوێیان هەڵخستووە، دێ دەنگی تۆق و تەلەسم و وردە گژنیژی گەردن کەش،
دەبێتە سەلای فەقێیان وەکو مانگی ڕەمەزان
ئەو باڵندانە چاوە ڕێگای ڕێی خەزاڵن، لە خۆیان حەرام کردووە ئاو و دان
ئەمن دەست هەڵناگرم لە بەژنێکە باریک و زەندێ پڕ لە بازن هەتا بەدەستی کوڕە
جحێڵە و کچە زودییان کەلاکم هەڵنەگرن و نەمبەنەوە سەر گۆڕ و قەبران
لە کن من وایە خەزاڵ لە قەبرێدا بۆم دەداتەوە جوابی مەعمووری ڕەحمان
زۆرزانە، چازانە، فەسیحە، بەلیغە، مەحکومی ناکەن مەعمووری سوبحان.
تۆ بەچاوی من تەمەشای خەزاڵت نەکردووە ئەگەر دادەنیشێ بەخانومانی
کەسێک نەخۆش بێ، دوازدە مانگە ناڵەی بێ لەبەر دەردی گرانی
بیبەنە مەجلیسی خەزاڵ، چاوێکی بۆ دەبێتەوە بەحەکیم و یەکی بۆ دەبێتەوە بە
لوقمانی
تازە ئەو نەخۆشە لەبەر ئەو دەردە ناناڵێنێ، دەبێتەوە خلاس و فانی
ئەمن دەست هەڵناگرمەوە لە بەژنێکە باریک و زەندێ پڕ لە بازن، هەتا مەعمووری
خولای تەماحم نەکاتەوە لە ڕوح و لە گیانی
ئەتۆ خەزاڵت نەدیوە ئەگەر بەزەردەخەنە پێدەکەنێ
مەگە قەتت نەدیوە ئەگەر دێنە گوڵ دان گوڵ لە بەدەنێ
ئەو گوڵانە لە حاستی پێکەنینی خەزاڵ شەفافیان نییە، گوڵ بێ قابیلەتە دەبێ پیاو
هەڵیکەنێ
ئەگە دەنگی دێ لە تۆق و تەلەسم و زێڕ و زنجەق و گوارە و کرمەک و بەربەنێ
هەچ کەسێکی عاشق بێ، جەرگ و دڵی لە زگیدا دەگەنێ.
جا خۆ ئەمن لەوێ حەفسی نەدەبووم شازدە ساڵە، خاڵی خەزاڵ لە من بەگۆل گۆلە

ئاخر ئەمن لەبەر ئەو خالانە دلم بەحری پڕ شەپۆلە
دەنا عاقلم هەیە و دەزانم مەملەکەتی باڵەکی و حەریری چۆلە.
ئەلعان ئەو بایەی دێ لە عێلی سمایل عوزێرییە
چومکە ڕەئیسی ئەو عێلە خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە
خودا هێناویەتە سەر دنیایە، دەنا حۆری بەهەشتی باقییە
ئەمن بەو بایە دەژیم، لە دلم دەداتەوە فێنکی و خۆشییە
ئەو بایە بۆنی خەزالم بۆ دێنێ، بۆیە دلم ئاسوودە بووە، ڕاوەستاوم بە خاترجەمییە
دییانەتی خەزاڵ دێنێ ئەو بایە، دەنا خۆ ئەمن ژیانم بۆ نییە
لەبەر چاوی من سەفەری چل پلەی حومامێ بێ قابیلەتە و قابیلەتی نییە
ئەو کەسەی کەمبەرەی قەتڵ ببەستێ، بلێ: لەگەڵ لاسە شۆڕی باڵەکانم هەیە دوژمنایەتییە
ئەمن بەمژانگی خەزالی لەگەڵ دەکەمەوە شەڕ و تیرەندازییە
حورمێ ئەتۆ بوختانت پێ کرد، بۆیە ئەو برینەت هاویشتمە دلییە
ئەو بوختانەی تۆ بەخەزالت کرد، درۆیە و تێیدا مەوجود نییە
ئەگە ئەتۆ دەپرسی لە ئەحمەد خانی سوورچی و زوراریيە
خەزاڵ عاشقە، چاو بەنگییە، لە لاس زیاتر وا نازانێ کەسی دیکە هەیە لەو دنیا فانییە
تیری منی لە جەرگی دراوە، دایمە مەستە، ئیغیار نییە
قەت سەعاتێک ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری ڕاناگرێ بەخزمەتکار و بە نۆکەرییە
من بەوە دلم لە تۆ هێشا، وەختە بلێم: ئەگەر مارەکراویشم نییە.
کیژێ من لەسەر سەفەرم، قسەت لەگەڵ دەکەم، خاترجەمِ بە عاقلم لە کەللەیدا نەماوە
زولفی خەزاڵ کەمەندە، داو داوە
جا خۆ من بەخۆم نییە لە ملم و لە دلم کراوە

هەموو ڕۆژێ لە کچە زوراریيان دەپرسێ: بۆچی لاس نەگەڕاوە دواوە؟
پەرێشانە، پەشۆکاوە، وەکو ئاسکێکی تفەنگچی لەسەر بێ، ڕێی لێ گۆڕاوە
ئێوارە و سبحەینان، دەستەوئەژنۆ دادەنیشێ لەسەر گۆم و گۆمیلکەی بەفراوە
مژانگی ئی خەزاڵ بۆتە قەرەوڵ، دایمە تیرەندازن، لەسەر دڵی من ڕاوەستاوە
ئەمن ئەو ڕۆژەم دنیا پێ خۆشە ئەگەر وردە وردە خەزاڵ بۆم هەڵدێنێ
دوو گۆشەی چاوە
وەدەزانم کە مەعمووری ڕەحمان خەبەریان بۆ من هێناوە:
خاترجەم بە، تۆ بەهەشتی، دەرکی جەننەتی باقیت بۆ کراوە
دەشزانم هەر وایە، کەسێکی دەگەڵ خەزاڵ تێک باڵێنێ، بەژنی وەک ڕەشەڕێحانە و
وەک لاولاوە
دەرکی جەهەندەمی لێ دادەخرێ، لە بەهەشتی باقی بەشی وییان داوە.
ئەوە خانزادە خان پێی دەڵێ:
ئەڵلاهوممەسەللی عەلا محەممەد لەو تیری بەپەیکان خەزاڵ لە جەرگی تۆی داوە!
بۆیە وا ئەژنۆت بەستراوە، زگت پڕ لە خوێن و لە زووخاوە
لە هەق دەستی ئیلاهی تەوەقو دەکەم چومکە دڵت هێندە لە ژانە و هێندە سووتاوە
مارێکی وا بەدڵی تۆی وەداوە، ئاورێکی وات بەر بووە لە جەرگ و لە هەناوە،
بەقسە و ئاوی دەستی من نەکوژاوە
نەسیحەتی کەست ناچێ دەگوێیەوە، بووە بەحەفسخانەی تۆ ئەو جووتە چاوە
خاترجەم بە خوداوەندی میری مەزن ساحێب ڕوحمە، ڕەبی لە خەزاڵی ببینی کام
و کاوە
ئەگەر خەبەرم بۆ بێنن، بڵێن: بەخۆشی لاس لە چل پلەی حومامێ گەڕاوە
تۆقێکم لە گەردنی دایە، دەیدەم لە مزگێنی، چون ئامۆزاکەی لە دای و بابیم
ئەلحەملای بە بەدبەختی لێی نەقەوماوە.
ئەگە تۆ هەر دەڕۆی ئەمن تەمەننا دەکەم لەبەر ئەو خودایە
بەکفلەکونێک داینا عاسمان و ئەو دونیایە

ئاگادارت بێ عیسای بنی مریەم، تەمەننات بۆ بکا ئیبراهیمی خەلیلوڵڵایە
ئاگایان لە تۆ بێ هەر چوار یاری نەبی، ئەمن دوعام ببێتەوە موستەجایە
تەمەننات بۆ بکا لە ڕۆژی گفتوگۆی ئەگە ئیجازەی هەیە لە خزمەتی خودایە
فەرمایشتی بەخێریت بۆ بکا موسای کەلیموڵڵایە
هاوارت بۆ دەکەم ئەگە تۆ عەولادی بەئادەمی سەفییوڵڵایە
ئەتۆ مەستی، برۆت جووتە، لەبەر عاشقێنی خەزاڵ چاوت هەڵنایە
ئەو جارە کە تەمەننات بۆ بکەن بەدڵی پڕ حەسرەت جەمیعی شەهیدانی سەحرای کەربەلایە
ئامانەتداری تۆ بێ وەیسەلقەرەنی لە ماهیدەشتی بەغدایە
گرێی دڵت بکرێتەوە، نازانم تۆ چ دەردێک و داخێکت لە دڵی دایە
مەڕامی دڵی تۆ پێک بێ تەمەننات بۆ دەکەم لە باری تەعالوڵڵایە
لە بنی گوێیانم ناڵە ناڵە، خۆشم لە بنی گوێیان دێ دەنگ و سەدایە
لە لاس وایە ئەو دنیایە هەر خەزاڵ و خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبییانی تێدایە
لەبەر خودای عاسمانێ دەپاڕێمەوە بەدەردی دڵت نەبیەوە مەخشوش و مفتەلایە
ئەمن هانای خۆم دەبەمەوە بەر حەزرەتی نوحی نەبی، موحتەبەرە و نەبییوڵڵایە
عیلاجی ئەو دنیا بەگێچەڵە بەقاقان و سوڵتانان نایە
هەموو کار دەچێتەوە بەر حوکمی ئەو خودایە.
عەزیزم ئەو سەفەرە کەس لە تۆ نابڕێ، کەس بەتۆ ناڵێ: دڵت لە خەزاڵ ببێتەوە لەنگێ
ئەدی تۆ زەینێ خۆت نەداوەتە کراسێکە مەحمەڵ دارایی، جووتێک شەمامە و شەمامە
ڕەنگین لە بنیدا هەڵدێنن ڕەنگێ
ئەتۆ وەکو دێوانە بی وایە، بەدەستی خەزاڵت دراوەتێ بەنگێ.
ئەوە لاس دەچێ بۆ سەفەری چل پلەی حومامێ و سەری کوێستانان و مێرگە گردەڵێ
و مێرگە بازەڵێ و جێ مۆڵگەی ئاسکان ئاوەنگداری پێشی مێرگە خاڵ خاڵە

کوێستانە، هەمیشە هەور لەوێ گەواڵ گەواڵە
گوڵی لێ دەپشکوێ، سوورە، شینە، کاڵە و ئاڵە.
ئەوە لاس بۆ ئەو سەفەرە دەچێ
ئامانەتێکی کۆنی هەیە و لە بیری نەچێ.
ئەوە لاس لەسەر سەفەرە و دەچێتەوە بۆ زەنگۆڵ و ڕەندۆڵی دەپیرە کوێستانان
بۆ نێو گوڵ و سومبول و گیاخاو و گوڵستانان
خۆی لەسەر دوو ڕاستەی ڕکێفێ ڕاگرتووە، وەکو ئەمیر و سوڵتان و خانان
ئەگەر کەسێکی لە چاوی منەوە تەمەشای بکا، بۆتە قابیز و دەبێتە قاتڵی ڕوح و گیانان.
ڕەبی سەفەرت خێر بێ، سەفەرت سەعادەت بێ، کەس نەتوانێ دەگەڵت بکا بەرامبەرییە
کەست نەیەتە سەر ڕێگای بۆ دوژمنایەتی و ڕێگرییە
چومکە مەستی هەمیشە، ئاگات لە خۆت نییە
بەدوور بی لە تیری ئەبەدی و لە ئەجەلی غەیبییە
چاوی دوژمن لە حاستت کوێر بێ، کەس نەتوانێ لەگەڵت بکا شەڕە شیر و تیرەندازییە
با دیدار ئاخرەت نەبی لە خانزادە خانی حەریری و خەزاڵ و خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە
عەجایەب ماوم، بۆ تۆ دایم دڵت بۆ خەزاڵ پڕ لە هێش و پڕ لە ژانە؟
بۆ لە دڵی تۆ نایەتە دەرێ ئەو سەرەتیر و سەرەپەیکانە؟
چون ئەتۆ دەڵێی: خەزاڵ بەرخە کۆرپەڵەی دوای مێگەلانە
یان خاسە سییە، بە ناز و نیم ناز دەچێتەوە سەر هێلانە
دەڵێی: خوناوکەی گەردنی یاقوتی عەبدولحەسەنە و لەعلی ڕوممانە
یان دەڵێی: ئەبرۆی جەللابە و تیخی لە دڵی من هەڵکێشاوە و وەختی خوێن ڕێژانە
یان دەڵێی: پادشای حوکماتییە و حوکمی حەفسخانەی بۆ دڵی من دانا
برۆ سەفەرت خێر بێ، ئامانەتت بێ چوار مەلایکەتی موقەڕڕەب

ئەگەر هەمیشە مەعموورن لە عەرز و لە عاسمانە.
بەڕێگای چەپەدا نەڕۆی هەوراز و شاخە، کەس پێی ناباتەوە هونەرێ
ئەگە بێتو وەسەریش بکەوی بۆ سەرێ
دوو سەد کەسی لێن ساحێبی تیر و پەیکان و خەنجەرێ
سەلای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، نە وەک لەو سەفەرە لاس موقەددەرێکی وەسەرێ
سەعاتی هەوەڵ خەبەر بزانم، زمانم لاڵ بێ، چاوم کوێر بێ، ڕوحم لە بەدەنی دەچێتە دەرێ.
بەڕاستەدا بڕۆ، ئەوە ڕێگایە، قەدیم بەوێیاندا هەڵێناوە هەنگاوە
دەنگی شمقاڕە، قاسپەی کەوە، لە نەغمەی بولبول پیاو مەحتەل ماوە
هەمووی جۆگە و جۆبارە، کانی و ڕووباری دەبەفراوە
سەری هەلالە و بەیبوون و گوڵە جووت تێک هالاوە و تێک چرژاوە
دەنگی شەهێن زۆر بەتەحسیرە، مراوی دەکاتەوە گاڵە گاڵ و قاوە قاوە
جا لەوێ ئەتۆ مەڕامی دڵی خەزاڵ پێک بێنە، چومکە بەهانەی لەسەر دڵی تۆ داناوە
ئەو حەلە بۆی چەپک چەپک بکە، بڵێن: لاپی عاشقانەی لەسەر داناوە
ئەو حەلە بۆی بەرەوە ئەو گوڵی ناسک و نەژاکاوە
جا بزانە پاداشتی ئەو گوڵانە بەڵکو بتداتێ کام و کاوە.
لاس دەڵێ: خانزادە خان ئیدی مەحتەلم مەکە چیدیکەم مەحتەل بوون بۆ نییە
بەس بگری و بەس ناز بکە بەدوو چاوی ڕەش و بەنگییە
بەس ئەوبەرە و بەریان بکە قەرە زولفت لەسەر سنگێکە سپییە
بەس بەلێوانت زەردەخەنە بگرە و بەسەرمدا ببارێنە عەترییە
قسەی تۆ تەحسیر دێنێ بۆ دڵی من، چومکە هەمووی غەریبی و غوربەتییە
ئەمن لە کن تۆم هەیە خوداحافیزی و مەرەخەسییە
بەڵکو زوو بگەمەوە کامی دڵی خۆم، تاو هەلاتێ بۆم بڕوا کۆترییە
نوسرەتێ دوایەم من لە دوای خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییە.
جا ئەوە خانزاد دەگری و دەبارێنێ

بیست و دوو داو لە زنجیرەی زولفان دەپسێنێ
سەلای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، کەسم لە ماڵە باب و باوانی نەمێنێ
جۆگەلەی خوێنی چاو و دڵم خوێن دەدەڵێنێ
ئەوە لاس چووە گوڵی چل پلەی حومامێ بۆ خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییان بێنێ
چاوی خەزاڵ بووە بە باز و دڵی لاس کۆترە و دەیڕفێنێ
هێندی ناز و نیم ناز بۆ لاس کردووە بەعەتری زولفانی تۆوێکی وا دەچێنێ
دەترسم لەو سەفەری گەورە و گران لاس لە حاڵی حەیاتدا نەمێنێ.
جا ئەوە لاس ڕۆیی، جار جار تەمە، جار جار هەورە، جار جار ساوە
جار جار ڕێ دەبینێتەوە، جار جار ڕێگای لێ شێواوە
هێندە عاشقە نە شل دەبێ ڕانی ڕکێفی و نە ماندوو دەبێ دەستی لغاوە
وەکو پەڕندە و باڵدار ئەسپی نە ماندوو دەبێ و نە لێی شل دەبێ هەنگاوە.
جا بەوەی کەم ئەزەلی و ئەبەدییە
نە لە گوێن کەسە و کەسی لە گوێن نییە
لاس لە دەروازەی چل پلەی حومامێ دابەزی لە ولاغێکە ڕەش کوێتی شێر خەزاڵییە
پەنجەی ڕاستەی دەهاویشت بۆ مۆرەی پشتییە
دەیهێنا خوارێ دووربینێکی سەمەرقەندی عەسڵە فەڕەنگییە
ڕێگای دوو ڕۆژان دوور لێکی دەکردەوە مووی ڕەش و سپییە
ئەو حەلە خەیاڵی خەزاڵی دەکرد، دەیگوت: داخولا حاڵی چییە
بڵێی دوژمن نەهاتبێتە سەر عێلی مەلا داود و مەلا نەبییە؟
ئەگەر دوژمن بێ بۆ سەر لاس دێ دەنا ئەوان دوژمنایەتییان دەگەڵ کەس نییە
پێت وابێ لەو دنیا پانە کەس ناتوانێ تەماح بکا لە تێشووی شێرییە
نابەڵەدم لێرە، لە کوێستانی عەڵەدینیان و چل پلەی حومامێ هیچ کەس دیار نییە
ئەگە بێتو بچمەوە ئاخر خەبەرم لێ دەپرسن، ئەمن پێم نییە خەبەرێکی بە ڕاستی و

بە ئەسەحییە
خۆ من نەهاتووم بۆ تەمەشا و بۆ نەخشەبەردارییە
ئەمن هاتووم، ئەو ڕێگایە گیراوە، ئەگە ڕێگا بکەمەوە بۆ کاروان و قەتار و توجارٟ باشییە

مەسلەحەت ئەوەیە بەندێک بلێم لە مەڕامی دلی خۆم و ئی خەزالی مەلا نەبییە
بەلکو ئەگەر چۆل نەبێ ببینم و لێم پەیدا بێ ئاوەدانییە.
ئەوە لاس بە دەنگ بەندێک دەلێ:
بریا کورسییێک بویایەم تازە تەختە، تازە باتمایەتەوە لەسەر وەستاکارە
خەزال بیکوتایە: ئەو کورسییەم بۆ بێنن، دلم مەخشوش و بریندارە
بۆ چل پلەی حومامێم بەڕێ کردووە ئەو عازیز و مەڕامی دلم و ئەو تەنیا سوارە
جار جار فکری بکردایە و جار جار بگریایە بەو چاوی گۆشەدارە
جار جار ئاوازی باتایە لە کرمەک و لە گوارە و لە قەتارە
زولفێکە خاسە ڕەنگی بە سەر سینە و مەمکانی بهاتایەتەوە خوارە
پێچیان بدایە وەکو کەمەندی قارەمان، تێک بهالانایە لەگەل ئەو جووتە هەنارە
جا کلفەتی بناردایە، بیکوتایە: بزانە لە ڕێگای زێیە بادینانەوە کێ دیارە
زگی پێم بسووتایە، بلێ: پیاوێکی ڕەشید بوو ئەما بەدل فەقیرە، هەژارە
یەک یەک سمایل عوزێری بانگ بکردایە، بیکوتایە: لە دنیایەدا چ خەبەرە؟ ئەوە دلخۆشییە بۆ من، دەمگوت: لە من دەکاتەوە پرسیارە
چون عافرەتێکی زۆر زرینگ و فەسیح و بەلیغ و وشیارە
دەزانێ ئەمن هاتوومە سەفەرێ، خاترجەم، نان و ئاو لە زاری ژەهری مارە.
ئەوە دەستی لە بنان گوێی نا، ئە ئەوەندەی بە بەند کوت. کوتی: بزانم لەو جێگا چۆلە کەسێک پەیدا دەبێ؟ ئەو بەندەش دەلێ:
جا دەلێ وایان ئەمن خەبەردار کرد، کوتیان: ئێرە ئاوەدانییە، نەمزانی ئەگەر چۆلییە
دەیانگوت: چل سالە ڕێگایان گرتووە، ڕێگای هیچ کەس نییە

ئەلعـــان لە دڵێکە مـن گـــەڕێ چەندی لـە هێـــشـــە و چەنـدی لە ژانـە و چەنـدی لە حەفسییە

ئەمن بێ ئیختییارم، لە تاوی دەردی خۆم ئاگام لە خۆم نییە

ئەلعان حەز دەکەم سەد سوارم لێ پەیدا بێ بە عەزمی دوژمنایەتییە

بیانکوتایە: پەنجایان پیاوی مامەڵاغای زورارییە، پەنجایان پیاوی خدر بەگی سمێڵ سپی کامەرییە

لەگەڵیان بکردمایە شەڕە ڕمب و تیرەندازییە

مردن بۆ من چاترە، ئەمن ئەو ژیانەم بۆ چییە

هاشا لەو ڕۆژگاری بەد و لەو زیندەگانییە

ئێستا خەزاڵ دانیشتووە بە دەستەوئەژنۆ و بە خەمناکییە

فرمێسکی سێ ڕێز دێنە خوارێ لە دوو چاوی بەنگییە

دەڵێ: چل شەوە بێ خەبەرم، ئاگام لە لاسە شۆڕی باڵەکان نییە

بریا پۆڕی بەڵەک بومایە، باڵندە بومایە، بیانکوتبا: بەباڵان فڕییە

بچومایەتە سەری کوێستانی خاسە ڕەنگ و چل پلەی حومام و زێی عەبدوڵڵای عەسۆی و مەلا محەممەدە کرۆزە، بۆ مێرگی بەیدی بەیدییە

تا بمزانیایە کورتە لاسی باڵەکان خەریکی چییە؟

ئەوجاریش دیسان کەسی چاو پێ نەکەوت. لەبەر خوڕڕەی ئاوێ و لە فریاد فریادی کوێستانان و لەبەر جەمبوشی قەدەم گێڕان و لەبەر ناکەلان ناکەلانی قەڵبەزەی ئاوێ و لەبەر بۆنی گوڵ و عەتر و عەبیر، پیاوی تێدا وەحشی دەبێ. دیسان، چۆلگە بوو، لەبەر پاشـەڕۆژێ لاس دەیگوت: پێم دەڵێن تۆ نەچوویە چل پلـەی حـومـامێ. ئەگـەر ئاوەدانێک ببینم، نێوونیشانێکم وەگیر دەکەوێ.

ئەوە لاس دووبارە دەڵێ:

بریا من شەدێک بوومایە لەوانی عەسڵە کە ژمارییە

بیانناردمایەتە کن پۆلێک کچە سوورچی و کچە زورارییە

ئەوەی لە عەمری چاردە ساڵان دان، هەمیشە دەڵێی: مەستن و هیچی ئیغیار نییە

لێیان هەڵ ببەستمایە ڕیشوەی باریک و ناسک و عەسڵە نیو گەزییە
سەری ڕیشوەیان گرێ نەدایە، بیانکوتایە: گرێ دان چاک نییە
ئەوە ماڵی خەزاڵە، دەیهاوێژێتە سەر قەرە زولفی مروارییە
نەوەک ئەو گرێیانە وە ڕوومەتی بکەوێ، ببێتە برین و ببێتە عەیبێکی بەئەسەحییە و ببێتە ناقیسییە
چومکە کولمەی ناسکە، ئەگە بێتو نارەحەتێکی وەسەر بێ، حەیفە خەزاڵ دابنیشێ بە عەیبدارییە
جا ئەگە من چوومەوە ئەو شەدەیەی بەسەرەوە بێ، ڕیشوەی شەدەی بەجەولانە بێنێ
و لێم بکاتەوە بەخێرهاتن و ماندوو نەبوونییە
بە لێوێکە شیرن زەردەخەنە بگرێ، بە زمان پێم بڵێ: ئۆخەی هاتیەوە لە سەفەری هات و نەهات و غەریبییە
بەچاو ئیشارەتی غولامان بکا، ولاغی لاس بەرنەوە سەر بەندییە
چادری من بەرنە پێشی کوێستانی باگرو، هەوار خدری بۆ فێنکییە
با لاس بۆم بگێڕێتەوە قسەی هات و نەهات و غەریبییە.
جا ئەوجار، لاس دەیگوت: سوبحانەڵلا دەبوو ئێرە سێ سەد چادر و چیغی تێدا بویایە
بە ڕۆژ خانم و خاتوونان لە نسار و لانووایان گوڵیان بچنیایە
ئەو کوێستانە عەتری دەگرت بەبۆنی خانم و خاتوونان، شەوێ بەشۆق و نوری چرایە
حەوسەد دەستە جەڵەب، هەر دەستەی حەوشوانی لەگەڵ بایە
شەو لەوەڕیان باویشتایەتە بناری کوێستانان، سەری گەوەڕان، تاو هەڵاتیان بهێنایەتەوە سەر کانی و کانیلەی دەفەرەعایە
جا ئەو حەلە ئەو کوێستانە ڕەنگی دەگرت، چونکە جێگای وا هەیە کێوە، شاخە جێگای وا هەیە دەشتە، سەحرایە

ئەما چێشتانێ سێ سەعات لە ڕۆژێ بچویایە، خەزاڵ کراسێکی موشەججەری قاقم ڕێزی عەسڵە مەحمەڵ دارایی لەبەر بکردایە

بەقەیتان و بەسەدەف ڕێز دەرکی شەمامە و شەمامە ڕەنگینی داخستایە

شێست و شەش تار زولفی عەمبەرئاسایی لە شانێکە مبارەک پەرێشانی بکردایە

لەگەڵ بەندۆکە و گۆی ئاڵتوون و سەری قۆیتاسان[1] تێکەڵی بکردایە

جار جار بەشانی چەپەیدا گورگ ئاورێکی داباوە، بیکوتایە: مەتڵەبم

لاسە بزانم ماوە یان بووە موتەوەففایە؟

جار جار بەلێوێکی شیرن زەردەخەنەی بگرتایە، جار جار بەزمانێکە مبارەک بیکردایە لائیلاهەئیللەڵڵایە.

کەس نەبوو، هەچەند ڕووانی و تەمەشای کرد کەس دیار نەبوو. لاس بەفکردا دەهات، دەیکوت:

سوبحانەڵڵا ئەگە بچمەوە هیچ دیاری و نێوونیشانم پێ نییە

ئەمن دەبێ شوکری خودای ببژێرم لەسەر شانی منی داناوە مەردی و مەردایەتییە

ئەگە شتێکی خودا بەپیاوی عەتا نەکا ئاخر عیسان بێ ڕوحە و هیچ ئیختییاری نییە

لە دوو جێگا چاوەڕێی منن بۆ باس و خواس و خەبەرداریيە

جارجار لە دڵیان خۆشی و شادمانییە، جار جار ئارەزوویانە بچنەوە سەر کوپەڵەی خمییە

هەوەڵیان خانزاد و خانزادە خانی حەریرییە

دوایە فرمێسکی دێتە سەر کوڵمێکە سورمەییيە

بەناز لەنجە دەکا و دەڕوا بە کۆترییە

کەسێکی خەمی منی ببێ قەتم دەرناوێژێ لە دڵییە

خەزاڵە و خەزاڵەشۆڕی مەلا داود و مەلا نەبییە

جا نازانم نە لە قیامەتێم چاو پێ دەکەوێ ڕۆژی ئەبەدی و ئاخرەتییە نە لە دنیایە

---

(١) قۆتاسە: زەنبەری زێو. «هب».

دەیبینم بەزیندوویی و بەزیندەگانییە
چون موقەددەر غەیبییە و عاسمانییە
لە تاقەتی خودا دایە چاک و خراپی، موقەددەر بە کەس نییە.
ئەوە کێو سەریان گەیشتۆتە کەشکەلانێ
بەڵکو ئەڵڵا ئەڵڵای گوێ لێ دەبێ پیاو لە مەلەکانی عاسمانێ
ئەوە لاس نە بەولاغی گرتەوە سانێ و نە پێی گرتەوە وچانێ
ئەوە هاتەوە گەوەڕی شەنگەڵ شەنگەڵ و بەردی سەغری و نیشانەی هەژدیهای قەدیمی زەمانێ
حەکاکان شێوەیان کێشاوە سەت ساڵ لەوەی پێش، لە بەردیان هاویشتووە نووسین و نومرە لێ دانێ
کەسێک نابەڵەد بێ، ئەو کانییە پێی دەڵێن: کانی شێر مەردانێ
کەسێک نابەڵەد بێ، سەوادی ببێ، بخوێنێتەوە ئەگە نومرەیان لێداوە بۆ ڕۆژی بەڵەدی و سەر نەجات دانێ.
جێگاکەی باسەفایە، ئەلعان بەندێک دەڵێ:
خەزاڵ چاوت بەمن بمێنێ بەئەستێرەکەی ڕۆژێ، ئەگەر جارجار دەچێتەوە بن هەوری و جار جار دێتەوە ساماڵی
ئەمن بەندێک بە خۆم هەڵ بڵێم، لێرە ماوم بە غەریبی و بە عەبداڵی
زەینێکە خۆم داوەتە تونکە تونکەی کوێستانان، بەزەییم بە خۆم دادێ، دڵم لە هێشە
و لە ژانە و جارجار دەناڵی
ئەمن دەمرمەوە لەبەر کەمبەرەیەکی سێ قوبە، یاقوتە، مەرجانە، تێکەڵە لەگەڵ دوڕی لاڵی
سبحەینان ئەگەر دەیبەستێ لە پشتێک و قەدێکە شمشاڵی
ئەگەر بەسەریدا بەردەدەیەوە پشتەوە، سەر پۆیلەی خالانە، ئەگەر پێی دەڵێن: دەسماڵی

لکی دەسماڵت دەڵێی قورینگی هەوەڵ مانگی بەهارێیە، جار جار دەنیشێ و
جار جار دەفڕێ بەباڵی
جا توخڵاکەی ئەتۆ بۆم هەڵێنە دوو چاوی بەنگی لەگەڵ دوو چاوی کاڵی
دە جارێک لە هەق دەستی ئیلاهی بپارێوە، بڵێ: کورتە لاسی باڵەکان ئی من
بوویایە بەحەڵاڵی
ئەبرۆت کەمەندی لە من کێشاوە وەکو تیژە پەڕی ڕەشەداڵی
سێ ڕێز لە پشتی پۆرگی چاوت خوار و جووت بوون، پیرۆزەییە خاڵی
هیچ کەس نییە بڵێ: ئەتۆ نەخۆشی یا نە بێ حاڵی؟
ئەتۆ شێتی، دێوانەی یان مەجرووممی وا دێوانە و عەبداڵی
وەختێکی ئەگەر عێلی سماییل عوزێری دێنەوە بۆ پاییزەهەوار و نزیک دەبنەوە
لە قەسر و ئەگە بێنەوە لە بۆ ماڵی
جا ئەو وەختی خەزاڵ دەچێ دەخانو بەرەو قەسرەوە، لە کوێ ببینم ئەو سێوی
نەگەییو، هەر دەڵێی لە مابەینی دوولکاندا ماویەوە، هەڵووچەی کاڵی؟
ئەوە بەندەکەی دەگۆڕێ:
لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە و چەندی لە واوەیلایە
لە بنی گوێیانم دەنگی شل و مل و ساپەگەردن و ناسک بەدەنان نایە
نە قەتارە و نە سوارە و نە ئاوەدانی تێدایە
عیلاجم هیچ نەماوە مەگەر ڕابوەستم لەبەر موقەددەری هەق تەعالوڵڵایە
ئەگەر کەسێک لێم بپرسێ: شێتی، دێوانەی تۆ لێرەی؟ دەڵێم: هاتووم بۆ گوڵی
چل پلەی حومامێ، ئامانەتییە و دەیانبەمەوە بۆ شیرن لەیلایە.
دەنگ و سەدای لاس وا دەهات، جێگاکەی بڵندە بە فێنکییە
لە گوێی وەتمان بەگ و مامەڕەش، ئەو دەنگەیان لێ دەبۆوە حاڵییە
حەوت کەسیان ڕادەسپارد و لێیان دەکردەوە سفاریشییە
دەیانگوت: چل پلەی حومامێ چۆلە و خۆ هیچ ئاوەدانی لێ نییە
برۆن بگەڕێن بزانن ئەو دەنگە ئی عەرزییە یان ئی عاسمانییە؟

جا ئەوە ڕكێفیان توند دەكرد و لە زاری وڵاغیان دەكردەوە ددانە لغاوە
چومكە بێ ترسن، هیچ كەس نەبووە و ترس بەوان نەدراوە
هەچ كەس بەوێدا ڕۆیی بێ، دەستی پێ نەكراوەتەوە و ڕووت كراوە
بێ ترسن لەوان وایە تەیموری شۆخ كەوانن دێنەوە بۆ ڕۆژی عەیش و ڕاوە
ئەوە بەحوكمی گەورەی خۆمان ئەو پیاوە، ئەو دەنگە پەیدا دەكەین یان ئاوازی
عاسمانێ بوو لەسەر عەرزی بۆتەوە بڵاوە؟
ئەوە لاس حەوت كەسی چاو پێ كەوت. لاس دەڵێ:
پەنام وەبەر تۆ ئەی ئەبەدییە
لێم مەعلوم بوو چۆل نییە و ئاوەدانییە
وەدەستم كەوت خەبەری ڕاستی و بە ئەسەحییە.
ئەوە لاس بۆ لای وان هات.
بەگەڕان چوون، خەبەردار نەبوون لەبەر ناڵەی كوێستانان و لەبەر دەنگی پیرە
شەهێنێ
ئەسپی لاس ئەگەر وڵاغی وانی دەدی: سێ كەڕەت كوڕڕەم كوڕڕەمێتی و دەحیلێنێ
ئەوە دەنگی وڵاغەكەیە، شێری نووستوو وەخەبەر دێنێ
ئەو حەوت كەسە، هەر كەسێ لە حاستی خۆیەوە لەسەر خۆوانی زینی ئەگەر
سەر هەڵدێنێ
ئەوە نەڕڕە شێرێك جڵەوی وڵاغی لە دەستی خستووە و بۆ خۆی دابەزیوە و
جێگاكەی هەورازە و بۆ خوارێی دێنێ.
ئەوە بانگیان كرد:
ئەرێ سوارەكەی ئەگەر لێرەكانە گرتووتە سانە
بەسنگی دەڵێی شێرە و بەڕاسانی دەڵێی قارەمانە
بەجوانی دەڵێی یۆسپی كەنهانە
نابەڵەدی، ئەتۆ لە كوێوە هاتووی؟ دەبێ لە مامەڕەش و وەتمان بەگ ببیەوە بە
میوانە.

ئەوە لاس بانگی کردن، کوتی:

زۆر گەڕاوم لە بەڕییە و لە چۆلییە

چاو بەستراوم و ئەمن بەڵەدیم نییە

وەرن لەگەڵم بکەن دوو قسەی بە دۆستی و بە ئەسەحییە

هەتا لێتان ئەمین بم، لەگەڵوو بێم بە میوانی و بە خاترجەمییە

کەسێکی پیاو لێی نابەڵەد بێ، لێی بکا پرسیار و لێی وەربگرێ ئەمینییە

دیارە پرسیارکردن بۆ دۆست و بۆ دوژمن عەیب نییە.

هەر حەوتیان ئیحتیرازیان لێ گرت و پێی پێکەنین. پێیان گوت:

سوارە ئەتۆ قەت چوویەتەوە بۆ مەدرەسە و بۆ پێشی مەدرەسەخانە

قەت دانیشتووی لە لای ئەو کەسانەی ئەگە عاقڵن و عاقڵ لە لای وان سوڵتانە

قەت کەوتوویە شەڕێکی وا ئەگەر بڵێن: ڕۆژی خوێنڕێژانە قەت کەوتوویە شەڕە شیر و سەرە ڕمب بادانە

کۆتر ئەگەر گیرا لەسەر هێلانە، بێ دەستەڵاتە، نازانێ سەری دەبڕن یان دێتەوە ڕۆژی بەرەڵڵاکردن و بەردانە

چل پلەی حومامێ بۆ تۆ حەفسییە، ئەوە تۆ کەوتوویەوە حەفسخانە

کاری تۆ خۆشییە و مێهرەبانە، کەوتوویەتەوە سەر ڕۆژی زەلالەتی و پاڕانە و لالانە

ئەلعان دەتبەین بۆ کن وەتمان بەگ و مامەڕەش، کاری تۆ بە دەستی وانە.

کێ بوو لە لاس و لە لاسە شۆڕی باڵەکان! ئەحواڵی تەڵخ بووە، دەڵێی شێرە و زنجیری پساندووە

دەڵێی هەژدیهایە و بێچوویان لێ خواردووە

دەڵێی سەردارعێلێکی قورسە و ژنیان لێ هەڵگرتووە

هەتا ئەورۆ کەس قسەی کاڵ و نازیبای پێ نەکوتووە

کوتی هەڵبەت دەڵێن بێ دەسەڵاتە و ئەجەل بۆ ئێرەی ناردووە.

لاس بانگی کردن:

سوارە ئەسپوو ڕاگرن، بەئەسپوو بگرنەوە وچانێ

بەحوکمی تیری زەڕنیشانێ وەک ژیشک (ژوشک) پەڕوو دەردەکەم لە نێوچاوانێ
من لە موقەددەری عەرزی ناترسم ئەما دەترسم لەوەی قەزا و قەدەر بێنە خوار لە عاسمانێ
ئەگە بێتو من بترسم بلەرزم سبحەینێ خەزاڵ بەو قسەیە دەزانێ
هەک ڕەبی گۆڕم بەرمەوە بۆ گۆڕخانێ
ئەجەل بەرگەشتە بگەڕێنەوە دواوە
نێوبانگو نەبیستووە لاسە شۆڕی باڵەکان، دەبێ دووسەت سواری لێ سوار بن
بلێن: لاس پێشی لێ گیراوە
لە پشتەوە سەت کەس، بلێن تیرەندازە و چۆکی لە عەرزی داوە
جا ئەو وەختی ڕەنگە لاس بترسێ، لێی شل ببێ هەنگاوە
خودایەکی ئەگەر ڕوحێکی لە ئەزەلی بە من داوە، دەبێ ئەو ڕوحە بەرێتەوە،
جا نازانم موقەددەری وییە، چومکە موقەددەری وی لە نەکاوە.
سوارەکان دەگەڵی بەکێشە هاتن، تیرەندازیان دەگەڵ کرد.
لاس هەچەند جارێکی چۆکی لە عەرزی دادەداوە
قاژەی تیری سەری کوێستانانی دەگرت، دەبۆوە بەناڵە ناڵ و گرمە گرم و قاوە قاوە
کەسێکی نابەڵەد بویایە، دەیگوت: ئەفراسیابە و دەگەڵ ڕۆستەمی لێ قەوماوە
هەر حەوتیان بەبرینداری، بەجۆگەلەی خوێنی چاویان، دەکشانەوە. هەر حەوتیان دەگەڕاوە
خەبەریان دەبرد بۆ وەتمان بەگ و مامەڕەش، دەیانگوت: سەحرای مەحشەرە و قەوماوە
بەری سێلاو ناگیرێ، هەچی وەبن سێلاو بکەوێ، دەڵێن: بابە مردووە و خنکاوە
نەڕڕە شێرێکمان دی، بەجورێک بەعومری هەق دەستی ئیلاهی خوڵقاوە
کەس پێشی وی پێ ناگیرێ، ئاوە، بەحرە، سێلاوە.
وەتمان بەگ و مامەڕەش عاقڵ بوون. دەنگی کێو و دەرە دەتگوت قەتاری تێدا

دەگەڵ تیری لاس. هەموو ڕانی دروو بوون بەقەبرغەی وڵاغەوە، سواریان بۆ دانەدەبەزی. بە وڵاغەکەوە دروو بوونی. ئەوان تەگبیریان کرد، کوتیان: ئەو کاسەیە ژێر کاسەیەکی هەیە.

ئەوە زۆر ئازا و بەکار و لەخۆ ڕادیو نەبوویایە، نەدەهاتە ئێرە. ئێمە ڕێگرین، تەریدەین. دوژمنی هەموو کەسین. ئەلعانیش ئەو کابرایە هاتووە بۆ ئێرە. چۆلگەیە، ئاوەدانی لە کن ئێمە نەبێ لە هیچ جێی دیکە نییە، ئاخر با بێ و بەخێرهاتنی بکەین و ئەگەر بەسلامەتی بڕوا خۆ نابێتە کوفر. بابێ بزانین چ کەسە ئەو کابرایە وا بەغیرەتە، دەڵێی سوڵتان سەید وەقازە، تیرەندازی کردووە.

دوکانی ناڵبەندی هەبوو مامەڕەش.

جا لەوەیدا بێ دەنگییان لێ ڕاکرد، کوتیان: با بۆ خۆی بێ. هات چاوی پێ کەوت لاس، دیتی هەموو خانووبەرەیە و ئاوەدانییە. ئەگەر هاتە پێشێ، مامەڕەش بەپیرییەوە هات، کوتی:

سوارەکەی سوار بووی لە وڵاغێکی شەو و ڕۆژ بەوڵاغت ناگریەوە قەرارە

لە باسکت بەستووە کەمەندێکی چەرمی گەوەزن، سەری بەبزمارە و دەڵێی

ڕەشمارەسەری ئی تیرت ئەگەر دێنەوە سووڕاندن دەڵێی هاوارکەرە و دەکاتەوە ئاواز و هاوار هاوارە

هێند بەهەیبەت سواربووی کەسێک نەتناسێ دەڵێ فەرامەرزە، پیاوی عاقڵمەند

دەڵێ: خێر ئەسفەندیيارە

ئەمن پیاوی شێری لە گەرمەلان هاتە دەرێ زۆرم خۆش دەوێ، ئەوی دیفاعی

سەری خۆی دەکا، دەڵێن: فەسیح و بەلیغ و وشیارە

پیاوی وا برای لە دایی و بابیم بکوژێ، ئەمن لەگەڵ ویم نییە دوژمنایەتی و شەڕ و بنارە

چون نابەڵەد بوون ئەوانەی هاتن، کوتیان: بزانین میرە، مەزنە، سوڵتانە یان ڕێبوارە؟

وەرە دابەزە، میوان بە، بەوڵاغت بگرەوە قەرارە

تا ئێمە ڕاز و گلێیی بکەین، لەگەڵ یەکتری بکەین سوال و جواب، لێت بکەمەوە

پرسیارە.
لاس دەیگوت: ئەنگۆ ڕێگرن، ئەمن لە جێیەک دادەبەزم بە میوانییە ئەگەر متمانەم
لێی ببێ و دڵم لێی بکا پرسیاری ئەمینییە
کەسێک پیاو بێ، جێگای عێل و عێل باش و ئاوەدانییە
پیاو خراپ دەردەدارە، شەرمەزارە و ڕووی نێو پیاوانی نییە
هەمیشە لە خراپە و خوێنڕێژییە، هەمیشە ئیشتییای لە تالان و لە درزییە، بۆیە
هەمیشە ئەو جێگای چۆلییە
حەز ناکەم میوانی ئەنگۆ بم، ئێرە جێگای پیاوان نییە
چومکە شێر ئەگەر خەوی لێ بکەوێ، لە خەودا دەتوانێ بیکوژێ ڕێوییە
خانەوادەی ئەنگۆ لە کن من هیچ ئیعتیباری نییە.
مامەڕەش پێی گوت: هەقتە، ئەمن لێت دەسەلمێنم
ئەمن قەولێکت پێ دەدەم، خوێنی خۆم لەبەر پێی ولاغت دادەپڕژێنم
بەخالقی خەللاق، میوان بە و زەرەدت پێ ناهێنم
کار جێگای خۆی هەیە، هێندێک کەس خەلات دەکەم، هێندێک ماڵی لێ دەستێنم
هێندێک کەس تەڕەقی پێ دەدەم، هێندێک کەس جەرگی لە زگیدا دەردێنم
ئەما میوان بەشەرت بێ دەستی غەیانەتی بۆ تۆ نەهێنم.
لاس ئەگەر ڕکێفی لە ولاغی دەدا و ولاغی لە پێشی مامەڕەش دەردەپەڕی
کەوانەی ئەبرۆی گرژ دەکرد و دەستی داویشتە سەر خەنجەر بۆ ڕۆژی لێقەومان و
شەڕی
دەیگوت: تۆ پیاوێکی ڕێگر و بێ عاقڵ و بەدفەڕی
توند قسە دەگەڵ من مەکە، ئەوە بەسەر لاسی باڵەکاندا دەخوڕی و دەنەڕی؟
ئەگەر لەگەڵ لاس بکەویە ڕۆژی تیرەندازی و شەڕە شیر، دڵت دەگەنی
دەبێ بەدەستی خۆت بۆ خۆت قەبر هەڵکەنی.
ئەوە لەو کەسانە نییە ئەگەر بەدەستی تۆ ڕووت کراون و ڕوحیان لە قەفەزی
بەدەنی دانەماوە
شەڕ لەگەڵ من کردن، پاش دوازدە ساڵی دیکە دەڵێن: مامەڕەش لە چل پلەی

حومامێ نەماوە
لێی پەیدا بوو شێرێکی ئاشق و دەزگیران بەجێماوە
شـەرت بێ نەیەڵم جارێکی دیکە کـەس بەدەسـتی ئەنگۆ، بڵـێن: کـوژراوە و ڕووت کراوە.

ئەوە پێک نایە بەو هەڕەشە و گوڕەشە و بەو قسانە
ئەتۆ دمت شیرن بووە لە قەتار و لە کاروانە
لە تاجر و لە وانەی دادەنیشن لەسەر دووکانە
چون بەڕێ چوونی ساڵێت بەوانە
نازانی ئەوە نەڕڕەشێری کاولە نوحسایە و لاسە شۆڕی باڵەکانە؟
سەرت هەڵبێنە، ئەجەل لەسەر گەردنتە، بەدبەختی ئەو سەعاتە لە تۆ میوانە
ڕادەسا لەسەر خوانی زینی، بۆستەی خەنجەری دەترازاند، وەهای ڕادەدا مابەینی هەرتک شانە
یەکی نابەڵەد بویایە، دەیگوت: ئەوە عەسڵ ڕۆستەمی زەمانە
بابە عیلاج پەزێری نییە، ئەوە نوتفەی قارەمانە
جا مامەڕەش دڵی پاک دەکردەوە و بۆی دەخوارد سی جزمەی قورعانە
پیاوی دەسکەرەوە و ڕەشید دڵ سافە و بە هەموو کەس دەکا متمانە.

ئەوە دابەزی. ئیـدی بەوە پێک نایـە ئەگـەر تەریدەبوون، ڕێ و شـوێنێکیـان بوو وەک شـەوکـەتی پوری پـەشـەنگ، ئەفـراسـیـاب. لاس چوو، جـێگا و ڕێگایـەکیـان بۆ دانا و دانیشت.

ئەوبەر ئەوبەر سەندەڵی داندراو قسە و گفتوگۆیان کرد.

مامەڕەش کوتی: ئەمن نێوبانگی تۆم بیسـتووە، ئێمە چون کەمتر لە ئاوەدانی داین و لە نێـو قـسـان دانـین، بۆیە چاک ئەتـۆم نەناسی، ئەلعـانیش ئـەتۆ لە چ دەگـەڕێی تا مەخسوود و مەڕام و ئارەزووت پێک بێنم بەدڵی نیگەران نەچییەوە.

لاس کوتی: جـەبعـەی دنـیـایە وایە، ئەوەی منی لێ دەگـەڕێـم بە زارم شـەرمـە ئەگـەر بیلێم. مـامەڕەش کوتی: بنیادەم لە دنیایە مەڕام و ئارەزووی دڵی لەسـەر هـەر شتێکی جـەمـبوشی بەسـت، ئیـخـتـیـاری عـاقڵی وی لە دەست ئەو شـتـە دایە. هـیـچ قـسـەیەک

نابێته عەیب ئەوی له بنی ئادەمدا مەوجود بێ.

جا لاس هێند لەمێژ بوو شەرابی نەخواردبۆوە، ئیشتیای شەرابی کرد. بەدەستووری مامەڕەش شەرابی گوڵ گوڵی بۆ میوانی عەزیز حازر کرا. ئەوە لاس دەڵێ:

ساقی بۆم تێکه شەرابێکی گوڵ گوڵی پرتەکالییه (پورتەخاڵییه)

ماندووم و با لەسەرم بچێته دەرێ نەگبەتی و کەسالەتییه

میوانی مامەڕەشم و هاتوومه کن وی بەمیوانییه

با فکرم ئازاد بێ ئەگەر شەرابم خواردەوە، قسەی بۆ بگێڕمەوە به ئەسەحی و به عاقڵییه

با نەڵێ: میوانم شێته و قسەی دۆدی و بۆدی و هەرچی و پەرچییه

ئەلعان تەن و بەدەنی من بۆ شەرابێک یەگجار زۆر ماندوو و موحتاج و توونییه.

حەوت قەدەح شەرابی پرتەکالیان بۆ تێ کرد، ئەوە لاس خواردیەوە. تەواوی ڕەگی بەدەنی هاتەوە سەرەخۆ، ماندوویی و نارەحەتی دەبەدەنیدا نەما. جا بەمامەڕەشی گوت:

بددەمەوە جوابێکی ئەگەر پرسیارت لێ کردم به هاسانه

ئەمن هاتووم بۆ گوڵی چل پلەی حومامێ، سەر بەگژنیژی و دانه دانه

ئی قوڵەشینکێ و مێرگه گردەڵێ و ڕندۆڵی هاتی هاتی و گوڵ گیری سەر بەپەیکانه

جا ئەوی له دڵم دایه با پێت بڵێم ئەگەرچی قابیل نییه بۆ مەجلیس و بۆ گفتوگۆ و دیو و دیوەخانه

ئەمن دایمه دڵم له هێشه، له ژانه، بێ دەرمانه

دەزانی کەنگێ ژانی دەشکێ؟ لیمۆی خەزاڵ له من بۆتەوە بەشەمامەی چوار بێستانه

بۆیه دەڵێم عەیبه، خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبییان بەمنی گوتووە نیزاح و بەهانه

دەڵێ: دەبێ چل دەسکم گوڵی سەرپلەی حومامێ بۆ بێنی، جا ئەو وەختی دەگەڵت دەبمەوە بەهاوڕاز و بەئاملانه

دەیگوت هەڵبەتە ناوێرێ بچێتە ئەو سەفەرە گەورە و گرانە
نازانێ ئەمن لە خولاّ زیاتر باکم لە کەس نییە، سەفەری وا لەبەر من زۆر هاسانە
هەتا خودا موقەددەری پێ نەکا، سەر بە بێ ئەجەل ناچێتەوە گۆڕخانە
ئەمن لە موقەددەری عەرزی ناترسم، غایبە قەزای هەق دەستی ئیلاهی ئەگەر
دێ لە عاسمانە
ئەمن بۆ خۆم لێرەم، ڕوحم فینجانە، ئیستیکانە
ئەو شەرابخۆری پێ دەکا وەکو مەی وەکو مەیخانە
ڕوحم ئەوە لە دەستی خەزاڵ و خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبییانە.
ئەگەر تەمەشای نومرەی چاوی کرد، پیاوێکی عاقڵ بوو مامەڕەش، زانی عاشقە.
حەوت ڕۆژی ڕاگرت بەمیوانی، کوتی: نەڕڕەشێری وەکو تۆ ئەمن ئیفتیخار دەکەم
ئەگەر میوانی من بێ. حەوت ڕۆژیان ڕاگرت. ئەگە هات خۆشی و ئیسراحەتگای چاو
پێ کەوت، کوتی:
لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە! ماندوو بووم، لەبەر ئاوازی
کوێستانان ماندووم حەساوە
چ بکەم نۆکەرێکم دەگەڵ نییە ئەگەر قاسیدیم بۆ بکا لە دواوە
ئەلعان ئاسک و جەیران لەچەیارن وەختی گێژەڕاوە
ئاخ بۆ قاسیدێکی، ئەلعان لەو سەعاتەدا دڵم حەسرەت و خەمی تێدا نەماوە
باتایە، بیکوتایە: خەزاڵم دی لەسەر جووتێک کەوشی پانیە فەڕڕاشی چوار بزمار
ڕاوەستاوە
بە ئەندازەیەک خەمناکە و دەڵێی شەهێنە و هەڵۆ لێی داوە
قەرە زولفی سوار و پیادە کردووە، ئەوبەرە و بەر لەسەر ڕوومەتێکی گۆناوگۆن
ڕاوەستاوە
سنگی کردۆتە دەروازەی سوڵتانی ئەستەمبوڵ، لە لاس زیاتر ئیجازەی بەکەس
نەداوە
سوبحانەڵڵا، ئەڵڵاهوممەسەللی عەلا محەممەد، نازانم هەر لەبەر دڵی من وایە و

یان هەروا خوڵقاوە.

ئەلعان لەو جێگا باسەفایە بویایە سمێڵم بکردایەتە پەرژینی کوڵمەی، قەدم

لە قەدێکی شمشاڵی بهاڵایە

ئیـدی لـەوە زیاتر زینـدەگـانیم نەدەویست، خـودا بۆی بـناردمـایە دەردی مـردن و موفاجایە

لە پلەی جوننییان و چل پلەی حومامێیان بناشتمایە

ئەو حەلە بیانکوتایە: غەریبە، ئاڵایەکیان لەسەر هەڵبدامایە

جا ئەو حەلی دەمگوت: شەهیدم وەک ئەو شەهیدانەی ئەگەر دەڵێن شەهیدن و لە سەحرای کەربەلایە

عەجایەب ئەگەر ماوم ئەوە چل شەوە دەنگی تۆق و تەلەسم و زێڕ و زنجەق و گوارە و کرمەک و ئاودەنگی و خەبەرچی خەزاڵم لە بن گوێیان نایە

دڵی خەزاڵ مجری پۆڵایە و بریا بمزانیایە چی لە دڵی دایە

ئەلعان شینگایە، شین و واوەیلایە لە مەملەکەتەکەی باڵەکەتی و کاولە نوحسایە

دەڵێن: لاس نەماوە ملکی بۆیە وا بێ ساحێب و بەرەڵڵایە

نازانن ئەگەر زەرگی بێ ڕوحمی خەزاڵم لە دڵی دایە

بەپەنجەی خەزاڵ نەبێ بەهیچ کەسی دیکە ئەو زەرگە دەرنایە.

لە زگی خـۆیاندا کـوتیـان: چ وەخـتـێک پارێزی ئـەوەی دەبێ و کـەلێنمـان بۆ هەڵدەکەوێ ڕووتی کەین و ببێتە نێوبانگێکی گەورە بۆ ئێمە. ئەگە تەمەشایان دەکرد بەعەزمی ئەوەی ڕووتی بکەن، هێندە بەهەیبەت بوو، ڕوح لە ئێخەی کراسیان دەچووە دەرێ، دەست و دڵیان نەیدەگرت نەیاندەتوانی دەستی بۆ بەرن.

جا ئەوە بەڵەدیان کرد بۆ تەواوی مێرگان، هەتا بردیانەوە سەری زەهاوێ

ئەگەر سبحەینان گیابەند و خاو پەلکەی داوێ

لاس ئەو دنیا ڕووناکەی بەبێ خەزاڵ ناوێ.

ئەو گولاَنەی خەزاڵ پەڵپی بۆ گرتبوون، هەمووی حازر کرد. ئەو گولاَنە بەچل ڕۆژ سیس نەدەبوون. لاس نەخشەی کێوەکان و کۆشکی مامەڕەشی هەڵگرت. پرسیاری

تەواوی لێ کردن، ڕێ و شوێنی وان حاڵی بوو بەچاکی. جا وڵاغەکەی ناڵی لێ ببۆوە، کوتی ئەنگۆ وەسیلەی ناڵبەندیو هەیە؟ مامەڕەش کوتی: ئەمن ناڵبەندم. لاس کوتی:

دەتوانی بتوێنیەوە پۆڵا و ئاسن، بڵێن: ڕاستە و سواعبەت نییە

وای ئاو بدەی بەمەحکەمی، بڵێن: ناڵی وا لە چوار پەلی وڵاغی کەسدا نییە

کاسەوی بێ دەیدەم لە سمی وڵاغێکە ڕەش کوێتی شێر خەزاڵییە

بەڵکو نهۆم نەهێنێ، جێگاکەم شاخ و چڕە، لەو وڵاغە زیاتر خۆ من چ هاوڕێی دیکەم نییە

ئەمن بەو وڵاغەیە دەگەڵ خەڵکیم پێ دەکرێ بەربەرەکانی و دوژمنایەتییە.

جا مامەڕەش هێنای چەرمی کەڵەکێوی دەباغی کرد بۆ دەماندنی کورە، جا ئەوە ئاسن و پۆڵای تواندەوە. چوار خڕیم چونی ناڵ دروست کرد. قەت بەعومری خۆی ئاسن و پۆڵای وا قاڵ نەکردبوو. شاگرد و ئەسبابی ساز کرد، ئەگەر وڵاغەکەی بۆ ناڵ بکا.

ئەگە ناڵەکە ساز بوو، لاس کوتی: بیهێنە، ئەو ناڵە ببینم. ئەگە ناڵەکەی دایە، ئەگەر دوو جاری بادا، ناڵ وەک مێوەڕۆن چوونە سەر یەک. جا ئەوە لاس کوتی:

ئاخر بۆیە دز و گۆران ئیعتیباریان بۆ نییە

جا ئەمن چۆن ئەوە بدەمەوە لە سمی وڵاغی بەحرییە

بۆم ساز بکە ناڵێکی لە پۆڵای عەسڵە سەبزەوارییە

بزماری قاڵ بکە سەر نەوزەڕییە

چونکە بۆ خۆت بێ کیفایەتی بۆیە کیفایەتی خەڵکیت لە کن نییە

ئەتۆ دەبێ ئەوەندەت عاقڵ ببێ، بڵێی: شوان و گاوان و گەدا نییە

ئەوە لاس و کورتە لاسی باڵەکییە

خوداوەندی میری مەزن بە شانیدا نەهێنێ نەدامەتی و بەدییە

جا خۆ نەڕەشێری وەک لاس ئیدی لە دونیایەدا نییە

ئەمن چۆنی لێ خەسارکەم سمی وڵاغێکی ڕەش کوێتی شێر خەزاڵییە

چون ڕێگاکەم ناخۆشە، لە جێیەک بڵندە لە جێیەک نەوییە

جا خۆ وڵاغ ئەمن ناباتەوە بۆ جێگای خۆم بەبێ ناڵی و بەپێ خاوسییە
ئەو حەلە لێتانی و سمایل عوزێری پێم بکەنەوە سواعبەت و گاڵتە و بکەومە
سەر قسەی بەدییە
مەگەر تۆ پۆڵا و ئاسنی بەقابیلەتت نییە؟

هەتا ئەمن لەسەریەک بددەمێ چل زێڕی سکەدار، ئەوی پێی دەڵێن: زێڕی سپییە. حەوت دەستەی ناڵ بۆ هێنا هەمووی دەنوشتاندەوە، وەک دەکورەی ئاسنگەری بنێی. هێنای ئاسنی خدێوی قەڵشتەوە، چوار قۆزاخەی کرد، جا لە هەر چوار لاوە پۆڵای باریکی تێنا. بەحەوت شاگرد دەیاندەماند. ئاور جارێ باوەشێک لە کوورە دەهاتە دەرێ هەتا تواندییەوە و مەحکەم و قایمی کرد بە پیکان. بە کەیفی خۆی جێبەجێی کرد. بیست و سێ بزماری هەموو بەجورێک تواندەوە و جێبەجێی کرد و سەری نیشانەی ئاسکی لێ دا، تا ئەوڕۆکە بۆ کەس جێبەجێ نەبووە. مامەڕەش کوتی: ئەگەر ئەوەم لێ قەبووڵ نەکا، تازە ئەو وڵاغە بەمن ناڵ ناکرێ.

مامەڕەش ناڵ و بزمارەکەی لە قاوەسینێکی نا، هێنای لە پێشی لاسی ڕاگرت. لاس ئەگەر تەکانێکی دایە، مەحکەم بوو. دەشیتوانی بیشکێنێ، ئەما بەهەر سوڕەت کوتی:

لێی دە، دەستت خۆش بێ. مامۆستا جا ئەوە وڵاغی بۆ ناڵ کرد.

لاس کوتی: فەرموو عەوێزی پاداشتی ناڵەکەت وەربگرە. حەوت زێڕی سپی دایە ئێکی بەقەد ناڵبەکێکی. مامەڕەش ئەگەر قامکی ڕێ دەخشاند سکەکەی دەبرد مامەڕەش کوتی: عەزیزم بە شێتم دەزانی، هەڵبەت دەڵێی دزە دنیای نەدیوە، ئەو پووڵە قەڵبە و سکەی نەماوە. لاس کوتی: وەڵڵاهی ئەو کابرایە زۆر بەحەڕەکەتە. پاشان لاس سکەی دەرهێنا و ئیمتیحانی کرد و دایە دەستی.

جا مامەڕەش پێی گوت: بۆ بەڵەدی دەبێ بۆ خۆم دەگەڵت بێم.

مامەڕەش کوتی: خۆم مەعاریفی عێل نشینان دەکەم بەواسیدەی تۆوە، چومکە هێندەم پیاو خراپی کردووە بەواسیدەی تۆوە نەبێ دڵم قەبوڵ ناکا بێمە نێویان و ئەگەر بەبێ سەدەمە نەجاتم بێ.

ئەما ئەتۆ دەکەم بەفرشتە و ڕوحی خۆمت پێ دەسپێرم. تازە بەخەیاڵی ئەوە نیم

چیدیکە بەدفەڕی و ناڕەحەتی دەگەڵ کەس بکەم. دەزانم لە قابیلەتت دایە لە هەموو جێگایەک داممەزرێنی. هەتا ئەمن لەسەر ڕێ و شوێنی تەریدەیی و خراپی لاچم. ئەگەر بێتو ئەتۆ لەوەیدا یاریدە و کۆمەگ بەمن بکەی ئەوە دیارە کابرایەکم لەسەر ڕێگای شەڕ و ناڕەحەتیم دەبەیە سەر ڕێگای خێر.

لاس کوتی: پێم خۆشە، ئەوە گوڵم پێیە، ئەتۆش وەکو گوڵ بێی بۆ نیشانە، بێی زۆر چاکە. جڵەوی لاسی گرت، کوتی: ئەمن نۆکەرم، بەنۆکەری دەگەڵت دێم، هەم خزمەتی خۆت دەکەم هەم خزمەتی ولاغەکەت دەکەم. هەتا ئەوڕۆ کەس دەقابیلەتی دانەبووە ئەمن نۆکەری بکەم، هەر خەڵک نۆکەری من بووە، ئەمن نۆکەری کەس نەبووم ئەما لە قابیلەتت دایە هەزاری وەکو من ڕابگری بەنۆکەری. ڕێت دەوەشێتەوە، بۆوە دەبی پیاو نۆکەریت بکا. کەماڵ و جەماڵ و غیرەت و یەغباڵت یەکتری گرتووە.

ئەوە لاس لێی قەبووڵ کرد. خوداحافیزی لەسەر تەریدان کرا. کوتی: قسمەتە، دەچم، قەتم ڕەفیقی وا و پیاوی وا جیهانپەنا وەگیر ناکەوێ. لاس ئەگەر هات پاش نۆ ڕۆژ کەوتە ئاچغی. خانزادە خان هەمیشە قەرەوڵی بوو. لە بیست و یەک جێگا چل قەرەوڵی دانابوو. قەرەوڵ خەبەریان دایە، کوتیان:

لە پلەی جوننییانەوە دوو کەس هاتن، ئێک پیادەیە و ئێکیان سوارە

یەکیان شێرە و ئێک ئیختیارە

ڕەنگە لاس بێ، وا دیارە.

ئەوە خانزادە خانی حەریری بۆ خۆی دێتە سەر ڕێگایە، ئەو وەختی ئەگەر تاریک و ڕۆنی بەیانی لێک دەبێتەوە.

ئەوە لاس هاتەوە بەدڵخۆشی و بەگوشادی بچێتەوە لای خەزاڵ. ئەگەر خانزادە خان چاوی بەلاس کەوت دیتی ئەوە خەریکی ئەوەیە ئەگەر ڕێبەڕی بکا، جا ئەوە بەندێکی بانگ کرد، کوتی:

سوارەکەی بەولاغت دەکەیەوە جەولانێ و پێی دەدەیەوە تەکانە

ڕەبی بەدوور بی لە چاوی بەد و لە تیری چڵکن و لە جەنگی ڕۆژی دڵ هێشانە

عەزیزم باز وەحشییە، دەسووڕێ، دەگەڕێ، لێی تێک ناچێ دێتەوە سەر هێلانە

فریشتە هەمیشە پەروانەیە و دەگەڕێ، دەچێتەوە بۆ دەرکی خەزنەخانە

هەمیشە گە پشووێکی با هات دەماری پیاوی حاڵی دەبێ لە بۆنی ڕەشەڕێحانە
ئەتۆ قەولێکی بە ئەسەحیت بە من دابوو، تەفرەدان عەیبە بۆ ئەو کەسەی دەڵێی شێری جەنگییە و هاتۆتە دەر لە لانە
درۆکردن ئی پیاوی بێ قابیلەت و شوان و گاوانە
درۆکردن بۆ لاس! مردن چاکترە لەو ژیانە
شازدە ساڵە لە بن کراسێکە مەحمەڵ دارایيدا جووتێک شەمامە و شەمامە ڕەنگینم بردۆتە حەفسخانە
دەڵێم ماڵی لاسە شۆڕی باڵەکانە
یان هەوەڵی ڕۆژێ لە دڵت نەدامایە ئەو تیری سەر بەپەیکانە
بە خۆشی دیارە عیلاجی تۆ نایە، نسحەتی کەست ناچێ دەگوێیەوە، بەڕاستی ئەوجار شەرمانە
بۆچی زەینێکە خۆت نادەیەوە ئەو کولمەی ناسک؟ قەرە زولف بوونە ڕێحانە و کولمەم خەرمانە
چ بکەم دڵت بەستووم، ئەتۆ بوویە شەم و ئەمنیش بوومە پەروانە
شەو و ڕۆژ لە خەیاڵی تۆ دام، دڵم بێ ئارام و بێ وچانە.
مامەڕەش ئەگەر گوێی لەو قسانە بوو، سەری جڵەوی لاسی گرت و کوتی:
سوارەکەی ئەمنت ببمەوە قوربانی ڕکێف و سەر و سواری و ئاوزەنگییە
ئەمن نابەڵەدم خۆ هیچ بەڵەدیم نییە
ئەگەر قسەت لە قسەیدا بکەم دەبێتە بێ عاقڵییە
بۆتە فکر و خەمناکی قسەی ئەو کیژێ مەرزینگان، یەگجار خەمناکی و پێ بەستی هاویشتومە دڵییە
لێم قەبووڵ بکە، جوابی بدەوە؛ بزانە مەنزووری چییە
پیاو لەگەڵ کەسێک ئەگەر ببێ دوژمنایەتی و بەربەرەکانییە
ئەگەر تەکلیفی لێ بکا، بچێتە کنی بە میوانییە
پاش دوژمنایەتی پەیدا دەبێ نێوان خۆشییە

خودگیری دەکەی و ناچی مەتڵەب و تەکلیفت لەسەر چییە؟
ئەمن بێ مەتڵەبم، خۆ هیچ مەتڵەبم نییە
دەتهێنمە تکایە ڕدێنێکی سپییە دڵی مەشکێنە، دڵ شکاندن چاک نییە
لە دڵ شکاندن دەپرسن ڕۆژی ئاخرەتییە
عەجایەب چ دڵێکت هەیە! کیژ دەڵێ شەنگەسییە
دەڵێی سەرسەوز و بۆرچینە، ئەگەر بەو دەڵێن مراوییە
چاوی دەڵێی ئەستێرەی ڕۆژییە شۆقی داوەتە چۆلی و بەڕییە
سنگی دەڵێی تەختی سوڵتانە چۆڵە و ئێستاکانە ساحێبی ئەو تەختە لەسەر نییە
فەرموو ئەوشۆکە لەسەر ئەو تەختە دابنیشە، دڵ شکاوە ئەو کیژە، بیکەوە دەلاڵەت و بیدەوە دڵ خۆشییە.

لاس بەقسەی مامەڕەشی کرد. عەتر و عەبیریان پێ وەرکرد. بە سەت ئیحتیرام لاس ئەوە میوان بوو. ئەوە بەخێرهاتنی کرد و لاس دەگەڵ خانزادە خانی حەریری داخیلی خێوەتێک بوون. ئەوە خانزادە خانی حەریری دەڵێ:

لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ئامان ئامانە
لە بنی گوێیانم خۆش دێ شەقەی ڕمب و قرمەی شیر هەڵکێشانە
دنیا هەر بۆیە خۆشە ئەگەر پیاو دەگا بەکامی دڵانە
سی ساڵم لە عومری ڕابردووە، لەو سی ساڵەیدا ئەوشۆ دڵم بێ تەکانە و بە وچانە
ئەمن شوکرانەی خودای دەکەم، لە نەزری ئەو خێرەیدا دەدەمەوە سەت شەک بەرانە
شەرت بێ ئەمن ببەخشم حەوت سەت زێڕی لەوانی بەبیست و چواری
بەوەزن سووکی بەقیمەت گرانە
چومکە ڕێگایان لێ گۆڕیوە مەلەکانی دەعاسمانە
بازی بەندی خەزاڵی لە قۆڵی داماڵیوە، سبحەینێ دەیخاتەوە سەر ڕەگی دەملانە
ئەمن زۆر ئیفتیخار دەکەم کورتە لاسی باڵەکانم ئەوشۆ لێ میوانە
وا دەزانم دەرکی بەهەشتێم بۆ کراوەتەوە، بەمردوویی ئەمنیان نەبردۆتە نێو قەبرانە

تەختی منیان هەڵگرتووە، بردیان لە بەهەشتی باقییان دانا
چومکە ئامۆزاکەی خۆشەویستم ئەوشۆکە لە کن منی گرتووە وچانە.
مامەڕەشیان خەلات کرد و ولاغیان دایە. ڕمب و چەتاڵ و مەتاڵ و تیر و پەیکان،
تەدارەکی ئەو وەختیان بەتەواوی دایە.
بەیانی لاس سوار بوو، خوداحافیزی کرد، هاتە سەر ڕۆینێ. خانزادە خانی
حەریری بانگی کرد، کوتی:
سوارەکەی سوار بووی لە ولاغێکی عەسڵە بەحرییە
پشت لە ئاوەدانی دەکەی و ڕوو دەکەی لە چۆل و بەرییە
دەڵێی شێری برسی و نێچیرت لەبەر دەستیدا نییە
هەزار جار سەری منت ببێتەوە بەقوربانی ڕانی ڕکێف و لاقی ئاوزەنگییە
هەچەند جارێکی ڕکێفت بۆ ولاغ دادێنی، دڵم تاریکە و لێی پەیدا دەبێ ڕووناکاییە
هەتا دە شەوی دیکە مەستم، دەڵێن: خانزادە خانی حەریری ئیغیار نییە
چومکە چاوم بەنێو چاوانت کەوت دڵم ئاسوودە بوو، تەکانی بۆ نییە
چاوەڕێی پاشەڕۆژیم، بگەڕێیەوە لێم تەحویل وەرگری دوازدە هەزار ماڵ عێلی
حەریرییە
ئاخ ئەوەندە نەمردمایە لە باوەشم بگرتبایە نەسرییە
بیانکوتبایە: پاشەکەوتە و میراتگری کورتە لاسە شۆڕی باڵەکییە
تازەکانە خاترجەم بووم بەدڵی خۆشی، تا چاوم پێت دەکەوێتەوە نەفس و هەوام
دەکەللەیدا نییە
هەڕۆ بڕۆ کوێر بێ ئەو کەسەی لە تۆ دەکا دووزمانی و شەیتانییە
دوژمنی قاتڵی ئەڕواحت دابنیشێ دەستەوئەژنۆ، بەڕەنجەڕۆیی و نیگەرانییە
ئێمە سی هەزار ماڵمان عێل لەبەر دەستی دایە، لە لاس زیاتر بێ کەسین، کەسی
دیکەمان نییە
سەرت لێ شێواوە، ڕێت لێ گۆڕاوە، پەرییان دەستیان لە دڵت داوە دەنا نەدەبوو
بەجێ بێڵی سنگێکی باغی شەدداد و دوو چاوی ڕەشی بەنگییە

خۆ کەسێکی ئەگەر نەخۆش بێ، بنالێنێ لەبەر دەردی گران و بلێن: ئەو دەردە دەرمانی نییە
ئەگە چاوی بەنێو چاوانی خانزادە خانی حەریری بکەوێ، بۆ وی دەبێتە دەوا
دەبێتە نوشتەی حەزرەتی خدری ئەگەر لە چۆلی و بەرییە.
دەهەڕۆ بڕۆ بەدلێکی پڕ لە هێش ئەمن بۆت دەکەمەوە تەمەننایە
ڕەبی بەدوور بی لە دەرد و بەدوور بی لە بەلایە
بەدوور بی لە دەست و ڕمبی خان قۆچی خانی گێلانگێسییان ئەگەر لەبەر حەوت سەت کەس زودی و عێلی لێتانێ هەلْنایە
بەدوور بی لە گێچەڵ و موقەددەری ئەوێ کاولە دونیایە
ڕەبی سەفەرت خێر بێ، دوازدە ئیمامی دەشتی بەغدایە بۆت بکەن تەمەننا و دوعایە
بەڵکو بەسلامەتی بگەڕێیەوە بۆ نێو عێلی باڵەکان و بۆ مەملەکەتەکەی کاولە نوحسایە.
ئەوجار لاس دەڵێ: کیژێ چاو بەنگییە
غوربەتی دڵت وەهای هێرش بۆ هێناوی فرمێسکت دێنەوە سەر کوڵمێکە سپییە
تۆق و تەلەسمت پاکی ڕەشپۆش کردوون، کەسێکی نابەڵەد بێ، دەڵێ: ساحێبی نەماوە و ئەوە میراتییە
یەستا لاس بەژیان ماوە، چ خەبەرە؟ خۆ بۆت نەهاتووە ئی لاس خەبەری مەرگییە
ئەمن لاسم و خۆ لاس کابرایەکی بێ غیرەت و بێ ناموس نییە
شتێک هەیە ئەجەل بێ مۆڵەتە و مۆڵەتی بۆ نییە
دەنا گە بێتو بەسلامەتی بگەڕێمەوە بۆ نێو عێلی کاسەوەندی و سمایل عوزەیرییە
لە تۆ بێ خەبەر نابم، چون بۆ ڕۆژی دوایە بۆ من بێ ناموسییە
لە تۆم دەوێ دوعای بەخێر و ئەوە لێت دەکەم خوداحافیزییە
هەتا لاس مابێ، بلێن: ڕکێفی لاس لەنگ نەبووە و لەسەر پشتی ئەسپییە
هیچ کەس ناتوانێ لە عێلی حەریر و باڵەکان بکاتەوە ناهەقییە

چومکه تیری لاس وەکو تیری غەیبییە
دوژمنی من قەت قەت ڕووناکایی و بینایی لە چاویدا نییە
ئەوەش تەمەننا دەکەم لە پادشای غەفور و ئەمن شوکرانەم وەبەر ڕەبییە
هەڵبەت بەکەسی دیکە ناکرێ ئەو هەیبەت و هونەر و تانوت و غیرەتە، ئەو ناومێتە سەر شانییە
دەنا بەبێ خوڵای، هیچ کەس ئیختییاری ڕوح و گیانی خۆی نییە
ژەنگی پێ مەهێنە بە تۆق و تەلەسم و گواران، جووتێک شەمامە و شەمامە ڕەنگینی
باغەڵت لە سنگتدا مەکەوە حەفسییە
هەمیشە دادەنیشی بەخەمناکی و نیگەرانییە
لەززەتی دنیایە هەر دڵخۆشی و ئازادییە.
ئەوە لاس ڕۆیی، دێتەوە نێو عێلی سمایل عوزێرییە
ئەوجارەکە خەزاڵ لە تاوی لاس وەک ماری بریندار جینگڵی دەدا، وەک کەسێکی برسی بێ، مانگی ڕەمەزانێ چاوی لە بانگییە.
خەزاڵ دەیگوت: دەردێکم گرتووە پێم وایە دڵم لە زگمدا ڕۆییوە
لە نجوومداران بپرسن بزانن ساڵ درەنگە یان زووە
پێم وایە نێوەڕاست مانگی هاوینێیە و گەلاوێژ کەوتووە
هەڵاڵ و بەیبوون و گیاخاو پەلکەیان وەراندووە
لەمێژە بێ نوتقە و دەنگی نایە ئەو داعبایەی پێی دەڵێن پەپووە
سەڵای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، ماڵە باب و باوانم ئاوری تێ بەربووە
ئەوڕۆ چل و پێنج ڕۆژە لاس و کورتە لاسەکەی باڵەکان ڕۆییوە
نە لە دوازدە ئیمامی دەشتی بەغدایە نە لە گومبەزی حەسەن و حوسێنان
نە لە قەسرەکەی شەمامکێ نە لە چل پلەی حومامێ خەبەرم بۆ نەهاتووە
نازانم لاس بەزیندەگانی ماوە زمانم لاڵ بێ بەدڵم دادێ یان ماوە یان مردووە یان دڵی گۆڕاوە و پووشی منی هەڵاویتووە

یان شەیتانان شۆفاران قسەیان کردووە و ئەمنی قەلەندەری بابان وێرانیان لەبەر دڵی لابردووە

ئەوە چل و پێنج شەوە قەلەندەرم بابان وێرانم دایمە دەڵێی لەبەر دەسمە مەیت و مردووە

قەت ڕووناکاییم بەدڵیدا نەهات نازانم نە پەرێشانی لاسە و نە مەلەکانی عاسمان دڵی منیان گرتووە.

لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە، ڕووناکایی تێدا نییە سوبح و

ئێوارێ شەوێ خەمە، سبحەینان خوێنم بەسەر سەری دادەبارێ

نان و ئاوم لێ ژەهری مارە دڵم هیچ سەعاتێک ناگرێ قەرارێ

لە دڵی من گەڕێ لە هێشە و لە ژانە، دایمە لە کاوەکاوە و دەکاتەوە هاوارێ

لە ڕۆژێکی ئەگەر بەمنیان کوتوە: ئەوە هاتۆتە ئاخر مانگی بەهارێ

دەنگی سەدای کوڕەی ئی لاس لە بن گوێیانم نایە، بەهیچ جۆرێک دەردی من نایهێ چارێ.

سبحەینان چەند خۆش بوو ئەگەر تاو گەزێک لە بورجی مونەووەر دەهاتە دەرێ

کورتە لاسەکەی باڵەکان لە خۆی دەدا تانوت و هونەرێ

دەیهاویشتە سەر مەلان ڕمبی دەمڕەشی هەژدە قەفی دەستی داویشتە سەر دەسکی خەنجەرێ

لە من وایە سوڵتانی ئەستەمبوڵم ئەگەر دەکەمەوە حوکمات و لە پێشم ڕادەوەستن دوازدە هەزار نەفەرێ

ئەلعان یەگجار زۆر بێ قەرارم، وەختە ڕوحم لە قەفەزی بەدەنم بێتەوە دەرێ.

ئەما من بێ کەسم، کەسم نییە شەو و ڕۆژ بگەڕێ لە چۆلی و لە بەڕییە

هەچ کەسێکی مێهرەبانم کا و بمداتەوە دڵخۆشییە

بڵێ: لاس هاتەوە و بۆم بێنێ مزگێنییە

دوازدە خێوەتی دەدەمێ سەر بەئەڵماسی ئاتەگ مرواریيە

حەوت سەت زێڕی دەدەمێ، هەموو سووڕەدار، بڵێن: لە خەزێنەی هیچ دەوڵەتێک نییە.

لە دڵێکە من گەڕێن نازانم بۆ قەتی ناشکێ ژانێ

بڵێسەی ئاورم دێتە دەرێ لە دەروون و لە دەروون خانێ

لە دنیایەدا کەس بەدەردی کەس نازانێ

دەنا بڵێسەی ئەو ئاورە دەبوو ئەو عەرزە بسووتێنێ بە سووتانێ

شەراڕەی ئەو ئاورە نە بە با دەکوژێتەوە و نە بە خوناوکەی دەبارانێ

دەزانی بە چ دەکوژێتەوە؟ ئەگە قۆشچی باز ڕابگرن لەسەر دەستانێ

خەبەرم دەنێ، بڵێن: لاس هاتەوە لە سەفەری گوڵ هێنانێ

ڕەبی زمانم لاڵ بێ، ئەمن نەدەبوو ئەو قسەیە بکەم و لاس وەکو شێری لێم بگرێ مانێ

جا گوڵی چل پلەی حومامێ چییە؟ لاسی بۆ بخەمەوە ڕۆژی دڵ هێشانێ

ئەما لاس بابانی خشتور کردووم و قەلەندەری کردووم، هیچ کەس بۆ خەبەری نازانێ؟

ئەما موژدە بێ ئەوڕۆ لە بنی گوێیانم خۆش دێ شوبا، وردە پەرچەم دەبزێورێن

بەشنە شنی زریانێ و بای بسکانێ

ئەگە حەکیم دەچنە سەر نەخۆشێکی دەریدێنن ئازاری کووان و سەرەتانێ

ئەو حەکیمە بۆ من لاسە شۆڕی باڵەکانە، ئەما پێم وایە دڵ بەحاڵی گوڵ دەزانێ

ئەوڕۆکە نەختێک دڵم کراوەتەوە، گوڵ هاتۆتە شکۆفەدانێ

زەردەخەنەی لێوم خۆ تا ئەوڕۆکە هیچ کەس نازانێ

پێم وایە خۆشی و بەشاڕەتییە، بۆنی لاس دێ لە دەور و مەکانێ

ئاوازێکی خۆشم لە بنی گوێیان دێ، دەنگی تووتییە و بولبول هاتۆتە نەغمە لێدانێ

شەو و ڕۆژ ئەمن دەلاڵێنم، بێ موقەددەر بێ، ئیرادی خراپی بەسەر نەیە، ڕەفیقی ڕێگای بن چوار مەلاییکەتی موقەڕڕەب و فرشتەی دەعاسمانێ.

لە دڵێکە من گەڕێن چەندە لە هێشە لە دەروونمدا خەیاڵ پەشۆکاوە

حەیوانە کێوی لەسەری سیپانێ لە گەوەڕی کانیە قەمبەریان قولاغەیان داوە[1]
هەمووی بێ گیانە، هیچی ڕوحی لە بەدەنیدا نەماوە
جا من دڵ خۆشیم بەوەیە پێم وایە کورتە لاسەکەی باڵەکان لە سەفەرێ گەڕاوە
دە بڵێن بە کڵفەتان: ئەو خەلات و بەراتە بۆچی بەوان دراوە؟
ڕەبی خەبەرم بۆ بێنن، بڵێن: گوارە و کرمەک و ئاودەنگییان بەمیرات لە پاش بەجێ ماوە
پێشی خێوەتی لاس ئاوپڕژێن بکەن، شەراب و لوقمەقازی و نانە شەکرینی دانێن، دە بگرنەوە گولاو و قەنداوە
تازییانە خلاس بکەن، تازییانە لە دڵی مندا نەماوە
بۆنی لاسم لەبەر دەماری دێ، ئەوجار خۆشییە، کامە کاوە.
جا ئەوە خەبەریان بە لێتانیان و گێلانگێسییان و سوورچی و زوراریيان دا، کوتیان:
لە قسان خەزاڵ پەڵپی لە لاس گرتووە، چۆتە چل پلەی حومامێ. شۆرەتە وا دەڵێن عیلاجیان نەکردووە لە چل پلەی حومامێ، کامی دڵی خەزاڵی پێکهێناوە، ڕەئیس تەریدە، مامەڕەشیشی لەگەڵ خۆی هێناوە.
جا کێ بوو لە ئەحمەد خان و لە ئەحمەد خانی زوراریيە
هەرتک چاوی گەشی پڕ دەبوو لە فرمێسک و لە خوێنییە
مردن چاترە لە بێ غیرەتی و لە بێ دەسەلاتییە
مەگەر ئەمن خزم و تایەفە و برا و کەسوکارم نییە؟
تانوتم لێ دەدەن دەڵێن: لاس شێرە و ئەحمەد خان ڕێوییە
مەگەر ڕۆژێکی بمبەنەوە سەر گۆڕ و گۆڕخانە و بمبەنەوە سەر قەبرییە
جا ئەو وەختە ئەمن غەرەزی ئی لاسم نییە
بەعالەمی ئاشکرا لێی داگیر کردووم کیژێ چاو بەنگییە، داوودەلینگ حاجی حوسێنییە

(١) قولاغە دان لە «هب»دا هاتووە. یانی گوێچکەیان وەدەر کەوتووە.

نیشانەکراوی منە فەرقی نییە دەگەڵ مارەییە
لاس بەکەڵەگایی داگیری کردووە و دەزانێ ئەحمەد خان هیچ ڕوحی لە
ئێخەی کراسیدا نییە
تەواوی عێل و عێل باشان ئەلعان تەماشای من دەکەن بەبێ کیفایەتی و
بەبێ نامووسییە
کەسێک ژنی خۆی پێ نەستێندرێتەوە چییە؟ بێ دەستەڵاتە و دەستەڵاتی نییە.
ئەگەر لە مەجلیسێ وای دەکوت و وای تانووت لە خۆی دەداوە
هەزار و نۆ سەت کەس لەسەر ئەژنۆیان ڕادەوەستان قرمەیان لە خەنجەری
دەمرەشی دەسک نێرۆیی دەبۆوە بڵاوە
هەمووی خەنجەر و شیری لە کالان هەڵکێشاوە
قسەی تۆ بوو بەتیر لە جەرگی ئێمەی داوە
شەرت بێ یان ئێمە پاکمان خلاس دەبین یان هەڵۆیان گۆشت و کەلاکی لاس بۆ
قافێ دەبەنەوە دواوە.
ئیدی خۆ تا ئەوڕۆکە کەس لە لاسی نەکردۆتەوە ئەسەرێ
کەس لە دەستی لاس کەلاکی لە مەیدان نەبردۆتە دەرێ
جارێکی لاس لە خۆی دا تانووت و حونەرێ
ئەوە بۆ بۆوی بوو بە قەباڵە و بە غیرەت و بە بەرگیری و بە جەوهەرێ؟
خۆ قانوونی دنیایە وا نییە، پاکو لە قەبرغە و ببەستن قەرەبینای دەمرەشی
وەستاکارییە
وڵاغان لە خاوێ بێننە دەرێ، ئەوڕۆ ڕۆژی مەردی و نامەردییە
با بناغەی خمخانە بگەڕێ لە عێلی مەلا داود و مەلا نەبییە
سێ سەت کیژ خۆیان حازر بکەن ئەگەر خەزاڵ دێ بە یەخسیرییە
پاکیان سەرزەنشتی بکەن، بڵێن: خۆت خستە سەر بەدبەختییە
کابرایەکی باڵەکی چ بوو تۆ لە پێشدا ڕاتگرتبوو بە نۆکەرییە
بیست و دوو عێلت شڵەقاند لە نێو خەڵکیت خست قەباعەت و خوێنرێژییە

هەتا ئێستا یەگجار زۆر بەحورمەت و خانومان بووی، ئەلعان دەتبڕن زنجیرەی زولفییە
پاش و پێش سواری ئێستری بکەن زۆر بەناخۆشی و بەبێ حورمەتییە
هەتا کەس ڕاینەگرێ بەکارەکەر و بەقەرەواشییە.
هەچەندی مەیتەران ولاغیان لە بەندێ دەردەکێشاوە
گێژەی مەرکەبانە، سوار ئەگەر وەردەسووڕا و دەسووڕاوە
چون هیچ کەس عاقڵی لە کەللەدا نەماوە
بارانی مەرگ و ئەجەل هەورە لەسەریان ڕاگیراوە
چونکە ڕۆژی دڵ هێشانە هەرکەسێ بۆ مەرگ و مردنی خۆی دەپاڕاوە.
دەجا با سەرە ڕمب و سەرە پەیکان و شیری کالان زێڕین لە دەوڵەتخانە بێتە دەرێ
هەرکەسێ نۆ گۆی زێڕی دابوو لە دەسکی خەنجەرێ
لاس هیچ نازانێ سوال و باس و خەبەرێ.
ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری ئیجازەی لەشکری داوە
هات، پێشی ناگیرێ، دەڵێی سێلاوە
ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری لەسەر دوو ڕاستەی ڕکێفێ ڕاوەستاوە
ولاغی دەسووڕێ و دەڵێی شێرە و تیرت لێداوە
کوتیان: ئاغا ئەو ولاغە بۆ بەدئەدایی دەکا؟ کوتی: مەیتەران تەنگەیان توند کێشاوە
هەمووی مرواری بەندە، نوقرە ڕێزە جڵەو لغاوە.
کێ بێ لە ئەحمەد خان ئەوە مەعموور دەنێرێ سان بەلەشکر بگرن و تەگبیرە، فکرە، ڕایە
هەچ کەسێک سەری لاسم بۆ بێنێ، بڵێن: ئەوە لاس لە دەستی وی دایە
ئەو دەبێ سەرپشک بێ خاتر خۆ بێ لە دونیایە
دەوڵەمەندم، ساحێب جەلالم، باسی دەوڵەتی من بە زمان نایە
ئەوە تیری لاسە لە مابەینی جەرگ و دڵم دایە
مەگەر بەکوشتنی لاس، دەنا ئەو تیر و زوخاوە لە جەرگی من دەرنایە.

ئەسیحەتو بکەم چومکە کەسێکی دوژمن نەبینێ هەرکەسێ لەبەر خۆیەوە شێری سپییە

لاس عیلاج پەزێری ناکرێ، لەگەڵی مەکەن تیرەندازییە

ڕاست و چەپی لێ بگرن، قووەداران، ساحێب غیرەتان دایبگرن بەڕمبی

دەمرەشی هەژدە قەفییە

لە نەکاوی بەسەردا بدەن، دەنا هەژدیهای جەنگییە

هەمیشە مەستە بەخەزاڵ، هیچ ئاگای لە خۆی نییە، ئیغیار نییە

پشتی بشکێنن، بیهاوێنە سەر ولاغێکە شێر خەزاڵییە

نابێ لاس بنێژرێ، دەبێ بیهاوێنە بەر سەگ و تاجییە.

نۆ عێل بوون تێکەڵی یەک ببوون. یەک بەختیاری بوو، یەک سنجانی بوو، یەک سوورچی بوو، یەک زوراری بوو، یەک جوکلی بوو، یەک گێلانگێسی بوو، یەک لێتانی بوو، یەک شەمامکی بوو، یەک کاسەوەندی بوو. ئەوە هاتن، قەرەوڵیان لە هەموو کێوان دانا بۆ ڕێگری لاس.

لە هەموو وەختێک، چون خودا وای دنیا داناوە، موفەتیش و دۆست لە هەموو جێگایەک هەیە. بنی ئادەم تۆوی پەڕیوەیە. ئەوە کچێک خانەوادە بوو، نەجیب بوو. زەمانێکی ئەگەر ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری هاتووچۆی عێلی مەلا نەبی دەکرد، عێلی مەلا نەبی ژێرڕاکەشیان دەکرد؛ ئەو وەختی، ئەو کچی ئەو کابرای خانەوادە جوان چاک بوو، خۆش مەشرەف بوو، خەزاڵ خۆشی دەویست.

خەزاڵ بەدایکی ئەو کچەی گوت، کوتی: ئەمن ئەو کچە پۆیلە دەکەم. جا ئەو وەختی خەزاڵ تۆقێکی گەردنی خۆی دایە.

دەیدایە ئەنگوستیلێکی گەرمە کارخانە، ئەڵماس ڕێزی ئەگەر لە قامکی هیچ کەسدا نییە نەقێبی سورمەیی و ئەتڵەس ڕەنگە، حەکاک و دوڕناسان دەڵێن: مرواریییە

داوێنی سیوانکارییە، سەری ئەڵماس کاری و بەگژنیژییە

جووتێک خڕخاڵ و بازنەی دەدایە دەترووسکێن هەروەکو ڕۆژییە

هێندێک دەڵێن: مەتای سەمەرقەندە، هێندێک دەڵێن: گەردن کەشە و سکە فەڕەنگییە

ئەو دایە، پۆیلەی کرد لە بۆ ڕۆژی ئاخرەتییە

کەسێکی چاکەی خەڵکی لەسەر بێ، دەبێ چاوەڕێ بێ بۆ ڕۆژی دانەوەی پاداشتییە

کەسێک بەچاکەی خەڵکی نەزانێ ئەوە دەبێتە زۆڵی و بێ مەیلییە

جا ئەگەر لەشکرەکە ڕۆیی بۆ ڕێگاگرتن و بۆ کوشتنی لاس، ئەو حەلە ئەو کچە کزەی دەهات لە جەرگییە

دەیگوت: حەیفێ عافرەت بێ دەستەڵاتە، هەمیشە بێ ئیختیارە، قەت ئیختیاری نییە

دەبوو هەمیشە من خزمەتکاری خەزاڵ بم، لە خزمەتی ڕابوەستم بۆ عەمربەری و بۆ قەرەواشییە

ئەوڕۆکە بۆ من نەگبەتی و نمەک بەحەرامییە

ئەوە لەشکرێکی گەورە و گران ڕۆیی بۆ سەر ڕێگای لاس، لاس ئاگای لە هیچ نییە

پیاو دەبێ تەمەشای پاشەڕۆژ کا، بۆ خەزاڵ نەهاتی و بەدبەختییە

وەختێکی ئەگەر ئەو کچە ساز بوو بچێتە پێش گەل و پاش گەلی مەڕییە

لەگەڵ پۆلێک شل و مل و سایەگەردن ئەگە بەوان دەڵێن شەنگەبێرییە

وەختێکی ئەگەر مەڕ دێتە سەر بێر و کانییە.

ئەو عافرەتە دەهاتە مەڕی. جەڵەبێک لە ئی سمایل عوزێرییان هەڵبڕا بوو، هاتبووە نێو مەڕی سوورچییان. دیارە ئاغا پێکەوە نێوانیشیان ناخۆش بێ، ڕعێت و ئامپا گفتوگۆیان دەگەڵ یەکتری هەیە.

ئەوە کوتیان: جەڵەبێکی سەت سەریمان هەڵبڕاوە، لە نێو مەڕی سوورچی و زوراریيان دایە، دێین دەیبەینەوە. ئەوە ئیجازەیان دا کوتیان: قەیدی نییە، بێن جەڵەبی خۆیان بەرنەوە.

ئەو سەعاتە ئەگەر بێری چوونە نێو مەڕی، شوانی سمایل عوزێرییان هاتبوون مەڕەکە بەرنەوە.

ئەو کچە ئەوە خەبەر دەدا. ئەگە هات و پرسیاری کرد، کوتی: ئەوانە چ کارەن ئەو مەڕەیان هەڵبوارد؟ کوتیان: ئەوە سمایل عوزێرین و جەڵەبیان بردەوە. بەبەهانەی کارێکەوە لە بێرییان خۆی ترازاند و خۆی گەیاندە جێیەکی نەدیو لە شوانەکانی عێلی سوورچی و زوراری. بانگی کرد:

ئەرێ شوانە دەستی منت بەداوێن بێ، ئەرێ شوانە

ئەگەر شەوێ خەو لە چاوی تۆ هەراسانە

شەوێ دەگەڕێی و مەڕ شەوێن دەدەی لە کۆهـ و کۆهسار و سەری پیرە کوێستانە

شەو لەوەڕی خۆت داوێیەوە کۆسرەتی شاڵە بەگیان و چێشتەنگای مەڕت دێنیەوە هەواری بێرییانە

وەرە دەستی منت داوێن بێ قاسیدێکم بۆ بکە، کەسێکی ئەگەر هێندە بەحوکم بێ و

بدا فەرمانە

دەبێ بتوانێ بکاتەوە سەخی گەرێتی و خەڵات بەخشانە

فەرموو غەنیمەتم لێ وەربگرە تا دوازدە دانەت بدەمێ، هەمووی یاقووت و مەرجانە

بە دزی و بە نهێنی، دەستی منت داوێن بێ ئەوە وەختی دڵ هێشانە

خەبەرێکم بۆ بدە بە شەنگە خەزاڵ و دایمە حۆلە دەڵێی پەری عاسمانە

کەسێک لە دنیایەدا بێ خەبەر بێ، بێ عاقڵە هیچ نەزانە

ئەلعان دەبێ خەزاڵ دابنێ شێلینگ و کووپە و کووپەڵەی دەخمخانە

لاس لە سەفەرێ هاتەوە، ئەلعان ڕوحی لەسەر دەستانە

نۆ عێل بۆ کوشتنی لاس چوون ئەگەر پێی بگرن نیزاح و بەهانە

بیکوژن و نەیەڵن بژی چیدیکە بە ژیانە.

بە خەزاڵ بڵێ بۆ بێ خەبەرە و خەبەردار نییە

بۆ کەزیەکە ڕەشەڕێحانەی ناباتە سەر شێلینگ و کووپەڵەی خمییە

ئاگات لێ بوو هەتا لاس لەوێ بوو کەس نەیدەتوانی لە عێلی سمایل عوزێری بکا کەڵەگایی و کەڵەزەرییە؟

ئەوە خەبەردارم کرد، هەتا لاس نەکوژن بە بێ کەسییە

ئەمن زگم پێی دەسووتێ، شێری زەرد بەتاقی تەنێیە و کەسی دەگەڵ نییە
بۆ نەبۆتە پەروانە ڕوحی، بفڕێ، بچێ بەکۆمەگی کورتە لاسی باڵەکییە
بێکەسی بۆ خولای دەبێ دەنا بۆ کەسی دیکە چاک نییە
ئەگە خەزاڵ کۆمەگ نەکا و لەو لەشکرە نەکەن پێشگیرییە
وەبزانێ لە ماڵی بابی دادەنیشێ بەسەری بەتاڵ و بە ملی بەکوێن و بە خەمناکییە
بۆ خۆی یەخسیر دەکەن و پێی دەکەنەوە بێ حورمەتی و بێ کیفایەتییە.
ئەوجار شوانەکە ئەگەر ئاوڕی لێداوە کوتی:
کیژێ زۆر مەمنوونم ئەگەر تۆ ئەو خەبەرەت بە من داوە
کوڵمەت دەڵێی لەعلی ڕوممانە و لە تاجران بەجێ ماوە
بەفری زستانێی لەسەر لاچووە و گزینگی تاوێی لێدراوە
لە دنیایەدا دڵ شکست نەبی، قەت چاوەڕێ نەبێ چاوت بۆ دواوە
بەمراد و کامی خۆت بگەی، بەغیلیت پێ بەرن، بڵێن: لەبەر بەختی خۆی حەساوە
خەزاڵ زۆر چاوەڕێی کورتە لاسە، شەو و ڕۆژ چاوەڕێگایە، ئەوەتی پشتیوانی مەلا داود و مەلا نەبی لە بیساتدا نەماوە.
ئەوە کیژێ گەلێکی دەستەوداوێن دەبوو، دەیدایە ئامانەتییە
دەیگوت: کۆمەگت هەق دەستی ئیلاهی بێ، چومکە شوانی قەتت نەمێنێ عێجزی و ماندوویەتییە
خەزاڵ ئەمنی پۆیلە کردووە لە عەمری حەو ساڵە و منداڵییە
ئەمن چاکەی خەزاڵم پێ نەدراوە، ئەوە بۆوی چاکەدانەوە و پاداشتییە
هەچەندی پێی دەکرێ خافڵ نەبێ، کۆمەگی پێ بکا بە لاس و کورتە لاسی باڵەکییە.
شوانەکە ئەو قسەیەی لەسەر دڵی بوو بە گرێ، چونکە پیاوی ڕەشید هەموو کەس خۆشی دەوێ. خەزاڵ لە چادرێ هاتبووە دەرێ، خەریکی ئەوە بوو بچێتەوە ژوورێ.
ئەوە شوانەکە دەڵێ:
کیژێ، کیژەکەی سەری زنجیرەی زولفانی ڕادەوەشێنێ

سنگت دەڵێی بەفری کوێستانە، هەوەڵ مانگی بەهارییە، قەدەم لەسەری خۆی دەسوورێنێ
دەڵێی وەنەوشەی کانییە قەمبەریانی، هەوادارە و سبحەینان ئاونگێ دێنێ
ڕەبی موقەدەری خودات نەیەتە سەری، بەخت و تەڕەقی و ئیغباڵت لێ نەستێنێ
هەچەندێکی بەلێوێکە مبارەک پێدەکەنێ و زەردەخەنە دێنێ
پێکەنینی وی دەبێ بە تیر، لە جەرگ و دڵی پیاویدا سەرەتیر بە جێ دەمێنێ.
دەمرمەوە لەبەر شەدێکی ئەڵوانی کۆر حوسێنی ڕیشوەیان لە هاتوچۆیە
جار جار دێنەوە سەر چاوان جار جار هەڵدەکشێنەوە سەر کەوانەی ئەبرۆیە
لەبەر قاسیدی سەر سنگت دەمرم ئەگە خڕبوون، هێندێک دەڵێن: نارنجە، هێندێک دەڵێن: لیمۆیە، هێندێک دەڵێن: گۆیە
ئەگە بێتو ئیجازەم بدەی، چومکە ئیختیار لەسەر گرۆیە
چوار قسەت دەگەڵ دەکەم و ئەمن کارم بە تۆیە.
هەزار جارت ئەمن ببمەوە بەقوربانی زولفێکی سێ بەنگییە
ئەگەر گۆی کەمبەرەت بەربوونەوە، دەڵێی سوارەی ڕۆمییە
جارجار دێنە سەر سنگت و جارجار شۆڕابەیان دێنەوە سەر عەرزییە
چاوت بوونەتە جەللاب، دایمە تیخیان لە دەستییە
هەیبەتت وایە هەموو کەس ناتوانێ بتدوێنێ، چون ئەو جەللابانە، وەکو چاوت بن، دایمە ئیشتیایان لە قەتڵ و خوێنرێژییە
مەڵێ شوانە وێڵێکی بێ قابیلەت ئەمنی دەوێ کاری چییە؟
ئەمنت دەمرمەوە لەبەر بەژنێکە باریک ئەگەر بێ غەوشە هیچ ناقیسی نییە
چەند میر و بەگلەران لە داخ و حەسرەتی تۆ سەریان بردۆتە بن گڵییە
ئیجازەم بدە، چاوت لە من نەبێتە ماری جەنگییە
ئەوەندە بزانە شوان بێ حاجەت نییە
ئەگە من خەبەرت بدەمێ بۆ تۆ خۆشبەختی و تەڕەقییە.
ئەوە خەزاڵ و خەزاڵەشۆڕ لەسەر پانیەی ڕاستەی ڕادەوەستاوە

وەکو ئاسکی ئەگەر بێچووەی بەجێ ماوە

ئەوە بەمێهرەبانی ئاورێکی لە شوان دەداوە

دەیگوت: چییان لێ کردووی، کێ ناهەقی لێ کردووی، چت لێ قەوماوە؟

هەتا هەقی خۆت بۆ جێبەجێ بکەم و بۆت بستێنم تەواوە.

شوان هاتە پێشێ کوتی: فلانکەسێک خەبەری بەمن دا، لاس هاتۆتەوە. نۆ سەردار عێل لەگەڵ ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری ئەوە لە سەحرای کەشانن، قەرەوڵیان هەیە و ڕێگایان پێ گرتووە.

خەزاڵ دەگری و دەبارێنێ

هەناسەی خەزاڵ یەکجار زۆر تەحسیر دێنێ

هەچەند جارێکی عەسرین و فرمێسک بەسەر کوڵمەیدا هەڵدەوەرێنێ

دەڵێ: سەلای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، کەسم لە ماڵە باوانی نەمێنێ

قەت بووە یەخباڵ بێ دە دەستتەوە و دوژمن بەزۆرداری لێت بستێنێ؟

جا ئەمن بۆ ڕوحم بمێنێ، بۆ دڵم خوێن نەدەڵێنێ؟

کێ بێ لە نۆکەر و لە نۆکەرێکی ئەگەر بتوانێ خەبەرێکم بۆ بەرێتەوە ماڵە باب و خەبەرێکم بۆ بەرێتەوە ماڵە باوانێ

پاشی سێ ڕۆژی دیکە عێلی لێتان و سمایل عوزێری دێنە سەر سووتان و تالان کرانێ

ئەوە هەیبەتی لاسە تا ئەوڕۆکە هیچ کەس ناتوانێ

ئەوە عێلان ڕێگایان بە لاس گرتووە، پڕیشکەی خوێنە، دەنگی تیرە، ئاواز دەچێتەوە

بۆ کەشکەلانی عاسمانێ.

خەبەریان بەمەلا نەبی و سەردار عێلان دا. مەلا نەبی کوتی: کەسێکی لە دونیایەدا ئەگەر شەرتێکی کرد، قسەکەی خۆی نابێ بەرێتەوە پاشێ، شەرت نیوەی ئیمانە. چون ئەمن بێ کوڕ و بێ نەسر (نەسل) بووم ئیختیار و دەوڵەت و ڕەئیسی و هەموو حیساباتێکم بە خەزاڵ داوە. بچن خەبەر بە خەزاڵ بدەن، حوکمی وا دەبێ خەزاڵ ڕای لەسەر بکێشێ.

خەزاڵ بۆیە بۆ خۆی لە ڕێوە حوکمی نەکرد و لەشکری ساز نەکرد، کوتی: ئیحتیرازم لێ دەگرن، با نەڵێن هێندی دڵ بە لاسەوەیە، ئەو خەبەرە درۆیە، تەمایەتی لەشکرمان پێ ساز بکا. ئەوە خەبەر بۆ خەزاڵ هات. تەواوی سەردار عێلان دەڵێن: حوکم و دەستەلات لە دەست خەزاڵ دایە.

جا ئەوە خەزاڵ دوازدە جارچی دەنارده نێو عێلییە
ئەوە ترازاندم دەرکی چەکخانە و کاری لازم کارییە
دوازدە هەزار سوارم بۆ سوار بێ، ولاغیان پیر نەبێ، سوار بن لە ولاغی عومر سێ ساڵەگییە
بەدەستێک کوڕە جحێلان بڵێن ئەوی هەمیشە مەستە و کەللەییە
چاوەڕێی یاری خۆیەتی کەنگێ دێتەوە لە ڕێگای کانی و لە ڕێگای مەڕییە
هەموو لە خۆیان قایم کەن سێ سەت پەیکانی سەر نەوزەڕییە
ئاو درابێ بەژەهری مارییە
وەختی دیفاع و دڵ هێشانە، قەت سەدەمە و کاری وا گەورە نییە
بەهومێدی خودای وەدەستیان دەکەوێ نوسرەت و فەتح و تەڕەقییە
لەبەر خودای عاسمان دەپاڕێمەوە، هیچی باری ئەجەلی لەسەر نەبێ، سەریان نەبەنەوە بن بارستی گڵییە.
بەدەستێک شەنگە پیاو بڵێن ئەگەر عومریان لە چل ساڵی تەواوە
دایمە غیرەتیان وەکو مەنجەڵی لەسەری دەکوڵێ و دەڵێن کوڵاوە
لە پشتی ولاغیان بکەن زینێکی موڕەسەع و لە زاریان بوکتن ددانە لغاوە
سەفەری سەعادەتیان بێ، بە دڵ شکستی نەگەڕێنە دواوە
کارێکی گەورەیە لە هەموومان قەوماوە.
بەدەستێک ژنان بڵێن شل و مل و ناسکە زیبایە
ئەوی کۆرپەی نەخشینی لە باوەشی دایە
ئەوان دوعایان دەبێتەوە قبووڵ و موستەجایە
هەموو ڕابوەستن لە دەرگای مەخسوود حاسڵکەر ئەگەر خودایە

تێکرا ئەوان بکەن ڕجا و تەمەننایە.
بەدەستێک کچە جحێلان بڵێن تازە سەرسنگیان لیری کردووە
مەمکیان دەڵێی شەمامەی حەوڕەنگە تازەکانە خاڵ خاڵی سوور بووە
زولفیان دەڵێی بەیداغی ڕۆمییانە، سێ بەنگی و داوداویان کردووە
ئەوان لە بۆ ڕۆژی مرادی خۆیان بکەنەوە پاڕانەوە و ڕجا و ئەرجووە
سەلای گەورە و گرانم لێ ڕابوو لەمێژە لەشکری سوورچی و زوراریيان چووە
خۆ لاس کوڕێک نییە دابمێنێ، زولفی خەزاڵە پێی بەستوە
مەعلووم حەوت شەو و حەوت ڕۆژە وچانی بە ولاغی نەگرتووە
بۆ خۆی زۆر توونییە، چۆلی و بەڕی بڕیوە و ماندووە
دەنا لە ئاوازی تیری کورتە لاس دوژمن بێ ڕووحە و ڕووحی چووە.
ئەوە لەشکر ساز بوو.
نیوێکی هیچ ئاگای لە خۆی نییە و لاقی لە ئاوزەنگی نەناوە
ساحێب جگەران پاش بەند و پێش بەندی شەوێیان هێناوە
هەموو کەس دەڵێ: ئەو ڕۆژەیە لە دەشتی ڕەی شەڕی ڕۆستەم و ئەفراسیاوە
فرمێسک سێ ڕێزگە لەسەر سنگی خەزاڵ هێرشی هێناوە
لەشکر ئەوە دەڕوا و ئاوپرژێنی پێشی خێوەتێ بەفرمێسکی چاوی خەزاڵ کراوە
دەبێ سنگت بۆ بکەم بەتەختێک دوو قەدەحی شەراب لەسەر داندراوە
سنگمت بۆ بکەم بەباغی نمروود بڵێن پەنجەی لاسی تێکەڕاوە
کوڵمەت بۆ بکەم بەشانەی هەنگوین، وەختی بڕینەوەیەتی و ڕەواقی تێکەڕاوە
ئەمن هەنیەت بۆ بکەم بەشەربەت و بەشووشەی گولاوە
ئەگە بێتو لوقمەیەک وەربگری، بڵێن ماندووی لەو سەفەر و جەنگ و جودالە حەساوە
هەقی خۆتە دەبێ وەریبگری، عەزیەت و عازاب و سەختڵەتی و ساغاویت گەلێک لەو سەفەرە کێشاوە
هەم ئەمن دڵم جێبەجێ دەبێ، هەم ئەتۆ ببینە کام و کاوە

ئەگە بێتو من تۆ نەبینم، ڕەبی ڕووناکایی و بیناییم ببڕێ لە هەردک چاوە
جا تانووتم لێ بدەن سەردار عێلان، بڵێن: میراتە و لە پاش لاسی بەجێ ماوە.
ئەوە سوارە ڕێز ڕێز و جووت جووت گەیشتنە قوچێ قەزەنی
هەمووی تیری لێو سووری شازدە موشتەیی جەرگی دوژمنی هەڵدەکەنی
چاوەڕێی قەدەمی لاسن ئەگە بیبینن بە دیانەتی و بە ئەهوەنی.
ئەوە سوار سەر بەرەو ژێر دێنەوە خوارە
جووت جووت و تاق تاق، جار جار دەگرنەوە قەتارە
چومکە ڕۆژی دڵ هێشانە، هەمووی مەخشووشە و دڵی بریندارە
ساحێب غیرەت بەپەلەن و دەڕۆن، بێ جەرگان چاریان بێ چارە
ئی وا هەیە خۆی دەدزێتەوە، خۆی دەگرێ لە پەسیو و لە کەنارە
ئی وا هەیە پێی خۆشە زوو بگاتە دوژمن و لێی بستێنێ تاقەت و ئیختیارە.
ئەگەر لاس هات بەغەیری مامەڕەش نەبێ هیچ کەسی دەگەڵ نەبوو. لاس ئەگەر تەمەشای کرد دیتی ئەوە لەو بەرەوبەری شاخان سوار دێن و دەچن، زانی قەرەوڵن. سوڵتانێکی وەکو عاقڵ بێ، خەبەرداری دڵی لاسی کرد. کوتی:
بران[1] ئەو ڕێگایە چۆلە، خۆ قەتم نەدیوە بەئاوەدانی
ئەلعان ئەو سوارانە لە من بوون بەنیگەرانی.
بە مامەڕەشی گوت: ئەتۆ زۆرت دنیا قونەکەو کردووە، زۆر دانیشتووی لەبازی ڕێگرتن و لە جەنگ و لە شەڕ و لە ڕۆژی دڵ هێشانە
کەسێک دنیای زۆر دیبێ، ئەو عاقڵترە و چارازانە
چومکە قسەیە، بیستوومانە لە بەرینان و لە پێشینانە
ئەو ڕێگایە چۆل بوو، دڵم یەکجار زۆر نیگەرانە
ئەو کاسەیە ژێر کاسەیەکی دەوێ، ئەلعان وا غەڵەبایی و ئاوەدانە
لاس تاقە نەفەرێکە ئەما هەمیشە هەر لەسەر گفتوگۆ و لەسەر قسانە
عێل و عێل باش و عاشیرەتان هەمیشە لە غەرەزی لاس خەویان لێ هەراسانە

(١) «بران» بەمانای برایە، هەرچەند «بران» دە فەرهەنگەکانیشدا نەهاتووە.

ئەگە عاقڵم بێ ئەو سوارانە هاتوون بۆ خوێنڕێژی و ڕێ بەستی و ڕێ بەندانە
جا پیاو دەبێ چوار گورچیلە بێ، نەترسێ لەو موقەددەری ئەگەر دێ لە عاسمانە
کەسێک ئەگەر دەست و دڵی بگرێ، دوژمن ناتوانێ بیکاتەوە بێ ڕوح و بێ گیانە.
ئەوە مامەڕەش جوابی دەداتەوە، دەڵێ:
من دەمگوت هەڵبەت کورتە لاس لە کەس ناترسێ و ترسی لە کەس نییە
چومکە گە ڕاوەستا لەسەر دوو ڕاستەی ڕکێف و غەزەبی لە نێوچاوانی دەبارییە
پیاوێکی ساحێب هەیبەتە، پیاوی وا بەهەیبەت و مەزبووت نییە
خەڵک دڵی بەئاوەدانی خۆش دەبێ، ئەتۆ دەڵێی سەری ئەو کێوانە بۆ ئاوەدانییە؟
ئەوە دوو سەت کەس دەبن، هێندێکیان وڵاغیان سوورە و هێندێکیان وڵاغیان سپییە
خاترجەم بە یان ڕاوکەرە یان بوکنییە
چل و پێنج شەوە لاس لە سەفەرە، نێوی لاس ئەلعان لە نێو هیچ عاشیرەتێکدا نییە.
ئەوە لاس خۆی بادەدا، سەری وڵاغی سووڕاند و کوتی:
ئەرێ پیری ئیختیارە
چومکە لەمێژە پیشەی تۆ دزییە و ڕێگرییە، بۆیە عاقڵ لە دڵتدا نەیگرتووە قەرارە
ئەتۆ دەڵێی کەس باسی لاس ناکا؟ لە نێو تەواوی عاشیرەتان باسی لاسە و هاوارە
ئەگە من عاقڵم ببێ وەختی دڵ هێشانە، دەبینی چەند کەلاک لەوەیدا دەکەون لە کووچە و لە کەنارە
جا ئەو وەختی پێم دەڵێی: لاس پیاوێکی عاقڵ بوو، ڕەشید و وشیارە.
ئیدی سوارەکان ئەگەر چاویان بەلاس کەوت، خەبەریان دا. بەجارێکی ئەوبەر ئەوبەری ڕێگای لێ گیرا. مامەڕەش عەبەسا، کوڕە پیاوێکی ڕەشیدیش بوو، ئەبەدا هۆش و تاقەتی نەما، کوتی بەزاتی خولای دەمانکوژن.
ئەوە لاس دوو کەڕەتی ڕکێف بە وڵاغی دادەهێنا، پێی دەکردەوە نەرمەغار و شەڕناخێوییە

دەیگوت: دەزانم قەرزدارم ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری هاتۆتەوە لێم بستێنێ قەرزییە
ئەلحەق کەسێک پیاو بێ نابێ ناهەق بڕوا، هاتووە بۆ هەقی خۆی و ناهەقی نییە.
جا ئەگەر پیاوە ڕانەمێنێ
یان هەتا زووترە هەقی خۆی بستێنێ
یان خوێنی خۆی لە گۆڕخانەی بڕژێنێ.
ناڵە ناڵە، گاڵە گاڵە، قاوە قاوە
قاژەی تیرە، دەنگی قەرەبینایە، ئەوهە لەگەڵ کوڕڕەم کوڕڕەمی ئەسپان دەبوونەوە تێکەڵاوە
مەلەکانی عاسمانێ لەو کارەی سەریان مەحتەل ماوە
ئەوە لاس چووە بن بەردێکی عەربەنووس کارچۆکی چەپەی لەبەر بلێسەی تیری دادەداوە
کێ دەتوانێ لەبەر حەزرەتی قابیز سەری وڵاغی بابداتەوە و توندی بکا لغاوە
وەبزانە حەزرەتی قابیزی لەسەرە، ڕووحی لە سنگی دەرهێناوە
لە ترسی قاژە و ناڵەی تیری لاسە شۆڕی باڵەکان پیاوی پیاو جەرگی دەتواوە
ئەوە دەورەیان گرت، هەر چوار لای وەکو حەسار گیراوە
کەسیش نەیدەوێرا بچێتە پێشێ، چون دنیای ڕووناک زۆر خۆشە، کەس حەز ناکا بە بەدبەختی ئەو ببێتەوە تەواوە.
لەبەر دەنگی تیری لاس لە شاخان گرمە گرمە ناڵە ناڵە هارە هارە
دەنگی تیری لاس دێ، گورینگە گورینگە، دەڵێی شمقارە.
لەسەری شاخان، تەمە، گەردە، تەپ و تۆزە
هەچ جارێکی دەنگی تیری لاس دێ، ئەو سوارانە تێک دەهاڵێن و دەبنەوە ئاڵۆزە
لەسەری شاخان ناڵە ناڵە، تاریکستانە
تیری لاس ئاوازی دێ دەڵێی ناڵەی هەورانە
سوارە وەکو مەڕ و بەرخ تێک دەهاڵانە
تیری دوژمن یەگجار زەرندەیە و لە پیاوی دەستێنێ ڕوح و گیانە

ئەو کەسەم زۆر پێ عەجایەبە، دەڵێ: لاس بنی ئادەمییە و حیسانە
لە ڕۆژی شەڕێ و کەلاک فڕێدان و دڵ هێشانە
خێر ئەوی ڕۆژێ کە کەوتە شەڕێ، هەژدیهایە، شێری مەیدانە، بەوری بەیانە.
لە حەوت جێگاوە هێرشیان بۆ لاس هێنا بوو. هەچ کەسێکی ئەگەر هێرشی دێنا و بێ بۆ سەر لاس لە ترسی تیری نەوزەڕی لاس نەیدەتوانی بچتە پێشێ. هەچ تیرێکی لە پێشی لەشکری دەدا جارێ خەڵوارێک گڵ بڵند دەبوو. سواران، واهیمە دەیگرتن و دەکشانەوە. کەس نەیدەتوانی جڵەوڕێز بکا و بچتە سەری. لاس دەیگوت:
ئەوڕۆکە دڵم لە هێش و لە ژانە، دەرمان بۆ دڵی من نییە
بۆ کەس نییە خەبەرێکم بۆ بەرێ بۆ عێلی باڵەکان و مەملەکەتەکەی باڵەکییە
بڵێن پێنج هەزار کەس ئامکوفی تاقە سوارێک نییە
ئاخ قاسیدێکم وەگیر کەوتایە لە کەس نەترسایە و بیانکوتایە: ترسی لە کەس نییە
فڕیبایە وەکو باز، بیانکوتایە: کەوکەند و هەوراز و بڵند و نەوی بۆ نییە
خەبەرێکی بۆ ببردمایە بۆ خەزاڵ و خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبییە
ئەگەر خەزاڵ بزانێ بۆم بگری و ببارێنێ بەدوو چاوی ڕەش و بەنگییە
فرمێسکی خەزاڵ بۆ من دەبێتەوە کۆمەگ و لە پشت سەرم دەکەن تیرەندازییە
جا ئەو وەختی ئەمن ئیفتیخار دەکەم، دەڵێم: بزانن لاس بێ کەس نییە.
کەس نییە خەبەرێکم بۆ بەرێ ئەگەر خەزاڵم بۆ بکا خەبەردارێ
بە پەنجێکی ناسک کوڵمەی بڕنێ و توێژی بێنێتە خوارێ
ببێتە نەخش، خوێن لەسەر سنگ و بەرۆکی ببارێ
بڵێ: قەلەندەرم بابان وێرانم چون کەس نییە کۆمەگ بە لاس بکا، مەگەر عەتری فرمێسکی منی بەسەردا ببارێ
ئەگەر ئەو ڕۆژە ببینم من کۆمەگم پێ ناوێ، قاسپەم دێ، عاشقم، وەک کەوی نسارێ
کەس نییە خەبەرێکم بۆ بەرێ خەزاڵ لفکەی کوڵوانەی شین بکا، ئەوبەرە و بەر بیهاوێژێتە سەر شانی لفکەی کوڵوانێ
لە سنگ و بەرۆکی توند بکا گۆ و کرمەک و قۆیتاس لەگەڵ بەندی قەیتانێ

برۆم بۆ بکا بەپەڕی ڕەشەداڵ لەگەڵ ئەو مژانگی بیکا بەپەیکانێ
ئەوەم پێ چاترە لە کۆمەگێکی ئەگەر لە پشتم بکاتەوە خوێنڕێژی و شیر هەڵکێشانێ.
هەر گەردنی خەزاڵم لێ دیار بێ، قەرە زولفم بۆ بکاتەوە پەخش و پەرێشانە
مەمکیم بۆ بکا بەئیستیکان و قوڵکەی گەردنیم بۆ بکا بەمەیخانە
وەدەزانم حەوت سەت سوارم سمێڵ سپی کامەری لە پشتییە لەسەر ئەمن دەکوژن دوژمن و بێگانە
ئەوان بەمن دەکەنەوە کۆمەگ و پشتیوانە
ئەگەر خەزاڵ دەنگی بێ لە تۆق و تەلەسم و لە بەندی لەرزانە
لەشکری وان وەدەزانن هەمووی تیری بەپەیکانە
لە ئاوازەی لەرزانەی خەزاڵ هەموو دێنە هەڵات هەڵات و ڕۆژی شکانە
نوسرەتێ دوایەم لە دوای خەزاڵ و خەزاڵەشۆڕی گەردن بەقەیسەری و سەر بەدووکانە.
ئەوە کۆمەگی لاس گەییشتێ، ئەوبەرە و بەر گیرا پێشی نسارێ
تیر وەکو تەرزەی بەهارێ دەبارێ.
هەیتە هاتە سواران لە خۆ دەدەن تانووت و حونەرە
دەنگی ڕمبە و قاژەی تیرە و کوڕڕەم کوڕڕەمی ولاغە و قرمە و کێشانی خەنجەرە
دەکەوێتە بەرپێی ولاغان، لە بەدەن جوێ دەبێتەوە سەرە
ئەوەی ئەگەر بێ غیرەت و بێ حونەرە
سەری خۆی خلاس کردووە، لە مەیدانێ چۆتە دەرە.
ئیدی ئەگە هاتن خۆیان موعاریفی لاس کرد، کوتیان: بێ کەس نی و کۆمەگت هەیە.
جا ئەوە لاس چووە سەر بەردێک، کوتی:
لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە، ئەو کەڕەتە ئەوە ئاوپڕژێن کراوە
کەسێکی ئەگەر ئاگای لەو کارە هەیە و ئەو لەشکرەی لەگەڵ خۆی هێناوە

تۆ ئەو خودایەی ئەگەر ئەو دونیایەی بەکفلەکونێک داناوە
ئەو لەشکرە بەحوکمی کێ کۆمەگە و بەحوکمی کێ هاتووە و هەستاوە؟
پێیان کوت: دوازدە کەس جاڕی کێشا، خەبەریان دا. خەزاڵی مەلا نەبییان حوکمی کرد، بەڕێی کردوون.
لاس دەڵێ: ئەوە من بووم هاتمەوە لەو سەفەری گەورە و گران و هات و نەهاتێ
ئەوە ئەمنم چاوم پێ کەوت کۆمەگی خەزاڵ و خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبییانم دەگاتێ
وەڵڵا وەدەزانم سولتانی ڕۆمییانم و لەسەر تەختی ئەستەمبوڵێ دەکەمەوە حوکماتێ.
ئەمن دەمگوت هەڵبەتە ڕۆژم بەدە و ئیقباڵم نەماوە
خەزاڵ و خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبییان مەیلی منی فڕێ داوە
چون تیری من لە جەرگی وی کارییە، وەهای لە جەرگی دراوە
وەکو خەونێکی پیاو شەوێ دەیبینێ، هێندێک کەس لە بیری دەچێ و هێندێک کەس دەڵێ: لە بیرم ماوە
جا من ئیفتیخار نەکەم خەزاڵ کۆمەگی ناردووە زانیویەتی ڕێگا لە کورتە لاسەکەی باڵەکان بەستراوە.
لاس دەڵێ خەزاڵ چاوت بەمن بمێنێ بەو سیوادەی ئەگەر شەبەق دەدا بەری بەیانی
ئەگەر دەنگ لە تۆق و تەلەسمی سنگت دێ، دەبێ بەبازاڕ و بەدوکان و بەئاوەدانی
فرمێسکی چاوی تۆ بۆ من دەبێتە قەرەسۆران، بۆ من دەبنە کۆمەگ و لێم دەکەن پشتیوانی
وردە پەرچەمت بەمن بمێنێ بەبەندی ئاوریشمی خاو ئەگەر بۆ من دەبێتە زنجیر و لە دڵم داوێژی نیگەرانی
قوڵکەی سنگت بۆ من دەبێتەوە بە شەربەت و بە کانی
هەمووی عاشقی تۆیە لە کەللەی داوم، هەیبەتی عاشقێنییە دوژمن لە حاستە من بێ ڕووحە و ڕووحی دەبێتەوە فانی
ئەگە نەرمە نەرمە بەڕێگایەدا دەڕۆی زەردەخەنەت دێتەوە لە لێوانی
چل و پێنج شەوە ئەمن لە سەفەرم، دەربەست نەبووم بۆ بێ ئاوی و بۆ بێ نانی

هەموو ئەوە عەشقی تۆیە و دڵی گرتووم، بۆیە ئەمن بەبێ بژیوە و تێشوو وام توانی
ئەگەر وەختێکی ڕۆژ لە بورجی مونەووەر دێتە دەرێ بەعومری پادشای ڕەببانی
خۆ من هۆشم نییە بزانم شەوە یان ڕۆژە، کە پەنجێکی مبارەکی تۆم دێتەوە مابەینی هەرتک شانی
حەیفێ بۆ کەس دنیا بەقای نییە، عاقیبەت دەمرین و دەبینەوە فانی
ئەما مەرگ لێی بگەڕامایە پێکەوە دابنیشتینایە بە خۆشی و بە شاڕەتی، بە ئاملانی.

ئەگەر لەشکرەکەی گەیشتێ و ئەو ئیفتیخارە پەیدا بوو، بەئەحمەد خانیان گوت: بزانە بەختی ئەو کابرایە چەند تەڕەقییە، بەتاقی تەنێ بوو، خودا هەیبەتێکی وای لەسەر شانی دانا، هەرکە چاومان پێی کەوت زەندەقمان چوو لە ترسان.

لە پێش چاومان بوو بە شێر و پێمان نەگیرا و پێمان نەکوژرا. بەخودای هەمووی عەمری شازدە ساڵەیی و حەڤدە ساڵەییە ئەو لەشکرەی بەکۆمەگییەوە هاتووە. ئەوان زۆر ئازا و ڕەشیدن، لە هیچ شتێک ناپرینگێنەوە، زۆر چاک دەست دەکەنەوە و دەست ناگێڕنەوە. هەژدیهای لێو زەرد وەکو لاس بێ ئەوجار کۆمەگی لە پشت بێ هیلاکەتییە. بەخوڵای ئەوی بڵێ: نێرم، ناتوانێ لەسەر پشتی ڕکێفێ ڕابوەستێ.

مەسڵەحەت ئەوەیە، تاس کوتوویە: بشکێم و نەزرینگێم، هەتا گەورە گەورە و پەڕ بەسەر لە نێوان لانە چوون، تا سەردار عێل و شۆڕەسوار بەدەستی ئەو پاڵەوانە ئەو هەژدیهای لێو زەرد لە بەین لانەچوون، ئێمە با ئەو مەیدانە بەتاڵ بکەین، هەڵیش بێین عەیب نییە! جا ئەوە بارگە و بنە و ئابداریان تێک نا. لەشکرەکەش لێک کشابوونەوە.

لاس کوتی: لە نێو خۆتان چل کەسی یەکەیەکەم بۆ هەڵبژێرن، بێن بازدید و تەفتیشیان دەکەم. ئەوی دەهات باسکی خەفتانەکەی پێ هەڵدەماڵی، ڕاست دەیگوت ڕاوەستە. دەیگوت: دەستت بقوچێنە. ئەوی قوڵکەی ئانیشکی قووڵ بووبایە و سێ ڕەگی لێ هەستابایە، هەڵیدەگرت.

هەڵیبژارد هەتا بوونە چل کەس. لەو لەشکرە چل کەسی پەسەند کرد. جا کوتی: بچن قەرەوڵ بن ئی لەشکری سوورچی و زوورارییان، ئەگەر شەوێ بڕۆن خەبەرم

بدەنێ. پێشـیـان پێ بگرن هەتا ئەمن دەگـەمێ. شـەڕیان دەگـەڵ بکەن. ئەو چل کەسەی نارد بە سێ جێگا، جێیەک سێزدە، جێیەک سێزدە، جێیەک چاردە کەس. ئەوە قەرەوڵی خۆیان دەکێشا تا سێ سەعات لە شەوێ چوو.

ئەو گاڵتەی هات لە بنەی بەردی(؟)

سەدایی مەرد و نامەردی

کەوتوونە دەستوبردی.

ئەوە سـازبوون هەڵێن. قـەرەوڵی لاس چومکە هەمووی سێ ڕەگی توندی لە قـوڵکەی هانیشکی بوو، هەمووی چوار گورچیلە کوڕڕە کوڕڕەی سمایل عوزێری، پێشیان پێ گرتـن، کوتیان: کـەسێکی ئـەگەر پێش بە لاسی بگرێ، هەق بەهەقـە، تۆڵەی لاس دەبێ لێتـان بکرێتـەوە. هەشتـا کـەس بەتیری سـەر بەپەیکان لە لەشکری ئەحـمـەد خـانی سـوورچـی و زوراری کـوژرا، ئەوانیش دە کـەسـیـان لێ کـوژرا. هـێندە بەغـیـرەت و بەجـەوهـەر بوون پێیـان عـەیب بوو خـەبەر بەلاس بدەن. ئەمـا لاس بەدەنگی سـواران و بەگێژە و بەگرمـە گرمـی سـواران خەبەردار بـوو. جا ئەوە دەستـبەجێ لاس سـاز بـوو، نیـزیکەی سێ سـەت کـەس دەگـەڵ لاس هـاتبـوو. لاس کـوتی: ئەوی نووسـتـبێ هەڵی نەستێنن. لاس دەڵێ:

بەوی کەم ئەگەر ئەبەدییە

چ بکەم خودا بەشی منی ترس نەداوە و ترسم نییە

چەندم پێ خۆشە ئەگەر قەوماوە، لە ئاوازی وەختی نیوە شەو و هـەڵات هـەڵات و

بریو بریو و بەیدی بەیدییە

جا ئەو کەسـەم دەوێ خـۆی ڕابگرێ لەسـەر دوو ڕاسـتـەی ڕکێفێ و بتوانێ ئەگەر

شەڕ بکا بە ڕمبییە

ئەو حەلە بۆم تەنەزول بکا لەشکری نۆ عاشیرەت، هەتا قیامەتێ تازەکانێ

ئەوانە سەرهەڵدانەوەیان بۆ نییە

نوسرەتێ دوایەم لە دوای کیژێ بەلەک زەردە، چل و پێنج شەوە ئەو لە من قاتییە

سنگت دەروازەی بەهـەشـتـێیـە و ئی جـەننەتی باقی، چل و پێـنج شـەوە بەشی منی تێدا نییە.

جا هاتن پێشی لەشکریان گرت. خان قۆچی خانی گێلانگێسی بە خومی کەمەندی لاس گیرا.

برایم خانی لێتانێ بەکەمەندی لاس گیرا. ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری بە مەرکەبەوە خست، کەمەندی هاویشتێ، گرتی.

جا ئەحمەد خان پێی گوت:

لاس مەردی وەکو تۆ لە دنیایەدا نییە

کوشتنی پیاوی وەک من لە دنیایە زۆر شتێکی خراپە، وەرە مەرد بە بمبەخشە، ئەگە نێوچاوانت تاڵە و دەڵێی بەخشینم بۆ نییە

داغێکم بەسنگێوە بنێ، لە کن هەموو کەس بمکە درۆشم و دیارییە

شەرت بێ بێمە کنت بە خزمەتکار و بە نۆکەرییە

ڕوح خۆشەویستە، قاتڵی ڕوحم مەبە، ئەوە بۆ تۆ شادمانی و نێوبانگ و دیارییە.

ئەوی هەڵات هەڵات، ئەوی تالانی بەجێ ما بەجێ ما.

خان قۆچی خان ڕدێنی سپی بوو، بە لاسی گوت: «کورتە لاسی باڵەکان پیاوێکی ڕەشیدی، حەز ناکەم بەدیت بەسەر شانیدا بێ. کەسێکی زۆر بێ ئینسافی بکا دەبێ ترسی قەزای عاسمانی ببێ، ئەگەر خولاّ ئەوی بشکێنێ. ئەتۆ ئەگەر بێتو، ئەوە داغی نۆکەری تۆمان بەسنگێوەیە، ئەتۆ خانەوادەی هیچ چاوت لەوە نەبێ، ئێمە هەمیشە حەوسەت کەسمان لە پشتی سوار بووە بێ کیفایەتمان مەکە بمانکەی بە نۆکەرێکی ئەوەی ئەگەر خزمەت بکەین و شەو و ڕۆژ لە کنت بین، ئازادمان بکە، بچینەوە سەر ڕێ و شوێنی خۆمان، ئێمە نۆکەرین، نۆکەر دەبێ خزمەت بەئاغا بکا، بمانبەخشە با دۆست و دوژمن و تەواوی دنیا لێمان حاڵی نەبێ، تەواوی خەرج و باج و زەکات و تەدارەکی ئی نۆ عێل بەتۆ بگا. بەبێ قسە و گفتوگۆی تۆ هیچی ئیختیاری ئەوەی نەبێ ئەگەر کارێکی سەربەخۆیی بکا».

لاس فکری کرد، کوتی: با پیاو دەستیشی بڕوا، ئەوانە زەلیلی بەردەستیشی بن، حەیفە بنەماڵی هەزار ساڵ لەوەی پێش لە بەین بچێ. ئیلتیزامی لێ هەستاندن و خۆیان بەنۆکەری لاس دانا. جا بۆیە لە قەدیمی زەمانەوە هەتا ئاخری زەمان دەڵێن: نە مار کلکی لە بیر دەچێ و نە باغەوان کوڕ.

ئەوە مارێک لە باغێکدا بوو، مارێکی زۆر سەقەت بوو، کەرەتێکی ئاوی دەخواردەوە باغەوانەکە چاوی پێ کەوت، کوتی: ئەو مارە ئەو باغەی لە من بەستووە، کەس ناوێرێ ڕوو دەو باغەی بکا، بۆ خۆشم ناوێرم بەباغیدا بگەڕێم. مارەکەش خەریکی ئاو خواردنەوە بوو هۆشی باغەوانی نەبوو، باغەوان ڕاست و چەپ بوو پێمەرێکی لێدا لای کلکی پەڕاند. مارەکە خوشی چۆوە نێو کونەکەی، کلکی لەوێ بەجێ ما.

مار ئەوە خۆی مات کرد، زەفەری بەباغەوان نەدەبرد. باغەوانەکە کوڕێکی بوو یەکجار زۆری خۆش دەویست، عومری نۆ سالان بوو. کوڕەکە ئەگەر چاوی پێ کەوت، مارەکەی دی بەدارەوە لینگی دایە، کوتی: مارەکەی بابم دەڵێ ئەوەتا. ئەگەر مار گنجی کرد و خۆی پێ دادا و لە مابەینی هەرتک لاقی هالا، کوڕەکە تاقەتی نەبوو، کەوت. مار بەتەپڵی سەریەوە دا، هەچی ئازای بەدەنی بوو، لە ژەهری ماریدا هەلا هەلا بوو. جا مار دمی برد زمانی کوڕی باغەوانی خوارد.

خەبەریان بەباغەوان دا. ئەگەر هات، ماران گاز بوو، مارەکە پێوەی دابوو. لە سوێی کوڕەکەی، ئەوە شەو و ڕۆژ باغەوان لەو مارە دەگەڕێ، ئەگە یان پێوەی دا یان مارەکە بکوژێ. مارەکەش دایمە دەگەڕا: باغەوانم بۆ هەڵ بکەوێ و پێوەی بدەم، تووکی سەری با بیبا. جا ئەوەیە دەڵێن: نە مار کلکی لە بیر دەچێ و نە باغەوان کوڕ.

ئەحمەد خان و خان قۆچی خان کوتیان: هەتا ئیختیار و کەلێن و دەرفەتمان دەبێ بێ دەنگ دادەنیشین. ئەوە خۆیان تەسلیمی لاس کرد. جا ئەوە لاس ئیجازەی دان، مەرەخەستی کردن.

ئەوان بەئیجازەی لاس ڕۆینەوە.

دەستبەجێ خەبەریان بەخەزاڵ دا، کوتیان: کار بەوە گەیشتووە. ئەوە بە پیر لاسەوە هاتن. بە ئەندازەیەک بەئیحتیبار و بەحورمەت لاسیان داخڵ کرد بەڵکو هەتا ئەوڕۆکە هیچ کەس وا بەحورمەت داخڵ نەبووبێ.

جا مەلا نەبی کوتی: ئەمن ئەوە خەزاڵی کچی خۆم پێشکێش کردی، هەر سەعاتێکی مارەی دەکەی مارەی کە. لاس لە دڵی خۆیدا کوتی: ئەگەر بێتو مارەی بکەم و بەدەستییەوە بگرم، ئەو خۆشەویستی و ئەو مەیل و هەوایە نامێنێ. کوتی: جا

ئەوە ئیختیار لە دەست خۆم دایە، بە وەختی خۆی مارەی دەکەم.

هەتا سێ ساڵ ئیدی لاس و خەزاڵ شەرم و شکۆیان نەبوو، لێک کامورەوا ببوون، کەسیش نەیدەتوانی ئیحتیرازیان لێ بگرێ.

لە مابەینی ئەو نۆ عاشیرەتەدا تەگبیریان کرد و پیاوی درِندە و ئازا و بەجەرگ و هەنگێوە و دەست ڕاستیان بە پووڵ و ماڵی دنیا لە جێگای دیکەوە هێنا، جا کوتیان:

مردن خۆشترە لە حەسرەت ژیان

لە ئاو سەرکەمی، لە ئاخ هەڵکێشان

لە ژێرڕاکەشی نۆ عاشیرەتان

ببینە نۆکەری لاسی باڵەکان؟

تەگبیریان کرد، لەو نێوەدا چل شەو بوو خەریک بوون ڕێوشوێنی کوشتنی لاس پەیدا کەن، دەنا خەرجی خۆیان ئەوە دەدەن. لە بنەوە کاری خۆیان کرد. لە سێ ساڵەوە هەتا پێنج ساڵ ڕێوشوێنی خۆیان مەعلوم کرد. تایەفێک بوون عەوێزیان پێ دەکوتن. عێلی عەوێز، لەوانە هەشتا کەسیان هێنا. سێ کەسیان یەگجار زۆر ڕەشید بوون، ئێکێکیان شاڵی چڵکنیان پێ دەگوت، یەگجار زۆر ئازا و دەسکەرەوە و تیرەنداز و بەکار بوو.

ئەوە پێنج ساڵە لاس و خەزاڵ پەروایان نەبوو. لاس سەری عێلی باڵەکی نەداوە. ئەما نێوبانگی شاڵی چڵکنیان زانیبوو. تەگبیریان لەوە کرد، کوتیان: بچن مەڕوماڵی عێلی سمایل عوزێری هەڵبگرن. جا لە هەموویەوە لێی سوار بن، ئەگەر ئەوە نەکوژرێ، پاکمان دەبێ بەرگی ژنان دەبەرکەین. مەڕوماڵ و گاڕان و حیساباتیان برد.

پیرێژنێک مانگایەکی چووبوو، بابانی بەقوڕێ گیرێ، دەنا زۆر هاتن، خەزاڵ کوتی: کەس هەقی نییە هەڵی بستێنێ. پیرێژن کردیە چەقە چەقێک لە دەرکی خێوەتی خەزاڵ ئەوسەری دیار نەبوو.

ئاه! کوتی: ڕۆڵە لە خوداوەندی میری مەزن دەکەمەوە تەڵەب و ئەرجووە

تیرێکی نەبەدی بۆ تۆ نازڵ بووە

لە پشتت بدرێ، بڵێن: لە دڵی کاری کردووە

تاقە مانگایەکم بوو، ئەویش عێلی زوراری و سوورچی و گێلانگیسی بەتالانیان بردووە.

ئۆ ڕەبی تیری دوژمنێک لە کاسەی کەللەت بکاتەوە هەتەرێ

ببینم بەدەستی دوژمن لە پێش مەرگتدا هەردک چاوت دەرێ

کوڕە خۆ لە پاڵ خەزاڵ و خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبییان نایەتە دەرێ.

گوێی لێ بوو لاس، ئیدی ئەگەر سووڕا خەفتانەکەی لەبەر کرد.

خەزاڵ کوتی: چ دەکەی؟ بۆ لاس وا بەئەجەلە لە خەو ڕادەپەڕێ؟

مەرگی حەوت سالانم وەپێشت گەڕێ

وەختی ڕاوێ نییە، هاوینە، پووشپەڕە، گوڵ نەماوە لەسەری ئاستەڕێ

مەچۆ دەرێ، ئەوە تازە بێری پۆل پۆل دێنەوە خوارێ لە نێو مەڕێ

پیرێژنێکی نۆ جار سی ساڵ زاوی دۆ لێ ڕژاو با هەر قسە بکا و بوەڕێ.

لاس بانگی پیرێژنێی کرد، کوتی: داوەرە پێشێ داپیرە، چ خەبەرە؟ کوتی:

چ خەبەرە! لە حاڵی حەیات دامەمێنە

شەو و ڕۆژ هەر خەریک بە خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبییان بگەوزێنە

ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری تالانی برد و تالان ئەستێنە

ئەی بۆ دەڵێن: لاس پیاوێکی ڕەشیدە، بازە، شەهێنە؟

جا ئەگەر وایە بانگی من بکە بڵێ: بچۆ کۆچکە و دەسماڵی ژنانم بۆ بێنە.

جا لاس دەینالاند و دەخوڕییە

بۆیان هێنا دەرێ ولاغی ڕەش کوێتی عەسڵە شێر خەزاڵییە

ڕۆژی ئەجەل پیاو عاقڵی لە کەللەیدا نییە.

جا ئەوە خەزاڵ پێی گوت: خەواڵووی، دەستی منت ببێ بەدامانە

خەونم دیوە دڵم بەحری بێ سامانە

شەو و ڕۆژ دڵی من ناگرێتەوە قەرار و وچانە

نەچی بۆو سەفەرە، دابنیشم بەقەڵەندەری و سەر بەتاڵی و بابانی وێرانە

کوڕە زۆر دڵ کولم، زۆر دڵ تەنگم، هەر وەدەزانم مەیتی تۆم لە بەردەستانە

له دڵمدا زۆر هاوار و واوەیلایە، دڵم زۆر نیگەرانە
وەرە ئەو سەفەرە بەقسەم بکە مەچۆوە سەر ڕێ و لوزەوی سوارانە.
لاس دەستی شل دەکرد، مستێکی دەدا لە تۆقان، تەلەسمان، زێڕان، زنجەقان، ئاودەنگییان، خەبەرچییان، ئاوەژووی دەکردەوە دەرزی
خەزاڵ هێشی پێ دەگەیشت و دڵی دەکزی
هێندی بەهەیبەت لێ دابوو یەک سەعات هۆشی خۆی نەبوو، سەر و نێوچاوانی دەتەزی
بەندی گوارانی دەپسان، تێکەڵ بوون، ئاڵۆزاون بەندۆکە و کەزی.
بەلاسی گوت: ئاخری ئەوە جەندازەی خۆت دەبەیەوە دەرێ
کوڕە خۆ من خەمی خۆم نییە ئەگەر هەرتک چاوم بە مستی تۆ بێتەوە دەرێ
کوڕە ئاخر خەونم دیوە، نەوەک ئەو خەونە لێت بکاتەوە ئەسەرێ
دوژمن گەلێک بەفێڵە، نە وەک موقەدەرێکت وەسەرێ
کوڕە ئەورۆ سەفەرت زۆر گرانە، مەچۆوە شەڕێ
ڕەبی ڕوحم وەکو تەیری تیژباڵ دایمە لەسەرت بگەڕێ.
لاس دەیگوت: کیژێ بەوجورە بێ ئیلتیفاتم مەدوێنە
بەندی کرمەکان و ئاودەنگییان، ناوەڵڵا وردە پەرەنگ لە گواران بە جەولانە بێنە
لوتف مەرحەمەت بکە بەخۆشی و مێهرەبانیم بدوێنە
چاوت بەئیلتیفات لە حاستی من هەڵێنە
ئەگەرچی سەهوشم کرد ئەو مستەم لە تۆ دا، لەو کوڵمەیەی دەڵێی بەفر و خوێنە
کراست لە بەدەنت توند کە، لە خۆتی بدە خاسە ڕەنگ ئەوەی پێی دەڵێن: بەر هەڵبێتە
ئەتۆ ئەگەر ڕاست دەکەی بە سەت ناز و نیمناز و نەزاکەت بڵێ: بڕۆ هەقی خۆت لەوانەی تالانیان بردووە، بستێنە
ئەمن نامەردی لە بەدەنمدا شین نەبووە، تۆوی نامەردی بۆ من مەچێنە.
ئاخر چ بکەم لەوەیدا سەرزەنیشتی من دەکەن، دەڵێن: تالانیان برد و لاس

پێی نەگەڕاوە. بەشی هەمــوو کــەس ترس ببێ، خــودا بەشــی منی ترس و خــۆف نەداوە

ئەگەر سواری دوو ڕاستەی ڕکێفێ بم، بڵێن: لاس تیر و خەدەنگی قاتڵی لە خۆی داوە

دەستبەجێ مزگێنیت بۆ دێ و خەبەرت بۆ دێ، دەڵێن: تالان بەتەڕەقی و فەتح و نوسرەت گەڕاوە

ئەگەر لاس سوار بوو بزانە هیچ کەس بەپیاوەتی لەسەر خوانی زینی نەماوە و لێی قەوماوە

وەبزانە هەمووی ڕکێفی شل بووە و خۆی لە پشتی ڕکێفێ فڕێ داوە

خۆ من تیخی بێ ڕوحمیم بەوەی لە جەرگی دراوە

بۆ شێوە و سەر و زولف و قەرە کەزیەی تۆ شێواوە و تێک هالاوە؟

ئەگەر سـوار ببم و بچمـە مـەیدانێ، خـەبـەرت بۆ دێ و دەڵێن گورگە و لە شـەگەلی داوە

ئەوە خەزاڵ دەڵێ: کوڕە دەستی منت داوێن بێ، ئەجەل لە پیاوی هەمیشە میوانە، مەیکە بەبەدفەڕی و لاسارییە

ئەمنت ببمەوە بەقوربانی چەکمێکی سمایل نامەی شێرنیشانی داود بەگییە

ئەمنت ببمەوە بەقوربانی خەفتانێکی ئەگەر ئی پڵنگی کێوییە

تەنگەی ولاغت کێشاوە بەتیغە پشتی چەرمی هەژدیها، ئەگەر خۆش کراوە و کراوە دەباغکارییە

ئەمنت دەمرمەوە لەبەر گەردنی ولاغێکی گەردن بڵندی عەسڵە شێر خەزاڵییە

بۆنی ناخۆشم لە بنی دەماری کەپۆی دێ، زۆر دەترسم دابنیشم بە بەدبەختی و سەرگەردانی و دڵ بریندارییە

دڵم خەبەری وا داومێ، ئەو سەفەرەت بەدبەختییە و سەعادەت نییە

ئەلعان ئەوڕۆکە مەڕوماڵیان بردووە، پەلە مەکە ڕابوەستە لەسەر سەبرییە

سبحەینێ جواب و تەکلیفیان دەگەڵ کورتە لاسی باڵەکان بزانە چییە؟

کوتی: خەزاڵ زۆرم پێ کوتی، دڵت شکاندم، ئەما ئەوجار دڵم مەشکێنە
هەرۆ لە مجری قاقانی دەستێکم بەرگی ژنان بۆ بێنە
کۆچکە و بەندۆکە و تا لە خۆم قایم بکەم بەندی بەرەڵبێنە
ئەگە کوتیان: ئەوە کێیە؟ بڵێ: لاس هەلات، ئەوە کڵفەتە، مەیدوێن، زۆر کەم دوێیە.
وەکو تۆ دەڵێی بەرگی پیاوان لە من خەسارە
کراسێکی مەحمەڵ داراییم لەبەرکە تا بەلاجانگم دابێتە خوارێ قەتارە و گوارە
ئەگە لێیان پرسی: لاس چی لێ هات؟ بڵێ: نەخۆشە، گولە، بیمارە.
ئەگەر بەمن دەکەی دەبێ ڕانەمێنی
کۆڵوانە و دەسماڵی ژنانم دەبێ بۆ بێنی
لە بەدەنمی بکەم و تا لە بەدەنمی وەرێنی
تا هیچ کەس پرسیار و گفتوگۆی لاسی نەمێنی.
هەک ڕەبی جەرگم لە زگم دابڕزی
هەک ڕەبی لەسەرم بێ کۆچکە و کەزی
جا چۆن دەبێ لاس لەبەر هەزار و پێنج سەت سوار سوورچی و زوراری و مامکی و
گێلانگێسییان دڵی بلەرزی!
قەستەم بەوەی کەم ئەگەر ڕوحی بەمن داوە
لەو زیاتر هیچ کەس ناتوانێ، بڵێن: تەنەزولی بەسەر شانی لاس داهێناوە
کەسی دیکە ناتوانێ، بڵێ: تەنەزولی بەبەدەنی لاس داوە
مەگەر بڵێن موقەدەری حەق دەستی ئیلاهییە، لە عاسمانی حەوتەمین حەواڵە کراوە.
خەبەریان بۆ هێنا، کوتیان: کورتە لاس ولاغت لە مەیتەرخانە هاتۆتە دەرێ،
قەدەرێکمان گێڕاوە
خاوی پاش بەند و پێش بەندی لە بەدەنی دانەماوە
زینی موڕەسسەعی لە پشتی کراوە

ئاوزەنگی ئەشرەفی بەقەبرغەیدا بەردراوە

بیست و دوو شوققەی حازرە، ئەوی بەژەهری مار ئاو دراوە

کەسێک ئەگەر لە دوور بیدینێ، هەیبەتدارن، ڕووناکایی دەبڕێ لە هەرتک چاوە

لاس خودا وای دروست کردووە، شێرە و بەوری بەیانە و بەمەردی خوڵقاوە

جا بابە ئەوجار ئەوە خەزاڵ دەڵێ. زۆری جنێو بەوانە دا ئەگەر وڵاغەکەیان هێنا بوو. خەونی دیبوو، پێی خۆش نەبوو لاس بچێ، دڵی خەبەری دابوویە. ئیدی ئەگەر لاس ڕاسا و وایان پێ گوت، خەزاڵ بەندێکی بانگ کرد:

کوڕە کورتە لاس ئەرێ شێرەکەی جەنگەڵییە

بێ گوێ و فکر و تەگبیرت بەهیچ کەس نییە

قەستەم بەوەی کەم ئەگەر بێ مەکانە و ڕەبییە

خەونێکی زۆر ئاڵۆزم دیوە، خەونەکەم ڕێگای خوێنڕێژییە

لە خەونمدا هەڵۆیەک هاتبوو، پەڕێکی ڕەش بوو پەڕێکی سپییە

دەسووڕا لەسەر عێلی سمایل عوزێری و چادر و چیغی مەلا داود و مەلا نەبییە

دەنگی دەهات، شەراڕەی ئاوری دەهاتە دەرێ لە زارییە

پرسیارم کرد ئەو داعبایە بۆ وا دەکا، ئەوە چییە؟

کوتیان: نەتدیوە فریشتەی تۆی بەدەستەوەیە و فریشتەی تۆی لە نێو چنگییە؟

ئەگەر بێتو بفرێ و بڕوا، دوایە تۆ بەدبەختی و هیچ بەختت نییە

ئەو خەونە وای کار کردووم لە دڵ و لە جەرگییە

بۆیە ئەو سەفەرەی تۆم پێ سەحادەت نییە.

ئەوە هەر خەزاڵ دەڵێ:

دوێ شەوێ ئەگەر لە خەوێ ڕاپەڕیم، باسکم بۆ کربوویە سەرین و

لە بن سەرت هاتبووە دەرێ

چومکە خەونم دیبوو دڵم دێشا، وەکو کەسێکی لەسەر دڵی بدەن مەودای خەنجەرێ

لەو خەونەم فکر دەکرد، دەمگوت: بابان وێران خۆم داخوا چم بەسەرێ؟

وڵاغت دەرکێشاوە دای کێشەوە، سەفەری خێرێ نییە وڵاغت هێناوەتە دەرێ.

کوڕە خەونێکم دیوە، ئەو خەونەی من، ئەمن دەڵێم ڕاستە و تێیدا نییە درۆیە
زەینێکە خۆت دەوە سنگ و بەرۆکی من، شەمامە و شەمامە ڕەنگین دەڵێی نارنجە و گۆیە
خوناوکە و ئەشرەفی لە ملان کەوتوونە هاتوچۆیە
بەعالەمی ئاشکرا لە خشلان لە گژنیژی گواران هاوار هاوار و داد داد و ڕۆ ڕۆیە
لە چاوانم هەڵ مەبەستە، ئی خوێنێ، جۆگەلە و جۆبار و جۆیە
سبحەینێ با دوژمن نەڵێن: چابوو لاس ئەوەی بەسەرهات، زۆر پیاوێکی بێ تەگبیر و سەربەخۆیە
کەمبەرەی پشتم ئەوبەرە و بەر ڕاوەستاون، هەمووی قسان دەکەن، کەوتوونە گفتوگۆیە
کوڕە دابین بە، نارەحەتی مەکە ئەو دڵی پڕ لە ژان و پڕ لە بۆسۆیە.
ئەوە لاس دەڵێ: خەزاڵ واوەیلا مەکە و مەگری و مەبارێنە
بەخەم ئەو دوو چاوی ڕەش بەڵەکت مەژاکێنە
زنجیرەی زولفت نەبێتە کەمەند، دڵی من لە نێو زگمدا دەرمەهێنە
ئەمنت دەمرمەوە لەبەر دوو چاوی ڕەش و ئەبرۆی پەڕی پیرەشەهێنە
ئەتۆ دەبێ غیرەتم وەبەرنێی، دەبێ بڵێی: برۆ مەڕومالڵ و تالان بەدەستی زۆر و بەئازایی و بێ باکی لە دوژمنی خۆت بستێنە.
لاس دەیگوت: دەڕۆم، ئیدی لەسەر سەفەرم
خەزاڵ دەیگوت: بەمیرات بەجێ دەمێنێ لیمۆی گەوهەرم
قەلەندەر و بابان وێران و خۆڵ بەسەرم
خۆ کەسی وا نییە لاس بگێڕێتەوە، مەگەر پەنا بۆ خوالای بەرم.
خەزاڵ دەڵێ: بۆیە وا بێ عاقڵم، عاقڵم لە کەللەیدا نییە
شێر وەحشییە، داعبای کێوییە
ئەو چاک و خراپە نازانێ ترسی لە کەس نییە
نازانێ هات و نەهات و ڕۆژی بەدبەختییە

لاسیش وەکو شێری زەرد هیچ عاقڵی نییە
بابان وێران خۆم دەزانم ئەمن لە پاشت بەجێ دەمێنم بەمیراتییە
بۆ من بەجێ دێڵی خەم و پەژارە و بەدبەختییە.
ئەوە خەزاڵ سێ کەڕەتی دەکردەوە هاوارە
وەرە دەستی منت داوێن بێ لە پشتی ڕکێفێ مەبەوە سوارە
چون دڵم وەهای کردووم وشیار و خەبەردارە
دەزانم ئەو سەفەرە بۆ لاس بەدبەختییە و دەبێتەوە مەخشووش و بریندارە
ئەگە بە قسەم نەکەی لە خوداوەندی میری مەزن دەکەمەوە تەڵەبە، ئەگەر ئەو بە
ئێمەی داوە ڕوح و عاقڵ و تەن و ئیختیارە
تیری شاڵی بەگی چڵکنت لە مابەینی جەرگ و دڵان بگرێتەوە قەرارە
چش لە ژیانی دنیایە، پاش تۆ ئەمن خۆراکم پیاڵێک ژەهری مارە
با لە مەجلیسان پاش پێنج سەت ساڵی دیکە بگێڕنەوە گفتوگۆی من و تۆ، بیکەنەوە بە
پرسیارە
بڵێن: دنیا ئەوەتا ئی وای تێدا بووە بەبەدبەختی و بێ عاقڵی خۆیان بوونەوە گرفتار و شەرمەزارە
بەدڵنیایی لە دنیای ڕووناک بە بێ مرادی و بە بێ چارە
لە دنیایە بەشی وان خلاس و قوتارە.
جا کێ بوو لە لاس و کێ بوو لە کورتە لاسی دەباڵەکییە
خۆی ڕادەوەشاند و پێی دەناوە لە ئاوزەنگییە
چاوی عەرزی نابینێ، چاوی نابینێ عەرزییە
هەر دەڵێی شێری برسییە و دەڵێی شێری جەنگییە
چومکە دایمە، لەبەر چاوی خەزاڵ، مەستە و ئیغیار نییە
بیست و دوو تیری لێو سووری شازدە مشتەیی دەبەستەوە لە پشتی ئی مەرکەب و
هەتا سەری تیر دێنەوە سەر ئاوزەنگییە

لە پشتی خۆی دەدا ڕمبێکی دەمڕەشی هەژدە قەفییە
کۆن نییە تازەیە، تازە هاتۆتەوە لەسەر وەستا و وەستاکارییە
لە خوێنی نەکرد و لێی دەتکێ دڵۆپە دڵۆپی دەخوێنییە
خەنجەرێکی سێ جەڵغەمەی بزمارکراوی نیشانەی مورخ و سیمورخییە
لە کالاندا جەوهەری دیارە، خۆ کەس لەبەر جەوهەری ئەو خەنجەرەی
هەڵنایە چاوییە
ئەگە قرمەی خەنجەری لاس بێ کەس پێی نامێنێ غیرەت و پیاوەتییە
دەستبەجێ لەگەڵی دەکا قسەی خۆش و مێهرەبانییە
دەڵێ: من نۆکەری تۆم، خۆ دوژمنایەتیم دەگەڵ تۆ نییە
چومکە خەنجەری لاس تیخی بێ ڕوحمییە
لە هەچ کەسێکی هەڵکێشاوە بزانە حەزرەتی قابیز هاتۆتە سەر سنگی بەمیوانییە
جەولانەی بەئەسپی دەدا و دەیگوت: خەزاڵ لە تۆم دەوێ دوعای بەخێر و لێت
دەکەمەوە خوداحافیزییە
دانەنیشی بەخەمناکی و بەدڵ ئالۆزییە
ئیدی من شەش سەعاتم پێ دەچێ، لە شەش سەعات زیاتر ئەمن کارم نییە
جا با خەڵک بڵێن: لاس شێتە، مەستە، دێوانەیە و ئیغیار نییە
یان وەدەستی خۆم دەخەم فەتح و نوسرەت و تەڕەقییە
یان موقەدەری هەق دەستی ئیلاهیم دێتە سەرێ، پەنجەی قەزا و قەدەر عیلاجی
نییە
دڵم قبوڵ ناکا دابنیشم بەهەناسە ساردی و بە ناپیاوییە
ئەگەر سەرزەنیشتم بکا پیرێژنێکی پەلکەسپییە
بڵێ: لاس مەتڵەبی خەزاڵە دەنا ئاگای لە ماڵ و دەوڵەتی خەڵکی نییە
ئەمن سەرزەنیشتم پێ خراپترە ئەگەر مەعمووری هەق دەستی ئیلاهی عەزیەتت
دەدەن لە گۆڕ و گۆڕخانە و لە قەبرییە.
ئەوە لاس دەیگوت: خەزاڵ ئەستۆیەکی ئِی زیڕاحیم بۆ هەڵێنە

بەس عەتر و عەبیر لە کوڵمەی ناسکت هەڵوەرێنە
بەس عەزیەت بدە ئەو دوو چاوی باز و بەس ئەو ئەبرۆ شەهێنە بشێوێنە
کەمەندێکی خاسەڕەنگی ئاوریشمی خاوی ئادەم گیرم بۆ بێنە
بڵێ: ئەگەر پیاوی لاس لەشکری نۆ عاشیرەتم بۆ بشکێنە
چل کەسم لە گەورە گەورە و پەڕ بەسەران بۆ لە خوێنیدا بگەوزێنە
سەری ئەحمەد خانی سوورچی و زوراریم بە دیاری بۆ بێنە.
خەزاڵ بەندێکی بانگ دەکا:
دەڵێ لاس هەرتک چاوم کوێر بێ، زمانم بگەڕێ بەلاڵییە
چومکە ئەمن بێ غەرەزم، هیچ لە دڵی مندا نییە
دوعایەکم لێ کردی، هاتۆتە دەرێ، تازە کەڵکی نییە پەشیمانییە
دەترسم ئەو دوعایە بۆ تۆ ببێ بەتیری چل سوارەی غەیبییە
ئەوە خەزاڵ کراسێکە مەحمەڵ دارایی لەسەرڕا دادەدڕییە
دەیگوت: وەڵڵاهی وەدەزانم لاس حەزرەتی قابیزت دەگەڵە و لێت وەردەگرێ
ئەو ئامانەتییە ئەگەر پێی دەڵێن زیندەگانییە و ڕوحییە.
هەک زمانم لاڵ بێ ئەمن دەمگوت: قسەی بەدم قەت بەزمانیدا نایە
بەدڵێکی ساف ئەمن لە لاسە شۆڕی باڵەکانم کردووە دوعایە
ئەلعان دڵی من خەبەرێکی وای تێدایە
پێم وایە ئەو دوعایەی من قەبووڵە و موستەجایە
ڕەبی ئاگادارت بن و ڕەفیقت بن دوازدە ئیمامی دەشتی بەغدایە
ئەلعان وەکو حەزرەتی وێسپ دڵی ناڕەحەت بوو ئەگەر دەیانگوت لە زیندان دایە
کارڕاستی هەر بەهەق تەعالوڵڵایە
وێسپی بردە میسرێ کردی بە حوکمڕان و بە پادشایە
ئەمن پەشیمانم لە دوعای خۆم، حەزرەتی وێنس ئەگەر لە زگی نەهەنگ دایە
ئەو بۆت ڕابوەستێ بۆ دوعای خێرێ لە دەرگای خودایە
ڕەبی ئاگاداری تۆ بن جەمیعی شەهیدانی سەحرای کووفە و دەشتی کەربەلایە

ئەوڕۆکە دڵی من زۆر مەخشووشە، پەردەی هەق دەستی ئیلاهی لەسەرە، بۆیە دڵی من دەرنایە

پێم وایە گفتوگۆی من و تۆ هەر ئەوڕۆکەیە، سبحەینێ هەرتکمان سەرمان دەبەینەوە

بادی فەنایە.

ئەوە لاس دەڵێ حورمێ حورمێ بۆچی وا دڵت بێ سامانە و ئاوری گرتووە

کوڵمەت ژاکاوە و ددانت ژەنگی گرتووە؟

قەرە زولفت لە من خوار و ژوور کردووە

دەروازەی شەمامە و شەمامە ڕەنگینت داخستووە

ئاخر ئەگەر بڵێن خودا موقەددەری کردووە

عیلاجی بەکەس ناکرێ، عیلاجی وەدەست کەس نەکەوتووە.

ئەوە خەزاڵ دەگری و لەخۆدانە

ئەوە لاس بەولاغی دەدا حەڕەکەت و تەکانە

لە پشتی دەڕۆیین سێ سەت کەسی لاو و نۆجەوانە

گوڵستانی ئێرەمێیە، لاس دەڵێی قارەمانە

ئەوە خەزاڵ دەستەوئەژنۆ دانیشت و سەرگەردانە و بابان وێرانە

لە کڵفەتان لە خانم و خاتوونان لە عەتر بەخشندان شین و واوەیلا و گریانە.

ئەوە چل و یەک کچ کوتیان: مەسڵەحەت ئەوەیە ئێمە بچینە کن خەزاڵ وا دەگری و دەبارێنێ، دڵخۆشی بدەینەوە، ئەوە لاس ڕۆیی، عەیب نییە، عەیبە لە نێو هەڵگیرا، بچین بزانین ئاخە چ خەبەرە؟ ئەوە هاتن، پێیان گوت:

خەزاڵ بۆ وا شێواوی، لانت بۆ وا زەلیلە؟

کیژی شل و مل و قامک پڕ لە ئەنگوستیلە.

بەخەزاڵیان گوت: ڕەنگت بۆ وا شێواوە

خاڵی گژنیژیت بۆ لە بن کراسێکی مەحمەڵ داراییدا حەفس کراوە

بەژنی باریک و قەدی شمشاڵت، چ بووە، چ قەوماوە، بۆ وا چەماوە؟

ئێمە وا دەزانین پاشی سێ سەحاتی دی خەبەرت بۆ بێ، بڵێن: لاس گەڕاوە.
ئێمە هێندێکمان خۆمان نەناسیوە، هێندێکمان تازەمان عەتر کەوتۆتە مابەینی سینە و مەمکانێ
چون خودا زانا و خەبیرە، بەسوڕی هەموو کەسێک دەزانێ
ئێمە دەستەودوعا ڕادەوەستین، خۆ خولا بێ مەکانە، کەس بەمەکانی نازانێ
لاس ئەو سەفەرە بەسلامەتی بگەڕێتەوە، دڵی خەزاڵ بێتە دەرێ لە حەفس و بەندی حەفسخانێ.
خەزاڵ بەدوو چاوی ڕەش مەگری و مەبارێنە
ئێمەش دڵمان زۆر ناسکە و دڵمان مەسووتێنە
بەس ئەوبەر ئەوبەریان بکە چاوی ڕەش و دوو ئەبرۆی شەهێنە
بەس شەراب گەردووشی بکە و بەس خۆت ڕابژێنە
ئەو خەمە بکە بەباڵندە و لە دڵی خۆتی هەڵفڕێنە.
هەموو شل و ملن، بەلەک خڕن، دڵخۆشی خەزاڵیان داوە
خەزاڵ وەکو وە دڵی بکەوێ جامێک قەنداو و جامێک بەفراوە
ئەوە بەخۆشی جوابی شل و ملانی دەداوە
دەیگوت: بەخۆم نییە دڵم کۆترە و بەدەستی لاس دەقەفەس کراوە.
جا ئەوجار باسی لاس بکەین. تەقریبەن مەڕوماڵەکەیان هێندە دوور خستبۆوە بربوویان دەخاکی خۆیانەوە. لاس پێشی لێ گرتن، بەسەر هەر کەسێکی دادەچوو سام دەیگرت، کەس نەیتوانی دەستی دەگەڵ بکاتەوە.
جا لاس شێری لە لان و شێری سپییە
پێشی بەمەڕوماڵ دەگێڕاوە، هیچ کەس ڕوحی لە بەدەنیدا نییە
چۆن ئاخر ئەنگۆ ئەمنوو نەکرد بەڕەئیس و بۆ خۆتان هاتنە کن من بەنۆکەرییە؟
بەمنوو نەگوت: مەرد بە مەبە بەباعیسی ڕووح و لەگەڵمان مەکە بێ کیفایەتییە؟
نۆ سەت ساڵە ئێمە سەردار عێلین، خانەوادەین، با خەڵک تەمەشامان نەکا بەچاوی بەدییە؟

نەتاندەزانی لاس ئێستا هەر ماوە، نەمردووە و لە قەبریدا نییە؟
گۆوەندە، شەڕە، هەتا پێتان بکەم عەزیەتدان و دەربەدەری و پەت پەتییە.
هیچ کەس لە حاستی لاس زمانی لە زاریدا نییە
ئەوە بوو بەقرمەی شیر و ئاوازی تیرییە
بوو بەدڵ هێشان و گەروو تاڵییە
باب ئاگای لە کوڕی خۆی نییە
چل کەس لە گەورە گەورە و سەردار عاشیرەت و پەڕ بەسەر و ساحێب نێوونیشان دەکەوتنە عەردییە
یەختەرمە لە مەیدانێ تێک دەهالان، شەقەی ڕەختە و دەنگی ئاوزەنگییە
چون ساحێبی نەماوە ئەو وڵاغە، بەرەڵلایە و کەسی لەسەر سوار نییە.
پێشی تالان و مەڕیان لە سێ جێگاوە دەگێڕاوە
قرمەی خەنجەرە و دەنگی تیرە و هەتلان هەتلانی سەقاوە
هیچ کەس نەبوو بڵێ: ئەوە ڕۆژی بەشارەتی و خۆشییە، دەیانگوت: ڕۆژی قیامەتە و دنیا بۆیە شێواوە
ئاوازی تیرە و هیچ کەس ڕووحی بەخۆی نەماوە
شەڕێکی یەکجار زۆر سەقەتە، قەل و داڵ بۆ کەلاک هێرشیان هێناوە
خۆ شەڕی یەکجارییە، هیچ کەس لە هیچ کەس نەدەگەڕاوە
بەحوکمی تیخی بێ ڕوحمی لاس، خەبەریان دا: ئەحمەد خانی سوورچی و زوراری کوژراوە
برایم خانی لێتانێ لەسەر پشتی ڕکێفێ فڕێ دراوە
خوێنی سەردار عاشیرەتانە، جۆیە، جۆبارە، سێڵاوە
شەڕەکە وەها دڵ هێشان بوو هیچ کەس خۆی پێ نەدەشێردراوە
تەمە، مژە، هەوری ئەجەل لەسەر ئەو لەشکرە ڕاوەستاوە
یەکی ناشارەزا بێ، وەک بارانە خوێن لە عەرزی هەڵستاوە
خەڵکی هەمووی بێ تەمەددودە، هیچی عاقڵی لە کەللەیدا نەماوە

چومکە مەرگ لە پێشی دەسووڕێ، دەڵێ: هەر ئەو سەعاتەم عەمر ماوە
شاڵی بەگی چڵکن، ئەو بەدەرفەتی زانی، لە قەبرغەی لاس ڕاوەستاوە
کوڕە کوتی: عالەمی هەموو کوشت، وەکو پڵنگ پێشی ئەو لەشکرەی چۆن گێڕاوە؟
تیرێکی سێ پەڕی وەستاکار جووتی ئەگەر سەری بەژەهری مار ئاودراوە
لە کەلەکەی چەپەی هەڵی کێشا، ئەوە لە غیلافی ماڵی کەوانی ناوە
قاژەی تیر لە کۆهەساران دەنگی دەداوە
بەناڵەی تیری، بەچەپەیدا ئەگەر لاس ئاوڕی دەداوە، تیر وەرش کونانە،
لە کەلەکەی چەپەی لاسی دەداوە
ڕانی ڕکێفێی شل دەبوو، لە دەستی شل دەبوو بەندی لغاوە
ئەوە ئاوری لە جەرگ و دڵی بەربوو، ئەوە بۆسۆی کەوتە نێو هەناوە.
جا ئەوە لاس دەیگوت: وەختێکە خوێن لە عاسمانێ دەکەوێتە خوارێ
ئارامی دڵەکەم زۆرت بەمن گوت: مەکەوە وەدوای تالان و هاوارێ
لێم ببووی بەنێرگس هەموو سوبح و ئێوارێ
ئەلعان خوێن لە مابەینی خەفتان و کراسم دەبارێ
هیچ کەس نییە خەبەرێکم بۆ بەرێ بۆ خەزاڵ، بریندارم، برینم بەدەستی وی
دەبرژێتەوە، ئەگەر وردە وردە خوناوکەی فرمێسکی وی بەسەر داببارێ
تیر لە گۆشتی داماوە، بەفرمێسکی چاوی خەزاڵ ژانی ئەو تیرە دەشکێ،
فرمێسکی چاوی خەزاڵ دەبێتە دەرمان و ئەو تیرە لە برینی من دەکەوێتە خوارێ.
زۆری بەمن گوت: مەچۆ، نەوەک دوعام ببێ موستەجایە
موقەددەری هەق دەستی ئیلاهییە، بەعەبدی چاری نایە
دەترسم دیدار ئاخرەت بم لە خەزاڵ، بەشی ئاخری وەرگرم لەو کاولە دونیایە.
بابە لاس بریندار بوو. لەشکری وان شکابوو. بە چل کەسێک ئەوە لاسیان هەڵگرت، تا بۆ جێگایەکی فێنکی بێنن. لاسیش بەتیری شاڵی بەگی چڵکن بریندار بوو. شاڵی بەگ ئەگەر زانی ئەوان شکان بەدوای واندا ڕۆیی.
جا لاس پێیان گوت: شاڵی بەگ ئەتۆی بریندار کرد. لاس کوتی:

کەسێکی تاقەت و هێزی دڵی هەیە و دەست و دڵی دەگرێ بۆم لە ماڵی کەوان نێ
تیرێکی پەڕ کەوییە
بریندارم، زۆر چاکم ئاگا لەخۆ نییە
شاڵی بەگ ئەمنی کەلەلا و بریندار کرد و لە منی کرد قەستی گیانییە
با غەنیمی من نەجاتی نەبێ بەشادمانی و بەخۆشییە
با شۆڕەتی ئەو نەڕوا بۆ نێو عێلی باڵەک و حەریرییە
با لە دڵی خانزادە خانی حەریری نەبێتەوە بەتیری نەدیدە و مارانگازییە.
جا ئەوە تیرێکی پەڕ کەوی خاسە ڕەنگی سێ مشتەییان بۆ لە ماڵی کەوانی دەناوە
جۆگەلەی خوێن لە پێشی هەڵدەستا، ئەژنۆی لە خوێنی خۆیدا ماوە
چۆکی ڕاستەی وەپێش دەخست و لاقی چەپەی دەخستە دواوە
ناڵەی تیری لاس دەهات، گرمە گرمە، ناڵە ناڵە، قاوە قاوە
هێندێک دەیانگوت: ئاخری زەمانە، هێندێک دەیانگوت: خێر عاسمان ڕووخاوە
هێندێک دەیانگوت: هەورە، هێندێک دەیانگوت: خێر بارانە، سێلاوە
هێندێک دەیانگوت: خێر قاز و قورینگن سەریان لێ شێواوە، هەڵۆ لێی داوە
لە گرێی پشتی شاڵی بەگی چڵکنی دەدا، سێ پەڕی لەسەر دڵی سەری دەرهێناوە
مەرگی شاڵی بەگی وەپێشە خۆی خست، ئەو غەرەز و داخەی لە سنگیدا نەماوە
بەبرینداری ئەوە لاسیان هەڵگرت، بۆ عێلی مەلا داود و مەلا نەبییان گێڕاوە دواوە.
جا ئەگەر بەشەلاڵی کەلاکیان هێنا بەردەستی خەزاڵی دڵ کول، خەزاڵ کوتی:
ئاخری وام چاو پێ کەوتی، چەندم لەبەر گێڕای دوو چاوی ڕەش و لێوێکی ئاڵ،
دەمزانی ئەوڕۆ دەبینم، بابانم وێرانە
دەجا بەدەستێک شل و مل بڵێن، ئەوی تەمەنی نەچۆتە پازدەی و تەمەنی تازەکانە
لە چاردە سالانە
ئارەقی مابەینی سینە و مەمکان و ئەوی وردە گژنیژی کرمەکی وێ دەکەوێ لە بنی گوێیان و ئەوی دێتە سەری سێبەری گوارانە

بۆم بێنن عارەقی سنگ و بەرۆک ئەگەر خوناوکەی لێ دەکەوێ سبحەینانە

بابانم وێران بوو، ئەمن بۆ کورتە لاسی باڵەکانی بکەمەوە بەدەرمان و بەپڕ دەرمانە

بیهاوێژمەوە سەر جێگەی تیری چڵکن، چون لاس بێ قەرارە، برینی زۆر لە ژانە

بەڵکو ژانی ئەو برینەی بشکێ. گەردنمی بۆ بکەمەوە بەوەتاغ و باڵەخانە

قوفڵی سنگ و بەرۆکێی بۆ هەڵبگرم، بەڵکو دابنیشێ لەو دووکانە و لەو

مێهمانخانە و لەو مەیخانە

سەلای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، بابانم وێرانە

ڕەبی کوێر بم لە هەرتک چاوانە

بەخولای لاس لە مردن نیزیکترە هەتا بڵێی بۆ ڕۆژی ژیانە

لاس دەیگوت: خەزاڵ مەگری، فرمێسک بەسەر سنگی مندا هەڵمەوەرێنە، خۆ تفی

تۆ بۆ من دەرمانە.

بێ تەشەنە برینم، دڵی خۆت مەڕەنجێنە

برینم مەکولێنەوە، جەرگ و هەناوم مەپسێنە

بیانکە بەساقی، دوو چاوی نەخشینم بۆ هەڵێنە

بڵێ: لاس هەقی برینداریێ خۆت لە کوڵمێکە ناسک و لە شەمامە و شەمامە

ڕەنگینی باغەڵێ بستێنە.

ئەتۆ ڕاستم ڕابوەستە لە پشت سەرییە

بریندارم تاقەتی دانیشتنم نییە

بڕوانمە بەژنێکە باریک و قەدێکە شمشاڵییە

با خەڵک نەڵێن لاس زنجیرەی قیامەتی پێ نییە

نازی تۆ بۆ من دەبێتە مەعموور و بۆم دەداتەوە جواب و سوالی قەبرییە

دڵم دێشێ و پڕ تەکانە، چاک چاکم ئاگا لە خۆم نییە

لەبەر قەرە زولفانت دەمرم دەڵێی داڵە میرەڵەیە ئافەندییە

ئەوە حوکمی مەشقی نیزامان دەکا، هاتووچۆ دەکەن ئێک دێتە پێشێ و ئێک

تێپەڕییە

دەمرمەوە لەبەر دوو چاوی شەهێن سێ ڕێز فرمێسکیان هاتۆتە سەر کولمێکی لیمۆییە

ماچێکم لە کولمێکە ناسک دەرێ با پێمەردی میران نەڵێن: لاس زەخیرەی قیامەتی پێ نییە

چون پیاو حیسێب و ئیختیار و تاقەت و ژیانی لە دەستی خۆیدا نییە

خەزاڵ وەسێتنامەم لە کن تۆیە با بتدەمێ خەبەرێکی بەخاترجەمی و بەئەسەحییە

سەرم دێشێ، دڵم ڕاناوەستێ، خەمی تۆمە خۆ خەمی خۆم نییە

هەزار جارت دەستی من ببێتەوە بەدامانە، موقەددەری هەق دەستی ئیلاهییە،

پێشی ناگیرێ، وەسەر هەموو کەس دەکشێ ئەو سامە

کوا دایک و خوشک و تایەفە و شینگای خوشکان، لە خەزاڵ زیاتر کوا کێی دیکە لە لامە؟

نەبادا پاشەڕۆژێ بڵێن: لاس پیاوێکی بێ عاقڵ بوو، پیاوێکی نەفامە

ئەگەر لە کولمێکی ناسک ماچێکم بدەیەی، بۆ من ژیانە، نەهارە، شامە

جا ئەوە لاس بەبرینداری لە خێوەتی خەزاڵدا کەوت. خەزاڵ تەواو نازی لێ شێوا.

ئەوە بەبرینداری یازدە شەو لەوێ کەوت.

جا ئەوە خەزاڵ دەستی دێنا سەر دەستییە

لە تاوی لاس شێتە و ئاگای لە خۆی نییە

سەلای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، ماڵە باوانم کەسی تێدا نییە

جا من لێم حەرام بوو ئیسرڕاحەت و زیندەگانییە

لە پاش لاس ئەمن ئەو دنیا بێ بەقایەم بۆ چییە؟

خودا موقەددەری لەسەر چییە؟

بۆ برینی تیری چڵکن نەیکرا عیلاج پەزێرییە؟

ئەوە لاس بەبرینداری ماوە بیست و یەک شەو. ئەگەر دەگیانەڵڵایەدا بویایە خەزاڵ بیدواندبایە قسەی دەگەڵ دەکرد، یەگجار زۆریش نارەحەت بوو. هەمیشە دووسەت کەس گەورە گەورە دەهاتنە کنی لە ڕانی خۆیان دەدا، جا ئەوانە دەچوونەوە بەماڵە

خۆیان دەگوت: خەزاڵ زۆر نارەحەتە، لاسیش برینەکەی زۆر کارییە، خودا بیپارێزێ.
جا بەخانەوادەی خۆیان گوت: تێگڕا بچن، ئەوڕۆ لاس زۆر نەخۆشە، دڵخۆشی خەزاڵ بدەنەوە.

جا ئەوە ژن و کچ دووسەت کەس سازبوون، خانەوادەی ئەوانەی گەورەی عەسرن.
هێندێک گوارە لە گوێیان دەکاتەوە سەمایە
هێندێک کۆرپەی نەخشینی لە باوەشی دایە
ئەوە بۆ پرسیار هاتن بۆ کن خەزاڵی دڵ موفتەلایە.
سەربەخۆ نەهاتنە ژوورێ، لە دەرکێوە ئەوە ئیجازە وەردەگرن.
شل و مل و سایەگەردن هەمووی لە باوەشیان دایە کۆرپەی نەخشینە
دەیانگوت: برینی لاس ئی تیری چڵکنە یان ئی ڕیشوەی قەرە پۆشینە
یان موفتەلای تیری خەزاڵە، یان برینداری چاوی کاڵە، بۆ بە هیچ دەرمانێک عیلاجی نینە؟
خەزاڵ دەیگوت: کەس نەیەتە پێشێ، سەڵای گەورە و گرانم لێ ڕابوو ڕووحی لاس لەسەر فرینە
لە مردن نیزیکترە، پێم وایە لاس ناژی بە ژینە.
لاس سێ کەڕەتی لەسەر ڕانی خەزاڵ ئاخ هەڵدەکێشاوە
دەیگوت: شەرع و مەخسوودی من و تۆ پێم بۆ ڕۆژی قیامەت ماوە
ئەوە خەزاڵ سەری لەسەر شۆڕکردۆتەوە و دەگری لاس بەئەجەلەوە چاوی لە پێشی هەڵێناوە
دەیگوت: خەزاڵ قەرە زولفی تۆ ئەمنی کردبوو پێ بەندییە
ئێرەکانە بۆ من وەتەن نییە، غەریبییە
جێگایەکی غوربەت و بێ کەسییە
زولفێکی خۆت بێنە لەسەر دڵمی دانێ بۆ دیانەتی و بۆ ئامانەتییە
پێ مەردی میران ئەگەر لێیان پرسیم، دەڵێم: ئەوە ئی خەزاڵی مەلا نەبییە
لێم خۆش دەبن، عەزیەتم نادەن، بۆ من دەبێتە ڕەفیقی گۆڕخانە و قەبرییە

مەیتی من بەڕێ بکەنەوە بۆ وڵاتەکەی خۆش ئاواز و حەریرییە
خانزادە خان زۆری چاو لە ڕێگایە، ئەمن بەرنەوە بۆ وی، با کەلاکم ببینێ، بۆ وی بەدبەختییە و خاترجەمییە.
ئەو جەندازە و کەلاکی من چاتر لە عەمەل دێنێ
با ئەویش وردە فرمێسکی خۆی بەسەر کفنمدا هەڵبوەرێنێ
با هیچی دیکە چاوەڕێیی نەمێنێ
ئەو دەنێرێ بۆ کاولە نوحسایە، دایک و خوشک و تایەفەم بۆ سەر گریان و جەندازەم دێنێ
ئەو دەزانێ ئەگەر عەتر و عەبیری دڵ گوشادی بەسەر مەیتی من دابپرژێنێ
مەیتی من بەڕێ کەوە بۆ وڵاتی حەریرێ بە پیادە و بە سوارە
کەس نەڵێ مردووە، بڵێن کەمێک بریندارە
خانزادە خانی حەریری زۆری دڵ لە دواوەیە ئەو بێچارە
دەترسم ڕۆژی قیامەتێ لەبەر ناڵە و نزولەی وی نەبمەوە خلاس و ڕزگارە
بەڵکو ئەو دوعام بۆ بکا و بپارێتەوە لە پەروەردگارە
بڵێ: هەچ هەقێکی منی لەسەر بێ، ئازاد بێ ئەو فەقیر و غەریب و هەژارە.
لاس سێ کەڕەتی لەسەر ڕانی خەزاڵ هەناسە هەڵدەکێشاوە
لەسەر ڕانی خەزاڵ دەبۆوە تەواوە
پاداشتی ئەو دنیایە هەر وایە، ئیحتیباری بە ئەسەحی بە کەس نەداوە
عاقیبەت مەرگە کەس لە مەرگ، ناگەڕێتەوە دواوە.
ئەی لەو خەبەرەی بۆ من دەهات لە نەکاوێ
بابان وێرانم ژیانی دونیایەم ناوێ
لاسە شۆڕی باڵەکان نایەتەوە سەرگە و بنگەی دیوەخانێ، لە کوڵمەی خەزاڵ بگرێ وردە خوناوێ.
ئەوە خەزاڵ دەگری و دەبارێنێ
فرمێسک بەسەر سنگ و بەرۆکی دادەپرژێنێ

لەبەر خەمی خەزاڵ هەلاڵ و بەیبوون و گوڵەجووت گوڵ دەوەرێنێ
کەسێکی ئەگەر گوێی لێ بێ دڵی برین و تەشەن دێنێ
هەج جارێکی تۆق و تەلەسمی خماوی ڕادەوەشێنێ
چاوی پڕ لە عەسرین بەناز و نیمناز هەڵدێنێ
سەلای گەورە و گرانم لێ ڕابوو کەسم لە ماڵە باوانم نەمێنێ
جا کوا لە عێلی مەلا نەبییان کەسی وا ماوە خوێنی لاسە شۆڕی باڵەکان بستێنێ؟
دەبێ لە بن کراسێکە مەحمەڵ دارابیدا شەمامە و شەمامە ڕەنگینی باغەڵێ ژەنگ بێنێ
شەرت بێ پاش لاسە شۆڕی باڵەکان نەیاندەم بەکەس بیانژاکێنێ
تا ڕۆژی ئاخرەتێ، ئەوی ڕۆژێ خوداوەندی میری مەزن قیامەت دێنێ
ئەو وەختی با لاس بەلوتف و مەرحەمەت بمدوێنێ
بزانێ میراتی وی، خەزاڵ نایدا بە کەس و بە کەسی نابڕێنێ.
ئەوە خەزاڵ خوێنی ڕوومەتی دەهاتەوە سەر گۆیە کەمبەرێ
دەیگوت: ڕەبی کەس مردووی وا گەورە و گرانی لە ماڵێ نەچێتە دەرێ
خەزاڵ دەبوو نەژی، دەبوو دەستبەجێ دڵی دەرێ
کوا سوارەکەی ئەگەر لە بەدەنی دەڕژا غیرەت و تانووت و جەوهەرێ
پاش وی کێ دەست بۆ شەمامە و شەمامە ڕەنگینی باغەڵێ بەرێ؟
کێ خەبەری بۆ من هێنا بەپەلە و لە نەکاوە
بە منیان کوت: لاس و لاسە شۆڕی باڵەکان ئەنگواوە
ئەورۆ سێ ڕۆژە ڕووناکاییم کەم بووە لە گۆشەی چاوە
بریا کوێر بوومایە نەمدیایە چیدیکە ئەو دنیا نەخشین و ڕەنگاوە
سەلای گەورە و گرانم لێ ڕابوو لاس کەللەی بەگلیەوە ناوە
جا کێ پەنجەی بگێڕێ لە باغ و باغچۆڵەی ساوا
جا کێ قەفی سمێڵی وەکو ئاوریشمی خاو لەسەر کوڵمەیەکی ناسک دەبزێوێ،
حەیفێ ئەمن مەرگم وەپێش مەرگی وی نەگەڕاوە.

خەزاڵ ئەوە دەگری و دەبارێنێ
کەمبەرەی ئاڵتوون لە قەدی خۆی دادەشکێنێ
بەقەوەی پەنجان زنجیرەی زولفی دەردێنێ
دەڵێ: حەیفە پاش لاسە شۆڕی باڵەکان خەزاڵ بمێنێ.
ئەوە خەزاڵ دایدەماڵی زێڕ و گەردن کەش و ئەشرەفییە، فەرەنتی و زێڕی سپییە
قۆیتاسان گە ڕاست و چەپ دەبوون دەگەڵ گۆی مەمکییە
گوارە و کرمەک شۆڕابەیان بۆ چییە
خوناوکەی گەردنێ میراتییە
هەموویان کڵفەتان بێن بیانبەن بۆ سەر کووپەڵەی خمییە
لە پاش لاسە شۆڕ قرانێک بەمن پێویست نییە.
دەبێ دابنیشم بە بەدبەختی و بە بەرگ کۆنی و بە قەلەندەری و بە سەربەکوێنی
جا کێ هەیە لە قابیلەتی ئەوەدا بێ ئەگەر خەزاڵ بەناز و نیمناز بیدوێنی
جا کێ هەیە لە قابیلەتی ئەوەدا بێ ئەگەر لە نیوەشەودا خەزاڵ لە خەو ڕابپەڕێنی
لەسەر سەرینێکی قومەجاز سەری خەزاڵێ ڕابژێنی.
کێ هەیە پاش لاس بتوانێ بەری چل عاشیرەت بگری
جا بۆ من کوێریان نەکەم ئەو چاوی ڕەنگ باز و سەقری
جا کێ ئەوجار پێشی عێلی مەلا و مەلا نەبی ڕادەگری
لاس بوو کۆمەگی بوون حەزرەتی ئەلیاس و خدری.
تازە نایەتەوە دەستان پیاوی وا ساحێب ئەرکانە
ئەمن بۆیە لاڵم دەکرد دوو گۆشەی چاوانە
مژانگم دەکردەوە بە تیر و بە پەیکانە
تۆق و تەلەسم و زێڕ و زنجەق و گوارە و کرمەک و ئاودەنگی و خەبەرچی، لەسەر سنگم دانا
ئەگەر لاسە شۆڕی باڵەکان پێم بکا باوەڕ و متمانە.
پیاوی وا لە هیچ عێلێکدا نەبووە

سەلاو قەت کەسم نەما، ماڵە باوانم وێران بووە
وابزانە عێلی مەلا داود و مەلا نەبی بەتاڵان چووە
ئەوە هەیبەتی لاس بوو، دەزانن لاس لە دەست دەرچووە.
دەبێ من ببمە قەلەندەر و سەر بەکوێن و بابان وێرانە
شەوێ و ڕۆژێ دەست بکەمەوە بە شین و واوەیلا و گریانە
دابنێم ئەو دنیایەی ئەگەر لاس لێی دەگرتەوە جێ ژوان و سانە
خۆم هەڵدەگرم بۆو ڕۆژەی ئەگەر خوداوەندی میری مەزن دەکاتەوە دیوانە.
کێ بێ لە نۆکەر و لە نۆکەری ئەوی دونیایە
بۆ ئاغای خۆی پێک بێنێ قەول و شەرت و وەفایە
ئەو دیوەخانەی ئەگەر لاسی تێدا بوو، بۆم ئاواڵە کاتەوە دەرکەی، زۆرم داخی گەورە و گران لە دڵی دایە
عەکسی لاسم وەگیر کەوێ، بەڵکو ئەمنیش بگرمەوە دەردی موفاجایە
بۆنی دیوی لاسم بەسەر دانەیە، ئەمن سوکنایی دڵم نایە.
کێ بێ لە نۆکەرێکی ئەگەر ڕاستە و بەئەسەحییە
خەبەرێکم بۆ بەرێ بۆ وڵاتی زمیر و بۆ وڵاتی باڵەکییە
بڵێن: لاس نەماوە و لە ژیاندا نییە
خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبییانی بەجێ هێشتووە بەمیرات و بەمیراتییە
هەچ کەسێکی ئەگەر میراتی بووێ، خەزاڵ حازرە، چومکە بە لاسی داوە قەولی ئەسەحی و ئاخرییە.
زۆر حەز دەکەم ئەگەر بمبەن بۆ وڵاتی گەرمێنێ
زۆر کەس چاوەڕێی ئەو میراتەن ئەگەر لە پاش لاس بەجێ دەمێنێ
دڵم نیگەرانە، نەوەکو کەسێک بێ لە عێلی سوورچی و زوراریيان بەزۆر میراتی لاس بستێنێ
کەسی وا نییە ئەگەر ڕمبی هەژدە قەفی لە پێش دوژمنی بچەقێنێ
ئەوی داوای میراتی لاس بکا، کەللە بپەڕێنێ

خۆ لاس نەماوە تالان لە تەرکە و تورکومان بێنێ
هیچ عێل و عێل باش و دوژمنێک نەتوانێ لە کن وی چاوی هەڵێنێ
ئەو دوژمنێکی لاس ببینێ دەستبەجێ قرچەی دەروونییە و جەرگی خوێن دەدەڵێنێ
سەری دادەخا، ناتوانێ سەری هەڵێنێ
دەزانێ ئەگەر ببزوێ ڕوحی لێ دەستێنێ.

تەواو بوو

*بەیتی بەروبوو درێژی لاسە شۆڕی باڵەکان لە شاری سابڵاغ لە مام ئەحمەدی لوتفیم بیست. نەورۆزی ١٣٤٣ .*

قادر فەتاحی قازی.

١

سەر هەڵێنە بڕوانە تۆقان، تەلەسمان، زێڕان، زنجەقان، گواران
کرمەکان، ئاوەدەنگییان، خەبەرچییان، لەگەڵ گەڕی دەدوگمانە
خاڵی ڕەش خێزەرەی[1] کردووە لە مابەینی سنگ و مەمکانە
تێکەڵ بوون دە گەڵ زنجیرەی زولفانە
دوعامان قەبوڵ بووە بزانە کاری سوبحانە.

٢

ئەتۆ دەزانی خودا چاکی بەئێمە داوە!
مەمک وەدەر کەوتن وەکو هەناری ساوا
چونکە عەزیەت و عازابمان گەلێک کێشاوە
خودا دوعای قەبووڵ کردین چاکی بە من تۆ داوە.

٣

دەرکی ماڵە باوان بەگوڵ و هەلاڵ و سێوەڕە
شەرت و نەزری من چل مەڕە
چومکی ئەو کارە بەکەیفی من وەرگەڕا
لەسەر سنگی ئەو کیژەی خڕکردووە جووتێک لیمۆی تەڕە
گە بێتو بزانن میر و بەگلەران لەسەر ئەو لیمۆیەی شەڕە.

٤

شوکرانە بە تۆ ئەی بیناهی چاوە
دوعام قەبووڵ بوو، تۆ ئەو نێعمەتەت بە من داوە
لەسەر سنگی ئەو کیژەی جووتێک لیمۆی کاڵ داناوە.

٥

دەرکی ماڵی بابم ئەوبەر ئەویەرە
لە لایەک ئاغایە و لە لایەک نۆکەرە

له لایەک ڕدێن سپییە و لە لایەک عەمر بەرە
لەسەر سنگی ئەو کیژت خڕ کردووە جووتێک گەوهەرە
شوکرانە بۆ تۆ ئەی سەمیعی بانی سەرە

٦

کوتی: ئەوە نەمردم دنیا وا دەبینم
نەختێک وەرە پێشێ ئەی نازەنینم.
کوتی: وەفا نەکەی، دڵم نەڕەنجێنی
لیمۆی کاڵم لێ نەژاکێنی
پەشیمانی غاییم لێ بەدەست نەیەنی،
خاتر خۆشت بێ ئەحواڵ
خۆ چاوت کەوت بەلیمۆی کاڵ.

٧

ئەوە هاتنەوە بۆ ماڵێ، ئەگە هاتنەوە مێهر هات کوتی:
مامۆستا مەجەلی[٢] خودای دەگەڕێن،
مەجەل لە من هاتەوە وەختی تاوهەڵاتێ
میرو بەگلەران حازر بوون بۆ سەر حوکم و حوکماتێ
عافرەتم لە دەستمدا نییە ئیختیار و دەسەڵاتێ
کەس نییە خەبەرێکی ئەسەحێم داتێ.

٨

مامۆستا بەوەی کەم ئەگە بێ مەکانە
ڕوحی کوللی زیڕووحێکی دانا
بۆ خۆم لێرەم و ڕۆحم چۆتە حەفسخانە
وەفا دەچێتە سەفەری حیجازێ،

سەفەرەكەی زۆر گەورە و گرانە
زۆر زۆر نارەحەتم،
دەترسم چاوم پێی نەكەوێتەوە بەو زووانە
بمدیبا لێم وەرگرتبایە ئیحتیبار و متمانە[٣]
دادەنیشتم بە دڵی بریندار و جەرگی پڕ لە ژانە
تا دەهاتەوە لەو سەفەرەی موعەززەم و گەورە و گرانە.

٩

مامۆستا كەروێشك چێشتانان دەكاتەوە چێشتە خەوێ
فێنكی ئێواران دەفڕێ كەوێ
ئەمن دنیام لەبەر وەفا دەوێ.

١٠

مامۆستا دەستی منت بەدامانە
دەتدەمێ یاقووتی عەبدلحەسەن و لەعلی ڕوممانە
جەواهێری لە بیست و چوار، ئەوی بە قیمەت گرانە
دەتدەمێ چاوم بەوەفا پكەوێ، دڵم زۆر لە ژانە.

١١

كێ بوو[٤] لە مامۆستای دە گوڵباوە
بەسەر شانی ڕاستەیدا ئاوری دەداوە
موستەعیدێك، فەقێیەك لە خزمەتی ڕاوەستاوە
مامۆستا قاقەزێكی دەنووسی،
مێر لە بنی قاقەزی ئیمزای لێدەداوە
ئەگەر وەفا بێت بۆ حوجرە،
كارێكی زۆرمان لە سەر وی مەحتەل ماوە.

١٢

کوتی: بابە دەستی منت دامانە
لە زەمانی حەزرەتی ئادەم تا دەگاتەوە ئەو زەمانە
ئازادی شتێکی چاکە بۆ موسوڵمانە
ئیجازەم بدە بۆ نێو ڕەفیق و ئاواڵدەرس و متمانە
چومکە سەفەرەکەمان گەورە و گرانە
با ئازادم کەن ئەوان خزم و دۆست و کەس و هامدەرسانە.

١٣

شا گەردنی هەڵێنا پێدەکەنی
ئەتۆ زرینگی سەڵتی، ڕەبەنی
نەچییە کن مێری خواجە حەسەنی.

١٤

دەیگوت: بابە بەوەی کەم ئەبەدییە
ئەتۆ ئاگات لە دڵی من نییە
دایمە ڕوحم لە چنگی مێرێدا حەفسییە
درۆ و دەلەسە فایدەی نییە.

١٥

بابی پێی کوت: بەوەی کەم ئەگەر بیناهی چاوە
پێم ئەتۆ ڕێت لێ گوڕاوە
عاقڵت لێ شێواوە، پەرییان دەستیان لە دڵت داوە
یا زنجیرەی زولفی تەنافە و لە گەردنت کراوە
یان ئەبرۆی تیرە و لە جەرگت دراوە
جێ دەمی مار پاش حەو ساڵان تەشەنی هێناوە
ئەمن نەمکوت بەمێرێ قاییل نیم، کاری خۆت لێ بێ تەواوە؟

١٦

وەفا دەڵێ: بابە دایکم بانگ کە، چون سووتاوم لە دەردی دڵییە
دایکم بە منی داوە شیری سپیە
چۆن کەس ئاگای لە دەردی کەس نییە.

١٧

ئەوە ناردیان لە دووی دایکی،
دایکی هات. برایم پادشا پێی کوت:
ئەوە چییە ئەو کار و بارە؟
وەفا وا دڵی بریندارە،
تەمایەتی لە دەستم دەرێنێ ئیختیارە.
عافرەت پێی بڵێ: عاقڵی نەماوە
قسێکی ئەمن کردم ناگەڕێتەوە دواوە
دەست لە مێرێ هەڵبگرێ،
خاترجەم بەشی وی پێوە نەماوە.

١٨

کوتی: کیژێ کیژێ کیژی کێیە
سەری منت بێتەوە بەقوربانی سەرێیە
پیاوی خراپت ببنەوە بەقوربانی زنجیرەی دەکەزێیە
مەترسە تا ڕۆژی قیامەت تەمام پێیە.

١٩

مامۆستا دایمە ڕوحم وەک تەیری تیژباڵ لەسەر ڕوحی مێرێ دەگەڕێ
دەمرمەوە لەبەر شەدێکی ئەڵوانی کوڕە کۆر حوسێنی فەرەجوڵڵا
ڕیشوەی لە مابەینی چاو و برۆیان دەکاتەوە شەڕێ

چاوی ئەستێرەی ڕۆژێیە هەڵاتووە، کاروانی پیشانی یەکتری دەدەنەوە:
ئەو ئەستێرەی ڕۆژێیە هاتۆتە دەر لە گەوەڕێ[٥].

٢٠

جا بانگی مێرێی کرد کوتی: ئەوە ئەتۆی ڕاوەستای لەسەر جووتێک
کەوشی پانیە فەڕڕاشی سەر نوقرە بەندییە
لە پێت دایە ئاواڵکراسێکی قەنەوزی پەڕ تاوسییە
کراسێکی عاسمانی مەحمەڵ داراییە
چارشێو شانێکی موشەجەجەری ڕیشوە نیوگەزییە
پشتێندێکی خاڵ خاڵی هەژدە گەزییە
کڵاوێکی سیمرێژولێ چەسپ کردووە بەدری بەحرییە
مێر گەندومییە، سوور و سپییە
تەرحی ئەو حۆریانەیە ئەگەر خودا دروستی کردوون لە بەحەشتی
باقییە.

٢١

دەیوت: مامۆستا دەستی منت دامانە
ئەتۆ بە مەت خوێندووە ئیننا فەتەحنا و سی جزمەی قورعانە
ئامانەتت مێرێ بێ، ئەمن سەفەرم زۆر گەورە و گرانە.
شێت دەبم ئەگەر مێر بۆ من هەڵدێنێ چاوە
کولمەی دەڵێی بەفرە و دۆشاوی پێدا ڕژاوە
تیرێکت لە جەرگی داوم لە پشتم پارچاوە.

٢٢

مامۆستا دەستی منت بەدامانە
لە دنیایەم نەکەی سەرگەردان و دەست لێک بەردانە

حوکمی وەلینێعمەتم لەسەرە و گەورەی زەمانە
بێ عەمری باب کردن یەگجار کارێکی گرانە
هەتا دێمەوە مێر کلەی نەبڕێ لە چاوانە
دانەنیشێ وەک سەغیر و کەسێکی لێی قەومابێ لە کووچانە
ئەو دنیایە بۆ هیچ کەس هەتا سەر نەماوە
ئەو حوکماتەی ئی منە، بابم عومری پیرە مەڕێکی ماوە
هەکاتا لەو سەفەرەی نەگەڕاوە دوواوە
ئەمن بەبێ مێرێ قەت لە خۆم نابینم کام و کاوە(٦).

٢٣

کوڵمەت بەمن بمێنێ بەشەمامەی حەوت ڕەنگە،
لە کوڕە بێستانچییان بەجێ دەمێنێ،
شەختەی پایزێ لە لایەکی داوە.
چاوت بەمن بمێنێ بەئەستێرەکەی ڕۆژێ،
ئەگەر گەز و نیوێک لە پێش ئەستێرەکەی مەلای ماوەراندا گۆشەی کێشاوە.
مامۆستا ئەمن دەڕۆم ئەما دڵم لە خزمەت تۆدا بەجێ ماوە.

٢٤

مێر دەیگوت: چبکەم، ئەوە خوداوەندی میری مەزن پێکی نەهێنا
کار و بارم
هەتا دێیەوە هەر ئینتیزار و لێو بەبارم
ئەگەر لە دنیایەشم بۆ نەبی لە قیامەت پێت منەتبارم.

٢٥

مێر دەڵێ: مامۆستا هەزار جار دەستی منت بە دامانە
ئایەتێکی عەزیمی بەسەردا بخوێنە ئەگەر بۆیەم(بۆمن) دەڵێن

ئایەتی عەبدوڕڕەحمانە
ئامانەت داری بێ وەیسەلقەرەنی ماهیدەشتی بەغدایە،
لەگەڵ وی بن جەمعاوەری دە پەریانە.
سەڵای گەورە و گرانم لێ ڕابوو،
پێم وایە ڕۆژی دەست لێک بەردانە.

٢٦

ئەی داد و لە دڵی من چۆن بووە بەهاوارە
سەری منت بێ بەقوربانی باڵتۆیەکی سەمبوری قاقمی دوگمە پازارە
بۆ خۆت ڕۆیی بۆ منت بەجێ هێشت خەم و پەژارە.

٢٧

هەوەڵ یا پادشای غەفوور
دووهەم یا پادشای غەفوور
یا قورعان و یا زەبوور
یا سەهیدی ساحێب نوور
لە شەیتانمان کەی بەدوور
مێرێم بۆ بێتە حزوور
کاری خوارم بۆ پکەی جوور.
خالەقی حەیی ڕەحمان
بە تۆم هێناوە ئیمان
دوور بم لە شوبر و شەیتان
قسمەت کەی باغی گوڵان.
ئەوە وەفا سووار بوو.

٢٨

چا مامۆستا لە منیەوە تەمەشاکە بەدوو چاوە

مێر دەڵێی گوڵی بەهارێیە و تازەکانەی غونچە کردووە و شکۆفەی

داوە

دەڵێی وەنەوشەیە و تازەکانەی دم بەگڵێیەوە ناوە.

وەختیشم لێ درەنگ بووە، هاتۆتە وەختی بانگی ئێوارێ

چاوت بەمن بمێنێ بە ئەستێرەی ڕۆژێ، کوڵمەت بەمن بمێنێ بەگوڵی هەنارێ

سبحەینێ هەچی زووترە بۆم بچۆ بۆ سەر کانی شێخان، کانی و ڕووبارێ

باجیرەی ڕێگایە هەڵگرم بە دیتن و بۆنی یارێ.

٢٩

وەفا بەمامۆستای کوت:

دەڕۆم بەشم بە خاکی مەغریب زەمێنێ– وە نەماوە

دەستی منت دامێن بێ ئامانەتێکە لە کن تۆم داناوە

نەیشکێنی ئەو شووشەی گوڵاوت لێ ڕژاوە

چون کولەکە[٧]، ڕوحم لەو شووشە گوڵاوەی ناوە.

ئەوە وە دەرکەوت وەفا.

٣٠

کێ بێ[٨] لە مێری بەزنجیرەی زولفانە

دەڵێی کۆترەو لێی ون بووە هێللانە

سبحەینان بازە و ئێواران تەڕلانە

نیوەڕۆیە بەرخە کۆرپەڵەی دووای مێگەلانە

هەڵی دەکرد چرایەکی زەڕنیشانە

لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت کڵفەتێکی دەوڵەتخانە

دەهات بۆ نێو لەشکری گەورە و گرانە

بۆ نێو لەشکری بێ بەعسەت و بێ ئیمانە
گەلێک دەگەڕا لە نێو لەشکری گەورە و گرانە
قەرەوڵ دەنگیان دەدا، کێیە ئەو متمانە؟
دەیگوت: کێهە مەزلی پادشایە، مەلیک شوجاعی ساحێب نام و نیشانە؟
کارم بەمەزلی وی هەیە، ئەی مەعمووری دەوڵەتی و مەعمووری میرانە.
پیشانیان دا.

٣١

خێوەتێکی دامێن بەزێڕی سەر بەژەنگار هەڵدراوە
وە بەریان داوە دوو سەت تیرەگی لەعلی ڕوممان، لەگەڵ پازدە ئاڵتوونی تازە دروستکراوە
تەختێکی میری بۆ مەلیک شوجاع داندراوە
نیشانەی سەگی لە پشتی سەری هەڵاوەسراوە
مێر دەستی حەدەبی بەسینگی دەگرت والێی دەکردەوە سڵاوە
ئەگە چاوی پێدەکەوت دەعەبەسا، بێ تەکللوم جووابی پێ نەدەدراوە.

٣٢

مێر دەیگوت: سەلام دەکەم لە کەسێک ئەگەر جوابی سەلامم بزانێ
بەڵەدبێ لە عیلمی نەسرومینەڵڵا سی جزمەی قورعانێ
ئەمن سەلامی خۆم مەحتەل ناکەم، دەیبەمەوە بەر مەلەکی دە عاسمانێ.

٣٣

شا نوتقی کرد و هۆشی هاتەوە بەرێ، وای جواب دەداوە:
دەیگوت: کیژێ سەرم لێ شێواوە
عاقڵم لێ پەشۆکاوە
کەس نەیدیوە بەشەو ڕۆژ لە مەغریبێ سەری دەرهێناوە
شەرق و غەرب و جنوب و شیمال ڕووناکە بەو شۆق و تاوە

نووری جەماڵت لە بەحر و بەرِیەی.داوە
هەچ کەسێ بتدینێ عاقڵی ناقیس و ناتەواوە.

٣٤

کورسێکی مورەسەعی جەواهێر بەندیان بۆ مێرێ دادەناوە.
دەیگوت: چکارەی، بۆ سەرت بۆ مەغریب زەمینێ هێناوە؟
کوتی: هاتووم و دەخورِم
بەئەڵماسان زگان دەدرِم
بەکێردان سەران دەبرِم
نابەڵەدم، لە عەکسیدا نووسراوە، خۆشەویستی وەفایە یەک و دووازدە
بەزێرِی دەکرِم.

٣٥

مەیە، خورِینت بێ فایدەیە
وەفا پیاوێکی رِەشیدە، نەڵێی پەخمەیە.
خاترجەم بە، دەست لە مێری وەفا هەڵبگرە، بۆ کەس نابێ، بۆ کەس
نایەتە رِەدایە
هەتاوەکو رِوحی لە قالبی دایە
هەتا وەفا نەیەتەوە لە سەفەری حیجازێ و نەگەرِێتەوە ئەو پادشایە.
بێ فایدەیە لە دوای قسەت کارنایە.

٣٦

دانیشن بەخەمناکی و بەبێ دەنگی
بەخەمناکی بەدڵتەنگی و بەدین لەنگی
خۆشەویستی وەفایە دەیبەنەوە بۆ وڵاتەکەی فەرِەنگی.
دانیشن بە خەمناکی و بە هەژاری
بە دەردەداری و بە دڵبریننداری
خۆشەویستی وەفایە دەیبەن بەدیاری.

٣٧

خەبەرێکم بۆ بەرن بۆ حوکماتێ
بەو جحێڵانە ئەوی عومریان چاردە ساڵانە، تازە دەگاتێ
لە خۆیان بدەن حونەر و غیرەت و زاتێ
خۆشەویستی وەفایە دەیبەنە دەرێ لە وڵاتێ.

٣٨

مێر بەغوربەتی فرمێسکی دەهات لە چاوە
هەر جارێکی بەغوربەتی ئاورِی دەداوە
شارەکەی مەغریب زەمینێ لە کۆرِەی گریانێیان دەداوە.
کەیخودایان دەیانگوت: چبکەین بێ دەسەڵاتین، دەستمان بەستراوە
سەڵای گەورە و گرانم لێ رِابوو، بەجارێک دینمان نەماوە.

٣٩

دەستی بەسنگی دەگرت و لە مامۆستاکەی دەکردەوە سڵاوە
مێر دەیگوت: مامۆستا سەت جار دەستی منت بەدامانە
وەختی وەفایە بێتەوە لەو سەفەری گەورە و گران و بەدبەختانە
وەفا پادشایە، لەسەری دەفرِن پۆلێک باز و لە دامێنی دەفرِن پۆلێک تەرِلانە
بلێ: مێر خوداحافیزی کرد. سەڵام لێ رِابوو وەختی دەست لێک بەردانە
ژن و منداڵی مەغریبێ دەیانداوە لە شین و گریانە.

٤٠

بۆت بەچیایە مەغلوبیان هەڵدەلێم، سەری بەنیستێیە و بنی بە تاوە
سەڵای گەورە و گرانم لێ رِابوو کەسم لە ماڵە باوانی نەماوە
خۆشەویستی وەفایە و لە مەغریب زەمینێ ئەسیر کراوە.

٤١

بۆت بەچیایە مەغلوبیان هەڵدەڵێم و دەڕوانمەوە بەری بەدەنێ
زەینەکەی خۆم دەدەمەوە وڵاتەکەی خەتا و خوتەنێ
مێریان بەیەخسیر برد و وەفا دەمێنێتەوە بەتەنێ.

٤٢

بۆت بەچیایە مەغلوبیان هەڵدەڵێم و بەهارە وەختی سونبول و هەڵاڵ
و بەیبوون و گیاخاوە
سەفەری زۆر گەورە و گرانە، نازانم لە چ جێیەک بەجێ ماوە
لە هەموو جێگایەک داد و هاوار و قاوە
دەڵێن: خۆشەویستی وەفایە لە مەغریب زەمینێ ئەسیر کراوە.

٤٣

بەهارە، ئەمن بەو بەهارەی ناکەمەوە متمانێ
لە خەڵکی شین دەبۆوە هەڵاڵ و بەیبوون و گیا خاو، لە من گوڵە گاگرۆیان
بەمانگی نیسانێ
ئەمن ئێخسیرم دەڕۆم، ئەمما کەس بەخەبەری وەفا نازانێ
ئەجەل دایمە لە پیاوی دەگەڕێ، دەترسم نەمابێ بە مانێ.

٤٤

بەهارە، ئەمن بەو بەهارەی قەت ناڵێم بەهارە
لە خەڵکی شین دەبۆوە هەڵاڵ و بەیبوون، لە باغی مەغریبێ گوڵی سێوی
خوسارە
لە منی قەلەندەری بابان وێران گوڵە گاگرۆیان سەر دەکەنەوە لارە
ڕێگای ساڵێک خەبەری هەموو کەسێک هەیە، ئەمما بەخودای خەبەری
وەفا زۆر نادیارە
زۆر دەترسم بەدوای ئەجەل بووبێتەوە گرفتارە.

٤٥

بەهارە، لە خەڵکی بەهارە لە من ناتەواوە
لە خەڵکی شین دەبۆوە هەڵاڵ و بەیبوون و شلکە گیاخاوە
لە منی قەڵەندەری بابان وێران گوڵە گاگرۆ(گەگرۆ)یان دەم
بەگڵیەوە ناوە
سەڵای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، پێم وایە وەفا نەماوە.

٤٦

دەیگوت: مامۆستا وەفا سوار بووە لە وڵاغێکی ڕەش کوێتی کەفەڵ
پانە
تازە هاتۆتەوە لە حیجازێ، زیارەتی وی زۆر دەرمانە.
بڵێ: جا چۆن شانت هەڵدەگرێ دانیشی لە نێو پیاوانە؟
دەزگیرانی تۆیان ئێخسیر کرد و بردیان بۆ فەرەنگستانە.

٤٧

کاسپان، جووتێران، جووتیان بەرنەوە سەر کووپەڵەی دەخمخانە
شل و مل و سایە گەردنان ببڕن زنجیرەی زوڵفانە
کەیخودایان بگرین وەک کەسێکی[٩] تازە مردوویان هەڵگیرابێ لەبەر
دەستانە.

٤٨

خەبەریان دا بە کەیخودایان، هاتنە خوارێ سێ و دووە
هەموو خەمناکن پاکی دەڵێی مردوویان لێ مردووە
بێ دەسەڵاتن، دەڵێن: مێریان بە یەخسیر بردووە.

٤٩

بەخانم و خاتوون بڵێن: چیدیکە نەکەنەوە ئەو بەرە و بەرو هەڵبەز
هەڵبەزی

بێنه سەر خمخانە، لە خمی نێن لفکە و کۆچکە و کەزی
ئەوە دڵی مێریّ لە مەملەکەتەکەی فەرِەنگستان دەڕزیّ.

٥٠

جوابێکم بۆ بەرنە ماڵە بابی جوابێکم بۆ بەرنە ماڵە باوانیّ
نەڕۆن، نەترسێن، وەفا ئەگەر بێتو ئەو دەردە بزانیّ
وەفا وە دوای من دەکەوی، بابم لە جێگای خۆی دانیّ.

٥١

بڵێن بە مەلایان: چیدیکە نەچنەوە قوتابخانە
فەقێیان، میرزایان، مەدەرسە بکەنەوە وێرانە
جا چۆن موسوڵمان یەخسیر بکریّ و یەخسیری دەستی کافرانە؟

٥٢

ئەوە مێر بەشانی ڕاستەیدا ئاوری دەداوە و گەردنی هەڵدەهێناوە(١٠)
دەیگوت: لە دڵێکە من گەڕێن چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە و
چەندی لە کاوە کاوە
خەمی ئەوەمە ئەگەر وەفا هاتەوە، دەڵێن: مێر نەماوە.
ئەویش زۆری عەزیەت و عازاب و سەخڵەتی و ساغاوی دەگەڵ من کێشاوە
دەترسم دڵی گەرد بگریّ و خەمناک بیّ ئەو شیرن لاوە.

٥٣

مامۆستای دەهاتە پێشیّ، دەیگوت: چبکەم؟ بیّ دەسەڵاتم، دەسەڵاتم نییە
دەنا نەمدەهێشت مێر ئەسیرکەن ببەن بە یەخسیرییە
چبکەم وەفا بیّ خەبەرە و هیچ خەبەری نییە
قەستەم بەوەی کەم بیّ مەکانە
ئەگەر بتبەن بۆ تەرکە و تورکومانە
خاترجەم دەتبەن بۆ خاکی فەرِەنگستانە

خەبەردار دەبن تەواوی موسوڵمانە
دەست هەڵناگرن خاتر جەم بە ئەی جانانە.

٥٤

وەفا دێتەوە لە حەجێ، نیزیک بۆتەوە لە مەملەکەتی خۆی، خەڵک دەچنە زیارەتێ.
وەفا کوتی: لازم نییە بێنە زیارەتێ، زیارەتی من بەکەس قەبووڵ نییە
مێرو و نەهێشتبایە بیبەن، زیارەتی من چییە؟
سەرێ من بێ بەقوربانی بەژنێ باریک و دوو چاوی بەنگییە
یەخسیریان کرد بردیانێ بۆ وڵاتەکەی غەیرەدین و فەڕەنگییە.

٥٥

دایکی کوتی: ڕۆڵە چ نەبووە، چ نەکراوە، خەمناک مەبە چ نەقەوماوە
مەغریب زەمین چۆل نەبووە، هەر وەک خۆی ماوە
کیژێ شل و مل و سایەگەردن ئێخسیر کراوە.
ئەمن شەرتم کردووە، قەستەم بەوەی ئەگەر بێ مەکانە
عەرز و عاسمانی بەبێ تەناف دانا
سەرداری دڵت بە، هەتا خلاس دەبێ خاکی ئیسلامە.
دایکی دەڵێ، کوتی: ڕۆڵە ئەتۆ سەر بدە کەسێکی ئەگەر مەزرا و زەمین دەکێڵێ
جا پیاو بۆ عافرەتێک سەت و بیست و چوار هەزار ماڵ بەجێ دێڵێ؟
ڕۆڵە ئەتۆ تازە هاتوویەوە لە غوربەتێ، سەری دایکێ خۆت بێتەوە بەقوربانی سەرییە
ئامانەتت بێ وەیسەلقەرەنییە
دەستی منت داوێن بێ کاری کردن نییە.

٥٦

ڕۆڵە قسەی دایک بۆ کوڕ یەکجار زۆر تەواوە
نۆ مانگ و نۆ ڕۆژم لە سەرت کێشاوە

شیری سپیم بە تۆ داوە
شیری مەمکەکانم حەڵاڵت بێ، نەچی؛ چ قەوماوە؟
لە بۆت هەڵدەبەستم جیسر و لە دامێنی بەحران بگەڕێ گەمییە
دوازدە هەزار سوارت بۆ سازدەکەم پاکی بڵێن: ئەوە وڵاغیان
بۆرە و سپییە
لە بۆت دێنم کچی پادشای سەفییە
سەفەری هات و نەهاتە فرزەندە کاری کردن نییە.
ئەو کارە لە عاقڵی هیچ کەس نایە
تازە بابت گرتوویە دەردی مەرگ و دەردی موفاجایە
میراتی بۆ تۆ بەجێ ماوە، لەبەر حوکماتێ کەس هەڵنایە
بۆ لە تۆ وایە دنیا هەر مێری خواجە حەسەنی تێدایە؟

٥٧

بەمەغریب زەمینێ بڵێن کەیخودایان عوزەرایان وەزیران بگرن
جەماتێ
بۆ وەفا پکەنەوە دەرکی حوکماتێ
مبارەک بێ پادشایەتی، ڕۆڵە خودا دەتداتێ.
سەری دایە خۆت ببێتەوە بەقوربانی سەرییە
بێ پادشایەتی بەدبەختییە
ئەوە مەغریب زەمین پادشای نییە
دەڵێن: جێیەکی بێ پادشابێ، کەس تەڵاقی نییە[11].
بەقا مەکە بەوان شل و ملی ئەگەر تازە دەگاتێ
دانیشە لەسەر حوکم و حوکماتێ
بێنە بەر دەس خۆت حوکمات و دەسەڵاتێ
هەچی پادشای لە دنیا دایە، هەموو کەس کچی خۆیت دەداتێ.

٥٨

وەفا دەیگوت: دایە قەستەم بەوەی کەم ئەگەر بیناهی چاوە
بێ عاقڵم، عاقڵ و ئیختیارم لە دەست خۆمدا نەماوە
پاکی بەدەستی مێرییە ئەگەر حەفس کراوە
سەت داخ و موخافەتی ئەوە دەمکوژێ، ئەگەر دەڵێن دەزگیرانی
وەفا بە یەخسیر براوە.
قەستەم بەو خودایەی کەم ئەگەر بەتەنێ
زەینی خۆم داوەتە ڕندۆڵی[١٢] کوێستانان، هەڵاڵ و بەیبوون و گیابەند
و خاو تازە دەگەنێ
دەست لە مێرێ هەڵناگرم هەتا مەعموری میران نەمبەنەوە ماڵۆکەکەی بەتەنێ
جا توخڵا کافر قەت موسوڵمانی دەدەنێ؟

٥٩

کوتی: ڕۆڵە سەری منت بێتەوە بەقوربانی سەرییە
دانەنیشی بە خەمناکی و بە دڵبریندارییە
شۆرەتت بڕوا بڵێن: لە نەکاو پادشا مردووە و وەفا ئاگای لە خۆی نییە
بڵێن: بەخولای بێ عەقڵە جا عافرەتێکی خوێڕی چییە؟

٦٠

کوتی: دایە چ بکەم ئاخر دڵم بەدەستی وی بەستراوە
ئەویش دڵی منی بەئامانەتی بە پەرییان داوە
بەندی ئەو دڵە ناکرێتەوە تا نەبینم بەژنێ باریک و ئەو بەڵەک چاوە.
قەستەم بەوەی کەم ئەگەر بێ مەکانە
سبحەینێ ئەمن لە مەغریب زەمینێ بەجێ دێڵم وەسێتنامە و عاقڵ و فامە
وە دوای دەکەوم هەتا ئیختیاری دڵ و کامە.

٦١

دایکی دوو ڕەکاعەتی سوننەت دەکرد و بەرەو قوبلە ڕادەوەستاوە
دەیگوت: کەس ئیختیاری تۆی نییە و کەس ئیختیاری دە دەستدا
نەماوە
چون بە کفلەکونێک ئەو دنیایەت سەرانسەر داناوە
بەحوکمی تۆیە ڕووناکە بیناهی ئەو دوو چاوە
سبحەینێ بلێن: وەفا بۆنی نییە و لەسەر ڕەنگی خۆی نەماوە
بەڵکو نەیناسێتەوە بەژنێکە باریک و بەلەک چاوە.
شەوێ نەنوست تا سبحەینێ دەبێتە بەری بەیانی
ئەو ڕووی کرد لە دەرگای ڕەحیم و ڕەحمانی
هەتا وەفا نەچێ بۆ سەفەری گەورە و گرانی.

٦٢

مێریان کە دەبرد، لە ڕێگایە تووشی پیرێژنێکی بوو، کوتی:
داپیرە مەزڵت ئێرەیە و بەڵکو مەزڵی بە ئەسەحییە
سەری مێرێت ببێتەوە بەقوربانی سەرییە
ئەتۆ شەرمێک بکە لە سەری خۆت ئەگەر سەرت سپییە
سوارێک دێ نە لە گوێن کەسە و کەسی لە گوێن نییە
سوار بووە لە ولاغێکی ڕەش، کوێتێ شێر خەزاڵییە
عەسڵە بەحرییە و ولاغەکەی عەرەبییە
سەقاوی[١٣] ئاوزەنگی لەعلی ڕوممان و یاقووتی عەبدولحەسەن و زێڕی
سپییە
لە شانی دایە ڕمبێکی دەم ڕەشی هەژدە قەفییە[١٤]
لە خوێنی نەکرد و لێی دەتکێ دلۆپی دەخوێنییە
لە پێی دایە جووتێک چەکمەی سمایل نامەی وەستا نەسیرییە

لە بەری دایە خەنجەرێکی دەم ڕەشی دەسک نێرۆییە
لەسەری داوە پۆلێک پەڕی تاووس، گەواڵ گەواڵیانە[١٥] دەگەڵ ساو و هەورییە
هانێ لە کنت بێ بەئامانەت چل و پێنج ئەشرەفییە
ئەگە هات منت بمرم بانگی کە بە دیانەت و بە میوانییە.
بلێ: بۆ وا هەڵوەدای بۆ وا هیچ عاقڵت لە کن خۆت نییە
ئەگە کوتی: چکارت بە منە؟ هیچ کارت بە من نییە.
بلێ: ڕاستی دڵی خۆت بلێ، تا بتدەمێ خەبەری ئەسەحییە.
چەند ڕۆژ لەوەی پێش لەشکرێکی گەورە و گران هات، دەگەڵیان بوو کیژێکی بەلەک زەرد و سوور و سپییە
وەک کووزەڵەی نێو کانییە
ئەویش وەک تۆ دێوانە بوو، هیچ ئاگای لە خۆی نییە.
دەیگوت: ئێخسیر کراوم، دەمبەن بە یەخسیرییە.

٦٣

داپیرە سەت جار دەستی منت بەدامێن بێ لە یادی نەکەی، نەچێ لە بیرت
سەت ڕەحمەت لە خۆت و سەت ڕەحمەت لە شیرت
منداڵم تازە دەگەمێ، ئافەرین بۆ فکر و ڕا و تەگبیرت.

٦٤

هات وەفا گەیشتە وێ، پیرێژن بانگی دەکا:
سوارە، ئەرێ سوارەکەی ئەسپە خڕی[١٦]
ئەتۆ دێوانە بووی، دەڵێی کۆتری هەڵدەفڕی
چۆلی و بەڕی و دەشتی دەبڕی
خۆزگەم کاتەوە بەو دایکەی ئەگەر تۆی دەبییەوە بە کوڕی.

ڕۆژ درەنگە سوارەکەی ساحێب متمانە
سەری داپیرەی خۆت ببێتەوە بەقوربانە
حەزدەکەم لێرە بەوڵاغت بگرێوە وچانە
لە داپیرەی خۆت ببیەوە بە میوانە
وڵاغت ئیسڕاحەت دەکا، بۆ خۆت پخۆی پارویێک نانە.

٦٥

ئەی لە داپیرەم چەند مێهرەبان و چاکە
پیریش بووە، کوڵمەی دەڵێی سەر گوڵی مێلاقە
ئەی خۆزگەم کاتەوە بەو کوڕە ئەگەر تۆی دەبیەوە بە دایکە.
داپیرە سەری منت بێتەوە بەقوربانی سەرییە
ڕێگام دوورە، وەختی دابەزینم نییە.

٦٦

دەیگوت: جا ڕۆڵە لە کنە منە خەبەری بە ئەسەحییە
ئەمن دەرمان دەکەم جێگای تیری غەیبییە.
دیگوت: ڕۆڵە بەوەی کەم ئەگەر پەروەردگارە
کیژێک هات زۆر لە تۆ زیاتر دڵی بریندارە
دایمە چاوەڕێیە و ئینتیزارە
یەگجار زۆر دڵی پڕ لە خەم، لە هاوارە
داپیرەت بەقوربان بێ، بۆ خۆم دیم، هەتا دەتوانی لە وڵاغت ببەوە
سوارە
نە بۆخۆت ئیسراحەت بکە و نەبە مەرکەبت بگرەوە قەرارە
چومکی ئارامی دڵی تۆ یەخسیری کوففارە
بەڵکو خوداوەندی میری مەزن پێک بێنێتەوە ئەو کاروبارە.

٦٧

پیاوێکی زۆر شۆخ و شەنگی
کاران پکە بە مەبخی[١٧] و بە بێ دەنگی
زوو خۆت بگەینە سێ قەڵاتی فەرەنگی.
دەستی منت دامێن بێ، چل سوارەی غەیبی بن بە ئاواڵت، دەگەڵت
بگرنەوە قەرارە
چومکە هەرتکتان عاشقن، ئیسلامن، هەرتک دڵوو بریندارە
چانییە ئەگەر چاوی پێت کەوت موتمەئینت دەبێ، دەڵێ: ئەوە یارە.
هەمیشە دڵی لە ئامان و داد و هاوارە
چومکە غەریبە یەخسیر و بێ ئیختیارە.

٦٨

پێی لە ڕکێفی مایەنی شێر خەزاڵی دەنا،
بیسمیللاهە ڕڕەحمانە ڕڕەحیم، تا بزانین چۆن پێک دێ ئەو کارە
سەقاوی ئاوزەنگیی زێڕە و قەڵتاغی زینی سەدەفکارە.
ئەوە وەڕێ دەکەوێ.

٦٩

دەڵێ خودایە لە نەکاوە هەچی بەسەرم هات بەسەرم هاتی
ئەتۆ پادشای ڕووناکیی و زوڵماتی
تەنگی ڕێگایەم زوو بۆ بکێشی، بگەمە شاری سێ قەڵاتی.
خودایەکی ئەزەلی و ئەبەدییە
نە لە ڕەنگی کەسە و کەسی لە ڕەنگی نییە
ڕەفیقم بن خدر و ئەلیاسی غاییبییە
چومکە هیچ کەس لە من زیاتر دڵی بریندار نییە.

٧٠

کێ بوو لە کاکە وەفای دەگوڵباوە
لە زاری مەرکەیی دەکرد ددانە لغاوە
دەیگوت: داپیرە مۆئمینی، دوعای بەڕۆحمم بۆ بکە دەوڵەت زیاد
و ماڵ ئاوا.

٧١

بەوەی کەم ئەگەر ئەبەدییە
ئەمن ناشوناسم، لەو شارە شوناسم کەس نییە
بێ ئیحتیبارم، ئیحتیبارم نییە لە دەستییە
خاترجەم بە، ناموسم ئی تۆ نییە
ئەوە ئی وەفایە، هەڵم گرتووە بەئامانەتییە.

٧٢

کوڕە دەستی منت دامێن بێ لێت دەپاڕێمەوە بەناڵان
خەزینەی خۆم ناکەم تاڵان
ببمە سەر کۆیلەی[١٩] منداڵان
بۆ سەرزەنیشتی مام و خاڵان.

٧٣

سەرفی نەزەرم لێ پکە
بەقسەی دڵتم دەگەڵ مەکە
بەدبەختی خۆت نازڵ مەکە.
خەزێنەی من تاڵان مەکە.
ناموسم بەیداغی ڕۆمییانە
دەچنە بنی بەندیخانە[٢٠]

سەت جار بڵێن: حەفسی گرانە
نەجاتی دەبێ جانانە
ئامانەتی من سوڵتانە
ساحێبی شاهی شاهانە
بت و لات و عەززا جانە
تۆ بەچت هەیە متمانە؟
پاکم لە کن ئەتۆ دانا
ئەمن ببەخشە ئەی گیانە.

٧٤

کوتی: زولفت قۆپەنی[٢١] ڕیحانە
سەری منت بێ بە قوربانە
ئەوە چییە ئەو داد و فیغانە
شین و واوەیلا و گریانە؟
ئەمن پادشام شاهە نشام
دارای قسمەتێکی دنیام
بەبت و لات و عەززا قەستەم
بەخاڵی مەمک و بە پەرچەم
لەگەڵ تۆمە چاو و دیدەم
بەخۆم نییە دەستت بۆ دەبەم.

٧٥

ئەگەر دەپرسی ئەحواڵم
دەردەدار وجگەر تاڵم.
ماڵ و دەوڵەتم من ناوێ
سەبارەت بەگەردنی لاوێ

زۆرت لەسەر ئەمن چووە
لەشکر ئەگەر هات و ڕابردووە.
ئەگەر هاتبووی و دەخوڕی
زاڵم بووی زگت دەدڕی
ئێک و دووازدە ئەمنت بەزێڕ کڕی.
ئیشتیبات کرد ئەریٚ جانە
ئەو دنیایە لە من وێرانە
سوێندم خواردووە بەقورعانە
بەبێ وەفا نامەویٚ ژیانە.
پادشای و ساحێب ئیختیاری
تۆ گەورەی، دایمە موختاری
هەم خونکاری[٢٢] و هەم سەرداری
دەست هەڵگبرە بۆ تۆ دەبێ یاری.
سەری منت بێ بەقوربانی سەرییە
خاتری عیسایی و ڕوحانییە
خاترجەم بۆ تۆ ژن قات نییە.
چومکی عومری من بیست ساڵە
دڵی من مەخە بە ناڵە
غەریبم ئەحواڵم تاڵە.
منت بمرم مەبە شەریکی ئەو بەشە
بەعیسای مریەمم ببەخشە.

٧٦

کوتی: کیژیٚ گەردنت دەڵێی بلوورە
فکر بکە غیرەتت زۆر جەسوورە
هەفتێکت ماوە، وەختت دوورە.

٧٧

وەفا هات داخلّی سێ قەلاتی فەرەنگ بوو.
ئەوی ئاشقن خۆش دەکولّێن
خۆش دەکولّێن وەکوو مەنجەلّ
وەک مەنجەلّی ئاور لە بن
شل و مل و سایە گەردن
تێک رژابوون چەن کچ و ژن
خان و بەگلەر هێدی و هێمن
نێرگز و هەلاڵە و بەیبوون و سوێسن.

٧٨

دەگەلّی دێن بۆ سەر حەوزی باغی، ئێک تاقە پیاویان دەگەلّ نییە
ئەگەر چاوی پێکەوت ئەوە لە دەروازەی باغییە(٢٣).

٧٩

جا کوتی: کیژێ کیژێ کیژی کێیە
سەری منت ببێتەوە بەقوربانی سەرێیە
غەریبم دلّم نانیشتەجێیە
لێم وەدە ئاوڕی بەخێرێیە
ئەو کیژەی کێیە دەچێتەوە بۆ سەر حەوزێیە؟
بەچاوت بازی و بەئەبرۆت سەقری
بەنازت جەیرانی و بەرۆینت کۆتری
نەجیبی، شل و ملی، زۆر نادری
هەزار خان و خانزادەت لەبەر لەنجە و لاری مری
پۆڕی بەلّەک داوت ناوەتەوە دلّی پادشایانی پێ دەگری.
چاوت بەمن بمێنێ بەئەستێرەکەی ڕۆژێ،

پەرچەمت بە من بمێنێ بە ڕەشە ڕیحانە
کیژێ ئاوڕی بەخێرێم وێدە ئەمن دەردم زۆر گرانە
وە بیرت نایە قەول و قەرار و نام و نیشانە؟
وە بیرت نایە لە کانی شێخان هەرکمان دەمانکرد تەمەننایە
هەرتک دڵمان دە بۆوە فەنافیللایە
هەرتکمان دەمانگرت دەرگای ئیللایە؟
ئەمن هەمان کەسم ئەگەر پێکەوە دەچووینەوە مەدرەسە و مەکتەبخانە
ڕووحمان تێکەڵ بوو، دەیانگوت: بە قالب دووانە.
بەجێم هێشتووە حوکمات و حوکمەتی پادشاهانە
شێتم، لە دوای تۆ بووم بە دێوانە.
کوتم: نەوەکو وەفا بڵێن پیاوێکی نامەردە
بۆ وا بێ ئیلتیفاتی لە جەرگت داووم زەرگە
ڕۆژێ حەوت کەڕەتم وە پێش تۆ کەوێ مەرگە.
لێمان گران مەکە ئەحواڵ و دەردە
با تۆ دابنیشی لە کۆشک و شانشینی و سەراو پەردە

٨٠

کوتی: کیژێ مەجەلی خولای دەگەڕێن، مەجەل دێنەوە وەختی چێشتانێ
چاوت بەمن بمێنێ بەئەستێرەی ڕۆژێ، کوڵمەت بەمن بمێنێ بە سوور گوڵی کوێستانێ
کوڕە بەقالان خۆیان لێ هاویشتوومە ئەوبەر ئەوبەری دووکانێ
ئەتۆ ئەوە دەچیەوە بۆ حوکمات و بۆ دیوانێ
ئەمن بەتەنێ بەجێ دێڵی، کەس بەو دەردی گرانی من نازانێ
وە بیرت نایە ئەتۆ کوڕ بووی، بەدوعای من لەسەر سنگت خڕ بوو جووتێک فینجان و ئیستیکانێ

مەجەلی خولای دەگەڕێن، هاتۆتە وەختی بانگی ئێوارێ
ئاوڕ بدەوە لە کەسێکی فەقیر بێ، پاش دەستی تۆ بێ، فەقیر و هەژارێ
چاوت بەمن بمێنێ بەئەستێرەی زۆرە و موشتەری، کوڵمەت بەمن
بمێنێ بەگوڵی هەنارێ
مەبارەکت بێ ئیستراحەتی حەوز و کانی و ڕووبارێ
ئەرێ ئاوڕی بەخێرێم بۆ وێنادەی ئەرێ یارێ؟
سەری منت بێتەوە بەقوربانی سەرییە
ئەمن تەختی پادشاییم بەجێ هێشتییە
ئەلعان مەغریب زەمین ساحێبی نییە
سەبارەت بە بەژنی باریک و دوو چاوی بەنگییە.
دەمرمەوە دەبەر شاکەزیانت لەسەر گراوی[٢٤] پانیەت دەکاتەوە شەڕێ
ئاوڕی بەخێرێم وێدە، نەختێک گەردنت وەرگەڕێ
کوڵمەت بەمن بمێنێتەوە بەشۆق و ڕەونەقی گوڵی سێوەڕێ.

٨١

مێر پێی دەڵێ: لاوژە جەرگت بۆ وا لەت لەتە
بۆسۆی دەروونت بۆ وا بەشیددەتە؟
مێر بۆتە گەنجی خەزێنەی خوسرەوی، دیارە زۆر بەقیمەتە.
مەسووتێ، مەبرژێ بەتەنێ، قەستەم بەدڵی ئەو ئاشقانەی ئەگەر تازە
دەگەنێ
یایداشتت[٢٥] دەکەم، شەوێ خەبەرێکت بدەنێ.
لاوە منت بمرم وا ئینتیزاری و دڵ بریندارى
یان نەخۆشی گازی ماری
پێم بڵێ: ئیسلامی یان کوففاری؟
ئەرێ لاوەکەی لەسەر ڕێگا ڕاوەستاوە
بۆسۆی دەروونت دێت و قرچەی جەرگت بووە بڵاوە

ئەمن هیچ هێزم نەماوە لە جەرگ و لە هەناوە
فەقیری، لەسەر ڕێگای(ڕێی) خۆت دابنیشە، ئەلعان ناکرێ دەنا
جووابی تۆم دەداوە
نەبادا مەعموری پادشایی بزانن ڕووحت بکەنەوە خلاس و تەواوە.

٨٢

ئەرێ لاوەکەی غەریب و بێ کەس و کەست نییە
چاوپێکەوتنی من بۆ تۆ ئارامی دڵییە
شێتی، دێوانەی، هیچ ئاگات لە خۆت نییە
ئەگەر نەمرم شەوێ دەتدەمێ خەبەری بەئەسەحییە
ڕێگای قسەکردن ئی تۆ دەگەڵ ئەمن نییە
چونکە ئەمن دەزگیرانی پادشام و تۆ فەقیری، هیچت نییە
نەبادا حاڵی بن، بتخەنە بەندیخانە و حەفسییە
زۆر دەترسم لە ڕۆژی قیامەتێ ئەگەر خوداوەندی میری مەزن لە
من بگرێ ئیعتیراز و بۆ من ببێتە بەدبەختی و نەدامەتییە
دەبرۆ گیر مەبە، ڕێی تۆ نییە
قسەت دەگەڵ من چیدیکە نییە.

٨٣

دەڵێ: کیژەکەی چاو بەنگییە
سەری منت بێتەوە بەقوربانی سینگی سپییە
دێوانەم، شێتم، خەوم نییە
تۆ ئەوە کەم ئەگەر ئەزەلی و ئەبەدییە
شەوێ بمدەیە خەبەری بەئەسەحییە
با نەمرم لە حسرەتان بێتە سەرت قەتڵ و نەدامەتییە
ئەوە لە تۆم هەیە خوداحافیزییە

سەرگەردانم، بابمێنمەوە بەسارەوانی و بەغەریبییە
خۆ کەس نازانێ بڵێن: ئەوە وەفایە و پادشای تەختییە.
بڵێن: تەختی بەجێ هێشتووە و دەردەداری دڵییە.

٨٤

سڵاوی لێ کرد: شاهی شەهەنشا
ڕوخسەتم بدا بچم بۆ سەحرا
بدەم بەسەردا لەچکەی پەشمینە
بچم بۆ سەحرا دنیا ڕەنگینە
چومکە غەریبم زۆر دەردەدارم
خاتر پەشێوم من لێو بەبارم.
ئیجازەم بدەی بچم بۆ سەحرا
لە بەدەنم بدا سەدایی شوبا
زۆر نارەحەتم شاهی شەهەنشا
بەڵکو ئەو دەردەم بچێ بەفەنا.
ڕوخسەتم بدا شاهی حوکماتدیار
بچم بۆ سەحرا دنیای سەبزەوار
بەڵکو خەمناکیم بەوەی بیهێ چار.
حەکیم و لوقمان هەتا چازانان
چەن دەوا و حیساب دەگەڵ دەرمانان
ئەگەر بمدەنێ سێسەت چازانان
نابێ بەقەترێک شوبای بەیانان.
قەدەمی(٢٦) سەحرا دەرد پەڕێنە، لێم بدا شوبا
ئەگەر گەدابی دەبی بە پادشا
ئەگەر سبحەینان لێت بدا شوبا.
وام عەرز کردی ساحێب ئیختیاری

حوکم ڕەوانی چونکە سەرداری
لەنێو پادشایان حوکم دیاری
با دانەنیشم بە دەردەداری
با نەیکەم بە گریان، شیوەن و زاری.

٨٥

کیژێ بۆ تیرت داوم لە هەناوە(٢٧)؟
عاقڵ و هۆشم لە کەللەیدا نەماوە
بۆ ئاورت لە دەروونم بەرداوە؟
نازانی مەغریب زەمین حوکماتی بە یەخسیری بەجێ ماوە؟
بۆ بێ قابیلەتم، قابیلەتم نییە؟
سەری منت بێ بە قوربانی مەمکانت، لە دووجێ کراسییان دڕییە
کوزەڵەی دەراوی(٢٨) کانییە
بۆ خۆت سەنتەنەتی، بۆ ئاگات لە دەردی من نییە؟
ئەمن وەفام، بۆ ڕاتئەسپاردووە: خێر وەفا نییە؟
لەسەر تۆم بووم دوچاری نەهاتی و بەدبەختییە
دوعای دایکمە، نەماوم لەسەر بۆن و ڕەنگییە.

٨٦

پیرێژن بەوەفای گوت:
لاوەکەی هیچ نەزانی
خەڵک بەڕانک و چۆغەی بۆرەکە، دەچێتە سەرەڕێی کچی شوانی
شەرت ئەوەیە ڕێگا بگری بەبووکی خانی.
تەماتە تۆ ڕاییبوێری بە هەناسە ساردی و بە فەقیری؟
خەڵکی بە ڕانک و چۆغەی بۆرەکە دەچێتە سەر ڕێگای کچی فەقیری
شەرت ئەوەیە ڕێگا بگری بەبووکی میری.

بە گوفتوگۆت دەڵێی کەو باڕی[٢٩]
شەرت ئەوەیە ڕێگا بگری بە بووکی قەراڵی
غیرەتی وەبەر دەنێ پیرێژن، مێر ئەسپاردوویە و فێری کردووە[٣٠].

٨٧

بەوەی کەم ئەگەر ئەبەدییە
خەلقی کردووە تەواوی قەفەزی ڕووحییە
پێم وایە تۆ عیلمداری، قسەم دەگەڵ دەکەی بە ساحیرییە
ئەتۆ دەڵێی: وەفامە. ئەمما ئەمن دەڵێم: وەفا نییە.
وەفا دەپێی دایە جووتێک چەکمەی سمایل نامەی وەستا نەسیرییە
سوار دەبێ لە وڵاغێکی ڕەش کوێتی شێر خەزاڵییە
وڵاغەکەی سم تەبەقە، عەسڵە بەحرییە
یەک یەک دەڵێن: قەباڵەی هەیە، خێر، ئەو وڵاغە عەرەبییە.
وەفا دەشانی دایە ڕمبێکی دەمڕەشی هەژدە قەفییە
پادشای مەغریبێیە، خۆ سوواعبەت نییە.
لە خوێنی نەکرد و لە دەمی ڕمبی دەتکێ دڵۆپی خوێنییە
ئارامی دڵمە، کەس ئاگای لە دڵی من نییە
سەڵای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، وەفا لە من قاتییە.
لەبەری دایە خەنجەرێکی دەمڕەشی دەسک نێرۆییە
زۆر بەقیمەتە، لە خەزێنەی چ دەوڵەتێکدا نییە
نۆ گۆی لە خەنجەریە، پاکی بەدری بەحرییە.
ئاوزەنگی وەفا لەعلی ڕوممانە و یاقووتی عەبدولحەسەنە و زێڕی سپییە.
ئەگەر سوار دەبێ لە وڵاغی، هەی ڕمبی بەدوور بێ لە چاوی بەدییە
ئامانەتی بێ خدر و ئەلیاسی غاییبییە
دوعای بەخێرێی بۆ بکا وەیسەلقەرەنییە
چ بکەم وەفا لە من قاتییە.

٨٨

کیژەکەی دەمەرزینگان

زولفت لە من دێنێ ئاورینگان

ئەی بە وەزن سووکی بە قیمەت گران

ئەمنت بمەوە بە قوربانی خاڵی ماعبەینی هەرتک مەمکان

ئەو بەرە و بەریان گرتووە، وەکو سوارە گرتوویانە سان

وەکو کەسێکی تاقانە بێ، بگرێ دەردێکی گەورە و گران

چاوی بە خاڵی مەمکان بکەوێ، بۆوی دەبێ بە لوقمان و بە دەرمان.

هەچ جارێکی ئەگەر بە ناز بۆم هەڵدێنی گۆشەی چاوە

خەدەنگی بەشیددەتت وا لە جەرگم داوە

کەللەی سەرم دەکوڵێ، ئاورت بەرداوم لە هەناوە

ئەمن وەفام، بۆچی دەڵێی: «وەفا لەسەر ئەو دونیایەی نەماوە»؟

ئەمنت دەمرمەوە لەبەر شازولفی دەچین چینی

لەبەر کولمە شەمامەی حەوت ڕەنگی ڕەنگینی

لەبەر لەنجە و لارت، چەند شیرن و نازەنینی

چۆن ئێستا ئەمن وەفا نیم وا بە بەدبەختیم دەبینی؟

ئامبازی[٣١] زیندانم مەکە وەکو کاکە مەم و خاتووزینی

بریندارم بەگورگاوڕ، دەرمانی پکە برینی.

٨٩

مێر کوتی: چ بکەم جێگاکە چۆل نییە و مەبخی نییە

دەنا وەفا خاڵێکی ڕەشی لەسەر شانییە

قەستەم بەوەی ئەگەر ئەبەدییە

ئەگەر ئەو خاڵە ببینم هیچ خەمم ئیدی لە دونیایەدا نییە

بڕۆ بابم ئەتۆ بێ ئیختیاری، بڕۆ کاری خۆت ببینە

عاشقی دڵ کاری تۆ نییە، ئەو زەحمەت و تینە

کێ نسحەتی کردی، کوتی: خۆت بگۆڕە؛ یانی «وەفای مەغریب زەمینە»؟

٩٠

وەفا دەڵێ: کیژەکەی ئارامی دڵانە
بەوەی کەم ئەگەر قادرە و بێ مەکانە
بەردێکی وات لەسەر دڵم دانا
عاقڵی من راجیع بە دەرمانە
با چیدیکە نەژیم بە ژیانە
تۆ ئەمنت داناوە دەڵێی: سواڵکەری کووچانە؟
ئاخر تۆ بە منت نەدا ناوونیشانە؟
یادگارانەت ئەوەتا: لەعلی ڕوممانە
یان ئاشقی کوڕی قەراڵی، بۆیە بەمن ناکەیەوە ئیحتیبار و متمانە؟
ئەگەر بە زەریفیم بدوێنی لە بیرم دەچێ ئەو سەفەری گەورە و گرانە
نەخۆشم، هەڵیان گرتووم بەدەستانە
گوفتوگۆی شیرن بۆ ئەمن دەرمانە
قەناعەتم تا ئەو ڕۆژەی خوداوەندی میری مەزن دەکاتەوە دیوانە
لە من بوویە کەرویشکی گەرمەلانە
ڕاوکەر لە دوات دەکەنەوە ژانە
لێم بوویە سێوی سەر لکان، پێت نابەمەوە هیچ زەفەرانە.

٩١

مێر کوتی: ئەی کەسێکی دنیا لە تۆ چۆلە، هیچ ئاگات لە خۆ نییە
ئەمن ئەوە دەڕۆم بە خوداحافیزییە
فکر دەکەم، بزانم خەبەری سبحەینێت چییە؟
ئەتۆ پادشا بووی، ئەلعان دەتدینم بە گەداییە.

٩٢

وەفا کوتی: سەری منت ببێتەوە بەقوربانی سەرە
ئەمنت ببمەوە بەقوربانی جووتێک لیمۆ ئەگەر دەڵێی گەوهەرە
ئەمن لە خۆم داوە تانووت و حونەرە
بووم بە سارەوان هەتا خەڵکی بڵێن: فەقیر و سواڵکەرە.
هەتا ژانی دڵم بشکێ، چاوم بەتۆ بکەوێ، ئەگەر برینداری دەستی خەنجەرە.

٩٣

پۆلێک هاتوون نەشمیلە
قامک پڕ لە ئەنگوستیلە
عاشق بەوان زەلیلە.
شل و مل و سایە گەردن
تێک ڕژابوون چەند کچ و ژن
چەلەنگە(٣٢)کەیان بدە بە من.
ئەگەر وشتری هانی
هەموو جانی بنی جانی
بەمێرد دەچێ دەزگیرانی
جییاز هات.
سەرین تافتە، دۆشەگ تووکی قوو
پیاوی تێدا بزورگ دەبوو.
زێڕ و زەمبەر و ئەشرەفی بڵاوکراوە
بە کەیفی هەر کەس ئیشعێک دەنێرێ(٣٣)
ئەوشۆ کە ئەگەر بووکە مێرێ
شا وا دەکا: کوڕ نێودێر(٣٤)بێ

فەقیر و هەژار پاکی تێربێ.
زێڕوەشانە و بەخشەندەیە
وەفا ئاگای لەو تەورە هەیە.
وەفا سەری سەودایە
بێ بەش بووم من لەو دنیایە
فکری هیچ بەدڵی دانایە
چون ئەو هەر مەتڵەبیی خودایە
پیاو نابێ هیچ بکا فکرێ
ئەوی خولا نەیکا ڕانابرێ.

٩٤

کوتی: تۆ ئەو خودایەی کە بێ مەکانە
عەرز و عاسمانی بەبێ تەناف دانا
ئەتۆ کافری، بێ بەعسەتی، حاڵی نی لە قسانە
ئامانەتی گڵ پێی ناکا غەیانە
ئەمن خۆشەویستی وەفام، بەهیچ کەس ناکەم متمانە
هەچ کەس تەماح لە ناموسی من بکا، سبحەینێ گۆڕی دەباتەوە گۆڕخانە
وەرە زۆرت لەسەر ئەمن چووە
زۆرت عەزیەت کێشاوە، عەمرت لەوەی ڕابردووە
ئەمن لێت دەکەم تکا و تەکلیف و ئەرجووە
لە من مەکە بەخێرا و درەنگە و زووە
ئامانەتی وەفا بەقسمەتی کەس نەبووە.
ئەمن ڕوحم یەکجار جانفیدایە
قسەی تۆم وەکو با بە گوێی دانایە
نابەخشرێ ئامانەتی وەفایە.

٩٥

ئەو جار دایکی وەفای لەبەر خودای دەپاڕێتەوە، دەڵێ:

پەنام وەبەرتۆ ئەی خودایە

ئەگەر داتناوە عەرز و سەمایە

مور و مەلەخ و سەرپاک ئەو دونیایە

ئاوری جگەر عیلاجی نایە

ئەتۆ ڕوحمێک بکەی بەو غەریبە، بەو وەفایە

خەونم یەگجار زۆر ناخۆشە، دڵم زۆر موفتەلایە

سیلەی ڕوحمت ببێ، دوعام لە وەفا کردووە، پەشیمانم ئەی خودایە.

پەنا بەتۆ ئەی دانای داوەرە

بە کفلەکونێک دنیات ڕۆناوە سەرانسەرە

عەرز و ئاسمان و حەوزی کەوسەرە

مەلاییکەت و قابەقەوسەین و ڕوح لەبەرە

یەگجار وەفا خەمناک و کوێن لەبەرە[٢٥]

ئەتۆ چ دەکەی و چ دەکرێنی

ڕوحمی خودایەتی خۆت بەحەرەکەت دێنی

وەفا بێتەوە سەر ڕەنگ و بۆنی.

٩٦

مێر دەڵێ: ئەوڕۆکە زۆر لەبەر دەماغم خۆشە سۆزەی شوبایە

پەنا و پشتیوانم وە بەر تۆ ئەی خودایە

ئەوی تۆ دەیکەی لە عاقڵی کەس نایە

چونکە کوللی زێڕووحێ، قەفەزی ڕووحی لەبەر دەستی تۆ دایە

ئەوی زیندووە و ئەوی دەچێتە بادی فەنایە

پێم وایە ئەو بۆنە، بۆنی عەتر و عەبیری وەفایە.

ئەو جار نالّێم وەفا نییە
نیوسەعاتی دیکە بژیم، لە من وایە هەزار ساڵ زیندەگانییە
کەس نەڵێ: مێر دەکوژن، وەڵڵا حەفسییە
لەوە زیاتر ئەمن ژیانم بۆ چییە؟
ئەمن نەمبەخشی دیانەت و ئامانەتییە
ناشزانم موقەددەری حەق دەستی ئیلاهی لەسەر چییە؟

٩٧

وەفای چاو پێکەوت.
مێر، وەفای گەییە کنێ
دەستی دەکردە گەردنێ
وەسرەتم نەبڕا لە دنێ.
شوکرانە وەبەر خودایە
چاوم پێی کەوت، وەفایە
سوبحانەڵڵا نەسرومینەڵڵایە
لەبەر موقەددەری ئەو دونیایە.

٩٨

کەونە کێ، کەونە دونیایە
سەرەخۆرەی، بێ بەقایە
چەند جوان، دەستیان پێگرتی،
چەند جوانمێر[٣٦]، دەستیان لێ بەردایە
ئیحتیباری بۆ کەس نییە
عاقیبەت دەچینە فەنایە
کاری تۆ لایەقێتی هەیە
هەر بۆ تۆ حەمد و سەنایە.

هەر ئەتۆی حەننان و مەننان
حەییوم و قەییوم، ڕەحیم و ڕەحمان
وێسپ نەجاتی بوو لە زیندان
یاقوب شاد دەبوو لە کەنهان
عەشمەتت دابوو بە سولەیمان.
موقەددەری تۆیە ڕەحمان
ڕازیم بەحەول و قەوەتت
بەدەریا و بەحر و شەتت
چ بکەم عیلاج نییە
ئاخ! چ بکەم بۆ برایەکی لە دای و بابییە
قاقەزم دەنووسی بۆ موسوڵمانان، ئەو کەسی ساحێبی مەسلەک و دینییە
چ بکەم وەگیرم ناکەوێ خدر و ئەلیاسی غاییب و غەیببییە
ئاخر چ بکەم لە کنم نییە ئەگەر بەباڵ دەفڕن هیچ پەرییە
بۆ خودای نەبێ بۆ هیچ کەس، بێ کەسی چاک نییە.

٩٩

بیسمللاهەڕڕەحمانە ڕڕەحیم
بەقووەتی حەق، کارسازی قەدیم
حەییە، زیندووە، هەرگیز نامرێ
عالم لە عیشیا، هەرچی بکرێ.
سەمیع و بەسیر، دەبیە و دەبینێ
لە دوور و نزیک، لە ژێر زەمینێ.

١٠٠

مێر شەوێ مەلیک شوجاعی، بەقەڵەمبڕێکی چکۆڵە کە لە بن بسکانی شاردبۆوە، دەکوژێ. بۆ خۆشی دەکەوێتە زیندانێ. دێن بیکوژن.

پاشان وەزیران تەگبیریان کرد، کوتیان: تازە بەکوشتنی مێرێ مەلیک شوجاع نابێتەوە، پووڵ و ماڵێکی زۆریشی لەسەر چووە، وا چاکە نێوونیشانی مێرێ بنووسین و عەکس و وێنەی لێ هەڵبگرین و دە مجرێکی نێین و بەئاوێیدا بدەین. ئەو مجرییە وە گیر هەر کەس کەوت، مێر بۆ وی بێ، بەو شەرتەی ئەو خەسارەتەو ئەو خوێنەمان بۆ ببژێرێ.

مجرێکە وەگیر پادشایەکی کەوت، هات مێری بەزەبری ماڵ و دەوڵەت هەستاند و دەگەڵ خۆی برد. ئەوە وەفاشی هەر بەدواوەیە. مێر ئەویشی بەتڵاند، دیسانەکە کەوتەوە زیندانێ. چون ئەجەلی نەهاتبوو نەیانکوشت.

لەو وەختەدا لەشکری ئیسلامێ گەیشتێ، شەڕێکیان کرد. خودا فەتحی دانە دەستی، لەشکری کافرانیان شکاند. مێریان لە حەفسێ هێنا دەرێ، بەسڵامەتی و بەخۆشی، مێر و وەفایان هێناوە مەغریب زەمینێ. پێک بڕان.

## پەراوێزەکان:

١- خێزەرە، وێدەچێ بەواتای ریزبەستن و بەدوای یەکدا ڕاوەستانە.

٢- مەجەل، لە انەیە لە بنەڕەتدا مەجال بێت، لەم دەقەدا بەواتای خواستی خوداوەندی و قەزاو قەدەرە.

٣- متمانە، ئەم وشەیە لە زۆربەی بەیتەکاندا دێتە بەرچاو، لەوانەیە شکڵی گۆڕاوی «مطمئن»بێت.

٤- کێ بوو، لەم شێوە پرسیارە لە بەیتەکاندا زۆر بەکاردەبرێ و بەر لەنا و ئاوەڵناو دێت.

٥-گەورە بەکێو یان لایەکی تایبەتی کێو دەگوترێ.

٦- «کاو» هەمان وشەی «کام»ی فارسییە بەواتای «چێژ» «م»ی وشەی فارسیی زۆرجار لە کوردیدا دەگۆڕێن و دەبنە «و» وەکوو: کام = کاو =، دام= داو، خام= خاو، نام = ناو، تمام = تەواو.

٧- جیا لەو جوانکارییە ئەدەبیەی لەم چوار نیوە بەیتەی دواییدا کراوە و ئاشکرایە، بیرۆکەی ڕۆح خستنە نێو شووشە و پێداویستی پاراستنی ئەو ڕۆحە ئەفسانە گەلی عامیانەی ئێرانی بەسەرەوەیە کە باس لە تاو وتە ئسیری پاراستنی گیان و ڕۆحی دێو و درنجی نێو شووشەکە دەکات.

٨- کێ بێ، بڕوانە پەراوێزی ژمارە چوار ٤

٩- کەس لێرە بەواتای کەسانە

١٠- هەڵدەهێناوە، کاری ڕابردووی بەردەوامە. هەڵ، پێشگرە.

١١- ئەم دەستەواژەیە بەواتای کەوتنە نێو مەترسیەوەیە.

١٢- ڕندۆڵ، بەدەوروبەری کێو دەگوترێ، وەک دەڵێن لە ناوچەی عێلی «زمرزا» کێوێک بەوناوە هەیە.

له زمانی کوردیدا بۆ کێوو لایەنەکانی وشەیلی جۆراوجۆر هەن، وەک: کێو، تەلان، زەرد، ماه، شاخ و داخ، بەندەن، گەوەڕ، چیا، ڕەوەز و هەتا دوایی.

١٣- سەقاو، بەگوتەی بەیت بێژ بەواتای جێ پێ و بەن و ڕەشەکەیەتی.

١٤- قەف، نێوقەدی هەندێ دار گرێ گرێییە. ئەم گرێیانە کە خڕن و ئەستوور نز لە بەشەکانی تری نێو قەدی دارن پێیان دەگترێ قەف. بەدەسکی گۆچانیش دەگوترێ.

١٥- گەواڵ گواڵ بەواتای هەڵدڕ هەڵدڕ و پارچە پارچە دێت. ئەم ئاوەڵناوە تەنیا بۆ هەور بەکاردەبرێ.

١٦- لێرەدا مەبەست لەخڕ ئەوەیە کە جەستەی ئەو ئەسپە گۆشتن و بێ چین و لۆچ بووە.

١٧- مەبخی، بێژ کردنی عامیانەی وشەی، «مەخفی»یە.

١٨- مایەن، بەواتای ماین.

١٩- کۆیلە، واتە غولامی ئاڵقە لە گوێ و گوێ لە مست. وێدەچێ لێرەدا بەیت بێژ ئەم وشەیەی بەهەڵە لەبری کۆنیە بەکار بردبێت. کۆنیە ئەو کەسەیە لۆمەی دەکەن و گاڵتەی پێ دەکەن و بەخراپە باسی دەکرێ و کار و ئاکاری دەبێتە عیبرەت بۆ خەڵکی تر.

٢٠- دەچنە کاری کۆیە، بکەرەکەی تاکە. ئەم حاڵەتە لە زمانی کوردیدا زۆر دەبینرێ.

٢١- قۆپەن، بەواتای نێوقەدە. لە بەیتی «باپیر ئاغای» «مەنگوڕ»یشدا هاتووە.

٢٢- خونکار، بەواتای پاشا یان وەزیر لە بەیت و باو و چیرۆکی کوردیدا بەکار هاتووە.

٢٣- ئەم ڕێکەوەندە ڕێکەوەندی پێشتری هەرچەندە هاوسەروان بەڵام وەزن و کێشان نییە.

٢٤- گراو، بەقسەی بەیت بێژ واتە ئێسکی پاژنە.

٢٥- یاداشت، بێژکردنی زارگوت و عامیانەی یاداشتە.

٢٦- قەدەم، بەگوێرەی بەیت بێژ بەواتای شنەبایە.

٢٧- هەناو لە شێوە ئاخاوتنی موکریدا بەئەندامێکی نادیاری شێوە نووسینە دەگوترێ. لێرەدا بەپێی زەمینەی ڕستەکان بەواتای جەرگ یان دڵە.

٢٨- دەراو، بەکەنار و لێوی چەم و کانی دەگوترێ.

٣٩- باڕ، بەباڵندەی تازە لە دایکبوو دەڵێن، مریشکی نێوماڵ لەم حاڵەدا پێی دەگوترێ «باڕۆکە».

٣٠- ئەم ڕێکەوەندە پەخشانە.

٣١- ئانباز وێدەچێ بێژکردنێکی «انباز»ی فارسی بێت بەمانای دەمساز.

٣٢- چەلەنگ، بەواتای جوانە.

٣٣- ئەم نێوە بەیتە شێواوە.

٣٤- نێـو دێرز بێ، ئەم ڕێکەوەندە لەکاتی ناو لێنانی منداڵ وەک پیرۆزبایی بەدایک و باوک دەگوترێ لێرەدا وەک پیرۆزبایی بەکارهاتووە.

٣٥- کون لەبەر، بەواتای بێچارە و بەدبەخت دێت. کون لە پەراوێزی کتێبی «جوگرافیای ڕۆژاوای

ئێران»» نووسراوەی ژاک دومرگان، وەرگێڕنی دوکتۆر کازم وەدیعی، ل ٢٣، بەم شێوەیە ماناکەی لێکدراوەتەوە: بریتییە لە دووشریتی درێژ کە هەر کام لایەکی چارداخ پێکدێن.

٣٦- جووانهێز وێدەچێ بە واتای جوانمەرد یان کوڕی گەنجە. بەڵام بەپێچوانە بەیت بێژ پێی وابوو بە مانای پیرە.

١

کابرایەک بوو عەزیز خانیان پێ دەگوت. ئەو عەزیز خانە لە پێشدا ئیختیاری تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕی هەموو لە دەستدا بوو. خودا ئەگەر غەزەبی لە کێو گرت دەتوێتەوە. عەزیز خان ئەو ماڵ و حیسابەی بووی، لە دەستی بۆوە؛ ملکی هیچ لە دەستدا نەما. ئەما کوڕێکی بوو؛ کوڕەکەی زۆر شوجاع و ڕەشید و دانیشمەند بوو. غایەتێکی شوجاعەت لەسەر دەست ڕۆیین شتێکی چاکە.

کوڕەکەی ئەگەر چاوی پێ کەوت وا فەقیربوون و ماڵیان لە دەستی کەم بووە، زۆر ناڕەحەت بوو؛ پێی خۆش نەبوو لە تەرگەوەڕێدا دابنیشێ. دەگەڕا لە وەڕەزییان، لەبەر سەرزەنیشتی خەڵکی. ماڵی دنیایە وڵاغێکی سوارییان مابوو.

عەینە ڕۆم هەیە، لە دەشتە بێلێیە؛ ئەلعانیش هەر هەیە. ئێرانە، تەهای هەرکی لەوێ دەبوو. ماڵە خاڵێکی ئەو کوڕە - کە نێوی سەعید بوو - لە عەینە ڕۆم بوو. ڕۆژێکی لە ڕۆژان سەعید کوتی سەرێکی ماڵە خاڵم دەدەم، لە عێجزی خۆی.

ئەوە سەعید لە عاجزی و لە چاری بێ چارە

دەیگوت: سەرێکی ماڵە خاڵم دەدەم، دڵم زۆر ماندوو و هیلاک و بریندارە

خەڵکی سەرزەنیشتم دەکەن، دەڵێن سەعید بێ ماڵ و ملک و ئاوارە و بێ کارە

هەمیشە مەحتەلە بۆ نیکلێک[1] و بۆ دوو پارە

جا خۆ من بە بیرەوەری خۆم لە دوام دەڕۆیشت سێ سەت پیادە و سوارە

ئەلعان مردن بۆ من گەلێک خۆشترە لەو ژیانە و لەو ڕەفتارە.

بە بێ بەختی و بێ ئیقباڵی

جار جار دەگریا و جار جار دەناڵی

سەعید ئەوە سوار بوو، هات بۆ ماڵە خاڵی.

٢

عەینە ڕۆم، ئاغایەکی لێ بوو؛ زێندیناغایان پێ دەگوت: زێندیناغا سەردار عێل بوو؛ سەعیدی دەناسی؛ دەیزانی لێی قەوماوە. ئەگەر سەعید هات، زێندیناغا لەبەر سەرا پەردەی خۆی دەگەڕا و قەدەمی لێ دەدا.

ئەوە سەعید بەنەرمی سڵاوێکی دەکردەوە لە زێندیناغا و ڕادەوەستا بەماتی و بە خەمناکی

تەنگەی وڵاغی شل ببوو، بە ماندوویی و بە هیلاکی.

زێندیناغا بەگەورەی دەزانی، ئەو عەلێکی دەداوە

دەیگوت: زۆر بەخێریی، سەعید بۆچی ڕەنگت شێواوە؟

عەزیزم زۆر فکر مەکە، دەڵێی ئەسپەک (٢) لە سەرتی داوە

خالقی پەروەردگار دنیای هەروا ڕۆناوە

هێندێک کەس دەچێتە پێشێ، هێندێک دەگەڕێتەوە دواوە.

بۆ دایمە فرمێسک وەک بارانە لە چاوت دەبارێ

هێندێک کەس لە نەردیوان دەچێتە سەرێ و هێندێک کەس لە نەردیوان دێتە خوارێ.

چومکە وای داناوە خوداوەندی میری مەزن.

پادشایەکی بێ خەیاڵ و بێ باکی

هێندێک کەس ملک و ماڵ دەکڕێ، هێندێک دەدۆڕێنێ خاکی.

چاوی لە نۆکەران هەڵتەکاند بەمەبخی و بە نیانی:

«وڵاغی لێ وەربگرن». « سەعید ئەتۆ لە من میوانی».

نەمری تا زەمانێکی دوور! بژی بە زیندەگانی!

ئیشەڵڵا ڕۆژێکی وا دەبێ بتبینم بە ئەمیری و خانی

چاوەڕێ بە ئیشەڵڵا بەکەرەمی خولای دەولەت و ماڵت دەبێتەوە

ماڵی دونیایە چڵکی دەستییە، جاری وایە پێوەی دەبێ، جاری وایە لێی دەبێتەوە[٣]

ئیدی لازم ناکا لە دڵی خۆتی بکەی بە گرێ و هەمیشە بوکڵێتەوە.

ئەوە وڵاغیان لێ وەرگرت. زێندیناغا کوتی: میوانی من بە. ئەمان سەعیدیش پیاوێکی جوان چاک و قسەزان و مەزبوود بوو، ئیدی فەقیری هیچی دەگەڵ ناکرێ، دەنا زۆر لایەق بوو.

٣

زێندیناغا کچێکی نارنجی هەبوو؛ نێوی ڕوفیە خانم بوو. مرواری لە لێو دەباری. ئەوە سەعید بە میوانی، میوانی زێندیناغا بوو. سەعید لەسەر ئەو ڕوفیە خانمە دەربەدەر دەبێ و دەچێتە عێراقێ.

بە نۆکەر و بە عەمربەر و بە کڵفەت و بە میرئاخوڕ و بە بەردەست و کارداری خۆت کوت زێندیناغا، کوتی: خودا کاران دەکا دەنا ئەوە گەلێک لە من موعتەبەرتر بوو. ئەلعانیش زۆرم پێ خۆشە ئەگەر میوانی منە. ئەگەر کەسێک بەبێ حورمەتی تەماشا دەکا، دڵی گەرد بگرێ، ئەمن قەبووڵ ناکەم؛ چۆن خۆشم دەوێ، لێی قەوماوە، میوانی منیشە، میوان پەزیرایی یەگجار زۆر لازمە.

خاڵەکەی زانی، پێوەی هات. سێ ڕۆژ بوو سەعید لە ماڵە زێندیناغای بوو. سبەینێکی زێندیناغا فەرمانی بەخەڵکی دەدا، سەعید لە وەتاغێ نەچووبووە دەرێ.

سەعید ئەگەر ئاوا بەرەو ڕۆژئاوایە تەمەشای کرد، دیتی کیژێ نۆڕەسید ئەوە لەسەر تەکیەی پەنجەرەی ڕاوەستاوە

مەمکی تازە ئەوە سەریان دەرهێناوە، تازەکانە لە بن کراسێکی مەحمەڵ داراییدا کە پرۆکەیان بە کراس داوە، مەمکێکی قەنداوە و ئێکێکی گوڵاوە

خۆزگە بەو کەسە کە لە بەژنێکە دەبینێ کام و کاوە

سەعید لە ڕانی خۆی دەداوە، زۆر زگی بەخۆی سووتاوە

بێ مڵک و قەڵەندەر و هەناسە ساردم، ماڵی دنیام نەماوە

سەد بریا میوانی زێندیناغا نەبوومایە، وەڵڵاهی تیرێکی بێ ڕەحمیم لە جەرگی دراوە

هەتا ئەو ڕۆژەی دەمرم ژانی ئەو برینەی قەت ناشکێ و بەهیچ کەس ناگەڕێتەوە دوواوە.

٤

کڵفەتێک لەو عەینەدا هاتە ژوورێ، سەعید کوتی:

کیژێ! کیژێ! ئەو کەسە لە بەهەشت بێ بەش نییە ئەگەر قسەی خەڵکی دەکا جێ بەجێیە

مەجرووم ئەگەر شێت ببوو، خەڵکی دەیانگوت: عاشقی لەیلێیە
خۆ پیاو بەفەقیری گول نابێ، مەمکت دەڵێی سێو و هەرمێیە
سنگ و بەرۆکت بۆندارە و دەڵێی قەتاری خواجە حەسەنی بەغدادییە و بارە عەترت پێیە
مانگی عاسمانێم بە دوو زانی، ئەما خاترجەم بە سێیە
ئەمن زۆرم خوێندووە یاسین، قورعانم لە سنگێیە
وەرە پێم بڵێ، منت بمرم! ئەما لێم مەکە بەهەڵڵا هەڵڵا و، لێم تێک مەدە ڕێگا و جێیە
ئەو قورینگی سپی چاو ڕەش وا تیخی جەللابی پێیە، پێم بڵێ کێیە؟

٥

کوتی: مەترسە! بێ عاقڵ نیم و عاقڵم تەواوە
هەچ کەس قسەی خەڵکی بگێڕێتە دوواوە، ئەو شەیتانە؛ تۆقی نەحلەتێی لە ملی کراوە
گوڵی نۆڕەسید، دەڵێی خەرمانە و شەمامەی حەوت ڕەنگت لەسەر داناوە
دەڵێی بولبولە، بەیانە، لەسەر گوڵ ناڵەیەتی و قاوەقاوە
دەڵێی کەنارەیە(٤) و هەور و بایە و ڕێگای لێ شێواوە
دەڵێی بازە و هەڵۆ نێچیری لە دەست بەرداوە
کوڵمەی دەڵێی سێوی لاسوورە و زوقمی ئاخر مانگی پایزێی لێ داوە
ڕەنگی عەقیقییە، سورمەیییە، گەندومییە، بەهیچ جورێک نەگۆڕاوە
منداڵە، فێرنەبووە بە جێ ژووان و ڕاوە
کوڵمەی و سینگ و بەرۆکی دەستی لێ نەدراوە و نەژاکاوە
چاک زەینی ئەو پانیەی بدە، دەڵێی بەفرە و دۆشاوی بەسەردا ڕژاوە
ئەوە ڕوفیە خانمە، کچی زێندیناغایە، گەورە گەورەی ئێران و عێراق پاکی لە تاوی ئەوە خۆیان لە قوڕێ ناوە
ئێستا مەیلی بە کەس نەداوە، چاوی بۆ کەس هەڵ نەهێناوە.

کەسێکی بریندار بێ، لە کن هیچ حەکیمێک نەیهێ عیلاج و چارە
کەسێکی ماران گاز بێ، پێوەی دابێ چزووی مارە
کەسێکی ئەگەر سووتا بێ بە گڕی ئاور و نارە
کەسێکی بە پەیکان و بە تیر بلێن برینداره
کە چاوی بە کیژی فندق دەم پکەوێ، ئەوە بۆ وی دەبێ بەشفا، دەیهێت عیلاج و چارە
ئەو لەو دەردە خلاس دەبێ، گەر ببینێ ئەو دوو چاوە مەست و بە خومارە
ئەو مژانگی ئاوریشمی، ئەگەر بە سەر کولمەیدا دێنەوە خوارە
سەت خۆزگە بەو کەسەکا ئەگەر لەوە کام و ڕەوا دەبێ، لەسەر ئەوە دەبێتەوە بە میر و بە سەردارە
ئەوە دنیا ڕادەبوێرێ، پێم وایە گوناحباریش بێ، لە قیامەتێ گوناحی دەبێتەوە قوتارە
کەسێکی بلێن فەقیرە، بێ دەسەلاتە، هەژارە؛ ئەگە ئەوە
ببینێ، وە دەزانێ شایە، ئەمیرە، خونکارە
پەزێرە، ساحێب عاقڵە، فەسیحە، بەلیغە، نێوبانگی لە تەواوی دنیادا دیارە هەموو کەسێک پێی نابا زەفەر و چارە.
عادەتی وایە سبحەینان ئیشتییای لە گوڵە، دەچێتە سەیری گوڵان. ئێواران سێبەر وەسەر دنیایە کشا، دەرکی پەنجەرە ئاواڵە دەکا، دەکاتەوە سەیرانێ
دەبێ بێنە سەیری ئاسک و حەیوانە کێوی، خەت و خاڵ لەو هەڵبگرێ جەیرانێ
وەکو من دەیناسم و دەزانم، کەس وا نازانێ؛ دەنا کە بیانزانیایە، ئەمیر بوویایە، وەزیر بوویایە، یان کەسێکی ساحێب حوکمەت و حوکمڕانێ
بەجێی دەهێشت حوکم و حوکمات، نەی دەویست دەوڵەت و ماڵ و بەخشین و خەلات بەخشانێ
دەهات، ئەگەر جارێک بە لوتفی مەرحەمەت بیدووێنێ؛ هەر گوێی لێبێ، بڵێ: ئەوە میوانی ئێمەیە، دەڕوا بۆ دەیوەخانێ.

ئەوە سەعید دەڵێ: کەسێکی فکر نەکا، لەسەر قسان ڕانەوەستێ، ئاخری دێتە سەر زەرەر و ڕۆژی قالووەلایە[٥]

دەنا، وەکو تۆ دەڵێی، ئەو دنیا پان و بەرینە هەر بە تاقی تەنێ ڕوفیە خانمی تێدایە

وەڵلا ناسکە، شل و ملە، ئەما لە شەوگوردی[٦] کەس نایە

بۆچی، نۆڕەسیدە گوڵی نێرگس و شین بووە لەبەر لانووایە.

ئەو تاریفەی تۆ کردت، ئەگەر کەسێکی چاک بزانێ

مەلەکەلەوتی عاسمانێ حازرە قابیز دێتەوە سەر گیانی، بۆ ڕوح کێشانێ

جا فایدەی چی؟ هەر کەسە دەگەڵ ئامدەمی خۆی دەتوانێ قسە بکا و پچێتەوە ڕێ و شوێنی جێ ژووانێ

ئەما ئەوە من لە عەرزیم و ئەو بەیداغی هەڵکردووە لە مابەینی عەرز و عاسمانێ

هەر حەزم کرد پرسیارت لێ بکەم، پیاو لە دنیایەدا هەموو کاری دنیایە بزانێ.

ئەو جوانی شیرن، دەڵێی وەنەوشە و هەلاڵ و بەیبوون و سوێسنەیە تێک هالاوە

دەڵێی شیری ئاسکە کێوییە دۆشیوتە و لە سەر قاوەسینێکت داناوە

دەڵێی بەفری گەردالّی[٧] هەوەڵ شەوە باریوە، ڕاوکەر ئێستا نەچوونە ڕاوە

دەڵێی خاسە کەوە و لە بەفرێدا سەری لێ شێواوە

منت بمرم، ئەو کیژی بەلەک زەرد دایکی خۆی ماوە؟

کوتی: میوانەکەی قسان دەپرسی بە ئەسەحی و بە فەسیحییە

سەری منت ببێتەوە بە قوربانی سەرییە

لە کەتە بارگین نابێ ولاغی بەحرییە

دایکی ئەوە، کچی میرەڵەی هەرکییە.

بەهاران سێ سەت و هەشتا چادری دێتە سەرێ

هەر چادرەی بیست و یەک ئەنگوستەکی سەر بەپەیکان و بەرچیغی دەدەنەوە بەرێ

دایمە لە دووای دەڕوا بیست و یەک نۆکەر لەگەڵ پازدە عەمر بەرێ.

نا! چاک حاڵی نەبووی، جێگای موعتەبەرە، عەسڵ سەردار عێلی داودی و هەرکییانە.

سەعید کوتی: چیدیکە لازم ناکا و چیدیکەم لازم نییە
ئاورێکت لە جەرگی بەردام کوژانەوەی بۆ نییە
سەد بریا لە تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ دابنیشتمایە دەستەوئەژنۆ و بە فەقیرییە
ئەمن وەدەرکەوتم دڵم گوشاد بێ، لە خەمناکی و بەدبەختییە
تا ئێستا خەمی فەقیریم بوو، ئەو جار تووشی دەردێک بووم هەر عیلاجی نییە
مەگەر بە دەستی خۆم قەبر هەڵکەنم، سەری خۆم بەرمەوە بن بارستی گڵییە.

٧

لەو عەینەدا گرمەگرم و ناڵەناڵ پەیدا بوو، زێندیناغا هاتەوە.
کڵفەتیش چۆوە ژوورێ. زێندیناغا چەند کەسی دەگەڵ بوو خدمەتکار و عەمربەر و نۆکەر، بەسەعیدی کوت:
ڕەنگت گۆڕاوە، ڕەنگت بۆ وا شێواوە؟
ئازاری فێت دەگەڵە یان تیخی بێ ڕوحمێت لە جەرگی دراوە، ڕەنگت گۆڕاوە!
دانیشتووی بەئینتیزاری، نەخۆشی، ئەنگوواوی یان برینداری
بۆچی فرمێسکی خوێن لە چاوانت بوون جاری
بۆچی تووشی دڵت بووە دەردی کاری؟
دەیگوت: ئاغام بەسلامەت بێ! هیچم لێ نەقەوماوە
فکر و خەیاڵ سەری لە من داوە
دەنا خاترجەم بە نێوچاوانی تۆ سەلامەت بێ! دڵم پڕ کام و کاوە.
ئەوە ئاغا دانیشت. لە مەجلیسێدا دەستیان بە قسان کرد.

٨

کێ بێ لە کڵفەت و لە کڵفەتی عەمر بەرێ
لازمیاتی ماڵە ئاغای ئەوە لە حەسارێ ڕا دەباتە سەرێ
ڕوفیە خانم، عەتری بێ ڕوحمێی لە سنگ و بەرۆکان هەڵدەوەرێ.
لێی تێک دەنا نێوچاوان و مابەینی دوو برۆیە

دەیگوت: ڕەببی لەسەر دڵت بێ ئازاری سەرەتان و سۆیە[8]
هەچ کەسێ لە ماڵە زێندیناغادا بوو، سەربەخۆیە
دوو سەعاتە، ئەو کابرایە کێ بوو لە گەڵت دەکرد بەمێهرەبانی کەلام و قسە و گفتوگۆیە؟

کلْفەت دەستەونەزەر ڕادەوەستا و، سێ قەدەم لەسەر پانیەی کەوشی بۆ دوایە دەگەڕاوە

دەیگوت: ئەمنت دەبمەوە بە قوربانی ئەو دوو گۆشەی چاوە
دوو بڕۆت لە من تێک ناوە، خۆزگە بەو کەسە کا ئەگەر بەڕەحمەت بۆی هەڵدێنی چاوە

ئەو کەسە وەبزانێ سوڵتان عەبدولحەمیدە، لەسەر تەختی ئەستەمبۆڵێ دانیشتووە،
دووازدە کەسی عەسکەر و ئەمیر و میرەڵە و خزمەتکار لە پێشی ڕاوەستاوە
ئەمنت لەبەر ئەو قەرە زولفانە مرم! جووت جووتە، داو داوە
سانیعی پەروەردگار وای دروست کردووی، دەڵێی ئاوریشمی خاوە
ئەمنت دەمرمەوە لەبەر نەقیمی قامکان! هێندێکی فەڕەنگییەو
هێندێکی سەمەرقەندەو هێندێکی ئی زەمانی کەیومەرسە و دییانەتە، بۆ تۆیان هێناوە

ئەمن هیچ بێ عەدەبیم نەکردووە، هەڵبەتە بوختانم پێ کراوە
میوانە، غەریبە، بەقسەی من نەختێک دڵی کراوە
ئیدی خۆ من مەملەکەتی عەینە ڕۆمێم لە دەست نەداوە.

٩

جا ئەو جار ڕوفیە خانمی دەم دوڕ ئەگەر وای زانی
دەی دواند بە خۆشی و بە نەزاکەت و بە مێهرەبانی.
کوتی: منت بمرم! با نەبێتە پەژارەم بۆ سوبح و ئێوارە و وەختی شام
درۆزن مەبە نەچی قسەی بالیغە بکەی لەلام
چ بوو دەگەڵ ئەو کابرایە دەتکرد قسە و گفتوگۆ و کەلام؟

دەیگوت: خانم! درۆت لە کن ناکەم، ئەمن دنیام بە بێ تۆ ناوێ
کچ دارە گوێزە، هەچ کەسێکی هات پللارێکی بۆ داوێ.
ئەو جار، تەشەکور دەکەم لەبەر ئەو خالقەی ئەگەر ساحێبی ئەرز و سەمایە
ئاخر ڕەببیی بە دوور بی لە دەرد و لە بەڵایە
لە چاوی بەد و لە سەدەمەی ئەو چەرخە کۆنە و لە ڕۆژی قالووەلایە
ئاخر هەچ کەسێکی تۆ ببینێ، کوێر دەبێ، لە تاوان چاوی هەڵنایە
هەموو کەس دەڵێ: خێر، ئەوە کچی زێندیناغا نییە، حۆری بەهەشتە کەوتۆتە سەر ئەو دونیایە
دەنا بنی ئادەم، خودا وای دروست کردووە، لە جێگایەکەوە ناقیسێکی لە بەدەنی دایە
یان شەلە یان خوار دەڕوا یان چاوی کەم بینایە
یان گرویێیە یان کەچەڵە یان چاک لاقی لە دوونایە
ئەڵڵاهوممە سەللی عەلا موحەمەد لە نەخشی ئەو خودایە
کەسێکی تۆ ببینێ، ئەگەر زۆر پڕ عاقڵیش بێ، عاقڵی دەچێ بە بادی فەنایە
ئەمن خەمی ئەوڕۆم نییە، زۆر کەس بە چاو پێکەوتنی تۆ زەهلەی چووە، ئەلعان لە بن گڵی دایە
خۆت پێشانی خەڵکی مەدە، با خەڵک نەگرێ دەردی پێ مردن و ئازاری موجافایە.
شل و مل و لەبەر دڵانی
گوڵی هەوەڵ مانگی نیسانی
داو و دەلینگ حاجی حوسێنی، گۆی سەر خەزێنەی سوڵتانی
دایک ڕۆڕۆت بۆ نەکا، لە ئەندازە بەدەر شلکی، ناسکی، فێنکی، جوانی.
ئەوە دەستبەجێ ڕوفیا خانم دەیکردەوە هاوارە
کڵفەتان ڕادەوەستان دەستەونەزەر و ئینتیزارە
دەیگوت: بڕۆن چل مەجیدیم بۆ بێنن، لەوی سکە لە بیست و چوارە.
ئەوە چل مەجیدییان بۆ هێنا، دای بە کڵفەتەکە. کارەکە مەخفی کرا.

چومکه زێندیناغا سەرعێل بوو، میوانی زۆر دەهات. ڕۆژێکی کاسەوەندی و خدر مامە سێنە و هەرکی و عەشیرەتی دی زۆر هاتبوون، میوان بوون. سەعیدیش هەر لەوێ بوو. سەعید کوتی: ئەو عالەمە ناناسم، با هەستم وەدەرکەوم بۆ سەحرایە.

زێندیناغاش مەحرەمانە کوتی: بە ڕوفیایە بڵێن لەگەڵ کڵفەتان بچێتە چادری قوچێ قەزەنی، میوانمان هەیە، با چاویان پێی نەکەوێ. عاشیرەت هەرچی و پەرچین.

چادر و چیغی قوچێ قەزەنی

هەچ کەس ڕوفیەی بدیبایە، مردووی لەبەر دەستان بویایە، قوڕی بەسەر بویایە، ئاگای لە خۆی دەبڕا و پێدەکەنی

ماڵ ئەگەر چرای کوژاوە تاریکە، زۆر ناخۆشە؛ ئەگەر چرایان هەڵکردەوە، پیاو دەکەوێتە دڵشادی و ڕەوشەنی

هەچ کەسێک جەماڵی ڕوفیای بدیبایە، پیریش بایە، دەهاتەوە سەر عەمری وەخت و تەمەنی.

ئەوە ڕوفیا بیست و یەک کڵفەتی دەگەڵ دەچوون، هەموو عەمریان لە چاردە ساڵە

کچ بەکچی هەر پەنجەی لە عەرز دەنێ، دەڵێی تەڕلانە و ساحێب باڵە

پاکی شل و ملە، نەژاکاوە

قەدیان دەڵێی شمشاڵە و لاولاو، سبحەینان وەختی گوڵ دەکا، لە بەدەنیان هالاوە

قۆیتاسان[9] لە پشتەوە دەبزوون، دەڵێی شەڕەنێزەیە و لەشکر تێک ڕژاوە.

جا ئەوان بازنە لە قۆڵ دەکەن لەسەر لیباسەوە.

بازنەی ئاوزەنگی دەستی دوڕە و یاقووتە و مەرجانە و جێ جێ نەقیمی ئاڵی تێگیراوە

پێ لە هەر جێگایەکی بنێ، گڵەکەی دەبێتە متفەڕک. دەڵێن حاجییان لە مەککەی معەززەمیان ڕا هێناوە

دیتنی دەبێ بە زیارەت، وەکو کەسێکی بڵێن سەفەری کرد و لە دوازدە ئیمامی دەشتی بەغدایە گەڕاوە.

ئەوە ڕوفیە بەو تەدارەکە بۆ چادر و چیغی قوچێ قەزەنی ڕۆیی.

١١

سەعید چومکە فەقیرە، دڵ ساردە، ئەوە دەکا خەیاڵ و فکرێ
وەکو پشیلەیەکی هەست لە مشک ڕادەگرێ
ئەوە بەپێش چاویدا ڕوفیا دێت و ڕادەبرێ.
ئەگەر چاوی بەڕوفیە دەکەوێ، جەرگ و دڵی قرچە قرچێتی وەختە نەمێنێ لە ڕۆژگار و لە گەوێ[١٠]
وەکو گۆرانێکی ئەگەر کاروان دەبینێ و بەمەبخی وە دوای دەکەوێ
ئەوە ڕۆفیە ڕۆیی و ئەویش لە دڵیدا بوو، بە شەوە زەنگ و تاریکەشەوێ
یا ڕەبی تۆ ئاقڵت داوە ،بە مەڕ، کۆرپەی خۆی چلۆن دەوێ
ئەمن بێ ڕێ و شوێنم، بێ نۆکەرم، بێ ئیختیارم، چۆن لە کێلەک و بناوان و لە چادر چیغی قوچێ قەزەنی چاوم بەڕوفیەی ماه جەماڵ بکەوێ؟
تا ئێستا خەمی دەوڵەت و ماڵ و ملکم بوو، هاشا و لیللا لە سەلتەنەت و دارایەتی، نامەوێ.

١٢

ئەگەر چوو، نەیوێرا بچێتە پێشێ. چوو لە کەنارێک، لە چادرەکان نەدیو، بەدەردی دڵی خۆی مەشغوڵ بوو. لەوێ دانیشت. ئەوە سەعید دەڵێ:

ئەی ئیلاهی! ئەی تاکی تەنیای فەردە!
خەڵک بەدەردێک گرفتارە، ئەمن دەردم دوو دەردە.
حەیی لەم یەزەل، پەنای پەنا دار
عیلاجم بکەی ئەی پەروەردگار
خەڵکی بە کەرەمی تۆ دەبێت ڕزگار
تۆ لە بەدبەختی پیاو دەکەی قوتار
بە بێ ڕۆحمی تۆ بینای بانی سەر
گیا لە خاکێ سەر نایەنێتە دەر.

پەنام وە بەر تۆ ئەی تاکی تەنیا
چەندت نەجات دان لە بەحر و دەریا.
من بێ بەش نەبم لە کەرەمی تۆ
غەریب و فەقیرم و دەستەوئەژنۆ.
گە دنیات دانا ئەی پەروەردگار
ئادەمت خەڵق کرد، تۆ کردت دیار
کردت بە نەبی کردت بە موختار
لێی پاشەکەوت بوو هەزار هەزار.
ئەمنیش یەکێکم عەولادی ئادەم
لە دڵم ڕەهاکەی پەژارە و دەرد و خەم
زۆر دەردەدارم، پەنات بۆ دەبەم.
لە تۆ زیاتر هیچ پەنام نییە
بێ پشتیوانم، پشتم خاڵییە.
ئیلاهی بۆ خاتری پێغەمبەرانت
بۆ خاتری سەیدی ئاخری زەمانت
بەخت و تەڕەقیم بخەیە سەر شان
نەمکەی ڕەنجەڕۆ و بێ بەخت و سەرگەردان
نەگەڕێم لە ڕیزەی زەلیل و کوێران
دەردی دوو دەردم تۆ بکەی دەرمان
ڕوحمی تۆ زۆرە، نەمکەی سەرگەردان
خەجاڵت نەبم لە دای و بابان
ئەوە دانیشتووم لە چۆلی و بیابان.
بە مەڕامی دڵ، بە شادکامی
تۆ ئاگات لێمە، دایمە لە لامی
عەلیم و خەبیر، هەموو شتێک دەزانی.

زۆر سەرگەردانم، زۆر لێقەوماوم
هەڵوەدای دایک و باب، دڵ بەجێ ماوم
جۆگەلەی بەستووە من خوێن لە چاوم.
عیلاجم نییە، پێم دەرناکرێ گۆ
مەگەر بەڕوحم و ئیرادەی تۆ
ئەمن بێ بەش نەبم لە ڕەحمەتی تۆ
گەلێک خەمناکم، نەمکەی ڕەنجەڕۆ.
یەگجار دەلالاّ بە دڵی بریندار
ئیلاهی! قادر! بۆم پێک بێنی کار
گەلێک بەدبەختم، فەقیرم، دوچار
لایەک بەڕوفیا بووم بریندار
لایەک دەربەدەرم من لە کەس و کار
پەنام بۆ هێنای، ببە پەنادار
نوحی پێغەمبەر، تۆ کردتە سەردار
لە کەشتی دەنا بیست و چوار هەزار
هەموو زی ڕووحێک، مەل و موور و مار
تۆ ڕوحمێک بکەی بە بەندەی گوناحبار
بەندەی بێ قودرەت، ڕوسیا و شەرمەزار.
هاتووم دانیشتووم بە سەرگەردانی
ڕووم نییە ئەگەر بچمەوە ئاوەدانی
قەڵەمی تۆیە، بۆ خۆت دەزانی.
تۆ پەنام بدەی، پەنام هێناوە
زمانم لاڵە، ئەژنۆم شکاوە
لە تۆ زیاتر پەنام نەماوە.
دەجا ڕوحمێک بەحاڵ و باڵم
دەروونی پڕ گڕ، بە زمانی لاڵم.

ئیلاهی پاڕانەوە دەبێتە شوکرانە
هاوارم وە بەر تۆیە ئەی حەیی دانا
دوعای قەبووڵ بوو لە دەرگای ڕەحمان
هێندە دەگریا، واوەیلا و ئامان
هەراسانی کرد جەمعی مەلەکان.
سیلەی ڕەحمەتی دەهەندەی داوەر
دوعای قەبووڵ بوو بەندەی خۆڵ بەسەر.
کەسێک خەیاڵێک گەر بکا قەستێ
بەمەیلی خودا ئاو ڕادەوەستێ.
ساحێب ئیختییار نییە قەت مەوجی دەریا
بێ عومری خودای بۆ جێیەک بڕوا.

١٣

هەتا پاش نوێژی نیوەڕۆیە ئەوە گریا و ڕووی لە دەرگای خالق کرد. پاش نوێژی نیوەڕۆیە کە مەڕ دێتەوە شاخی، لە جێگایەکی پەنا، لە کن ئاودڕێک، دانیشتبوو؛ وەختێکی شوان زەینی دایە، تاجی و تولە هێرشیان بۆ دەبرد. شوانەکە کوتی:

دەبێ کێ بێ ئەو لێقەوماوە
لەو چۆلی و بەرپییە وا بەجێ ماوە
فەقیر و هەژار، بێ کام و کاوە.
شوان دەیگوت: تۆ کێی غەریبی بێ چار
بێ خواردن و ئیسراحەت، تۆ ماوی هەژار
ئەوە نیزیکە، قوچێ قەزەنە
جێگای غەریب و دڵ نارەوشەنە.
بۆ تۆ دانیشتووی وا لەو سەحرایە
دنیا هەزاری وەک تۆی تێدایە
هەر کەسە بەدەردێک موفتەلایە.

بڕۆ! تۆ بڕۆ بۆ چیغ و ڕەشماڵ
ئەلعان شەو دادێ فەقیری عەبداڵ
چاوت دەردێنن گورگ و قەل و داڵ
عاقڵت نەماوە وەک پیر و منداڵ.

١٤

ئەوە شوان وای پێ گوت. جا ئەو جار، چارشێوی مینارەنگ، ڕوفیە بەسەری دادا؛ بەڵکو بانگی کڵفەتان دەکا:دڵم خەفەیە، نەچین بۆ سەحرایە؟

بچین بۆ سەحرا، دنیای ڕەنگاوڕەنگ
تەدارەکی گرت شەیدای شۆخ و شەنگ
زولفی لە کوڵمەی کەوتنە شەڕ و جەنگ.
قەدەمی ڕەنجە کرد، بە بێ بەهانە
گوارەی لەعل کۆ کەوتنە جەولانە.
بەدەن بەوێنەی نمرود شا
بەندۆکە[11] و قۆیتاس کەوتوونە سەما
بازی بەندی لاڵ لە قۆڵی دەکا
بێ سووچ و تاوان جوانان شێت دەکا.
کەسێک ببینێ هەر سەرگەردانە
ئەو کەسە دڵی پڕ هێش و ژانە.
لە تاو باڵای وی هەر ماڵ وێرانە.
ئەوە ڕوفیە میوەی بەهەشت ڕەنگ
بەقیمەت گران، مەتای گران سەنگ
هات لە بۆ سەحرا، دنیای ڕەنگاوڕەنگ.
سنگ و بەرۆکی دەبەخشێ بۆن
هات لە بۆ سەحرا، دنیای گۆناوگۆن
بەکەس نەماوە چەرخی قەدیم و کۆن.

هەر کەسێ ڕۆژێک ساحێب ئیختییارە
عاقیبەت مەرگ لەوێ ڕا دیارە.
هەچەندی پیاو لە دنیا دەفکرێ
ئاخری شەربەتی مەرگ وەردەگرێ.
کڵفەتان دیتیان یەکێک دیارە
مەعلووم فەقیرە، برسی و هەژارە.
کوتیان: ئەوە کێیە لەو بیابانە
ئەو فەقیرە و ئەو ماڵ وێرانە؟

١٥

ڕوفیا کوتی: بانگی کەن، یان لێقەوماوە یان فەقیر و تاڵان کراوە
یان ئەوە کوڕە، زەلیلی چاوە
یان ئاشقە، دڵی حەفس کراوە
یان لە ماڵە خۆی دەرکراوە
بزانین پەنای بۆ کێ هێناوە؟
کڵفەتان بەناز، ناز و نازەنین
ئایشێ و ئایشە گوڵ، لەیلێ و گوڵ چین
بەسەدای ناسک، بەمێهرەبانی
سەعیدیان بانگ کرد، ئەگەر وای زانی
جەرگی دەسووتا وەکو بریانی
کزەکزیەتی، شل دەبوو ڕانی.
ئەوە لێی پرسی: چکارەی هەژار؟
کوتی: فەقیرم، من سەرگەردانم
من لە عەینەڕۆم لەنگۆ میوانم.
ڕوفیا بانگی کڵفەتەکەی کرد؛ ئەوی لە عەینەڕۆم، لە دیوەخانێ چووبووە کنی، پێی کوت:

تام خۆش و بۆن خۆش میسلی عەمبەر بۆ
لەگەڵ وەت دەکرد ئەتۆ گوفتوگۆ؟
کوتی: بەڵێ، میوانە لە خانەوادە
پیاوێکی نەجیب و ساحێب ئیجادە.

١٦

ڕوفیە پێی گوت: پیاوێکی عاقڵ و قسە مەحکەمی
پێم وایە دڵ پڕ دەرد و خەمی.
ئەدی بۆچی تۆ هیچ چارت نایە
میوانی و تۆ هاتوویە ئەو سەحرایە
کوتی: وەختی قسەم نییە، ناکەم گوفتوگۆ
زمانم لاڵە من لە حاستی تۆ.
نوتقم بەستراوە، عاقڵم کەم بووە
ڕوحی ڕەوانم لە تەن ڕۆییوە،
دەبێ سەبرت بێ، بێمەوە سەرحاڵ
جا قسە بکەم من ئەی مەه جەماڵ
دەنا هەیبەتت ئەمنی کردووە لاڵ.
پیاو بێ نوتقە لە حاست موعتەبەر
لە سنگت داوە تەلەسم و گەوهەر
بێ دەسەڵاتم، بەندەی خۆڵ بە سەر.
بە مێهرەبانی لە منت کرد پرسیار
لە بۆ من بۆتە مایەی ڕۆژگار
خەم و پەژارەم پاکی بوو قوتار.
هەزاری وەک من دەسەرت گەڕێ
زولفان لە کوڵمەت چۆن دەکەن شەڕێ
شیخ گە بتبینێ، بۆت وەردەگەڕێ.

ئەگەر بتبینێ مەلا و عولەما
چیدی ناتوانێ پێش نوێژی بکا.

١٧

من لەگەڵ تۆمە ئەی دڵ دەردەدار
لێم خاترجەم بە، مەبە ئینتیزار
قەستەم بەزاتی شاهی کەرەمدار.
تۆ دەراوێژە فکر و خەیاڵت
تەڕەقی کردووە بەخت و ئیقباڵت
دڵخۆشی بدە حاڵی بێ حاڵت
عەسرین مەڕێژە لە چاوی کاڵت.
زولف لە هەنیەم[١٢] هاتنە هاتوچوون
عەتر دەبەخشن وەک گوڵی بەیبوون
دێوانە مەبە، مەبە بە مەجنوون.
حەوسەڵەت ببێ، ئەوە ڕۆژگارە
چەند کەس وەکو تۆ چاری بێ چارە
ئازاری دڵە، پێک دێ ئەو کارە.
بچین بۆ قۆناغ، بۆ قوچێ قەزەن
دنیای تاریکت لێ ببێ ڕەوشەن.
بنێ لە ژوور سەرت قسەی خاترجەمی
لەگەڵت ناکەم هیچ مەیل کەمی
چۆن دەستەوئەژنۆ و زۆر دڵ بە خەمی.
کار جێبەجێ نابێ بە خەمناکی
بەسووتانی دڵ، خۆ بە هیلاکی
جێبەجێ دەبێ کار زۆر بەچاکی
کەسێکی نەمرێ و نەچێتە خاکی.

کەبکی خەرامان، وەنەوشەی ساوا
وەکو هەلالە، قەت نەژاکاوە
زۆر بەئیلتیفات دڵخۆشی داوە
سەعید وەک جاران خەمی نەماوە.

١٨

سەعیدیان هێنا بە خاترجەمی
ڕوفیە خاترجەمی کرد نەکا مەیل کەمی.
ئەوە هێنایان داخیلی خێوەتێکیان کرد.
بە ساحێب ماڵ گوت، ئەوە میوانە
قەدیم ئیختییاردار، بەگلەر و خانە
ئامانەتو بێ ئەوشۆ لەو جوانە.
بە سەد ئیحتیرام پەرزێری بکەن
گلێیی نەبێ، دڵ هێشی مەکەن.

١٩

ئەو جارە کە ڕوفیە بەکڵفەتێکی ئەمیندا – ئەوی قسەی دەگەڵ سەعید کردبوو – ڕای ئەسپارد، کوتی:
بێدار بێ شەوێ، نەخەوێ
ئەوشۆکە من دێم چاوم پێی بکەوێ.
هەر کەسێ ڕۆیی بۆ لای ئارامگا
ئەما سەعید دڵی وەسوەسە دەکا
چاک دەناڵێنێ لە دەرگای خودا
هەڵبەت من دوعام بووە مستەجا
بۆیە بە شیرنی جوابم وێ دەدا.
ئەگەر کڵفەتەکە وای پێ گوت، سەعید کوتی: هەک بەقوربانی بم! وەڵڵاهی دوازدە شەویش نانووم.

٢٠

ڕوفیە وەک بولبول لە شەو ڕاگرت هەست
شەدەی فەرەج کار بە سەت نیمناز بەست
چەتری ئەنگاوت وەکو تاوسی مەست.
چارشێوی ئاڵ ڕەنگ خستییە سەرشانی
زۆر بە هێدی و نەرم و نیانی
خۆی حازر کرد، بە خان و مانی
وای کرد نەزانن هیچ کڵفەتانی.
بە سەری دادا تافتەیەکی تار
بریسکەی دەدا وەک هەوری بەهار
شکۆفە دەدا وەک خونچەی نیسار.[١٣]
وەک قەوسی قەزەح سەت ڕەنگ دەنوێنێ
وەکو بولبولێک ئەگەر دەخوێنێ
وەکو شەنگەبی، با ڕای دەژێنێ.
قەولم پێ داوە، ببم بە تەبیب
زۆر چاوەڕێیە، جوان چاکی غەریب.
دەردی دوو دەردە، بۆی بەرم دەرمان
قەدەم ڕەنجەکرد سەوڵی خەرامان.[١٤]
گەردن بەوێنەی بێ قسوورە تاق
کوڵمەی بەوێنەی سوورگوڵی مێلاق.
کەوشی نوقرەبەند حازری کرد ئەوجار
چەتارە و ئەتڵەس کرد سەر بەرەو خوار
هەتا نەی ناسن خزم و کەس و کار.
کوڵمەی بەمیسلی گوڵی گەوەڕێ
دڵی وەک پەروانە ئەوە دەگەڕێ.

زۆر لێ شیرنە خاڵ هەتا پەرچەم
وەکو پەروانە دەچێ بۆ لای شەم.
قەدەمی ڕەنجە کرد کیژی بێ قسوور
وەک شەم داییسێ، لە نزیک و دوور
زولفی سێ بەنگی کردن خوارو ژوور.
چەتری ئەنگاوت، وەکو دێوانە
ڕاست و چەپ زولفی لە کوڵمەی دانا
وەک کۆخ گوڵ دەکا، دەگەڵ ڕەزیانە.
وەک میوەی بەهەشت، وا شەفاف دارە
هەر لەو شیرنە کرمەک و گوارە
هەچ کەس بیبینێ چاری بێ چارە.
سێ قەدەم ڕۆیی، تەلای دەستەوشان
پەرچەم و زولفی لێ بوو پەرێشان
زولفی دەسوورێن بەشویای زریان
لە نیوە شەودا لەیلێی خان و مان.
جا لەوێ سەعید هەر چاوەڕێیە
هەناسەی با دێ، چاکی گوێ لێیە
چاوی، وەک مەجرووم، لە ڕێی لەیلێیە.
ئەوە مەستە چەم هات بە پارێز
زولفان لە کوڵمەی جووت جووت گرتیان ڕێز
دەسماڵ لە گەرنی وابوو ئاوێز
دەسماڵ دای پۆشیوە ئەتڵەسی دێز[١٥]
وەکو کولەجە بێ، مەتای گران قیمەت
جەرگی عاشقان دەکا کەت و لەت.
بێ غەوشی باڵای نایە لە حیساب

هەر کەس بیبینێ، جەرگی دەبێتە کەباب.
ئەوە غەریبە، قەولم پێ داوە
ئەلعان ماندووە، دڵ پڕ زووخاوە.
وەک عاشق دەبێ گەر بەهاران کەو
خرمەی بەرۆکی وەک گەنجی خەسرەو
ئەندێشی نەکرد، ئەوە هات ئەو.
هەستی بۆنی کرد میوانی دەستوور
دەستبەجێ زانی ئەگەر هات لە دوور.
وەک لەیلەتولقەدر لە بانگی شێوان
گەردێ وەختێکی بۆ بەرەکەت پێوان.

## ٢١

جا ئەوە ڕوفیە بە دزی و بە مەبخی هاتە کن سەعیدی، هەرتک پێکەوە کەوتنە قسان. ڕۆفیە دەڵێ:

لەسەر قسەی خۆم من هاتم، خەتەرە
کەسێک بمبینێ یان کارەکەرێک یان عەمربەرە
ئەوە بۆ من باسی سەرە
دەڵێن: بۆ کوێ چوو ئەو دولبەرە؟
هیچ کەس منی نەدیوە، نە میر و نە بەگلەرە
نە خان و ئەمیر نە پەڕ بەسەرە.
جارێ پێم بڵێ نیازی دڵت
تۆ بۆچی دایمە دڵ لە هاواری
بۆچی شێواو و دڵ بریینداری
تۆ بۆچی دەکەی گریان و زاری
بەڕۆژێ ڕووناک، بەشەوی تاری.
ئەوشۆکە لێرە تۆ گرتت قەرار

هەر چاوەڕێ بووی بەندەی ئینتیزار.
بۆنی هەلاڵە بنۆشە ئەتۆ
بەس دابنیشە تۆ دەستەوئەژنۆ
بەس واوەیلا کە، تۆ داد و ڕۆڕۆ
بەس فرمێسکت بێ وەک جۆبار و جۆ.
ئیدی تۆ مەکە داد دەگەڵ هاوار
فرمێسکت نەیە وەک کانی و ڕووبار.
ها بەهرە بەرە تۆ لە لیمۆی کاڵ
مەست بە بە بۆنی سینە و وردە خاڵ
تا قنیاتت بێ هەتاکو سەت ساڵ.
دەستی درێژکرد، هاویشتییە گۆنە
پەنجەی شێر ڕەنگی بۆ سینەی هێنا
چومکە غەریبم دڵم مەشکێنە
بۆنی هەلاڵە و گوڵ و بەیبوونە
دڵی غەریبان گەلێک کەسکوونە.
لیمۆی کاڵی کرد بە حەڕاجی شار
بۆی وەدەردەخست لیمۆ و وردەخاڵ
مێهرەبانی کرد بە دوو چاوی کاڵ
لە دەورەی سووڕا وەک تەیری تیژباڵ
بە هومێدی خودا دەبین بە حەلاڵ.
کامورەوا بوو لە گەردنی بۆندار
با لە دڵی کەم بێ، ئەو هات و هاوار.
هەتا نیو سەعات هەر عەیش و نۆش بوو
خۆشی و بەشارەت، کاریان سورِ پۆش بوو.
هیچ کەس نەیزانی بەو ئەحواڵە

لە دڵی سەعید خلاس بوو هاوار و ناڵە.

عەزیزم! ئەوەک کەسێک بزانێ
شەیتانی بکا هەتا دەتوانێ.
با بێ عەیب بێ لەیلێی خان و مان
شەیتانی نەکەن لە ماڵەباوان
بێتە دەنگوباس، بکەومە سەر قسان
با پێمان نەڵێن ڕەکیکی و بوختان
دەجا ساکین بە! بە زاتی حەننان
بە کەس نابەخشم من باغی گوڵان
قەولم بە تۆ دا، نابم پەشیمان.

سەعید پێی گوت: خانم ئەمن هەژارم
ئەوە خوداوەند پێکی هێنا کارم
من بە لوتفی تۆ زۆر منەتبارم.
لە مێژ بوو ئەمن ببووم دێوانە
ڕوحت دەرهێنام لە حەفسخانە
سێ سەت جار ئەمنت بم بە قوربانە
چاوەت وەک بەحری بێ سامانە
کزەی شەماڵ دێ، شەپۆل لێدانە
ڕەبی نەکەومە دەست لێک بەردانە.
ئینتیزارکێشم، تەسکینم نییە
سنگت وەک تەختی سەمەرقەندییە
ئەبرۆت غەدەنگ کێش، قەڵەمکارییە
بەبێ لوتفی تۆ ژیانم نییە.
چاوان دەگێڕی بە مەستی و هوشیار
هەچ کەس بتبینێ پێی نامێنێ چار.

به تیری عەشقت ڕۆحم نەمابوو
دایم و دەرهەم دڵم سووتابوو
ئەوە گەدایەک ئامڕازی شا بوو.
قەدەم ڕەنجەکرد سەوڵی خەرامان
بۆ ئیسڕاحەت گا بە عەتر بەخشان.
سێوی نەگەییو، هەڵووچەی کاڵی
کەس لەو سورڕە نەدەبوو حاڵی.
کار بە پارێز بوو، بە عاقڵ و کەماڵ
عەتر دەباری لە ڕووی وردەخاڵ
گەلاوێژ ڕەنگ بوون هەرتک چاوی کاڵ
ئەوە هاتووە بۆ لای ماڵ و حاڵ.

٢٢

لە ئیسڕاحەتدا، کەمێک حەساوە
فکر و خەیاڵی لە دڵدا ماوە
سنگ و بەرۆکی کەمێک ژاکاوە.
کوڵمەی بە میسلی گوڵی هەنارە
کەوتە خەیالات لەبەر ئەو کارە.
کوڕێکی مێهمان، وا سەرگەردان بێ
دایم مەست و شێت، خولی بیابان بێ
میوانی بابم بە دڵ و گیان بێ
چ فکرێک بکەم من بۆو مەخسوودە؟
قەولم پێداوە، کەسێک لە قەولی خۆی بێ پەشیمان
بەدبەخت دەبێ، دەبێ سەرگەردان
جێ بەجێی دەکا پادشای ڕەحمان.
خودایە پێکی بێنی تۆ کاروبارم

بەڕەحمەتی تۆ هومێدەوارم
دڵ شکست نەبێ ئەو ئینتیزارم
چۆن قەولم داوە، بووە بە یارم.
ئەوە شەو ڕابرد، ڕۆژ هاتەدەر
دنیای ڕووناک کرد خورشید لە خاوەر.
لە خەو هەڵستان، بوو بە بێداری
هەر کەس بۆ جێیەک، زۆر بە وشیاری
لە سەعید خلاس بوو دەردی کاری
وە دەستی کەوت باغی مرواری
مەمانی بۆ برد سەوقات و دیاری
لێی خلاس بوو ئەو شێتی و هاری.

٢٣

ڕوفیا حوکم کرد وەک حاکمی حوکمدار
بارگە بارکەن، ئێستر بە قەتار
با بێنە پێشێ گوڵناز و گوڵنار
کڵفەتان بە ناز، پاک بە لەنجەولار
جوابیان داوە بە توندی و تەیار
با بەرەو ماڵ بین، جا بڕۆین ئەو جار.
یەگجار عاشقە وەردۆکی باڵتەڕ
ئەگریجەی لەسەر گۆنا دەکا شەڕ
هاڕەی گوارەی دێ وەکو بای سەڕسەڕ.
مەستە، ئیغیار نییە جەمینی خۆشحاڵ
دەهێت و دەچێ خانمی کرچ و کاڵ
ڕیشوەی بەربۆوە لە گۆشەی دەسماڵ
داعبایەک هەیە پێی دەڵێن شوخاڵ[١٦]

دەجا با بڕۆین ئەو جار بەرەو ماڵ
وردە وردە دێ کزەی بای شەماڵ
جارجار دەردەخا گۆنا و خەت و خاڵ
خڕەی گۆ و قۆیتاس، بازی بەندی لاڵ
ئاگای لە خۆی نییە، عاقڵی بووە بەتاڵ
لە عیشقی سەعید بووە بە عەبداڵ
ئەبرۆی بە میسال پەڕی ڕەشەداڵ
ئەگەر دەگەڕێ لە هەور و ساماڵ.
دەنگی کڵفەتان بە سەد نیمناز
ئاوازەی بولبول، دەنگی قەرەناز
باڵی ، لە دڵی داوخواز
ئەو جار هاتنەوە، بە گوارە و قۆیتاس.
ئەگەر ئەوان دەکەوتنە ڕێ
هەموو مەمکیان وەک هەرمێ و وەک بێ
عەینە ڕۆم لە میوانان چۆل دەبێ.
میوانان ڕۆیین، هەر کەس بۆ جێی خۆ
عەینە رۆم چۆل بوو، هاتەوە لیمۆ.

٢٤

سەعید بەجێ ما لە قوچێ قەزەن
فکر و خەیاڵ کرد نەک بمکا بە پەن.
دەستم داوێنت پایز و بەهارێ
عەتر لە کوڵمەت دایمە دەبارێ
نەمکەیە کۆینەی گشت هەرزەکارێ
بڵندت کردووم، نەمخەیە خوارێ.
هەر کەس بە جێی خۆی، خەبەر! خەبەردار!

هەر کەسێک ڕۆیی بۆ بورج و تالار
هەر کەس بۆ جێی خۆی، بۆ کار و ڕەفتار.
سەعید گە زانی قەزەن چۆل بووە
کیژی سۆسەن خاڵ لەوێ ڕۆییوە،
با منیش بڕۆم بە داخ و حەسرەت
با زوو بگەمێ، گەرنی میسلی شەت
مەگەر بە ڕوحمی خولای دەنا عیلاجم ناکرێ قەت.
گەلێک کەس لەوە دێوانە بووە
لە خۆی بەرەوژوور تەمەشا کردووە.
زۆر لە من زیاترە کیژی مەمک هەنار
بڵێی ئەو کەرەتە پێی ببەم چار؟
ئەو حوکمڕانە، ئەمن میوانم
بێ نۆکەر و پیاو، زۆر سەرگەردانم
لوتفی مەرحەمەت کرد، منەت بە گیانم.
دەبێ مەمنون بم تا سەحرای مەحشەر
دڵی نەشکاندم، نەبووم دەربەدەر
تا عەمرم هەیە دەبم بە نۆکەر
لە نۆکەر کەمتر، دەبمە عەمربەر
سەبارەت بەوی، یارەکەی دلبەر
گە زانیبێتیان من خۆڵم وە سەر
وە لەرزە کەوتووە سەما تا زەمین
جگەرم سووتا، ڕۆحم گرتی تین
من بە ڕووسووری بچمە کن زێندین
نەک خەجاڵەت و لارەمل نشین
لێی بێ خەبەر بووم، وەردۆکی باڵ شین.
ئەوە سەعیدیش وەڕێ کەوت، بێتەوە.

ئەگەر میوانەکان ڕۆیین و سەری فاریغ بوو زێندیناغا، پرسیاری کرد، گوتی: ئەمن کۆنە بەگلەری مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕم میوان بوو، چی لێ بەسەرهات؟ زۆرم خۆش دەویست. کەسێک پەنای لێقەوماو بدا، سوننەتیشە و خێریشە. نەمزانی چی لێ بەسەرهات؟ گوتیان:

لەبەر میوانان لەبەر گاڵەگاڵ
پێی عەیب و شەرم بوو، تەڵخی بوو ئەحواڵ
زگی بەخۆی دەسووتێ، فەقیر و عەبداڵ
پێم وایە ڕۆیی بۆ قەرە ڕەشماڵ.
پێم وایە ڕۆیی لە بۆ کوێستانێ
گوتی: کەسێک خەبەری بزانێ،
هاتۆتە ئێرە مەردی خۆش ئەحواڵ
دەبێ بیدەمێ نەختێک پووڵ و ماڵ.
غەریب و دڵتەنگ، سەر لێشێواوە
یەکجار مەزڵووم و ئەو لێقەوماوە
هەڵبەت گە قەدەمی بۆ ئێرە هێناوە
بە عاقڵ و بە هۆش بە ئامۆژگاری
بەڕێی دەکەمەوە بەدەست و دیاری.
ئەوە سەعیدیش بە دڵی پڕ خەیاڵ بەڕێوەیە.
هێندە خەیاڵ کرد ئەو لە حاڵی یار
زەحمەتە پێک بێ ئیش و کاروبار
ئەو دەربەدەرە لە پاک کەس و کار
دەترسم بەدی بگرێ، لە پشت ببەستێ زینهار.
چومکە فەقیرە، دڵ بریندارە
لە ماڵ و دەوڵەت ئەو بێ ئیختیارە
گەلێک دەترسێ لەو کاروبارە.

تەفرەقە ببێ، نەڕوا بۆ وەتەن
لە ڕووی هەڵ نەیە خۆی بکا ڕەوشەن.

٢٦

زێن دیناغا پیاوی وە دووخست، لە ڕێگایە تووشی سەعید بوون و هاتنەوە. زێندیناغا بەخێرهاتنێکی زیادی کرد و کوتی: لە کوێ بووی؟ نەمدیتی ئەگەر ئەو میوانانە لێرە بوون!

سەعید کوتی: وەزیفەم وابوو، ببی بەرقەرار
تۆ میوانت بوون، ئەمیر و سەردار
هەمووی سەردار عێل، ڕەئیس و موختار
ئەمن دانیشم گەردن بەرەو خوار
لە ڕێزەی ئەوان ئەمنی بێ ئیختیار،
من پێم شەرم بوو، پێم بێ ئەرکان بوو
چومکە ڕۆژەکەی دەوری ئەوان بوو.
پاک ساحێب مڵک و ساحێب ئیختیارن
پاک دەست ڕۆیشتوو، ساحێب ڕەفتارن.
زگم دەسووتا من بە حاڵی خۆ
کۆتر نابێتە ئامڕازی هەڵۆ.
دڵت گەرد نەگرێ، من بە فەقیری ئەو بە شەلەشەل
قورینگیان نەدیوە ئامڕازی خەرتەل.
هەموو شتێک لە فەقیری خۆشترە بە غەیری کافر
قەلیان دا بە قەل، کۆتر بۆ کۆتر.

٢٧

زێندیناغا پێی دەڵێ:
تۆ دڵت وا بوو هەتا سەردار بووی

گەورەی دوو عێل بووی، ساحێب ئیختیار بووی.

مەگەر نەتبیستووە لە نایب و وەزیر

خێر و سوننەتە دڵخۆشی فەقیر.

کە فەقیریش بی ئەتۆ بەگلەری

بێ خزمەتکار و بەندە و نۆکەری،

ئەمما لە کن من زۆر ساحێب ئیعتیباری

ئەلعانیش لە کنم میر و سەرداری

خوێنت لە چاوان بۆ بووە جاری؟

وا تەڵخت بووە حاڵ دەگەڵ ئەحواڵ

هێندە فکر مەکە ئی دەوڵەت و ماڵ

بە دەست قادرە بەخت دەگەڵ ئیقباڵ.

هەتا بەخت بوو ساحێب ئەرکان بووی

گەورەی عێلی خۆت، دەوری زەمان بووی.

من دەگەڵ تۆمە، دەبی ڕەنجەڕۆ

تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ کێ دابووی بە تۆ؟

وا بە سەرفکر کردنی داچووی

ئەوی دابوویەی، هەر ئەو لێی هەستاندووی.

هێندە داد و واوەیلا مەکە

لە خۆت بەرەژێر تەماشا بکە.

هێندە هەڵ مەهێنە تۆ ئەو چاوانە

خەزێنەی خودا گوشاد و فراوانە

ئەو عەرزە گەلێک بەرین و پانە.

ئەوە دڵخۆشی داوە، کوڕە ڕووی بابی سپی بێ! ئەگەر چی! ئەگەر چی!

مەجلیسی بۆ گرت، شەوق و پێکەنین

وەکو مەجلیسی ئاغای میر زێندین.

هەتا دڵخۆش بێ چومکە میوانە
دەیزانی عاجزە، زۆر پەرێشانە.

٢٨

ڕوفیا فکرد کرد، ڕووی کرد لە عاسمان
کار دوروست دەکەی کارسازی کاران
مەکانت نییە، هەرتۆی بێ مەکان
جێت نە لە عەرزە و نە خۆ لە عاسمان
یا ڕەبی بکەویە ڕەحمەت بەخشان.
بەندەی گوناحبار، زۆر گوناحبارم
بە ڕەحمەتی تۆ گە پێک بێ کارم
هەچەند فکر دەکەم زۆر شەرمەزارم
چۆن ساحیب ڕەحمەتی، هومێدەوارم.
لە دوو ڕێ، ڕێیەک، کێهە بدەمە بەر
گەلێک هیلاکم، وەکو قەستە سەر
خەجاڵەت دەبم لە خانەدانم
لە دایک و خزم و برا و بابانم
وە دوای دڵ کەوم، هەتا دەتوانم.
قەولم بە غەریب، بەو کوڕە داوە
دایمە ئەویش دڵ پەشۆکاوە.
کێهە ڕێگایان بکەمە مەنزڵ
بۆ دایک و بابان یان هاواری دڵ؟
برینی دەروون، ئاتەش لە تاوە
لە عەمری پازدە جەرگم بڕاوە
قەول و شەرت و شوێن من بەوم داوە.
گە لە قەولی خۆم ببەم پەشیمان

ئەو وەکو قەقناس دێتە سەر سووتان
ئەمنیش برینم هاتۆتە برکان
ئەمنیش مەعلووم نییە بژیم بە ژیان
گەر لە قەولی خۆم ببم پەشیمان.
کڵفەتی بانگ کرد: ئەی بەئەرکانە!
قسێکی دەکەم، پکە متمانە
جووابم بدەوە مەرد و مەردانە
ئاوری دڵم زۆر بێ ئامانە.
بە عەمری نۆجوان، بە پازدەساڵی
دنیا نەدیوی بە کرچ و کاڵی
شکۆفەی وەخت، من بە منداڵی
چاکت گوێ لێ بێ، لێم ببە حاڵی.
ئەلعان هەمیشە دڵ بە پەیکانم
دایم و دەرهەم چاو لە گریانم
ئاتەشی عەشق لە جەرگ و دڵانم.
مەجنوون بۆیە جێی کێو و کۆهسار بوو
هەڵبەت وەکو من دڵ بریندار بوو.
دەستم داوێنت گەلێک بێ چارم
گەلێک مەغشوش و دڵ لە هاوارم
بە عاقڵ و کەماڵ پێک بێنە کارم.
بە مێهرەبانی، بە هێدی و هێمن
وانەکەی سەعید بێتە سەر کوشتن.

٢٩

ئەوە کڵفەتەکەی پێی دەڵێ:
هەزاران هەزار لێیان قەوماوە

له تۆ گەورەتر، ئەو بەند و باوە
چەند کچ لە ماڵە بابی هەڵگیراوە
ئێستا هیلاکی، عاقڵت نەماوە.
پێنج و دوو ڕۆژێک جەنگ و تاڵییە
ئەوجار، مەترسە، خۆشی و کاڵییە.
نەخشەت بۆ بکێشم بە ئیزنی خودا
شەماڵ و زریان لە سینەت نەدا.
پێویست نییە ئیدی ئەو واوەیلایە
دەزانم گریێت وا لە دڵی دایە
کوڵمەت دەدرەوشێ، دەڵێی چرایە
بەژنی بێ غەوشت وەکو بیزایە
وێسپی میسرێ دە شەوگوردت نایە.
تۆ بێ بەلابی ئەرێ شەکری خاو
تۆ ناڵەت نەیە لە جەرگ و هەناو[18]
لێت شل نەبێ ڕۆیین و هەنگاو
جێ بەجێی دەکەم بە هەور و بە ساو.
بمکەی بە وەکیل، من ببمە موختار
بەهومێدی خولا پێک دێ کاروبار.

٣٠

بە لیمۆی کاڵم، هەڵومرن برۆ
خۆم تەسلیم دەکەم سەت جاران بە تۆ.
وەک مفەتیشان تۆ نەکەی قسان
سبحەی بیکەیە کارێکی گران
چومکی جگەرم هاتۆتە سووتان
لەگەڵ کەسی دی نەکەوتوومە قسان.

یەکجار زۆر دڵم ئەوی خۆش دەوێ
شەو بێدارم، خەوم لێ ناکەوێ.

٣١

کڵفەت قەول دا، سوێند خوارد بە کەریم
پادشای ڕەحمان، کارسازی قەدیم
غەیانەت ناکەم هەتاکو بژیم
ئیتمینانت بێ ئەرێ شەنگەسیم.
دوڕێکی دایە، بە قیمەت گران
ببیە بۆ سەعید، غەریبی میوان
با دڵنیا بێ، نەبێ سەرگەردان.
لە کنی بێ دیاری، نام و نیشانە
ئیعتیبار دەکا، دەکا متمانە
ئەو زیاتر لە من دڵ پەرێشانە.
پەرێشان نەبێ، نەبێ سەرگەردان
قەولم دوروستە وەک قەولی مەردان
ئەو تەفرە نادەم، هەم لەسەر دڵان.
من لەوی زیاتر دڵم پڕ سەنگە
مەغشووش و عاشقم، دڵم زۆر تەنگە.
ئاو وا ڕژاوە هەر پیاو بۆ ژنان
قەراریان بووە و هاتوونە ژووان.
بڕۆ بزانە قسەی وی چییە
دیداری سەعید لە من قاتییە.
تیری بەدبەختی لە جەرگی داوم
کزە کزیەتی جەرگ و هەناوم
ئەمن شەو و ڕۆژ بۆ وی سووتاوم

تراوکە[١٩] دەکا، نابینێ چاوم
وەک شیری خاوێن، من هەڵگەڕاوم
کاروان ڕۆیشتووە من بەجێ ماوم
دەڵێی تەیرێکم من باڵ شکاوم
هەمیشە دەروون پڕ لە زووخاوم
دڵ پڕ هێش و ژان، لە کاوە کاوم.
ئەویش وەکو من وا گەرووتاڵە؟
ئەویش وەکو من شێت و عەبداڵە؟
بە دیاری بدەنێ ئەو چاوە کاڵە.

٣٢

کڵفەتەکە دەیزانی چ وەختێک سەعید لە وەتاغێ دەچێتە دەرێ. دەو عانیدا هات، ئیشارەتی سەعیدی کرد، سەعید تێگەیشت، ڕاوەستا لە سەری. کڵفەتەکە کوتی:

هانێ تۆ بگرە بەندی دوڕی لاڵ
با لێت کەم ببێ حەسرەت و خەیاڵ
ئەتۆ شاد دەبی بە دوو چاوی کاڵ.
بە مێهرەبانی، بە گوفتی شیرن
بە خۆش ئەخلاقی، بە هێدی و هێمن
دایم و دەرهەم هەر خزمەتکارم
غوڵامی مەمکی وەکو هەنارم
فریادی دڵم، داد و هاوارم
خودای تەعالا پێک بێنێ کارم.
ئەلعان حازرم بە ڕووح و بە گیان
بە خزمەتکاری، وەکو نۆکەران
ئەگەر دەپرسێ زیاتر لە قسان
دەستی هەڵگرێ لە باب و باوان

تا ڕووحی خۆمی بکەم بە قوربان
هەتا لە دنیا بژیم بە ژیان
وەکو ئەنتیکە بینێمە سەر دەستان
هەتا ئەو بەرم بۆ ماڵی باوان.
دەنا بە کوێری، بێ ڕووناکایی، بە بێ بیناهی، دەڕۆمە دواوە
مەجنوون وەک منی لێ نەقەوماوە
بە قسەی ئەسەحی من جوابم داوە
گە ڕازی نەبێ کیژی تێل بەسەر(٢٠)
جوابم چاک نەدا و، بمکا دەربەدەر
تەکلیفی چییە لە سەحرای مەحشەر
زۆر بە عاقڵی پێی بدە خەبەر
دنیا تاریکە لە من سەرانسەر
تیری لە جەرگم وای کردووە هەتەر
لە ڕاستەی داوم لە چەپ چۆتە دەر
گەر بێ مەیل بێ من خاکم وەسەر
بە وەعدی سێ ڕۆژ پێم بدا خەبەر
لە ماڵە بابی، لە گەنج و گەوهەر
ئەوی شک دەبا سکە سەرانسەر،
حازری پکا بۆ ڕۆژی مەبخی
ئەگەر ڕاست دەکا و بۆم حازر دەبی.
دەنا خاترجەم من بێ مرادم
بێ ملک و ماڵم، قەت بۆ وی نابم.
ئەوە قسەی ڕاستی پێ گوت.
نەترسێ لە ڕۆژی بڵێسەی تیر و شیر، لە قرمەی خەنجەر
قەستەم بە زاتی دەهەندەی داوەر

لە نێو لەشکردا دەبمە پەڕ بەسەر.
وەکو فەرامەرز، ڕۆستەمی زاڵم
وەکو سێلاوێ لەشکر دەماڵم.
سینەی جەوهەردار بکەمە سپەر
هیچ خۆفت نەبێ، ئەرێ تانج بەسەر
وەک شێری نووستوو دەبم بەخەبەر
گە حەوسەت بن لە ئاغا و نۆکەر
پاکیان هیلاکن، دەبن دەربەدەر.
خاترجەم ببە بێ دەسەلات نیم
ڕۆژی لێقەومان لەسەر هەلات نیم.
بۆ قەرە زولفت ئەمن دێوانەم
دەنا زۆر ئازام، پیاوی زەمانەم.
نەوەک خەیاڵ کەی ببن خەبەردار
ئەویش دەکوژن، ئەمنیش گرفتار
لە ماڵی باوان دەبم شەرمەزار.
کلفەت بە نیمناز خەبەری هێنا:
ئەرێ نازەنین! ئەی شێت و شەیدا
حەریف وەک شێرە، جگەر هەژدیها
زۆر بەهاسانی، ئەتۆ چاک دەبا.
عەجیب جەوهەردار، ساحێب گوفتوگۆ
ڕەشید و ئازا، مەردی سەربەخۆ
لە نێو مەیداندا پێی دەردەکرێ گۆ
یا ڕەبی دایکی بۆی نەکا ڕۆڕۆ!

٣٣

هەرتكیان قەراریان لەسەر ئەوە دانا كە بیبا و هەڵیگرێ. سەعید ئیختییاری ئەوەی نەبوو بڵێ: بمدەنێ. ڕێگای ئەوەی نەبوو بیدەنێ. سەعید بە مەبخی بە كڵفەتەكەی گوت:

بە سەرگەردت بم، كوڵمە وەک لیمۆ!
كارێكم هەیە جێبەجێی كە تۆ
جێیەكمان بۆ ببینەوە لێی بكەین گوفتوگۆ.
كڵفەت بە عەدەب جوابی دەداوە:
چونكی خانمم دڵی گۆڕاوە
پڕ لە كل دەكا ئەو جووتە چاوە
ئەویش وەكو تۆ جەرگ سووتاوە.
خاترجەم ببە بە زاتی سوبحان
جێبەجێی دەكەم بە مەبخی و پەنهان
خانم بۆ ئەمن لە خەڵات بەخشان
ئەگر هەڵدێنێ ئەو گەرنی كەشان(٢١)
نایەڵم ئیشەڵڵا بێنە سەر قسان.

٣٤

ئەوە كڵفەت جێگایەكی بە سەعید نیشان دا، كوتی: شەوێ ئەگەر بۆی هەڵكەوێ دێ. گوفتوگۆی خۆتان بە خاترجەمی بكەن بێ ترس. كام و مەڕامی خۆتان لەوێ پێک بێنن.

كڵفەتەكە هاتەوە، بە ڕوفیەشی كوت، كوتی: لە وەختی خۆیدا بچۆ، چاوەڕێم كردووە، قسەی خۆتان وا بكەن ئەگەر كارەكەو زۆر لێ كۆن نەبێ، زووتر بە دڵی خۆو بگەن.

دایكیشی كەمێک سۆزەی كرد بوو، دڵی خەبەری دابوو. ئە لە وەیدا قەرەوڵ و حیساباتی دانا. حەوت شەو سەعید دەچوو، هەتا ڕۆژ لە وێ دەبوو؛ ئەو دەرفەتی

نەبوو بچێ، دەیگوت: بزانن کارەکەم لێ دوور دەخەنەوە، ئەو حەوت شەوە سەعید خەوی لە چاوی نەکەوت، دەبوو بە ڕۆژ دەهاتەوە.

دایکی ڕوفیەش، ئەسمە خانم، دڵی نەدەهات خەبەر بە کەس بدا، ئیدی شتێک بوو قسەکەی هەر دە دڵی خۆیدا ڕاگرتبوو.

بۆ هەشتەی دەرفەتی وەگیر کەوت، چوو. هێندە چاوەڕێ بوو، وا درەنگ چوو، ئەگەر چاوی پێی کەوت، گوتی:

زۆر چاوەڕێ بووم، درەنگت کرد ئاخێس

بەرۆک قاقم ڕەنگ، کردت قرمە ڕێز

لە بەرت کردووە ئەتڵەسێکی دێز

بۆ من دووزامم لێم دەکەی پارێز؟

حەوت ڕۆژ چاوەڕێ، من خەوم نایە

ڕوحم تیژ باڵە، دایمەت لە لایە

ئەمنت بم بە قوربان ئەو لاجانگ و گۆنایە

دیتنی تۆ بۆ من کابەتوڵڵایە.

خاڵی سەری کوڵمەت هەر وەک شەو زەنگە

چاوت فەرماندەیە و خەبەر دەدا، دەڵێ: ئاتەشە و جەنگە

بەرۆکت دەڵێی باغی شەددادە و دەنوێنێ بەهەزار ڕەنگە

شێخی ئیرشاد بتبینێ، بە دیتنی تۆ دینی لەنگە

ئەمن ئەو کارەم بۆ کرد؟ لە خۆم زیاتر! سەرم لە سەنگ دا.

ئەگریجەت ئەگەر تاق و جووت لەسەر کوڵمەت دانا

دایم ڕوحم گیراوە. بردوویانەتە حەفسخانە

هەر مەتڵەبم تۆیە، وە نازانم ئەو دنیایە تێی دایە چاک و خراپ و شێت و دێوانە

دەمرم لەبەر قەرە زولفت، دەڵێی عەسکەری فەرەنگ و پادشای عوسمانە

قولکەی گەردنت شەربەتی کەوسەرە و فینجانی بەڕەحمەتت لەسەر دانا

با تۆ قابیزیش بی، ڕوحمت ببێ، جووانم، چ – وەختی گیان کێشانە؟

لفکەی دەسماڵت ئەوبەر ئەوبەر کردووە و کردووتە لانە و لانە
هەزار جارت گیانی من ببێتەوە بەقوربانی ئەو جووتە چاوانە
ئێکێکیان بۆ من جەللابی قەستە سەرە و ئێکێکیان بۆ من حەکیم و لوقمانە
درەنگ هاتنت بۆ من بوو بەقەستە سەر، هاتنت بۆ من خۆشی و بەشارەتی و خەڵات بەخشانە
بۆ ئەتۆ لەیلێی سۆسەن خاڵی؟ بیستووتە گە مەجروومی دەربەدەر کرد لە قەوم و خێش و کاشانە
بەو قەرارەم دەربەدەر مەکە، ئەمنت ببم بەقوربانی گۆی ئەو جووتە مەمکانە
دەڵێی مانگی چاردەیە، وەختی درەنگ هاتن و پەنهانە.
دەمرمەوە لەبەر ڕیشوەی دەسماڵت، دەسکار نییە، مروارییە
هاتۆتە خوارێ بەسەر خاڵی ڕەش و گەردنێکە سپییە
زۆر چاوەڕوان بووم، بۆ تۆ زۆر خراپ و گوناحبارییە
گە بێتو ئازادیم لێ وەرنەگری، ڕۆژی قیامەتێ تەکلیفت چییە؟
ئاخر ئازادت دەکەم، بۆچی مابەینی من و تۆ دۆستایەتی و خۆشەویستییە
بەژنت لە من هەڵێناوە و دەڵێی بێ گەلایە و شەنگەبییە.
زۆر ئارەزوو هەیە ئەگەر دەگەڵم بکەی گوفتوگۆ و پکەوییە قسانە
دوڕ بێتە دەر لە مابەینی ئەو لێوانە، دەڵێی مەرجانە
قسەکردنی تۆ بۆ من حەسانەوەیە، وە دەزانم پادشام لەسەر
تەختی دانیشتووم و ڕۆژی مەردانە
دەمرم لەبەر قۆیتاسی سەر جەواهێرات، هاویشتووتە ئەو شانە و شانە
هەچەندی پێدەکەنی وە دەردەکەون لە پێشەوە ڕێزەی ددانە
لە من وایە سوڵتانی ئەستەمبوڵم و خەزێنەم کردۆتەوە و هاتوومە سەر خەڵات بەخشانە
عاشق، زەلیلم، مەستم، چ وەختی جگەر ئاور تێ بەردانە؟

ئەو جار نۆرەی جوابدانەوەی ڕوفیە خاتوونێ دێ:

به لەبزی شیرن، ئەو بە پێکەنین
جوابی دەداوە شۆخی نازەنین
وەک ڕۆژ کە هەڵدێ لە خاوەر زەمین
ئەگریجە و زولفی داناوە چین چین
شەفافی کوڵمەی وەک گوڵی زەمین
تام خۆش و بۆن خۆش، ئەخلاقی شیرین.
ئەتۆ شێتیش نەبی من دەڵێم بەنگییە
عافرەت ئیختیاری لە دەست خۆیدا نییە
کەسێک بیزانیایە بێ ناموسییە
بۆ تۆ بەدبەختی و دەربەدەرییە
بۆ من بێ نازی و سووکایەتییە.
دایکم نازانم کێ پێی داوە خەبەر
هەمیشە منی کردووە دەستبەسەر
بۆ کاری پێویست ناوێرم بێمە دەر.
ئەگەر بزانن خزم و کەسوکار
دۆست تاکو دوژمن، هەتا کەسێک یار
وەک پووشی بەر ڕۆژ من دێنێتە خوار.
پەلە لە کاران هەر بەدبەختییە
ئەتۆ لە وەیدا شعوورت نییە.
ئاتەشی عیشق تۆی کردووە هیلاک
هەر وەختە ئەتۆ سەر بنێی لە خاک
ئەتۆ لە هیچ کەس نیتە ترس و باک.
ئەگەر بزانن نابم تێل بەسەر

دەبێ لە دنیا ببم، دەربەدەر
سووک و چرووک بم، ببم دەستبەسەر
جا پیاو تاڵی بخوا یا نەخۆشەکەر؟
دەرفەتم هەبوو من بۆیە هاتم
بە دیاریم هێنا کوڵمەی نەباتم.
مەبە بە باعیس ڕۆحی نازپەروەر
کەمترم مەعموور تۆ بکە دە سەر
کەمم لێ بگرە تۆ ئەو بەرە و بەر.

٣٦

جا ئەو جار سەعید دەڵێ:
ئاخر بەخۆم نییە، دڵ بێ قەرارە
ڕای دەوەشێنی کرمەک و گوارە
بەناز هەڵدێنی چاوی بەخومارە
سنگت هەر وەکو بازاڕ و شارە
بەروێت دەنگی دێ، دەڵێی قەتارە
قەرە زولفانت قەدی ڕەشمارە.
ئەگەر دەتبینم، بە ناز و نیمناز
زولفی سێ بەنگی، باڵی قەرەناز
من بوومە کۆتر، ئەتۆ بوویە باز.
کەمتر پێم بگرە عوزر و بەهانە
خاڵت داناون جووت دانە دانە
چاوان وەکو ئەستێرەی بەیانە
کرمەک و گوارە هاتنە جەولانە
ئیغیار نیم، مەستم، دەبمە دێوانە
ئەنگوستیلەی دوڕ لە نێو قامکانە

هەمووی میراتی حەزرەتی سولەیمانە
دەنا ئەو نەخشە نییە لەو دەور و زەمانە
بیناهیم دەبڕی لەو دوو چاوانە
جەرگ و دڵ کەوتنە جەولانە دانە.
با دانەنیشین بە شەرمەزاری
لە ئێمە ببڕن ڕۆژی دڵداری
هەرتک با بڕۆین بە جووتە سواری
نەک شەیتانان چەتمان بدەن لە کاری.
هەچ کەس بێتو زێندیناغا حاڵی بکا
بۆ من دەبێتە قالووەلا.
چومکی ئەلحەقی بۆ من پەزێرە
مێردی حیسابی، گەلێک جوانمێرە.
زۆر بە حورمەت من لێی میوانم
من مەمنوونی ویم هەتا دەتوانم.
خەجاڵەت نەبم، بەختم تێک بهاڵێ
ئەی کەسێک قسە بکا، زمان لاڵێ
دەبم بەکۆینەی سەت هەزار ساڵێ.
ئەگەر بێتو کارێکی وا ڕاببرێ
ئەو جار هیچ کەس میوان ڕاناگرێ.
بۆچی غاییبە لە کەس دیار نییە
دەنا کارێکی غەیانەتییە
من دانیشتووم بە نمەک خۆرییە
بە ئاغام زانی، پەنای کەم نییە.
بێتو بزانێ ئەو شەرت و ئەرکانە
تەماحی کردووە لە حەرەمخانە

ڕوفیە دەڵێی سێوی سەر دەستانە
لەگەڵ ڕوفیە خانم لەسەر قسانە.
ئەلعانەکە چاکە نەختێک سەربەخۆم
دەنا دەبێ ڕووی خۆم ڕەش کەم ، لە دنیا بڕۆم
بۆچی من تەماح بکەم ئەگەر لە ئاغای خۆم.
دەستوبرد بکە ئەتۆ لەو کارە
دوو بەدوو دەڕۆین بەجووتە سوارە
قەدریان کەم نەبێ ئەو دوو چاوە بە غومارە.
بی ئەگەر چەقاندت درەنگ شین دەبێ
گۆشت ئەگەر ماوە بۆگەنیو دەبێ
ئەو کارە لێمان ئاشکرا دەبێ.

٣٧

ڕوفیە جوابی دەدانەوە:
لێت قەبووڵ دەکەم قسەی مەسڵەحەت
منیش دەترسم ئەگەر بگرین بەد.
بە وەعدەی سێ ڕۆژ هەر مونتەزیر بە
چاوەڕێی لوتفی باغی هەنجیر بە
ئامما وەکو باز هەر نێچیر گیر بە.
دڵم دەردێنم لە حەفسخانە
مردن خۆشترە نەک ئەو ژیانە.
بە دزە دزە و بە سەت واوەیلا
پیاو نازانێ چلۆن پارێزێک ببا
وەک دەچێ بۆ بێچوەی شێر مار و هەژدیها
گە شێر بزانێ تۆخماغی دەکا.
بەوەعدەی سێ ڕۆژ کار دەبەمە سەر

لەگەڵ خۆم سازدەکەم گەوەر و ئەسمەر
لە ماڵی باوان ئیشەڵڵا دەچینە دەر.
من لەگەڵ تۆمە چاک پاک کەوە ڕێیە
کە ئێمە بڕۆین ڕێ و جێت کوێیە؟
دەبێ بەعاقڵی زۆر بە تەڕدەستی
لەبەر سێ سەت سوار نابێ بوەستی.
ئەی موقەددەرە، ببێتە دڵهێشان
ئەی موقەددەری پێ بکا خالقی حەننان
وە دوامان کەون مەردی زێندین خان
وەک ڕۆژی قیامەت بێتە تیر باران.
چاکت گوێ لێ بێ هەتا لە لاتم
ئەمن عافرەتم، بێ دەسەلاتم.
ئەتۆش وەکو من بی دەستەوئەژنۆ
لە مەیدان ببێتە داد و ڕۆڕۆ
لە بەرمان دەڕوا خوێن وەک جۆبار و جۆ.

٣٨

ئەوە سەعید جووابی دەداتەوە، دەڵێ:
عیلاج و دەردم زۆر بێ ئەنوایە
چومکە سوارە و ئیمدادم لە دوا نایە
موقەددەر مەگەر بێ لە لای ئەو خودایە،
دەنا خاترجەم من جڵەوگیرم
وەکو هەژدیها، چۆن شێری پیرم
من دەست ڕەقاسی لە شیر و تیرم
تۆ ترست نەبێ باغی هەنجیرم.
دەجا تۆ بڕۆ خەریکی کار بە

وەک قەرە سۆران دڵ خەبەردار بە
بێ خەم و خەفەت، تۆ بێ ئازار بە.
لە ڕۆژی مەیدان من نیمە شکۆ
ئەویش دەگەڵم بێ قەدەمی تۆ
لێم دەستێننەوە هەنار و لیمۆ؟
قرمەی خەنجەر و شەقەی ئاوزەنگی
بڵێسەی ڕمب و پیاوی شێر ڕەنگی
وەکو ڕۆستەمم بکەومە جەنگی.
من باکم نییە لە پێنج هەزار سوار
لە بەر تیری من کەس نابێ قوتار.
من چەندم دیوە دەور و زەمانە
دەنگی تیران دێ هازەی پەیکانە
چەند کەسم کردووە شێت و دێوانە.
وا تەماشا مەکە لێرە بێ ئیختیارم
من باغەوانی باغی هەنارم
یا ڕەبی خولا پێک بێنێ کاروبارم
ئەمن قاتڵی پێنج هەزار سوارم.
پێی دڵخۆش بوو ڕوفیەی شەکری خاو
ئەو شکۆفەی دا وەک گوڵی لاولاو
قەدەمی توندکرد، ڕووناکی بوون چاو
بۆجێ و ماوەی خۆی ڕۆیی بە هەنگاو
ڕاستی کردنەوە ئەو زولفی شێواو
دوگمەی توندکردن ئی سنگی ژاکاو.

٣٩

ئەوە ڕۆفیە هاتەوە جێگای خۆی. ئەگەر هاتەوە بە دڵی گوشاد، بانگی کڵفەتێکی خۆی کرد، ڕۆفیە یەکجار زۆر لەماڵێدا بەدەسەڵات بوو.

حوکمی وەک حوکمی سەوڵی خەرامانە

وەکو شەددادی دەور و زەمانە

ئیختیاری حوکم بابی بۆی دانا.

جا ئەوە کڵفەتەکە هات:

سەر ئەفروزی بوو، تەعزیم بە یەکجار

وەزیفەی، چاتر پێی دەکرد ڕەفتار

گەردن هەڵاڵە کوڵمە چون خوسار.

عەمر بفەرموو شۆخی شۆخ کەمان

تا جێبەجێی کەم کار بە دڵ و گیان

ئیشەڵڵا نایەڵم بکەویە سەر قسان

هەر ئیختیاردار بی، خانم و سوڵتان

هەر دڵ گوشاد بی بۆ خەڵات بەخشان

بۆنت عەتربەخشە وەک گوڵ و ڕیحان

سەتی وەک منت ببێ بە قوربان

سەر تۆپی عالەمی کیژێ خان و مان

لە تۆ جوانە لێو دەگەڵ ددان

پێم وایە ئەوڕۆ چووبووی بۆ ژووان.

٤٠

ڕوفیە کوتی:

پێم وایە، ئەتۆ وەک گوڵی

بێ عاقل نی، عاقڵ کامڵی

هەمیشە لە من تۆ قەرەوڵی.

عەمر و عەزیزم! بیناهی چاوانم
تام خۆش و بۆن خۆش، گەردن کەشانم
لەبزی بێ ڕەکیک، لەبەر دڵانم
خزمەتت دەکەم هەتا دەتوانم
وەنەوشەی ساوای باغ و بێستانم
ئاخر ئەمن بە سوڕی تۆ دەزانم
بۆیە قەرەوڵی گۆشەی چاوانم
من جڵەوگیری شوبر و شەیتانم.
جا نیازی دڵەکەی بەکڵفەتەکە گوت.

٤١

کڵفەت گوتی: بەخولای قسەی کامڵە
ولاغ حازر دەکەم پاش درێژی پێش کورت، پشت وەکو مڵە
هەتاکو بڵێن مەخسوودت حاسڵە
تەنەزول نەبی لەو دەردی دڵە
ئەگەر تۆ منداڵ بی سەعید کامڵە.
بۆت وەکار کەوم ئەمن هەر بۆ خۆم
زینی سەدەفکار، کاری عەرزە ڕۆم.
مەجیدی و عەبو تۆپ، خەزنە بە خەڵوار
لە بۆ ڕفتاری دەوری ڕۆژگار.
مەترسە، غیرەت قەت لە دەست نەدەی
دەنا لە دنیا تەنەزول دەکەی.
مەرکەب و زین و تەدارەکیان گرت.

٤٢

شەوێک پێنج شەممۆی مانگی شابان بوو
وەختی هەلاڵە، شکۆفەی گوڵان بوو.

لەسەر نییەتی ئاشقێنی ئەوان وایان کرد
سەعید ڕوفیەی لە ماڵی بابی هەڵگرت.
هەتا سێ سەعات هیچ کەس نەیزانی
نە ماڵە باب و ماڵە باوانی
نە دۆست و دوژمن نە ئاوەدانی.
سێ سەعات ڕابردوو دەچوون بەڕێوە
هیچ نەژاکاوە ئەو کوڵمە سێوە
دەڵێی دووکانە و دەسکی گوڵ پێوە.
بایەکی دەهات وەکو سەرسەری
بەخەیاڵ نووستبوو دایکی دەرپەڕی.
بزانم ڕۆفیە لەسەر چ حاڵە
بە فریوی نەبەن، گەلێک منداڵە.
ئەگەر کردیەوە بورجی ڕەنگاورەنگ
نەیدی بەچاوان ڕوفیەی شۆخ و شەنگ
کلّفەتی بانگ کرد بە مەبخی و بێ دەنگ
پێم بڵێ، ڕاست برۆ، ئەو کارە چییە؟
لە نیسفی شەوێ ڕوفیە دیار نییە
بۆ من شان کەسری و بێ نامووسییە.
دەنگی دا: خانم! من بێ خەبەرم
ڕووحی ڕەوانم، ئەی تانجی سەرم
ئەمن کلّفەتم، من عومربەرم.
ئەمن نازانم بەزولفی تاجدار
ڕوفیە چی لێ هات، کیژی مەزەدار.
بەڵکو، شەوە، خەوی لێ پەشۆکابێ
سەری لە دەرکی کلّفەتێک نابێ.

یانە چووبێتە ماڵی جیرانێ
چون ئەو جەوانە، حاڵ چاک نازانێ.
وەختێکی گە چوون بۆ خەزنەخانە
شپرزە و شپڕێو بوو ئەو مەکانە.
ئەگەر زەینی دا جەرگی بڕاوە
جیاز و قوماش هیچی نەماوە
دەرکی ڕووی خەزنە پێوە نەدراوە
کوڕڕەی دەریایی دووانیان براوە
نیوێکی ماڵی تالاّن کراوە
سەعید میوان بوو، ئەویش نەماوە
بە داد و گریان بە شین و هاوار
ئەو جار زێندیناغا دەبوو خەبەردار.

٤٣

جاڕچی جاڕ کێشا بەئامان ئامان
سوار بن لە مەرکەب سوار و نۆکەران
خراپ قەوماوە، دەستم بە دامان
دەبێ ڕووسیابم تا ئاخری زەمان
ڕوفیەیان بردووە، سەرداری خانمان.
سەرم سوڕ ماوە من لە ئەو کارە
سەعید فەقیرە، هێدی و هەژارە
چلۆن بە ڕوفیەی ئەو بردووە چارە؟
لە هەموو کووچان داد و هاوارە.
دوو سەت کەسیان وە دوا کەوت، هێندێکیان ولاغیان شێر خەزاڵییە
ولاغ هێندێکی کوێت و سپییە
هێندێکی ڕەشی ڕەنگ قەترانییە

هێندێک سێ ساڵن، پاک گوڵ گوڵییه.
جڵەو ڕێزانه، خراپ قەوماوه
ڕوفیەی سەردار عێل خۆ هەڵگیراوه
دەڵێی وەنەوشەی با لێ نەدراوه
هەر وەکو باغی هەناری ساوا.
قرمەی خەنجەران، سەدای ناڵه ناڵ
وەک ڕۆژی قیامەت، بوو به گاڵەگاڵ
وڵاغ وەک باڵدار پاکی گرتیان باڵ
هێندێکان له سوێی دوو چاوی کاڵ.
ئەوه بەوێڵغار، کردیان به لینگدان
هێندێک بەحەسرەت، هێندێک به گریان
پرسیاریان دەکرد له ڕێبوار و شوان
له خەڵکی غەریب، له شەو به کێوان
کەسو نەدیوه؟ جووتێک ناسک سوار
دوو بەدوو بڕۆن، هەروەکو ڕێبوار؟
کابرایەک دیبوونی، مەڕ له شەو لەوەڕ
یەکی قوشمه بوو، دێوانه و بەدفەڕ.
ئەمن دیتمن نیوه بوو له شەو
له گەردنی دیار بوو خەزێنەی خوسرەو
دوو سوار هاتن ڕۆیین بەسەر ڕەو.
دەفڕین به باڵ هەروەکو کوڕکوڕ
ڕوویان کرد له ڕێی وڵاتی مەرگەوەڕ.
سواره بڵاوبوون، کەوتنه وێڵغار
له هەموو باسکان بووه داد و هاوار.

٤٤

خالق هەر ئەتۆی جەببار

ڕەبی هەر ئەتۆی جەببار

یۆسفت لە زیندان ئەتۆ کرد ڕزگار

ئەگەر بۆت حیساب بکەم، تاکو بیست و چوار

چەند پیاوی گەورە گەورە بەقودرەتت بوون گرفتار

ئەگەر ڕەحمەتت بزووت هەمووت دەکردن ڕزگار

ئەگەر تۆ موقەددەر بکەی چاک پێکدێ کاروبار

گە تەنەزولی بکەی ئەو بەندەی خاکە سار

هەمیشە هەر بەدبەختە، هەمیشە دڵ بریندار.

٤٥

سەعید ئەگەر دەڕۆیی، وەک شەهێن و تەڕلانی

وچانی بە ولاغ نەدا هەتا کەوتە بەیانی

ئاوازەی زەنگوڵان دێ، دەگەیشتە یەک کاروانی

ئەوە مەرگەیی بوون، سەعید چاکی دەزانی.

شوناسی دەگەڵیان بوو، چۆن ئەوان ساحێب زاتن

سەعید چاکی دەناسین، چونکە خەڵکی یەک وڵاتن.

سەعید کوتی: سەفەرو مبارەک بێ مەکان و موزەییەن کرد

قەتارو چاک لێ بوخڕن، ئێوە بکەن دەستوبرد

نەبادا ئەنگۆ ببینن، بڵێن:«سەعید کوژرا و مرد!»

لە من خراپ قەوماوە، کارێکی زۆر گەورەم کرد.

ئەنگۆ خەبەر بەرن بۆ وڵاتی مەرگەوەڕ

خەڵک بزانێ، نەوەک لەشکرم بێتە سەر.

لەشکری گەورە و گرانێ

عیلاج پەزێریم نییە لە ڕۆژی دڵهێشانێ
نەکوو موقەددەر بکا خودای عەرز و عاسمانێ.

ئەوە لە کاروانییەکان دوو پیاوی گورج و گۆڵ ڕۆیین تا خەبەر بدەن بە وڵاتی مەرگەوەڕ. بریو بریو پەیدا بوو! پێشیان پێ گرت.

٤٦

لاقی ڕاستەی وە پێش خست، لەسەر ئاوزەنگی دانا
چۆکی لە قەڵپووزی نا، تیری کرد بەنیشانە
پێشی لەشکری گێڕاوە، شەڕێکی ڕۆستەمانە
ڕوفیە یەکجار شێواوە، گەلێک کرچ و منداڵە
لەبەر بڵێسەی تیران، لە گرمە و ناڵە ناڵە
لەسەر ڕکێف خۆ ناگرێ، یەکجار زۆر زاری تاڵە.
سەعید کوتی: چرای لە دڵم! بۆچی تۆ وا شێواوی؟
خاترجەم بە من هەڵۆم، ئەتۆ دەبیە مراوی
مراوی لە هەڵۆ ناستیندرێ، هەتا زیندووی و ماوی.
دەزانی بۆ شێواوم؟ من لەبەر تۆ دەناڵم
دەنا لە جەنگ و جودال وەکو ڕۆستەمی زاڵم
تا دەگاتە عەینە ڕۆم لەشکرت بۆ دەماڵم
ئەمنت بەقوربان بم! من لەبەر تۆ عەبداڵم
ئەلعان خەبەر بزانن، دەگەنێ مام و خاڵم
ئەمنیش خاترجەم بە کەم دەست نیم، ساحیب گورز و مەتاڵم.
ناوێرن بێنە پێشێ هەتا من ڕوحم ماوە
ببینە سوار و پیادە چەند کەلاک فڕێ دراوە
خوێنی عەقیقی پڕژا، زەمینی پێ ڕەنگاوە
دەڵێی ئەو ڕۆژەیە دەڵێن: سیاوەحش کوژراوە!
ئەگەر چەتر بنگێوی وەک شەهێن و وەک تاوس

ئەمن ئەو شەڕە دەکەم وەک ڕۆستەم و کەیکاوس.
یەکجار زۆر چاکی لەشکر گێڕاوە. ڕوفیە دابەزیبوو. خۆ سەعیدیش بستێکی بەجێ نەدەهێشت! دوو کەسەکە کە لەشکریان دی، هەڵاتن زوو خەبەر بدەن.

٤٧

چادر لە کوێستانێ بوو، لە پێشی شاڵە بەگیانە
عێل و عێلباش تێک ڕژاون، جێگاکەیان کوێستانە
ئەوان خەبەریان دەدا: دۆست هەتاکو بێگانە
ئەگەر گۆشت لە ڕێش بێ خاترجەم لەسەر نانە
سەعید مەرگەوەڕییە، دوژمنی لەسەر سانە
وایان پێش پێ گرتووە، نامێنێ بە ژییانە.
بۆ ئێمە ئابڕوو چوونە ئەگەر سەعید نەمێنێ
ڕوفیە خانمی هێناوە، عێل هاتووە لێی بستێنێ.
سێ سەت سواری هەرکییان دێن دە خاک و مەکانمان
ئەگەر سەعید بکوژرێ، تەماح دەکەن لە گیانمان
بۆ ئێمە ئابڕوو چوونە، بەخوڵای کەسرە بۆ شانمان.
ئەگەر وایان خەبەردا، بوو بە بگرە و بە بێنە
وەکو ڕۆژی قیامەت هەمووی ڕفێن ڕفێنە.
سوارە و پیادە پەیدابوون، سەعید کەم کەسێک نییە
لە مێژە گە نای بینین، قەدەرێکە دیار نییە
زێندیناغا ناتوانێ، کاری بە سەعید چییە؟
خوڵا بکا هێنابێتی کیژێ سوور و سپییە
تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ ئێمە دەی دەین لە خوێنییە
با سەعید دابنیشێ بە ڕوو سووری و ئازادییە.
ئەوە لەشکری وانیش هات. تێک هاڵان، بوو بە شەڕ. زێندیناغا بریندار بوو.

شێری زەرد ماندوو نابێ، لە شەڕی قەت ناوەستی
فەتح و نوسرەتی زیادی، مەعلوم بوو کەوتە دەستی.
زێندیناغا بریندارە، گرمەی عەرزی پەیدا بوو.
بوو بە بگرە و بە بێنە
ئێک دەڵێ: بیکوژە، ئێک دەڵێ: لەشکر بشکێنە
ئەوە خالیداغا هات، گەورەی خدر مامەسێنە.
بوو بەڕۆژی ئاخر زەمان
پیاو زگی پێ دەسووتان
لەبەر بڵێسەی چەخماغان! چەخماغیان لێک ترازان
کوڕڕەم کوڕڕەم پەیدا بوو! لەبەر دەنگی مەرکەبان!
سەدای تەپڵی خوێن ڕێژی! بوو بەگرمە و تەپڵ لێدان
مامز بەگ پەیدا بوو، ئەو بوو گەورەی هەرکییان
سێ سەت کەسی دەگەڵە، هەمووی عەبلە و هیچ نەزان
لە شەڕێ یەکجار زۆر چێن، دەیان هێنا پێشێ سنگیان
چۆن ئەوان ناترسن، بێ بەعسەت و هیچ نەزان
شەڕەکە زۆر گەورە بوو لە عاشیرەتی کوردان
لەسەر ڕوفیەی شیرن ڕوو، هەرکی کەوتنە قوڕ پێوان
گە یەخسیرمان بچێت، دەبێ بکەوینە کێوان
کەژاوەیان دەهێنان، ڕوفیە زولفی دەشێوان
لە کەژاوەیان دەنا، بردیان باغی گوڵ و سێوان
ئامانەتی سەعیدە، بردیان بۆ ماڵە باوان
سێ سەت کچی مەرگەیی دەورەی ڕوفیەیان دەدان
هێندێک بەزمانی شیرن، هێندێک بە دڵخۆشیدان
دەیان گوت: هیچ مەترسێ، وڵاتت کرد ئاوەدان

ئیشەڵڵا سەر دەکەوین لە شەڕی گەورە و گران
تۆ زولفانت نەشێوێ ئەی بۆنی گوڵ و ڕیحان
مەمنونییەت زۆر دەکێشین، ئەتۆ بووی بە بووکمان
خێر و بەرەکەتت هێنا، وڵاتت کرد ئاوەدان
نێوبانگی ئێمە دەڕوا بۆ ڕووسییە و بۆ تورکان
دنیا هەمووی دەزانێ، هەتا خەمسە و مێهرەبان
عومری تۆ بێ بەڵا بێ! لێت نەشێوێن زولفان
چەتری تاوسی بنگێوە، زمانت لەنگ نەبێ لە قسان
تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ دەبێ بۆت بکەنە قوربان
سێ سەت کچی دەگەڵ هات، کردیانە قەدەم لێدان
سەعید مەردێکی تاڵە وەکو باز و وەک تەڕلان
زۆر موقەددەر قەوماون، ئەو دەرچووە وەک مەردان.
لە خۆت خاترجەم ببە، چومکێ تۆ شلک و خاوی
شەڕی وات قەت نەدیوە، بۆیە مەست و شێواوی
وڵاتی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ، دەیدەین لە خوێنی چاوی.

٤٩

خالیداغای خدر مامەسێنە، پرسیاری کرد، کوتی: ئەمن جەرگم ڕەش بووە! سواری وڵاغێکی شێیە
حەوت نۆکەری لە دوای دێن، دەڵێ: سەعید لە کوێیە؟
کارم بە کەسی دی نییە، بزانم ئەحواڵی چۆنە
شەڕی عاشیرەتانە، هەڵی ئایساند ئەو خوێنە
شەیتان زەللەم پێ دەکا! خالید یانە مەمێنە
یان سەعید قەباعەتە، بچۆ ڕووحی لێ بستێنە.
عیشاڕەتیان کرد: سەعید چۆتە سەنگەرێ
دەستێکی شیر و تیرە، دەستێک لە سەر خەنجەرێ

کەس زەفەری پێ نابا، گە دوژمن چاوی دەرێ
مەگەر ڕۆژێکی قادر پێی بکا موقەددەرێ.
خالیداغا هاتە پێش، هیچ نەیدەگرت وچانە
وەکو پڵنگی چەنگ بەخوێن، وەکو ورچی لە لانە
لە سەعیدی ترش و تاڵ کرد، تێکی نا نێوچاوانە:
حەرامزادەی بێ نمەک ڕوحت لەسەر دەستانە
بەهەویای ڕوفیە مەبە، سەعاتێکت لێ میوانە.
ڕوفیە وەک چرا وەک شەم
ئەمن لە تۆی دەستێنم، خاترجەم بۆ خۆی دەبەم
هەر وەکو شێر مەمەندی شەرت بێ چوار پاڵووت بکەم
شۆڕەتت وەها بڕوا، بۆ عالەمت تەنبێ کەم
گەرووت وا لێ تاڵ بکەم گە بتدەنێ ئاوی زەمزەم
ڕوفیەت لێ بەمیرات بێ، پێ بزانن ڕۆم و عەجەم
تەماداری هیچ مەبە، ئی شەمامەی گوڵ بەدەم
ئەمن قەستم کردووە، ڕوفیەی کاڵ بۆ خۆم دەبەم.
سەعید وەک شێری بریندار لە سەنگەرێ دەغەزرا
دنیای لێ ترش و تاڵ بوو، وەک شێر و وەک هەژدیها
ئەو کەسە بێ غیرەتە دیفاعی ڕوحی خۆی نەکا
چەند کەس بەو دەردە چوون گە ڕابردوون لە دونیا
تیرێکی حەوت مشتەیی لە ماڵی کەوانی نا
وەکو برزوی شێر هەژدەر شانی چەپەی لێ بادا
گەوەزنی پێشی تیری چەرمی جەولانە دەکا
تەپڵی سەری دەدا بەر، لە قوڵکەی گەردنی دەدا
وکو تۆپی منداڵان، لە ڕکێفی فڕێ دەدا
کەلاکی سەردار عێل قەل و داڵاش با بیبا

بوو بەداد و واوەیلا!
باب بە کوڕی دەگوت: نەچی!
هێندێک کەس پەشۆکا بوون، هێندێک کەس خوێن گرتی
هێندێک کەس دادەبەزی، با یەختەرمەی لە دوو بی.
بەکوشتنی خالیداغا ڕاوەستان و گرتیان سان
نۆکەر و کەس و کاری قەدەرێک بۆی دەگریان.
بوو بەداد و هۆنە هۆن
کار چۆن پێک دێ؟ چلۆن
کەلاکی وییان هەڵگرت
چومکی من مەردم بۆ خۆم
چەندازەی مردوو بڕوا بۆ وڵاتەکەی عەینە ڕۆم.

٥٠

سابیر بەگ نۆ جەوانە
عومری ئەگەر زۆر زۆر بێ، تازە هەژدە ساڵانە
زۆر جوانچاک و سوارچاکە، دەست بە شیر و پەیکانە
خەبەری ڕوفیەی زانی، بۆتە شێت و دێوانە:
خۆ قەوڵیان بە من دابوو! ئەو جار ماڵم وێرانە
ئەمن قەت ڕۆفیە دەدەم! بکەوێتە دەست بێگانە
مەگەر عومرم نەمێنێ، بێمە سەر خوێن پڕژانە
جا خۆ ئەو حەلەش هەر مەردییە، بڵێن: خوێنی خۆی لەسەر ڕۆفیە دانا.
پیاوێکی زۆر بەوەج بوو، وەک شەهێن و وەک باز بوو
ئەو وەرزیشی کردبوو، یەکجار زۆر تیرەنداز بوو
ئەو بۆ کوشتنی سەعید یەکجار دڵی داوخواز بوو.
دەنگی وڵاغی دەدا، بە سنگ و قەوەی مەرکەب چەند کەسی بەرەوپشت خستن.
بە دەو قووەی مەرکەب دنیای لێ تاریک کردن.

ڕۆژی لێ کردن بە شەو
لەگەڵ سەعید گەیشتنە یەک، وەک ئەفراسیاب و خەسرەو.
سابیر ئاغا دابەزی، نۆکەر ولاغیان وەرگرت
وەکو کەکی کۆهەزاد دەست گەرم بوو، دەستوبردی کرد
چۆ سەر سەنگەری سەعید، شانی یەکتریان دەگرت
قرمەی خەنجەران دەهات، قیامەت ڕا دەبرد
ساحێب غیرەت نەیدەوێرا، تەماشای وانی نەدەکرد
سەعید نەپەشۆکابوو، ئەو بەخەنجەری سێ بست
لە سابیراغای دەدا، جەرگی لە پشت وە دەرخست
تەواوی لەشکر زانییان، دەست و لاقیان دەبوو سست
فەتح و نوسرەتی گەورە سەعید خستییە مست.
ئاغا نۆکەری کوژراوە، نۆکەر ئاغای بەجێ ماوە
بەخوێن دنیا پاک ڕەنگاوە
چەند کەس بەیەخسیر گیراوە
چەند یەختەرمە بەجێ ماوە
لەشکری هەرکییان شکاوە
یەخسیریان لێ گیراوە
لەسەر ڕوفیە ئەو کارە قەوماوە.
ئەوە هاتنەوە بە دڵساردی و بە دەردەداری و بە هەڵبوواردی.

٥١

جا با بێینە سەر باسی گەورە گەورەی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ
تەواوی خڕیان کردەوە ئێکی دە مەڕ و بیست کاوڕ
با بۆ سەعیدی بنێرین ئەو شوجاعی دوژمن قڕ.
قەدیم ئەو بەگلەرمان بوو

له سەرمان میرخان و خان بوو
یەگجار دەست ڕۆییو بوو، ساحێب نام و ئەرکان بوو
کە موقەددەری لێ قەوما، ئەوە کاری ڕەحمان بوو.
لێو تەڵخ نەبێ ئەحواڵ
حەیفە پیاوی وا دەستکەرەوە نەیبێتن دەوڵەت و ماڵ
با عاجز و دڵگەرد نەبێ چاوی کاڵ و قەدی شمشاڵ.
ماڵی هەتا دە مەڕ، هەتا بیست کاوڕ بۆیان نارد.
بوو بە گرمە و هۆنە هۆن
معافە برینج و ڕۆن.
داوەتێکی بۆ گیرا تا ئەورۆ کەس نەیدیوە
سوور و سپی و توتوفحە وەکو گوڵێ غەملیوە
کۆخ و هەنار و هەنجیر دەگەڵ یەک تێک چڕژیوە.
سەری زولفان دەبزوێ بەشوبایە زریانی
عاشیرەتی مەملەکەت پاکی بەو کارەی زانی
شەربەت و قەنداو دەگەڕێ وەکو ڕووبار و کانی
ڕۆفیە لە بیری دەچوو ماڵە باب و باوانی
لە ڕەشیدی سەعید و لە ڕۆفیەی سنگ کوێستانی
لە دۆڵی ورمێ وە لە مەحاڵی سۆما و برادۆستانەوە هەتا کوردی کەڕە و ئاراڕات،
هەموویان ئەوە بەدیاری و بەخۆشی بە سەعیدییەوە هاتن. کوتیان:
ئەتۆ ترست نەبێ چارەگێک هەتا بستێ
بڵێی ئەگەر «بێ کەسم، کەس لە من ناپرسێ»
ئێمە کۆمەگت دەکەین، چاوت لە دوژمن نەترسێ.
لێت تێک نەچێ گوزەرە
پیاوی ئازا و دەستکەرەوە هەمیشە پەڕ بەسەرە
فەقیری زۆر ناخۆشە، هەمیشە سەرلەبەرە
سەعید یەگجار ڕەشیدە، یەگجار ساحێب جەوهەرە

وەک فەرامەرزی ڕۆستەم ساحێب غیرەت و جگەرە
ئەوە هەموویان پێوەی هاتن، سەعید دامەزرا لە مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕە.
ڕوفیەیان لە سەعید مارە کرد
قەنداوخۆری و حیسابات ڕابرد
شین و واوەیلا دەنێو هەرکییان کەوت.
سابیر و خالیداغا و چەند کەسی دیکە کوژرابوون.
من حاڵم بەوە شێوا
ئاغایان نێویان هەیە، پیاوی فەقیر بێ نێوە.
مارەیان کرد و ئاو بەئاوریدا کرا.
سەعید کوتی: ئۆخەی بە شادکامی و بە کامڕانی و بە عاقڵ و فامی و بە ئاشکرایی، ڕوفیە لە لامی

٥٢

**ئەوە دەچینە سەر میر سێوە دین بەگ ئەوجار:**
خالقی حەیی داوەر
دنیات دانا سەرانسەر
داتنا پیر و پێغەمبەر
ساحێب جەوهەر و بێ جەوهەر
هەرچی ئیرادەی تۆ بێ، چ پکا بەندەی خۆڵ وە سەر؟

٥٣

ڕوفیە هەتا پێنج مانگان لە کن سەعید بوو بە خۆشی و بە شادمانی. پاش پێنج مانگەی باری حەملی هەڵگرت. ڕوفیە لە نۆ مانگ و نۆ ڕۆژە، لە عەینی ئەوەی ئەگەر بورجی حیکمەت وە دەربکەوێ، بە عومری خالقی پەروەردگار، لەسەر ئەو زگ و منداڵەی چوو؛ بە سەر و بەرەوە ڕۆیی.
سەعید لە ماڵێ نەبوو؛ خەبەریان دایە، سەعید هاتەوە. ئەگەر گەڕاوە، نەیان

ناشتبوو؛ دووازده سه‌عات بوو مردبوو. کوتی: بۆ ڕاوگرتووه؟ کوتیان: له‌به‌ر تۆ؛ کوتمان: با بێته‌وه.

٥٤

ئه‌وه سه‌عید ده‌ڵێ:

ئه‌و دنیایه‌م پێ خۆش بوو له‌به‌ر ڕۆفیه‌ی شیرن زمان
تیخی ویم له جه‌رگی بوو، دڵم هه‌میشه وه‌ک کوێستان
مردن بۆ من خۆشتره، نه‌بادا بێمه ژیان
بریا قابیس باتایه، به‌عه‌زمی گیان کێشان
ڕوحی من وه‌کو ڕوفیه، ته‌نم چووبا بۆ قه‌بران
له‌گه‌ڵ ڕوفیه‌یان بناشتمایه، یه‌ک کێل بویایه سه‌رینمان
به ته‌مای قیامه‌تێشم هه‌رکمان ببین به یه‌ک گیان
بۆ قیامه‌تێشم چاک بوو پێی قایم ده‌بوو ئیمان
عیلاج په‌زێری نییه، له کیس چوو باغی گوڵان
چومکه یه‌گجار شیرنه قه‌ڵه‌م و نه‌خشی سوبحان
لێم دوور نه‌که‌وێته‌وه، دڵ ده‌سووتێ به سووتان
له دوو لام لێ قه‌وماوه: یه‌کێک نه‌ماوه ئارامی دڵان
یه‌کێک دوژمنایه‌تیمه له‌گه‌ڵ سه‌ر عاشیره‌تان
خۆ له بیریان نه‌چووه خالیداغا و سابیر خان
زێندین بریندار ده‌بوو، برینی بوو له برکان
برینه‌که‌ی چاک بۆوه، ئه‌لعان ده‌ڕوا به چۆکان
جێگای تیره‌ندازی منه ئه‌وی کردووه ماڵ وێران.
به‌خودای ده‌بێ بناڵم! هه‌میشه ده‌ست بده‌م له دڵ
مه‌نجه‌ڵ و قازانی مێردان به نۆ ساڵان دێته کوڵ.
هه‌چه‌ند من فکر ده‌که‌م: یان من هیچ عاقڵم نییه
یان سه‌فه‌رم له به‌ره، که‌لکی ئێرانم نییه.

ئەگەر بژیم و بمێنم
ئەمن لە دوای ڕوفیە لە ئێرانێ نامێنم
دەڕۆم لە بۆ گەرمێنێ، سەری خۆ دەدۆڕێنم
یان نێو و نیشانێکی چاتر لە وێ ڕا لە بۆو دێنم
بەحوکمی دەست و مستم، بەئازایی دەی هەستێنم.
سەعید فکری لە دڵ کرد: دەچمە گەرمێنێ، مرادم ببێ حاسڵ
نایناسم، شوناسیم پێی نییە، ئاغای شوجاع و عادڵ
لەسەر تاریفە میر سێوەدین بەگ لە ناسرییە و کۆنە موسڵ
قسمەتم پکەوێتە وێ، جا ئەو جار دەگەم بە دڵ.
بۆ ڕۆژی دەعوایە، جگەری خۆم دەناسم، شێرە و قەت قەت هەڵنایە
خزمەتی دەکەم تا ڕووح لە بەدەنم دایە.
هەچەند فکری لێ دەکەم، ناخۆشە سەرلەبەری
خەڵکی سەرزەنیشتت کا، دوژمن وەکو موشتەری
لە هەموو جێیەک باست کەن، بکەویە سەر خەبەری.
پیاو ئەگەر پیاو بێ، ئەو کەسەیە، ئەگەر بژی و بمێنێ
یان سەرێکی ئەگەر هەیەتی بە مەردی بیدۆڕێنێ
یان فەتح و نوسرەت لە هەندەران ڕا بێنێ.
ترس و خۆفی پیاو نەبێ لە غەریبی و کاروبار
لەسەر خوانی زینی ڕاست و چەپ ببێ سوار
ترست لە هیچ کەس نەبێ، وەک ڕۆستەم و ئەسفەندیار
دەنا بەسەرلەبەری، گەردن کەچ، ملت بکەی خوار
داخولا کێ پێم بسپێرێ خزمەتێک و کاروبار؟
غەنیمەتێکم داتێ، ڕای بوێرم سەفحەی ڕۆژگار
ڕەبی ئەمن نەمێنم، سەرم بچێتە بن گڵ و خار
شەرت بێ بچمە گەرمێنێ گە ڕوحم ببێ قوتار.

ڕەبی ئەو کەسە نەبێ کە وەک ژنان دابنیشێ و دەستەوەستان بێ
ئەو ڕۆژەم من پێ خۆشە نێوت لە نێو پیاوان بێ
هازەی بڵێسەی گەروەشین، دەنگی تیر و پەیکان بێ
سوار لە ڕکێف وەرگەڕێن، پیاو وەکو قارەمان بێ
نەوەکو دابنیشێ، لەسەر قسە و باسان بێ.
وا بی چاترە نەوەک بەدەستەوەستانی و بەهەناسە ساردی دابنیشی.

٥٥

جا ئەوە سەعید دەڵێ:
پەنام بە تۆ ئەی بیناهی چاوە
عەلیم و خەبیری، ئەمن لێم قەوماوە
لە لایەک ئارامی دڵم بەعومری تۆ لەبەر چاوم هەڵگیراوە
لە لایەک دوژمنایەتی حەوت هەزار سوار پێی دە دەرکم ناوە
ئەو سەفەرە بەهومێدی تۆ دەکەم، نەمکەی خەجاڵەت و سەرلەبەر و جگەر سووتاوە
نەتەویان سەرزەنیشتم بکەن، بڵێن سەعید ڕۆیی، دایک و بابی لە مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ بەجێ ماوە!
بەخەجاڵەتی و سەرلەبەری و بێ هێزی نەگەڕێمەوە دواوە.
پادشایەکی ئەگەر بەسوڕی هەموو کەس دەزانی
ئەوێ ساڵێ لە مەملەکەتەکەی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ دەبۆوە بە نان گرانی
سەعید کوڕی عەزیزە، لە تایەفەی شا قوڵی خانی
سەعید دەچووە کن دایک و بابی، دەیگوت: دایە ئازادم کە! چون بەهەشت لە بن پێی دایک و باب دایە، ئەوی ڕۆژێ ئەگەر خودا دەکاتەوە حەشر و دیوانی
ڕووناکاییم لە ئێرانێ نییە، یان بە پەڕبەسەری دێمەوە یان ئەو ڕووحەم دەکەم فانی.
دایک و بابی دەیان گوت: ڕۆڵە نەبووە و نەکراوە
بۆ عافرەتێک بۆ لە دڵت پەیدا بووە هێش و ژان و هالاوە؟

بۆ تێل بەسەرێک، نۆرەسیدێک، لە وڵاتەکەی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ نەماوە؟
ئێمە بەجێ دێڵی، بێ ملک ماوین و لێمان قەوماوە
سەعید دەیگوت: قەستەم بەوەی کەم ئەگەر دنیای داناوە
ئێرانم لێ بۆتە حەبس و بەند، کەڵکی ئێرانم نەماوە
بەیەکجاریو بەجێ نایەڵم، لەورۆوە زەخیرە و بژیوەی حەو
ساڵو ماوە
ئەگەر بێتو مەرگ مۆڵەتم بدا، لەو سەفەرە دەگەڕێمەوە دواوە.
سەعید پێی لە ئاوزەنگی دەنا و کوتی: بیسمیللاهی ڕڕەحمانێ ڕڕەحیم، ئەمن تەمەننا و دوعام لە کن تۆ چییە؟
یان نەمێنم و سەرم بەرمەوە بن بارستی گڵییە
یان بێمەوە بە فەتح و نوسرەت و ڕووسوورییە.
ئەوە هەر وەکو ورچی ئەگەر دەغەزرێ لە لانێ
شەوی مابوو سەعید دەڕۆیی، دەیگوت: با هیچ کەس بەسوڕی من نەزانێ
هەتا ئەو ڕۆژەی دەچمەوە سەفەری هات و نەهاتێ، ئی گەورە و گرانێ
جا نازانم نە بەمیری دێمەوە سەر تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ یان دەچمەوە دەرکی خەڵکی بۆ پاروو پاروو نانێ
چومکە ئەوە غاییبە، هیچ کەس بەموقەددەری حەق دەستی ئیلاهی نازانێ.

٥٦

ئەوە سەعید ڕۆیی بۆ خاکی عێراقێ، بەهەر چەنگ و چونێکی بوو هاتە مووسڵێ.
سەعید نابەڵەد بوو، بەکووچە و بازاڕی نەدەزانی
نەیدەزانی لە کوێ پەیداکا پارووێک نانی
شەوێ بە نابەڵەدی دەرکی کردەوە لە پیرێژنێک، وە ژوور دەکەون بە دڵساردی و بە میوانی
داپیرێ دەیگوت: ڕۆڵە زۆر بەخێرێی. دیارە غەریب و نابەڵەد و بێ خزم و قەوم و قاشانی

ئەمما ڕۆڵە دیارە پیاوێکی ئازا و وێچوو، نۆجوانی
چ کارەی؟ چ کەسی؟ با داپیرە بەسوری تۆ بزانی
چومکە واسیدە لە کن خودایە، تەگبیرکەریش چاکە بۆ ڕۆژی مەبخی و نیانی
غەریبی، مەغشووشی. بۆ وا دڵتەنگ و سەرگەردانی؟
ڕەنگت خۆشە، نەژاکاوی. پێم وایە خەڵکی کوێستانی
فرزەندی دولبەندم بۆچی وا مەغشووش و دڵ پەرێشانی؟
پیاو دەبێ شوکرانە بژێربێ بە زاتی بێ شەریک و لەم یەزەل و بێ مەکانی
ئیوا هەیە خولا تەڕەقی پێ دەدا و ئی وا هەیە خولا تەنەزولی دەخاتە سەر شانی
نابێ پیاو بەوە بگەڕێ: بەمەغشووشی و سەرگەردانی.
ئەوڕۆکە پێم ڕۆڵە تۆ زۆر پەرێشانی و حاڵت بێ حاڵە
شەنگی، شۆخی، شانت قابیلی گورز و مەتاڵە.
ڕۆڵە هەتا لە دنیایە ماوی بەبێ دەوڵەتی مەناڵە.
غەریبە، ئەما پێم زۆر کوڕێکی لاو و شازە
بەبێ دەوڵەتی مەناڵە و بەدەوڵەتیش مەنازە.
زۆرم دیون لە دنیا پیر و شەخس و جوان و جوانمێرە
بەبەشی خولای قانیع بە و شوکرانە ببژێرە.

٥٧

ئەو جار ئەوە سەعید دەڵێ:
داپیرە ڕەبی ڕووت سپی بێ قەتت کۆست[٢٣] لێ نەکەوێ
وەکو نسیحەتم دەکەی، بەقسەی تۆ قەبرغەم لە عەرزی دەکەوێ
غەریبم، نابەڵەدم، ئاخر ئەمنیش زیندەگانیم دەوێ.
خۆ ئەو عالەمە هیچی لە عاسمانێ بۆی نەباریوە
هەر کەسێ بەرێوشوێنێک عەتای خولای دیوە
ئەمن نابەڵەدم، قسمەتی من ئەوڕۆکە بۆ کۆنە مووسڵێ هاتووە و غەملیوە.
ئەی کوتی ڕۆڵە با نسیحەتت پکەم، پووڵت دەدەمێ، سبەینێ

بچۆ کن مەستەبەگی، تەبەقێک قایشی فەڕەنگی بکڕە، ئەوی عەسڵە بوڵغارە
دایکت بۆت دەدروێ، پێشی بڵێن: سەدەفکارە
ئاوریشمی خاوی تێ دەخەم، لە کن هەموو کەس موعتەبەر
بێ و بڵێن: لە هەموو کەس ڕا دیارە
پێنج و دوو ڕۆژێک شەربەت فرۆشی بکە، هەتا چاوو ڕوون هەڵدێ و دەکرێتەوە، دەتبێتەوە بەڵەدی و شوناسی و ئیختیارە
ئەگەر ڕۆژیش دوو پارە پەیدا بکەی، بەحاڵە حاڵ بیگەیەنیەوە بە سێ پارە
ئەوە بۆ سەفحەی ڕۆژگارە
شەوێ لە ماڵە داپیرەی خۆت بگرەوە وچان و قەرارە
هەتا بزانین ئیرادەی لەسەر چییە ئەو بێ مەکان و پەروەردگارە
سەعید بیست و پێنج شەو بەقسەی داپیرەی بە شارەکەی کۆنە مووسڵێدا دەهاتەوە خوارە
لە شانی دەبەست کوندەیەکی جەعفەر بەگی لەوی عەسڵە بوڵغارە
پێشی کوندەی گوڵینگ ڕێزە و سەدەفکارە
سەعید دەیگوت: چ بکەم؟ نسیحەتم وایە، چارم بێ چارە
ڕۆژێ پەیدای دەکرد سێ پارە؛ ڕوحمیان پێ دەکرد، لێیان دەکڕی، دەیان گوت: فەقیرە، بێ کارە، هەژارە!

٥٨

پاشی بیست و پێنج شەوەی لە شارەکەی کۆنە مووسڵێ دەبۆوە بە بگربگر و جارکێشانە
لە بازاڕی ئاڵا بڵندکردن و ئاڵا ڕاوەشانە
عەتر پڕژاندن و عەتر ڕژانە.
جارچی جاڕی دەکێشا: خەڵک ببێ خەبەردارە
خەڵک بەعەدەب ڕابوەستێ، نەکەن کاری بێ قانوون و بێ ڕفتارە
میر سێوەدین بەگ ئەوە هات، دەگەڵیەتی حەو سەت سوارە

زۆر پیاوێکی ڕەشید و بە دەمارە
نەبادا لە کۆنە مووسڵێ ببێتەوە دڵهێش و دڵبریندارە
بۆ ئێمە خراپە، لێمان لەنگ دەبێ بازاڕ و دووکان و کاروبارە
سەعید گوێی هەڵدەخست، چاک حاڵی دەبوو لەو گفتوگۆ و لەو قسەو لەو پرسیارە
دەیگوت: خولایە من نێوبانگێ میر سێوەدینم بیستبوو
دەیان گوت: ئەمیرە، زۆر پیاوێکی جگەردارە
ئاخ چاوم پێی بکەوتبایە، بە قسەو بە گوفتوگۆ! بمدیبایە چلۆن دەکا ئاغایەتی و ڕەفتارە
ئاما من شەربەت فرۆشم، عومری پادشای پەروەردگارە
قەیدێ ناکا، ئەوڕۆکە شەربەتی خۆم دەفرۆشم بە دەنگ و بە هاوارە.
سەعید ئەگەر دەیزانی گرمەی سواران دێ، دوکان و بازاڕ هەمووی غەملاوە
بەئاوپاشی عەتر بە کوچە و بە خەیابانی کۆنە مووسڵێ دا کراوە
چون میر سێوەدین بەگ میوانە و قسمەتی بۆ وێ هێناوە
کووچە و خەیابان وەکو باغی شەدداد دەڕازاوە
شل و مل و سایە گەردن سەریان لە پەنجەران دەرهێناوە
هەمووی دەڵێی خونچەیە و تازەکانە شکۆفەی داوە
ڕۆژێکی زۆر خۆشە، دەڵێی ئەو ڕۆژەیە ئەگەر ئاوڕەحمان پادشای بەبە ئیشتیای لە شکار و ڕاوە
چون ئەوێ ڕۆژێ دوازدە هەزار کەس فەقیر و موحتاج و گەدا خەڵات دەکراوە
سەعید لە دڵی گەردیش و کێشە و قاوە قاوە
غیرەت پاڵی وە دڵی داوە
غیرەت لە پەراسووانی زۆریان بۆ هێناوە.

٥٩

میر سێوەدین بەگ دابەزی.
میر سێوەدین بەگ پیاوێکە هەمیشە ئاونشینە بەدەوڵەتی تورکان و بەسوڵتانی

ئەوە لە دەرکی والی مووسڵێ دادەبەزی بە میوانی
بۆیان دەکرد بەگاو و گەردوون بیست و پێنج مەڕ بێجگە لە شەک بەرانی
خانم و خاتوونان دەهاتنە سەر کەوشی سەغرە چنی سەر نوقرە بەندی بە وەزن سووکی بە قیمەت گرانی
لە بەریان دەکرد کراسی قاقم ڕەنگی موشەجەری سەمەرقەندی عەسڵە کارخانەی فەڕەنگستانی
دەیان گوت: ئەوەکو میر سێوەدین بەگ بمانبینێ با تەماشامان نەکا بەسووکی و بێ کیفایەتی و نێو بانگمان لە دنیایە نەڕوا بە بەدبەختی و بە سەرگەردانی
شل و مل و سایە گەردن ورینگەیان دەهات لە زنجیرەی زولفانی
بولبول و و داعبای دەنگ خۆش دەهاتنەوە سەر ڕۆژی خوێندن و نەغمە لێدانی
عەیش و نۆشی وام نەدیوە، هەتا ئەوێ ڕۆژێ خودا دنیا دەکاتەوە فانی
سەعید جەرگی کزە کزیەتی، دەسووتێ وەکو بریانی
دەیگوت: بێ کەسم، غەریبم. چومکە هەمیشە دانیشتبوو بە ئەمیری و بە خانی زگی بە خۆی دەسووتا، بە چاوی پڕ ئەسرینەوە ڕووی دەکرد لە دەرگای ڕەحمانی.

٦٠

پاش نوێژی نیوەڕۆیە میر سێوەدین بەگ بە بازاڕیدا هات - لە زەمانی سوڵتان سەلیم دابوو - بزانێ کێ عەریزەی دەداتێ، بزانێ کێ ناحەقی لێ کراوە. بە بازاڕیدا دەهاتە خوارێ، بە پرسیارکردن لە خەڵکی و لە مەعموری دەوڵەتی و لە ڕێبواران. سەعیدیش ئەوە هاواری دەکرد و شەربەتی خۆی دەفرۆشت.
ئەوە میر سێوەدین بەگ لەبەر دەرکی دووکانی قوماش فرۆشێک گرتوویە قەرارە
عالەم هاتووە لە دوور تەماشای دەکا، چۆن یەکجار دەست ڕۆییو و ساحێب ئیختیارە
لەسەر مڵکی سوڵتان سەلیم حوکم ڕەوان و موختارە
سەعید دەیکردەوە بە شەربەت فرۆشی و بەهاوار هاوارە
میر سێوەدین بەگ دەیگوت: ئەوە چییە؟ پیادەیە، سوارە، کاروانە، قەتارە؟

قەتم نەدیوە لە کۆنە مووسڵێدا ئەو هاوار و ڕەفتارە

مەعموری دەناردن، ئەوە بێ ئەسەر نییە، ئەو فەقیری بێچارە

کوتیان: قوربان! شەربەت فرۆشە، لەبەر سەفحەی ڕۆژگار و زیندەگانی بەقورینگی دەکاتەوە شەربەت فرۆشی و هاوار هاوارە

مەعموران سەعیدیان گرت، هێنایان سەر بەرەو خوارە

تەعزیمی میری کرد، کوتی: بە سلامەت بێ ئەو میرە، ئەو سەردارە

چ کارێکت بە من بوو تا سەری خۆمت لە ڕێگایدا بکەمەوە ڕزگار و قوتارە؟

پیاوی وەک تۆ ئەمن بدوێنێ، دەبێ ببم دڵخۆشی و سەرخۆش و خۆش ڕەفتارە

پایەت لەنگ نەبێ، بەهومێدی خوداوەندی میری مەزن لە دنیایەدا هەمیشە بگەڕێی بە ئەمیری و بە ئیفتیخاری و بە سەردارە

ئەگەر ئەمن هاوار هاوار دەکەم، لەبەر ئەوەیە کاسبییە؛ چ بکەم چارم بێ چارە!

غەریبم، قسمەتی هەقی دەستی ئیلاهی منی خستۆتە ئەو شارە

نابەدڵەم، ئێستا فێر نەبووم ئی شەرت و ئەرکان و ڕەفتارە

خانم و خاتوونان سەریان لە پەنجەران هێناوەتە دەرێ، هەموو بۆنی عەتریان لە سنگی دێ، زولفیان ڕاوەستاوە تار تارە

هەمووی شکۆفەی وەختیانە، مەمکۆڵەیان دەڵێی هەنارە

هەر کەسێ بەدڵی خۆی مەغشووشە و سەرگەردانە و گرفتارە.

٦١

میر کوتی: عەزیزم شەربەت فرۆش! ئەسڵەن مەکانت کوێیە؟

وا لێو بەباری، ڕەنگت زەرد بوو، دەڵێی هەرمێیە

مەعلوم پیاوێکی بێ مەزڵ و بێ ڕێگا و جێیە!

دەیگوت: خزمەتی میر سێوەدین دەکەم هەتا ڕۆژێکی دەتوانم

ئەمن سەرگەردانم! دەست لێک بەردانم!

پیاوی ڕۆژی شەڕوشۆڕ و دڵهێشان و مەیدانم

ئەلعان لەسەر قسمەتی هەق دەستی ئیلاهی لێرەکانە ماڵوێران و بێ جێ و مەکانم

تەحویلم لێ وەرگرە میر، ڕۆژێ بیست و دوو کەڕەت قەزات لە گیانم
ئەسڵەن کۆنە بەگلەرم، هاتوومە لێقەومانێ، ئەمن خەڵکی ئێرانم
ئەلعان لێرە شەربەت فرۆشم. بێ خزم و بێ قەوم و بێ کەس، بێ ڕووناکیی کەسوکارانم.
ئەوە میر سێوەدین بەگ پێی دەڵێ: ئەرێ شەربەت فرۆشەکەی فەقیری بێچارە
شەربەتێکم بۆ تێکە، تا بتدەمێ زێڕێکی لە وی سکە لە بیست و چوارە
دیارە مەستی، شێتی، بەڵکو بێیەوە سەر عاقڵ و ببیەوە ئیغیارە.
ئەوە سەعید لە پشتەوە ڕا گورگاوڕێکی دەداوە
بەکوڕە قەنداغچێکی دەگوت: بۆم بێنە شووشێک گوڵاوە
قەنداغچی گوڵاوی دێنا و لە دەستی سەعیدی دەناوە
سەعید پیاڵەکەی بەگوڵاوێ دەشوت و پێشی کوندەی سەدەف زێڕی عەسڵە بوڵغاری بەعەدەب بۆ پێشی پیاڵە دەهێناوە
دەیگوت: زۆر تەشەکور دەکەم سەردار عێلی دووازدە هەزار سوار داوای لە من کردووە بۆ قەنداوە
قەنداوێکی بۆ تێ دەکرد؛ چۆن بەگوڵاوێی شوتبوو، عەتر و بۆنی لە زاری میر سێوەدین بەگ دەداوە
یەگجار زۆری ئەو قەنداوە پێ خۆش بوو، چۆن واسیدەیە و خودا قەڵەمی لە کاری سەعید داوە
دەیگوت: ئێرانی خانە خراپ پێم وایە ئەتۆ ئەو شەربەتەت لە قابە قەوسەین و بەهەشتی باقی هێناوە
ئەوەتی من میر سێوەدین بەگم، هیچ شەربەت و لەزەتێک تامی لە زاری من وا نەداوە.
ئەمان ئەی فەقیری بێچارە، بڕۆ لە مەنزڵگات دای بماڵە ئەو مەشکەی کوندەی بوڵغارە
وەرە بۆ مەنزڵێ، دەتدوێنم ئەی بێچارە
ڕەنگی تۆ وەوە ناچێ، چاوت غایەنن، دەڵێی ئی شێری بریندارە

پێم وایە تۆ بۆ ئەوە دەبی بتکەن بە ڕەئیسی دووازدە هەزار پیادە و سوارە
ئەمن ئەوە لە ماڵە والی میوانم و گرتوومە قەرارە
کوندەت لە ماڵێ دابنێ، لەگەڵت دەنێرم پێش جلەو و شاتر و خزمەتکارە
جا لەوێ لێت دەپرسم جواب و سوال و ڕەفتارە
ئێرە جێگای کاسبی و فەقیر و هەژارە
جێگای من نییە قسەی لێ بکەم، لێی بگرم مەزڵ و قەرارە.

٦٢

پیاوی لەگەڵ نارد پێنج شەشێک، کوتی: ئەو کاسەیە ژێر کاسەیەکی هەیە، ئەوە سەعید چۆوە کن پیرێژن. پیرێژن بەپیریەوە هات. پیرێژن خۆشی دەویست، لە جێگای کوڕی خۆی دانابوو، بەپیریەوە هات، کوتی:
ڕۆڵە بەدوور بی لە بەلایە لە ئازارە
دایە پیرەت بەقوربانی بێ! ئامانەتداری تۆ بێ پەردەکەی پیر سوارە[٢٤]
ئەوڕۆکە کە ڕۆژ زووە، بۆ هاتوویەوە بۆ ئیسراحەت و بگریەوە قەرارە؟
ئامانەتداری تۆ بن پیر و پێغەمبەر و وەیسەلقەرەنی نازدارە
ڕۆڵە من وەک دایک و کوڕان دەگەڵ تۆ دەکەم گوفتوگۆ و هەستان و ڕۆنیشتن و ڕەفتارە
کاسبی جەوهەرێکە لە دوورەوە لە پیاوی دەنوێنێ و، لە پیاوی دیارە
ئەوڕۆ، چاک بوو تا ئێوارێ پەیدات دەکرد دوو پارە.
سەعید دەیگوت: داپیرەم چەند میوانگر و لەبەردڵانە
ڕەبی سەری منت ببێتەوە بەقوربانە
خوداوەندی میری مەزن پێت عەتا بکا دین لەگەڵ ئیمانە
چومکی بۆ منت دانا تەگبیر و ڕا و مەسڵەحەت و ڕێ پیشاندانە
ئەتۆ بۆ من بووی بە واسیدە، بۆ کاسبی کۆنە مووسڵێ، لە ماڵە تۆ بووم بە میوان و بە پەنهانە
میر سێوەدین بەگ ئەگەر موعتەبەری تەواوی دونیایە، عالەم دەیناسێ، ڕەئیسی سپای سوڵتانە

نازانم چ کارێکی بە من هەیە؟ ئەوە لە سەرم ڕاوەستاون خزمەتکار و بەگلەر و عەمر زانە

ئاغای پەڕ بەسەر لە ماڵە والی میوانە

لە منی گێڕاوەتەوە، نازانم نە ڕۆژی مەرگە و نە خەڵات بەخشانە؟

نە بەختم تەڕەقی دەکا و نە عومرم لەسەر دەستانە؟

چاوەڕوانم لە تۆ ئەگەر بۆم ڕابوەستی دەستە و دوعا لە دەرگای سوبحانە

میر لەگەڵم لەبز خۆش و فەسیح و بەلیغ بێ، چیدیکە نەگەڕێم بەشەربەت فرۆشی لە کووچە و لە کۆڵانە

غەریبم، کەس نامناسێ، دەنا خۆ بەمن ناکرێ ئەو جورە کارانە

چومکە پێڵاوی غەریبیم لە کن تۆ کردەوە، لە کن تۆ بوومەوە بە میوان و بە پەنهانە

خوداوەندی میری مەزن میر سێوەدین بەگ بکا بەواسیدە و بڵێن: دەستی عێزەتی لەسەر شانی دانا

پاشە ڕۆژێ بۆ تۆم دەبێ کەلک و سەفەر و نێو و نیشانە.

لە سنگی دا پیرێژن، کوتی: ڕۆڵە هەڕۆ بڕۆ! ئاگادارت بێ چوار یاری نەبی، شەریعەتی محەممەدەل مستەفایە

ڕەبی بەدوور بی لە دەرد و بەدوور بی لە بەڵایە

بەدوور بی لە قسەی نەتەوی و لە شەیتانی دونیایە

بەختت بڵیند بێ، هانام دەبەمەوە بەر کابەی موعەززەم و بەر کابەتوڵڵایە

حەزرەتی نوحی نەبی، ئیبراهیمی خەلیلوڵڵایە

بۆت بپاڕێنەوە مووسای کەلیموڵڵا و عیسای ڕووحوڵڵایە

ئاگاداری تۆ بن خدر و ئەلیاس، وێنسی پاک ئەگەر لە زگی نەهەنگێ دایە

بەخولای بەمیوانی تۆ هەمیشە خۆشی و بەشارەتی و شادمانی و ڕووناکاییم لە دڵیدایە

دە ئاگاداری تۆ بن حەسەن و حوسێن، ئەگەر بێ گوناحن و شەهیدن لە کەربەلایە

ئاگاداری تۆ بێ شێر عەلی شێر، ئەگەر پێی دەڵێن: عەلی مورتەزایە

تەواوی هاشمییان ئاگایان لە تۆ بێ، ئەگەر گەورە گەورە و ساحێب نێون لەو دونیایە

پەنای خۆم دەبەمەوە بەر ئەو کەسەی دای ناوە عەرز و سەمایە

دە ڕۆڵە ڕەبی بەدی شانت نەگرێ و بە خۆشی ڕایبوێری غەریبی، پچیەوە کن دایک و بابانت بەدڵی خۆش و بەفکر و تەگبیر و ڕایە

تەمەنام بردە بەر ئەو پیاو چاکانەی ئەگەر دوعایان دەچێتەوە بەر لەقایە.

ئەوە سەعید بەفکر بە بازاڕەکەی کۆنە مووسڵێ دادەهاتەوە خوارە

جار جار دەترسێ دەڵێ: دەبێ موقەسیربم؟ ببمەوە دەسگیر و گرفتارە؟

یان کارم جێبەجێ دەبێ بە ڕەحمەتی خولای؟ هەر جارێکە و ئەو جارە

لە خەزێنەی خولای کەم نابێ ئەگەر میر ئیلتیفاتم دەگەڵ بکا، جا ئەی بمکا بەمیر ئاخوڕ، ئەی بمکا بەقەننەدارە

ئەی بمکا بەکەوش دانەر، ئەی بمکا بەخزمەتکارە

چا نییە کەسێکی بمناسێ دەڵێ: سەعید لە کن میر سێوەدین بەگ گرتوویە ئیسراحەت و قەرارە

چومکی نێوبانگی میر سێوەدین بەگ لە شا و خونکاری ڕا دیارە

پیاو لە کۆگای گەورە خۆڵ وە سەر خۆی بکا، ئەگەر نەژمێنێ دیسان هەر خۆشە ئەو کار و ئەو ڕەفتارە.

ئەمن لە تاوی ڕوفیە دەربەدەر بووم، هاتووم بۆ وڵاتی گەرمێنێ، خزم و کەس و کار زۆر بۆ من چاوەڕێیە

ئەگەر چوومەوە، ناڵێن: سەعید لە کوێ بووی؟ دەڵێن: داخولا سەعید چی پێیە؟

لەبەر کەسم سەر دانەنواندووە، تەسلیمی تۆم ئەی خودێیە

میر بەقەڵسیم نەدوێنێ، دەگەڵم بکا قسەی بەڕێ و جێیە.

٦٣

ئەوە سەعید هاتە دەرکی میری. هەرچەند مەعموران بە سەعیدیان کوت: وەپێش کەوە برۆ کوتی: ناڕۆم

دەیگوت: بابە! ئەنگۆ بێ تەگبیر و بێ فکرن
سەرزەدە بۆ کن پیاوی گەورە نابێ، دەبێ ئیجازەم بۆ وەربگرن.
پیاو دەبێ پێک بێنێ شەرت و شوێن و کار و بارە
کەسێکی لە دنیادا بیبێ دەست ڕۆییوی و سەنتەنەت و ئیختیارە
دەبێ پیاو بەشێتی لێی وەژوور نەکەوێ، لێی وەربگرێ ئیجازە و ئیعتیبارە.
کوتی: هەتا میر نەڵێ «بێ» لە میر وەژوور ناکەوم، لە قابیلەتی ئەوەدا نیم.
ئەوە بەمیری دەڵێن: کابرای شەربەت فرۆش غەزریوە. دەڵێ: نایەمە ئەو مەجلیس و دیوەخانە
هەتا میر بۆم نەنێرێ ئیجازە، بەنگۆ ناکەمەوە متمانە
نەبادا بۆ میری ببێتە شان کەسری، بڵێن: پیاوێکی شەربەت فرۆشی لێ میوانە
ئەمن فەقیرم، بێ کیفایەتم، لە میر تێک نادەم قسە و گوفتوگۆ و تەگبیری زاهیر و پەنهانە.
دەبێ میر ئیجازەم بدا، زۆر بەئیجازە و بەئیعتیبارە
دەنا ناتوانم وە سەرکەوم لە قاڵدرمان و لە دیوان و لە تالارە
هەر کەس لە دنیایەدا دەبێ وەزیفەی بزانێ، هەر کەس جێگای خۆی دیارە
مەگەر لەوەیدا نەتان زانیوە غەریب و فەقیر جێگای کووچە و
سەررزەردە لە مەجلیسێ وە ژوورکەوی، هێندێک کەس دەڵێن: شێتە، هێندێک کەس دەڵێن: بێ عاقڵە! هێندێک کەس دەڵێن: خومارە

٦٤

ئەوە بە میر سێوەدین بەگیان کوت. میر سێوەدین بەگ کوتی:
بەو خودایەی کەم ئەگەر ڕەحیم و ڕەحمانە
زۆر پیاوێکی عاقڵە، دیارە زۆر پیاوێکی وەزیفەزانە
ئەوە زۆر شانشینە، هەمیشە جێگای مەجلیس و دیوەخانە
دیارە کەم کەسێک نییە، بڵێی: گەورە بووە لە کووچانە؟
جا ئەوە میر ئیجازەی دەدا، لە دڵی سەعید پەیدا دەبوو باوەڕی و متمانە

سلاوێکی لە میر و مەجلیس دەکرد، عەلێکیان بۆ دانا
کورسییان بۆ دەبردە لای سەرێ، سەعید دەیگوت: ئەوە جێگای میر و خانە
ئەمن هاتوومە کن میری، لەگەڵم دەکا دوو قسە و، نازانم نە خەڵاتە و نە بەراتە و نەوەختی تیرە بارانە
لە وەزیفەی خۆم لا نادەم، جێگای من لای خوارێیە و جێگای من پاشخانە.
لەبزی سەعیدی میر چاو پێکەوت، هێندی پێ خۆش بوو، وەک هەنگوین و وەکو شەکەر
گوێتان لەو قسەیە بێ ئەی ئاغا و ئەی گەورە گەورە و پەڕ بەسەر
لەبزی ئەو کابرایە چەند خۆشە. دەزانێ مار بەزمانی خۆش لە کون دێتە دەر[٢٥]
ئەمن چەند کەسم هەیە: نۆکەر و حاڵزان، خزمەتکار و ئەمربەر
ئەمن تا ئەوڕۆکە کەسم نەدیوە وا گوفتوگۆزان بێ، کار و گوفتوگۆی خۆی وا بەرێتە سەر.

٦٥

جا ئەوە ئەو جار بانگی سەعیدی کرد، کوتی:
ڕۆڵەم لە کوێستانێ پیاوت کوشتووە، غەیانەتت بەنیشتیمان کردووە یان ڕێگات گرتووە؟
چۆنە ئەتۆ قسمەتت بۆ گەرمێنێ هێناوە، سەری خۆت هەڵگرتووە؟ یان ناحەقیت لێ کراوە؟
موقەسیری دەوڵەتی یان مڵکت لێ بڕاوە؟
پێم بڵێ بۆچی هاتووی؟ دیارە ئەتۆ دڵت لە ئێرانێ بەجێ ماوە
قسەی تۆم زۆر بەکەیفێیە، گوفتوگۆت دەڵێی شەکری خاوە
ڕاستیم پێ بڵێ، درۆ بۆ هیچ کەس بەرەی نەداوە
هەرکەس درۆزن بێ، لێی ئاشکرا دەبێ؛ پاشە ڕۆژێ دەستەوئەژنۆ ڕاوەستاوە
هەچ کەس ڕاستگۆ بێ، خوداوەندی میری مەزن لە دونیایەدا تۆفیقی داوە
وەرە پێم بڵێ بەڕاستی، دڵت شێواوە و لێت سووربوون قولینچکی چاوە

پێم وایە، کۆنە بەگلەری، چل و پێنج کەس گەورە گەورە و پەڕ بەسەر بەدەستی تۆ کوژراوە

ئەگەر ڕاستیم پێ بڵێی، لە دەستت دەنێم سێ سەت سوار، هەمووی ساحێبی جڵەو و ئاوزەنگی و سەقاو و لغاوە

چۆمی شەمامکێت دەدەمێ، بڵێن: بە سوور باشی کابرایەکی ئێرانی لەسەر داناوە

ئیختیار و دەست ڕۆییت ببێ، نەبادا بڵێن: بەدبەختە و کابرای هێنا و لێی قەوماوە

وەکو بەگلەران بگرە و بێنەت ببێ، لە گەرمێنێ پەیداکەی پیاوەتی و غیرەت و شوجاعەت و ناوە

بتبێ چاکە و پیاوەتی و بەخشین و گەورەیی و دراوە

نەبادا بڵێن: میر سێوەدین بەگ کابرایەکی بە فریو برد، بەدبەختی کرد، لەسەر چۆمی شەمامکێ و ئەوبەر ئەوبەری بەلکێی داناوە

سەرفە و ئیختیاری لە دەست خۆت دابێ، هیچ کەس حیسابی لە تۆ نەکێشاوە

خاترجەم بە چرات هەڵکرا، کەس نەڵێ: ئەوە چرای کوژاوە.

٦٦

ئەوە سەعید جوابی داوە، کوتی:

مەملەکەتی شارەبانم بدەیەی بە موختاری و بە سەرداری

ئەمن تێیدا دانانیشم بەغەریبی، ئەگەر ببمەوە بە پادشا و بە تاجداری

ئەگەر حەز دەکا ڕامبگرێ میر، دەبێ بمباتە کنە خۆی بۆ نۆکەری و بۆ خزمەتکاری

هەتا بزانێ ئەمینم، چاکم، خراپم، چاکم تێ بفکرە تۆ بۆ ئەمینی و بۆ ڕۆژی دڵهێشان و بۆ بەدڕفتاری

ئەگەر لێت دوور بم، شەیتانان، شۆفاران، لێم بکەنەوە شەیتانی و بوختانی نادیاری

ئەگەر لە کن ئاغای میر سێوەدین بەگ بم، دەزانێ چلۆنە ئەو ڕفتارە

میر بەسلامەت بێ، ببێتەوە ڕاوەستاوە و بەرقەرارە

پیاو بەزاری خۆی قسە بکا، هێندێک کەس دەڵێن: پیاوێکی نابەکار و بەدڕفتارە

لە ڕۆژی لێقەوماندا تاقیم کەوە، سەری سەعید بە شەش سەت سوارە

واشم تەماشا مەکە، بڵێی: لە کۆنە مووسڵێ لە شانی کردبوو مەشکەیەکی دوو پووتی عەسڵە بوڵغارە

ڕۆژ هەتا ئێوارێ دەیکرد بەناڵەناڵ و بەهاوار هاوارە

ڕۆژێ پەیدای دەکرد سێ پارە و بەحاڵە حاڵ دەی گەیاندەوە بەچوار پارە.

پیاوی گەورە نابێ شووشەی پیاوی بشکێنێ

پیاو دەبێ ڕازی بێ بەو قەزا وقەدەرەی ئەگەر خودا بەسەری دێنێ.

پیاو ڕازی بێ بەو موقەددەرەی ئەگەر خودا لەقای دیوە لە هەرتک شانە

پیاو دەبێ ڕازی بێ بەنەگبەتی و بەدبەختی و ڕۆژی خەڵات بەخشانە

چۆن موقەددەری خودای لە چاک و خراپ غایبە و پەنهانە.

٦٧

وەسماناغا ئەوە لە مەجلیسدا بە دزی دەگەڵ ئەوەی لە تەنیشتی دانیشتبوو سرتە و قسە دەکا، دەڵێ:

میر سێوەدین بەگ، کابرایەکی لە ئێرانێ دەربەدەر بووە و هەڵاتووە

کەس نازانێ نە وڵاتی ئاور تێ بەردراوە و نە دزی کردووە،

بۆ وا مەرحەمەت و ئیلتیفاتی بۆی بزووتووە؟

کەسم نەدیوە ئاغای میر سێوەدین بەگ هێندەی دەگەڵ بکا ئیزهار و گوفتوگۆ بەقەڕاعەت و بە نێو و نیشانە

خۆ کەس نازانێ ئەوە دزە، هەڵاتووە، یا نە گۆرانە

گەدایە، فەلاحە، یا نە شوانە

ئاغای میر سێوەدین بەگ لە ناشوناسی، نەدیو و نەناسیوو هێناویەتە سەر کاری گەورە بەدەست دانە

عەجایەب لەوە ماوم، کابرایەکی شەربەت فرۆشی بێ نێو و بێ نیشانە

ئێرانی ئەگەر لێیان قەوما بۆ گەرمێنێ دێن، بۆ فەقیری و بۆ هەژاری و خۆیان دەکەنەوە پەنهانە

میر سێوەدین بەگ، دایمە لە مەجلیسیدا دادەنیشێ حەوسەد کەس هەموو گۆی

خەنجەری نۆ دوپشکە و دەسکی خەنجەری گەوەزنە و خەنجەری لەسەر جەوهەر ڕژانە
عەجایەب گوفتوگۆی لەگەڵ ئەوەیە، ئەوە نوشتەی لێ کردووە
یان ئیسمی ئەعزەمی لێ خوێندووە وا میر سێوەدین دەگەڵی هاتۆتە گوفتوگۆ و ئیلتیفات و کەرەم بەخشانە

٦٨

میر سێوەدین گوێی لێ بوو، ئەما چاک حاڵی نەبوو ئەوە بەتوندی دەیگوت:
وەسماناغا تایەفەی چەڵەبییە
ئەو سرتە سرت و جرتە جرتەت لە چییە؟
ئەمن دەڵێم کەیخودایە و ڕدێنی سپییە
لە مێژە لە مەجلیسی من دانیشتووە بەکەیخودایی و بەنمەک خۆرییە
بێ عاقڵی! بێ کیفایەتی! عاقڵت لە کەللەی سەریدا نییە
لەو قسەیەدا لێم ڕووناک کە مەنزوورت چییە؟
مەنزوورت خۆشییە یان هاتوویەتەوە سەر گوفتوگۆی بەد و شەیتانییە؟
هەچ کەسێ بەدی خەڵکی بڵێ، ئاخری دادەنیشێ بە زەلیلی و بە نەقوستانی و بە کوێرییە
سست! هەقی گوفتوگۆ و قسانت نییە.

٦٩

سەعید کوتی: ئاغام دەبێ زۆر بە حەوسەڵە بێ لەو دونیایە
خودا دونیای وا داناوە، هەزار چاک و خراپی تێدایە
ئی وا هەیە کارشکێنی خەڵکی دەکا، ئی وا هەیە بۆی دەبێتە سەبەب، بۆی دەداتەوە حەول و تەقەلایە
ئی وا هەیە تەماح لە کوشتنی پیاوی دەکا، دوایە بەفکر دەڵێ: کارێکی ناموستەجایە
ئاغا بیبەخشە لە مەجلیسێدا، با پێی بمێنێ ئەوەی لە دڵی دایە

ڕۆژێکی من بە خزمەتگوزاری تۆ گەیشتم، ئەوەی لە دڵی دایە پێی مەخفی ناکرێ؛
دەیکاتەوە ئاشکرایە

پاشملە پیاو قسە دەکا، بە خەیاڵی خۆی پاشملە دەبڕێتەوە سەری میر و پادشایە
بە منی ببەخشە، فەقیرە، سەهووی کردووە، پیاوی وا لە شەوگوردی مەجلیسێ
نایە.

میر سێوەدین بەگ کوتی: قۆڵی بگرن، هەڵی هەستێنن، بەکاری مەجلیسی من نایە،
وە دەری نا. ماجبی هەیە لێی مەبڕن، ئەمما قەدەغەیە مەجلیسی من، نابێ هاتوچۆی
مەجلیسم بکا. وە دیوی دەرێیان نا.

٧٠

جا میر سێوەدین بەسەعیدی کوت، کوتی:

ئەوشۆ لیرە میوانم، سبحەینێ دەچمەوە خانەدان و سەنتەنەت، پیاوێکی نەجیبی،
چاوت زۆر وشیارە

خودا بەقسمەتت بکا، لە دەستت دەنێم ئیختیار و کار و بارە.

ئەوە سبحەینێ میر سێوەدین بەگ هاتەوە بۆ ناسرییە. دەور و پشتی خۆی بەمیر
سێوەدین بەگەوە هاتن. حەوسەد کەسی پیاوی گەورە گەورە پێوەهات، لە مەجلیسێ
دانیشتن. ئەوە سەعیدیشی لەگەڵە. مەجلیس وای لێ هات وەکو مەجلیسی پووری
پەشەنگ ئەفراسیابی تورک.

جا ئەوە میر سێوەدین ئاوڕێکی داوە، کوتی: نازر بێ، بچێتە بازاڕێ، میوانم زۆرن،
بکڕێ بەسەت جورە

قومرییە و باڵوێزە و کۆترە و لە هەمووان کەم قیمەتتریان شالورە

بیست و چوار ئاورگی بێ دوگەڵی داییسا، نیسک و نۆک و دۆکەشک ئی تەندوورە

دیوەخانی گەرم بووە، سەندەڵی وەزیفەزان دای ناوە، هەمووی ڕاست و جورە

پەنجا سەرین داندراوە، پەڕی خاسە سی و بولبول و قودروورە(٢٦)

دەوری و ناڵبەکی و لایەق کێشی مەجلیسێ، هەمووی لایەقی مەجلیسە ئەو
دەستوورە

گەردن کەشە و ماڵی بوڵغارە و هەمووی فیداکارییە و، فەغفوورە
هێندێکی ئەڵماسی سپییە، هێندێکی مروارییە، هێندێکی مەتای بەحرییە، خاڵ خاڵیان یاقوتی سوورە
کەسێکی نابەڵەد بێ، زگی بەخۆی دەسووتێ، داییسێ وەک ئاوری نێو کوورە
ئەوی گەورە گەورەی عەسر و زەمانەن، هەمووی میوانە و لە حزوورە
ڕەبی ئەو سەنتەنەتەت لێ تێک نەچێ، لە تاریف دایە ئاغای من لە نیزیک و دوورە
دەجا با ئاشپەز بێن، حەبێ خان و ئایشەخان و گەوەر و ئەسمەر و زڵەخا و فیدا و شاشان و وەنەوشان و، هەمووی کەمبەرەی داناوە بەزەمبوورە
دەجا با سەر ببڕدرێ مەڕ و شەک بەران و شەک و چل و حەوت دانەیان گیسکە و کوورە.
ئاشپەز هەمووی خۆی حازر دەکا، خڕە دێ لە قاپ و کەوچک هەمووی وەکو ئاوێنە
چەند ڕەنگین بووە ئاشپەزخانە و پێشخانە، ئاور لەسەر ئاییسانە
خانم و خاتوون، ئەوی نازرن، هەمووی لەسەر فەرماندانە.

٧١

مەجلیسی میر سێوەدین بەگ گەلێک بەخۆشی گیراوە
کەسێک خەمناک بێ، ماندوو بێ، دەڵێ: ئۆخەی ماندووم حەساوە
ئەو جار دەبێ فکر بکەی لەو ساحێب عێزەتە ئەگەر بیناهی چاوە
چەند مەجلیس و بناغەی وا قایمی تێک داوە.
نۆکەر دەسووڕێن پاکی پیاڵەیان لەسەر دەستانە
مەجلیس گەرم داهاتووە، وەختی قاوە دانانە
هەمووی بەگلەرە و میرە و گەورە گەورەی ئەو زەمانە
مەگەر پیاوی ساحیب دەسەلات، دەنا خەڵکی زمانی لاڵە لە قسانە
چومکی مەجلیسی میر سێوەدین بەگ زۆر بەشەرت و بەئەرکانە
چل و هەشت کەس مەعموورە، ئەوان ئاگایان لە کەوشانە
سەد و بیست و یەک کەس خەریکی قاوە دانان و شەراب گێڕانە

پیاوی گەورە گەورە کەوتوونە قسە و گوفتوگۆی ئەو پیرە زەمانە
ئەوە میر سێوەدین بەگ دەڵێ: ئاغایان! کابرایەکی حاڵزان لە وڵاتی ئێرانێ ڕا هاتووە
چاک دەفامێ بدوێ، وە بەر دڵم کەوتووە
خەیاڵم هەیە کارێکی لەبەر دەستی نێم ئەگەر بحەسێتەوە ئەو دڵ ماندووە
چومکێ لە مەملەکەتی ئێرانێوە پەناهەندەی من بووە
زۆر پیاوێکی عاقڵە، پێم وایە بەعومری خۆی دەست ڕۆییو بووە.
بووە ساحێب ئیختیارە
لە جوابدانەوەدا زۆر عاقڵ و وشیارە
لایەقێتی ئەوەی هەیە لە دەستی بنێم کاروبارە
دڵی خۆی بکاتە سەرپشک، یان ببێتە گەورەی حەوسەد سوارە
یان لە مەجلیسێدا ببێتەوە بە قەننەدارە.
هەتا نەڵێن: میر سێوەدین بەگ قسەی دەگەڵ کرد و قسەی بۆ پاشەوە گەڕاوە
ئەمن لە کۆنە مووسڵێ قەولم بەو کابرا غەریبەی داوە
پیاوێکی بێ وەج نییە، دەڵێی کاموسی کاشانییە و خوڵقاوە
خواوەندی میری مەزن بێ عاقڵی نەکردووە، عاقڵ و هۆش و تێگەیشتنی لە پاڵی ناوە
ئەنگۆ ئاگادار بن بۆ پاشەڕۆژێ، بزانین لایەقێتی چی هەیە؟ نەوەکو بڵێن: میر سێوەدین بەگ ئەو دەروێشە، ئەو کابرا بێ دەسەڵاتە، چییە لە کن خۆی داناوە
ئەنگۆش عەیاری قسەی لێ هەڵبگرن، گوفتوگۆی لێ ببیەن لەو غەریبەی ئەگەر لە ئێرانێ ڕا قسمەتی بۆ ئێرە هێناوە
غەریب هەمیشە لە خۆی دڕدۆنگە، هەمیشە بێچارەیە، لێی قەوماوە
جا ئەوە بەزمانی فەسیح و بەمێهرەبانی میر سێوەدین بەگ دڵخۆشی دەداوە.
میر سێوەدین بەگ بانگی سەعیدی کرد بێتە پێشێ، بێتە نێویان.
کوتی: عەزیزم! بە فریوت نابەم ئەگەر من تۆم هێناوەتە ئەو جێگا و مەکانە
هەڵگرە خزمەتێکی بە وەزن سووک و بە قیمەت گرانە

شەرم نەکەی، لێت ویشک نەبێ بنی زمانە
ئەمن میر سێوەدین بەگم! ببینە خانم و خاتوونان هەموو چوونەتە ئاشپەزخانە
مەجلیسی من تەڕە، هەمیشە ڕەخس کێشان و ساز و دەیارە لێدانە.

٧٢

ئەوە سەعید ڕاوەستا، لە چاوی میری دەفکرێ
دەڵێ: ڕەبی عەمرت هەتا زەمانێکی دوور گوزەشتە بکا و ڕاببرێ
دوژمن نەتوانێ ئەگەر پێشی سەنتەنەت و حوکمی تۆ بگرێ
لە خۆت باڵادەستتر نەتوانێ ئەگەر قسەی ڕەکیک و ناحیسابیت لە پێش ڕابگرێ
کاری تۆ هەر بەخۆشی و بە شارەتی لە مەجلیسی گەرمدا ڕەبی هەر بکرێ
ئەمن کابرایەکی بێ قابیلەتم، مەمنوونی میریم و غەریبم و قەدرم ڕادەگرێ.
ئەمن پیاوێکی غەریبم، ئەمان لە دڵدا زۆر وشیارم
هەچ کارێکی پێم بسپێرێ منەتبارم، بێ ئیختیارم.
مەجلیس بە سلامەت بێ هیچ کەس دڵی نەکا نسکۆیە
دیارە قابیلەتی کاری من میر بە تۆیە.
قاز و قورینگ ئەگەر لە عاسمان دەگەڕێ
گەورەیان هەیە؛ ئەگەر قاوە قاو دەکەن، دەچنەوە بۆ سەری کوێستان و ئاتەگی ئاستەڕێ
دیارە شوان، دەینێرنە بەر مەڕێ
دەبێ ئەوە مەڕە بگێڕێ، هەتا بلەوەڕێ.
هەزار جارت ئەمن ببمەوە گیانفیدایە
گەورەی عەسریش بۆ بنی ئادەمی هەر وایە
هەچی تۆ مەرحەمەتی بکەی و پێم بکەیەوە عەتایە
ئەمن زۆری پێ مەمنوونم، چون ئەو دنیا ڕووناکە بۆ هەموو کەس هەر وایە.

٧٣

میر دەیگوت: قەستەم بەوەی کەم ئەگەر پەروەردگارە
ئاغایان، سەعید پیاوێکی عاقڵ و جگەردارە،
لە مەجلیسی خۆم جارێ دوورت ناخەمەوە
دەتکەمەوە بەئامپیاڵە و بە قەننەدارە
دەتکەمەوە ساحێب ماڵ و ساحێب ئیختیارە
لە کن تۆ قابیلەتی نەبێ ئەو پووڵەی سکەی لە بیست و چوارە
هەمیشە بتوانی ببەخشی پێنج و شەش هەتا هەزارە
دەبڕۆ خەریک بە لە کار و ئەوە پێکت هات کاروبارە
تێگڕا پیرۆزباییان لێ کرد پەڕ بەسەر و میر و بەگلەر و ئیختیاردارە.

٧٤

ئەوە سەعید لە کن میر سێوەدین بەگی دامەزرا.
دوو ساڵ لە مەجلیسی میردا دەبۆوە بەقەننەدارە
میر ئەگەر دەیزانی ئەمینە، لایەقەتی مەجلیسی هەیە، ساحێب نمەک و بەئیعتیبارە
تەڕەقی دەدایە، دەی ناردەوە سەر عەبو تۆپ و مەجیدی و زێڕ و ڕەواجی مەملەکەت، دەیکردەوە بەخەزنەدارە
کەسێکی خودا تەڕەقی بدا، نەشەیتان و نەشۆفارە، هیچ کەس ناتوانێ چەتی بدا لە کارە
چل و هەشت سندوق ئەڵماس و زێڕ و زێو و ئەوی بەقیمەت گرانی ئەگەر لە عالەم ڕا دیارە
سەعید لەسەر ئەو خەزێنەی دەبۆوە بە سەردارە
لە دەستی دابوو بەخشین و بەخەڵکی دان بەژومارە
کەس حیسابی لێ ناکێشێ، بۆ خۆی لەسەر ئەو خەزنە و جەلالە موختارە
لە ماوەی سێ ساڵاندا هیچ غەیانەتی لێ وەدەرنەکەوت، میر لە بنەوە ئاگای لێ بوو،

له قڕانێک ڕا هەتا دەگاتەوە دووپارە

ئەوە میر دەیگوت: عەزیزم! پەرێشان مەبە، مەڵێ سەڵتم و ئەمن لێرەکانە غەریبم، دڵت نەبێتەوە بەعەبداڵە

تێ بفکرە لە مەملەکەتی ئێمە تا بتکەمەوە ساحێبی ئیجاد و ژن و ماڵە

ببینەوە، بزانە کێ لە شەوگوردت دەکشێ و کێت دێتەوە سەر حاڵ و ئەحواڵە

کێ عاقڵە و مەستە و ناسکە جەمینە و چاوی کاڵە

کێ بەکەیفی تۆیە، شل و مل و قەد شمشاڵە

لەبەر دڵی تۆ شیرن بێ، سەر و شەدەی دەگەڵ دەسرە و دەسماڵە

تازە لە کن من بە ئەمین دەرچووی، لەبەر ئەوەی ڕوحم وەک لاولاو ئەوە لە تۆ هالا.

سەعید ئەگەر میر وای پێگوت، زۆر پێ خۆشحاڵ بوو. چون دنیا خالی نییە، دنیا بەنەفس و هەواوە خۆشە

٧٥

چاکە شین دەبێتەوە. میر سێوەدین بەگ لە حەرەمخانەی خۆیدا، لە کن خانم و خاتوونان، بە چاکە باسی سەعیدی کرد؛ کوتی: مەملەکەتی ئێرانێ یەگجار زۆر قەدیمە، دنیا جور بەجور بنی ئادەمی تێدایە، سی و سێ ساڵە ئەمن حوکمەتم و ئیختیاری سوڵتان سەلیمم لە دەستی دایە، خزمەتکارم هەیە، خەزنەدارم هەیە، قەننەدارم هەیە، هیچ کەسم وا بە ئەمینی نەدی؛ هەموو لە ڕێگایەکەوە نا ئەمینی لێ وەدەرکەوت. ئەما بەتانجی سوڵتان سەلیم! ئەو کابرای ئێرانی بایە پەناباتێک نائەمینی و ناقسووری و لەبزڕەکیکی و شەیتانی و دووزمانی و خراپەم پێوەنەدی. جا لەبەر ئەوەی کەسێکی ئەگەر بێ خراپە و بێ قسوور بێ زۆرم خۆش دەوێ.

جا پیاویش لە دنیایەدا دەبێ ژن و منداڵی خۆی وا تاقی کاتەوە:

کەسێکی تۆ خۆشت ویست، ئەویش ڕوحمی دەچێتە سەری و خۆشی دەوێی. کەسێکی تۆ نا خۆشت ویست و بە تاڵیت باس کرد، ئەویش ناخۆشی دەوێ و دەبێتە قەستەسەری. چون کەیفی لەوەیە سەفحەی ڕۆژگاری میری بەخۆشی ڕاببرێ، ئەوی ئەو ناخۆشی ویست، ئەویش ناخۆشی دەوێ. ئەوە ژن نییە ئەوە باسی سەرە ئەگەر تۆ کەسێکت ناخۆش ویست ئەو بەدزی تۆ گوفتوگۆی دەگەڵی ببێ، کەسێکی ئەتۆ

خـــۆشت ویست و ئـەو بەنـەتەوی دانا بزانە ئەو ژنە نـاجـسنە و بەکـــار نایـە. ئەوە نسحەتی عەلی بەردەشانییە.
مـیـر سـێـوەدین بەگ کـوتـی: خـەریکم ئینشـەڵڵا ژن بۆ سـەعـیـد بێنم، وەبەر دڵم کەوتووە.

٧٦

سبحەینەیەک بەیانە، تازە ڕۆژ لە بورجی مونەووەر دێتە دەرێ
خـانم و خـاتوونـی حـەرەمـخـانـەی میـر سـێـوەدین بەگی کربوویانەوە دەرکی چوار فەسڵ[٢٧] و پەنجەرێ
هەموویان بە شل و مل ڕەعنایی خۆیان هاویشتبووە سەر گۆیە کەمبەرێ
هەر کەسێکی بە نائەمینی تـەمەشـایان بکا، هەرتک چاوی لە کەللەی سـەری دێتە دەرێ
کەس ناتوانێ تەمـاشای حەرەمـخانەی میـر سێوەدین بکا، جەرگی لە نێوزگی دێننە دەرێ
سـەعید سـەری خۆی داخـست، بەوێدا هـات، کوتی: ڕەبی چاوم کوێر بێ! نەبادا لە حەرەمخـانەی میری بکاتەوە هـەتەرێ
بانگیـان کرد: خـەزنەدارەکەی ئـەمـینی مـیـر سـێـوەدین بەگ! ئیـجـازەت هـەیە وەرە سـەرێ
کڵفـەتان عەجایەب مان، کوتیـان: خـانم و خـاتوونی میر سێوەدین بەگ بەکەسیـان نەداوە ئیجازە و بوار و گوزەرێ
نازانین لێی دەپرسن چ گوفتوگۆیەک؟ چ باس و خەبەرێ؟
ئەوە سەعید هەم شەرمیشی دەکرد هەم وە سەرکەوت.
ئەگەر هات، دەتگوت بەهەشتی ڕەنگینە و دەروازەی بەڕەحمەت کراوە
خانم و خاتوونان هەمووی زولف و هەنیە و چاوو ئەبرۆی بەنگییان تێک هاڵاوە
دەڵێی باغی شەدداده و ئێستا کەسی نەچۆتە نێوێ و نەژاکاوە
دەڵێی بورجی بەڵەکە و پەرییان خاتووزینیان لە خەوێدا بۆ کاکە مەم ڕاکێشاوە

هەچ کەس چاوی پێی بکەوێ، نابەڵەد بێ، عاقڵی لێ دەبێ کەم و ناتەواوە
بۆچی موجەسسەمەی قەدیمی ئەوبەر ئەوبەر لێ داندراوە
هەمووی جەواهێرە و ئەڵماسکاری کراوە
تاریفی دیوەخانی میر سێوەدین بەگی نەبە قەڵەم دەنووسرێ و نە بە زمان دەبێتەوە تەواوە
چ نییە ئەو زینەتە، پێنج و دوو ڕۆژێکە، ئاخر ئەویش سەری دەگڵی ناوە
کڵفەتان قاوەسینەی جەواهێراتیان لە سەر دەستی ڕاگیراوە
دەستبەجێ کورسییێکی داری عودی قابیل دروستیان بۆ سەعید دادەناوە
ئەسمەخان دەڵێ: عەزیزم! غەریبی ئێرانی! قەدەمت مەملەکەتەکەی ناسرییەی هێناوە
میر سێوەدین بەگ تاریفی تۆی کردووە، دەیگوت: زۆر ئەمینە و زۆر پیاوە
بیست و یەک یاقووتی عەبدولحەسەنم بۆ تۆ داناوە
ماڵی بابمە، ماڵی میر سێوەدین بەگ نییە و لەگەڵ خۆم هێناوە
ئەگەر تۆ ژنت هێنا، مەترسێ، دەتدەمێ، با نەڵێن: دەس تەنگە و خەزنەداری میر سێوەدین بەگ مەحتەل ماوە
ئایشەخان دەڵێ: مەترسە! ئەو کارەت لەبەر نەبێتەوە گرانە
چل و شەشت دەدەمێ یاقووتی عەبدولحەسەن و لەعلی ڕوممانە
ئەگەر بەقیمەتن، کەمتر وەگیر دەکەون ئەو دەور و زەمانە
بۆ خەرجکردنی ڕۆژی داوەت و ڕۆژی ژن هێنانە.
ئەسمەر خان دەڵێ: ئەوە پیاوێکی عاقڵ و چازان و بە مشوورە
کاری خۆی زووتر دیوە، کردوویە جورە
ئەمنیش تێدام، دەیدەمێ چل و حەوت یاقووتی سوورە.
سەلمە دەڵێ: چل و هەشت گۆسالە و گۆسفەند، ئەوێ ڕۆژێ ئەگەر دەبێتەوە بە شایی و لۆغانە
بیست و یەک ئاڵتوونی دەدەمێ، ئەوی هیچ دەوڵەتێک نەیبردۆتە خەزنەخانە

ڕەواجی بازاڕە و زۆر بە قیمەت گرانە
بیست و یەک گۆسالەی دەدەمێ بۆ وەختی سەربڕین و خەڵات بەخشانە
چون عێزەتی تۆی میر لە کن ئێمە داناوە.
سەعید سێ کەڕەت دەستی لەسەر سنگی دادەناوە
بەئەدەب و بەئەرکان پاشە و پاش دەگەڕاوە
دەیگوت: خوشکەکەی لە دای و بابێ! خودا بتان کا بەرقەرار و ڕاوەستاوە
چومکە گوفتوگۆی ئەنگۆ تا ئەورۆ دەگەڵ هیچ کەس نەکراوە
زۆر مەمنوونم، ئەمنتان بە برای دای و بابی خۆتان داناوە
ڕەبی قەت مەجلیسو تێک نەچێ! قەت ئەسرینو نەیە لە تەمبەڵی(؟) چاوە
میریش هەر دەست ڕۆییو بێ! خودا بیکا بەرقەرار و ڕاوەستاوە
ئیجازەی وەرگرت و سەعید دەگەڕاوە
چومکی ئەوە ئیفتیخارە، دڵ خۆشییان داوە.

٧٧

سەعید وەک سەلیمی جەوهەری وایە جار جار تەڕەقییە و جار جار سەری لە چاڵاوە
جار جار شوانەوێڵەیە و جار جار دوو سەد کەسی لە پشت ڕاوەستاوە
جار جار لەنێو میر و بەگلەرانە، جار جار جێگای قوڕ و قوڕاوە
کوێرەوەری و خۆشی، هەموو پێشاتی دونیایەی کێشاوە.
ئەوە ماڵە میر سێوەدین بەگ کوتیان: پۆیلەت[٢٨] دەکەین ئەگەر ژن بێنی. دایانێ و دەشی دەنێ.
کابرا دەست ڕۆییوبوو، لە کچان، لە ژنان، لە خەڵکی دەپرسێ بزانێ کێ لە قابیلەتی وی دایە. ئەوە ژنێک نێوی یاسەمەن بوو، سەعید پێی گوت: میر سێوەدین بەگ ئیجازەی لەسەرە ژنێ بێنم، هەتا ئێستا کەسم نەدیوەتەوە، ئەتۆ دەڵێی چی و ناڵێی چی؟ یاسەمەن کوتی:
خەزنەداری میری دەڵێی بێ عاقڵە وَ هیچ عاقڵی نییە

دەنا وەکی تۆ دەڵێی مەملەکەتی ئێمە چۆلە و کەسی تێدانییە
ئەگەر لە بڵندی تەماشا دەکەی، هەتا پیشانت دەم بڵندی و حونەرییە
ئەگەر کارت هەیە بەجێگای پەست و نەوییە
خۆ لە مەملەکەتی ئێمە ئەو جێگایە و ژن و کچ قات نییە
ژن لە حاستی پیاوان قابیلەتی چییە؟
پیاو دەبێ فەسیح بێ بەلیغ بێ کەسێکی کەیفی گرتی، بیداتەوە دەلالەت و دڵخۆشییە
ئەدی تۆ لێرە دانیشتووی، قسە بکەی بەخەمناکی و بە کزییە
خۆ ئەوە پیشەی دلێر و پیاوان نییە
ئەوە پیشەی پیرێژنانە، دەڵێن: بێ دەسەلاتییە
کورە ڕەبی قوڕی گەرمێن و کوێستانت بێتەوە سەرێ
بە دەردی کەسکوون جەرگ و دڵت بێتە دەرێ
بۆ شەرم لە ژنان دەکەی؟ دێیەوە سەر ڕۆژی مردن و قەستە سەرێ
ئەتۆ تێ نەفکریوی هەتا شوانێ هەتا گاوانێ
هەر کەسێ دەچێتە سەر شەوگوردی خۆی لە کچ و ژنان و هەچ کەسێ بۆ خۆی چارەی خۆی دەزانێ.
پیاو بۆ خۆی دەبێ وەک پڵنگ بێ و بکا دەستوبرد
بۆ بەشی تۆ نەماوە وا قوڕت وەسەر خۆت کرد؟
ئەوە یاسەمەن تانووتی لێ دا و بزاوتی و زمانی ڕەبەری پێی خست.

## ٧٨

کچی فەتالی بەگی بەگیان بۆ سەعید دیتەوە؛ نێوی حاسیە خان بوو. سەعید لە ماجبی خۆی بەرتیلێکی زیادی دا، گوتی: شێوە و عەکسم بۆ بێنن، بزانم چۆنە؟ سەعید، هەر چۆنێک بوو، شێوەی وەگیر کەوت. سەعید ئەگەر چاوی پێ کەوت، ئاهـ لە نیهادی هاتە دەرێ! جا گوتی: خودایە! لەسەر ناڕەحەتی، ئەمنت خستۆتە سەر ئەو خۆشی و ئیختیارە؛ ئەوەش بەهێزی میر سێوەدین بەگ نەبێ، لە

تاقـەتی مندا نییـە. غـەریب و کـەس نەناس و بێ خـانـەوادە و فـەقـیـر و هەژارم، ئەوە سەعید پێنج شەش مانگ فکری لێ دەکرد و تەگبیری بەخەڵکی دەکرد.

میر سێوەدین بەگ کەڕەتێکی مێهمانێکی کرد بۆ باغی هەناران. عالەمێکی زۆری لەگەڵ بوو. پاش نەهارێ عـالەم هەمـوو هاتەوە، هەر کـەس بەلایەکدا. سـەعـیـدیش نابەڵەد بوو، بەڕێگایەکی دیکەدا هاتەوە.

حـاسیە خـانیش، قەرەوڵی دانابوو، خـەیاڵی بوو بچێتە سـەحـرایە. لە سـبحـەینێوە حازر ببوو، لەبەر میری وە دەرنەکەوت. ئەگەر میر لە باغی هەناران گەڕاوە، قەرەوڵ کوتیان: میر هاتەوە؛ ئەگەر وەدەردەکەوی، وە دەربکەوە.

حـاسیە خـان، کـە لەبەر مـیری پەکی کـەوتبوو، وڵاغی بۆ حازر کرابوو؛ هـات سـوار بوو. ڕکـێـفی لە وڵاغی دا و لـە شـاری وەدەرکـەوت. لە ڕێیـە تووشـی سـەعـیـد بوو. سەعید عەکسەکەی پێ بوو، ناسی.

(جا وای بنووسە لەنگی تێدا نەبێ! مامە شێرە[٢٩] دەیگوت: ئەو بەندە پیروەلی باغی دێنێ!)

سەعید کوتی: حیزی هەمبانەی کولوانە، هەتا تێی ئاخنی دەیبا، ئەوە هەوە ئەگەر من بە حەسرەتیەوەم. سەعید کوتی:

ئەلحەمدولیللا کەوتییە خووانی زین

خورشید هەڵاتووە لە خاوەر زەمین

بە سەرگەردت بم وەردۆکی باڵ شین

عەترە لە کوڵمەت وا بۆتە ئەسرین

مژانگت هاتنە خوار بۆ خەڵات بەخشین

چاوانت کاڵن، وەک حەرفی یاسین

زولفت داناون بەڕێز چین بەچین

وەک جەنگی بوڵغار لەشکر تێک ڕژین

هەناوم سووتا، دڵم گرتی تین

ڕەنگین بوو سەما، گوشاد بوو زەمین.

٧٩

ئەوە زۆر لەسەرەخۆ حاسیە خانی بەگلەربەگی ولاغەکەی ڕاگرت، بەکاوەخۆ لە جوابی قسەکانی سەعیددا کوتی:

ئەرێ تۆ کابرا بەمنت گوت حەڕفان
پێت کوتم: سوار بووی لەسەر زین و خوان
خاڵت داناوە لە سینە و مەمکان؟
ئەمن ناتناسم، ئەبلەی هیچ نەزان؟
خەزنەدارەکەی هاتووی لە کوێستان
لە ئەندازی خۆت وەرە سەر قسان.
کێ ئەو قسەی بەتۆ کوتووە
تاریفی منی لە کنت کردووە؟
ئەو قسەیە بۆ تۆ گوج و سەهووە.
من بەگلەربەگیم، ئیختیار دەستانم
بێ کەسوکار نیم، وە دەزانی شوانم؟
دایمە لەسەر خەڵات بەخشانم.
لەوەتی حاسیە لە دایکی بووە
دڵی ناسکم گەردی نەگرتووە
هیچ کەس سەهۆی وا گەورەی نەکردووە
تۆ بەحوکمی کێ ڕێت بەمن گرتووە؟

٨٠

ئەو جار نۆرەی سەعیدە. کڵفەتان لە دوور ڕاوەستابوون، نەهاتنە پێشێ. سەعید دەڵێ:

قەزات لە گیانم بەئەهوەندی بدوێ نەگ بەتووڕەیی
حەزناکەم بکەی حجوب گەورەیی!

کەسێک گەورە بێ، دەبێ بەئەرکان بێ
بۆ بەردەستی خۆی لە بەردڵان بێ
کابرا خەڵکی گەرمێن بێ، یان ئی کوێستان بێ.
قەزات لە گیانم کیژ سوورمەییە
ناسک و شلک و سوور و سپییە
قسە زەکات و ملکی بۆ نییە(۳۰)
بەمێهرەبانی پێم بڵێ ئەوە کاری تۆ نییە
قەزات لە گیانم خانمی دڵ شکێن
بۆچی باز ناچێتە سەر ڕێگای شەهێن؟
خەڵک داو دەنێتەوە لە وەردۆک و داعبا
نازانێ، گیرا و ئەگەر نەگیرا
ئەوە لەشکدا، بەهەویای خولا.
قسێکم کردووە، نییەتی بەها
جوابی قسەکەم بەخۆشی بدە.
چۆن لە کنم بوو عەکسی تۆو شێوە
بۆیە قسەم کرد ئەمن لە ڕێوە.
بانگی کرد: ئاخ لە بانی ئاخ! ڕۆ لە بانی ڕۆ!
کێ شێوەی منی هێناوە بۆ تۆ؟
خوێنی برێژم وەک جۆبار و جۆ
سەعید کوتی: تۆ مەبە تووڕە و تۆسن و عەسەبانی
سنگت کردۆتە شەربەت و کانی
با بەگلەربەگی بی، دیارە گە خانی
ئەگەر گوڵیش بی لەسەر دەستانی.
ئەگەر قەڵا بی ئەمن لەشکرم
ئەگەر تۆ گوڵ بی، عەترت دەگرم.

دڵخۆشیم هەیە شادبم بە خاڵت
بەگەردنی بڵند، مانگی جەماڵت
بەئەبرۆی پەیوەست، قەدی شمشاڵت
مژانگی پیاو کوژ، دوو چاوی کاڵت
ڕەبی زۆر خێر بێ فکر و خەیاڵت

٨١

حاسیە فکری کرد: بۆ خۆی هەڵکردووە؟
ئەوە بۆ ڕێگای بە من گرتووە؟
وە دیارە ئەوە جەرگی کەبابە
جوابدانەوەی خێر، گەلێک سەوابە
خەڵکی دەچتە حەج، بۆ ماڵی کابە
ئەوە چاوەڕێی سواڵ و جوابە.
کوتی: عەزیزم! ڕێی قسان نییە
کاری وا بەئاشکرایی چاک نییە.
بەختت بڵند بێ، گەرد نەگرێ ڕەنگت
ئاو پرژێن بکرێ جەرگ و دڵی تەنگت
بەبێ قسوور بێ ڕووی شۆخ و شەنگت.
تۆ مەیژاکێنە لەبزی گەوهەرم
ئەمن ڕێبوارم، لەسەر سەفەرم
ئەلعان بێ جواب و قسە و خەبەرم.
لە ڕۆژی خۆیدا لێت دەکەم پرسیار، دەتدەمێ خەبەر
مەردی حیسابی، ئەی ساحیب جەوهەر
ڕێگام بەربدە خەمم کەوتە بەر.
ئەمنیش وەک تۆ با نەبم موفتەلا
پیاو دەبێ بەعاقڵ تەگبیرێک بکا

بۆ ڕمب چەقاندن، جێی ڕمبی بکا[٣١]

بولبول نەزانە، شەوێ دەخوێنێ

جەرگ و هەناوی خوێن دەدەڵێنێ

خەوی شەوانە لە خۆی دەستێنێ

تا بۆن و عەتری گوڵ وە دەست بێنێ.

سبەینێ بەیانی خەو لابەلای دەکا

عەتری گوڵ دەچێ ئەو وەختی بە با[٣٢]

ئەوە حاسییە ڕۆیی. دە ڕۆیشتنێدا کوتی: ئەگەر ڕێگای دەستم بێ و قسمەت بمهێنێ و چارەنووس بێ، خاترجەم بە کوێستانی دەتخەمە بەردڵان.

٨٢

ئەوە سەعید دەڵێ:

پشتت تێ کردم، دەچی بۆ سەفەر

لە جەرگت داوم پەیکانی دوو سەر

ڕزگاریت نابێ لە دەشتی مەحشەر

زولفت داناون، وەک سوارەی تەتەر

لەسەر لێوانتن خاڵی وەک عەمبەر

خۆزگەم بەو کەسەی پێت دەبا زەفەر.

لێم دوور کەوتیەوە، بوو بەپەژارەم

چومکی غەریبم، گەلێک بێچارەم

بوو بەقنیاتی سوبح و ئێوارەم.

بریا نەمدیایەی گەنجی شای سوڵتان

دەسماڵ خێڵەکی، سەرداری کیژان.

ئەوە سەعیدیش هاتەوە. جا بزانین پاشە ڕۆژێ چۆن دەبێ؟

٨٣

سەعید هاتەوە بۆ خەزنەخانە
کەمێک دڵتەنگە، وەکو دێوانە
دڵێکی لە وییە، یەک لە شاخانە
بریا نەمدییایە لەنجەی جانانە
لە جەرگی داوم پەیکان و تیری
بەچاوی دادامەوە، کوتی: فەقیری
سەعید خەریک بوو بەکار و حیساب
بەجەرگی شکست بە سینەی کەباب.
هەتا حەوت ڕۆژان ئەو کارە ماوە
جەرگی سەعیدی پڕ لە زووخاوە
ئەگەر بە با دەرکە دەکراوە
دەیگوت: قاسیدە و خەبەری هێناوە.
ڕۆژێک مابووی پچێتە نیوەڕۆ
فرمێسک دەڕۆیی وەک جۆبار و جۆ
سەعید دەیگوت: من بەدەستی خۆم چم کرد لە خۆ
چاو سوورێک ئاخر لە دەورەم نییە
غەریب و بێ کەس، پشتم خاڵییە
دەبێ هەر بکەم ڕەبی ڕەبییە.

٨٤

ئەوەندی زانی کڵفەتێک بەناز
بە لەنجە دەڕوا کۆتری تەقڵەباز
سەعید ڕاوەستا لەسەر دەنگوباس.
کڵفەت سەلام کرد، وەزیفە جۆیی

چاو و برۆکەی وەک ئاسک ڕۆیی.
من لەگەڵ تۆمە ئەرێ خەزنەدار!
تۆی لەگەڵ خانم هەتە کاروبار
ئەتۆ لە بەگلەر بەگییان پرسیارت کردووە
دڵی حاسیە خان ئاوری تێ بەربووە
قاقەزی ئەسەحی بۆ سەعید ناردووە.
نووسیویەتی: ئەمن بێ کەس نیم، من خانەدانم
ساحێبی براو ماڵە باوانم
چاکم تەماشاکە، کەسر نەکا شانم.
بۆ وی جێبەجێ نابێ ئەو کاری گران
یەکتر گیر نابێ عەرز دەگەڵ عاسمان
مەگەر میر سێوەدین بەگ بێتە سەر قسان.
بێ ملْک و ماش و تۆ بێ ئیختیاری
لە خۆوە مەست و شێت و خوماری
ئەگەر دەتەوێ پێک بێ ئارەزووی دڵان
هەنگاوت بشتە نێو باغی گوڵان
دەبێ حاڵی کەی میری سەربەخۆ
دەنا تا ماوەی دەبی ڕەنجەڕۆ.
دەنا پێک نایە بۆ تۆ ئەو کارە
هیچ کەس ناتناسێ، ئەرێ بێچارە
قەت بەتۆ ناگا ئەو دۆست و یارە.

٨٥

ئەو جار سەعید فکری لە حاڵی خۆی کرد:
دەبێ بەدەستی خۆم من خۆم بنێژم
چۆن من جەوهەری خۆم لە کن میر سێوەدین بەگ بڕێژم؟

جا بڵێ ئەمن وەها دەدوێنێ
ئەمن بۆت بچمە کاری خوازبێنێ؟
هەڵبەت دەلاڵم، ژنم پێ دێنێ
عاسمان بڕووخێ ناچمە سەر قسان
ئەو کاری گەورە قەت نابێ هاسان
میر سێوەدین بەگ وەکو قارەمان
بۆ منی بێچارە بێتە سەر ژن هێنان
سوێندم بەڕەحمان گەر ئەبەدییە
ئەو قسەیە لە شانی میر سێوەدین بەگ نییە
بۆ من نەهاتییە، زۆر بەدبەختییە
کاری وا بۆ من نمەک بەحەرامییە.

٨٦

دوو کەڕەتیش چاویان پێک کەوت؛ عاشق بوون، وایان لێ هات هیچیان بە بێ هیچیان قەرار و وەقرەیان نەبوو.

بە شەش مانگ جارێک میر حیسابی خەزنەی لێ وەردەگرت. پێنج هەزار تمەنیش کەم بوویایە، میر بەچاوی دانەدەداوە؛ یەکجار زۆری خۆش دەویست. لە شەش مانگەیدا وەختی حیسابی خەزنەخانەی بوو، سەعید دەفتەری حیسابی خەرج و داهاتی هەڵگرت، چووە کن میری. میر لە قەڕاعەت خانەی ئیسڕاحەتگادا دانیشتبوو، چێشتەنگاو بوو.

سەعید سەلام کرد، بوو دەستەونەزەر
فیدای گیانت بم میری پەڕبەسەر
حیساب و کیتاب پاکم کرد لەبەر
بۆ حیساب هاتووم ئەی لەبز شەکەر.
سەری هەڵێنا، میر جوابی داوە
ئەگەر تەماشای کرد، سەعید شێواوە

لەسەر ڕەنگی خۆی نەماوە
دەڵێی کاروانە و ڕووت کراوە
دەڵێی ئاسکە و تیری لێ دراوە
دەڵێی مانگی چاردەیە و لە عاسمان گیراوە
میر سەعیدی بەهەناسە ساردی دەهاتە پێش چاوە
بۆ وا شێواو و جەرگ کەبابی؟
سەرنجت دەدەم وەک جاران نابی
پریسکەی دڵتم لە کن بکەوە
بۆ خەزنەخانە خەمت مەبەوە.
کێ لە تۆی کردووە زوڵمی گرانت
کێ شێواندوویە گۆشەی چاوانت؟
بۆچی وەکو «بێ» ڕەنگت زەرد بووە؟
زوڵم و ناهەقی کێ لە تۆی کردووە؟
زۆر کز و دژ و ڕەنگ لە ڕوو بڕاوی
وەک داری بێ ئاو شکست و شکاوی
من وای تێدەگەم، وام دێتە پێش چاوی.

٨٧

سەعید دەڵێ: من لەگەڵ تۆمە ئەمیر و سەردار!
هەر بێ بەلا بێ خانی جەوهەردار
هیچ کەس بە زوڵم بە من نابا چار.
هیچ کەس ناتوانێ پێم بەرێ زەفەر
هیچ پەڕ بەسەرێک، هیچ میر و بگلەر.
بنی ئادەمییە، دڵی عەبداڵە
هەمیشە لەسەر فکر و خەیاڵە.
لەبەر غەریبیان کەمێک پەرێشانم

خزمەتت دەکەم هەتا دەتوانم
بەزوڵم و زەلاڵەتی کەس نازانم.
ئاخر میر گەلێک لێی دەکرد پرسیار
خۆ تۆ نەنگوواوی، نی بریندار
ئەگەر قۆڕ بپێوی، سەت واوەیلاکەی
دەبێ مەتڵەبت لە من ئاشکراکەی.

٨٨

ئەلعان قسێکم من لە دڵی دایە
بەڵام ئەو قسە نامستەجایە
بەکوشتن نەبێ لە زارم دەرنایە.
هەرکەس بەڕێی خۆی دەبێ بکا تەمەشا
گاوان شانی خۆی، دەروێش بۆ دەروێشە
بۆ خانان دەبێ باغی وەنەوشە
زۆرم قسەکرد، میر دڵی هێشا.
بۆ پیاوی گەورە، لە سێ قسە زیاتر چاک نییە.
خودای تەعالا ببێ بە سەبەب
پیاو دەبێ بە سێ قسە بێتە سەر مەتڵەب.
سەرم هێشاندی، تۆ لێت کردم پرسیار
تەخت و مەکانت ببێ بەرقەرار.

٨٩

میر سێوەدین بەگ کوتی: ئەلعان شێواوە
ئەوە قسە ناکا، دیارە شتێکی لێ قەوماوە.
هاتەوە ماڵێ، کوتی: خەزنەدار، ئەمینی ئەرکان
لەکنم نەخۆشە بەدەردی گران

زۆرم لێ پرسی، نەهاتە قسان
گەلێک بەسامن ئەمیر و چازان
هەموو کەس ناکا قسەی بەردڵان
بەڵام بێ سامە لە کن پیاو ژنان.
بە عاقڵ و کەماڵ، بە هونەرداری
کڵفەت بنێرن، بە ئامۆژگاری
پرسیاری لێ بکەن زۆر بە وشیاری.

۹۰

چا ئەوە کڵفەت چووە کنی؛ بانگی کرد، گوتی:
ئەی بەئیعتیبار! ئەرێ جانانە
ڕوخسەتت هەیە بۆ حەرەمخانە.
هیچ مەترسە! لێوت نەگرێ بار
گوفتوگۆ هەیە، لێت دەکەن پرسیار.
سەعید بە لەرزین، بە شەرم و خەیاڵ
بۆچی بانگ دەکەن سەعیدی عەبداڵ؟
ئەوە هات بۆ کن ناسک جەمینان
تام خۆش و بۆنخۆش، لەخت و لار(۳۳) شیرنیان
بەرۆک خەزنەخانە، زولفی چین چینیان
هەموو کەس ناتوانێ بچێتە دینیان
کەس نەیدیوە ڕەنگی ئەتلەسینیان.
مەگە هەر سەعید بچێ بۆو کارە
ئەویش لە کن میر زۆر ئەمیندارە.
دەنا قەل ناتوانێ بچێتە کن هەڵۆ
قسە و گوفتوگۆ بکا سەربەخۆ
بچێتە نێو باغی نارنج و لیمۆ

تامیان بکا هەنگوین و گەزۆ.
بە عەدەب سەلام کرد، ڕۆح لەسەر دەستان
زۆری شەرم کرد لە گەڕی چاومەستان
پاکی گەردنی وەک باغ و بێستان
کوڵمەی گەش و جوان، وەک گوڵی کوێستان.
دەستەو نەزەر و بێ ڕوح ڕاوەستا
تا نەیدوێنن، هۆشی نییە، مەستە.
بە مێهرەبانی و بە عاقڵ و کەماڵ
دڵخۆشیان داوە، فەقیری عەبداڵ!
هیچ شەرم مەکە، لێت نەگۆڕێ حاڵ.
هەرچی لە دڵتدا بیخە سەر زمان
وەک بۆ تۆ هاتووە، ئەبلەی هیچ نەزان!
بۆ کەس نەهاتووە لە کن میر و خان.
پرێسکەی دڵت بکە ئاشکرا
خۆ بولبول نی شەماڵ گوڵت ببا
بێ دەسەڵات نی، دروستی کردووی خودا.
بۆچی دایمە سەرت بە تەمە؟
دڵت پڕ لە دەرد و خەمە؟
مەیشارەوە شێتی دێوانە!
دەنا دەبێ بچی بۆ حەفسخانە.

٩١

هەر چوار و پێنجیان بەتوندی کوتیان دەبێ ڕاستیمان پێ بڵێی. جا سەعید ڕووی دەئێکیان کرد و کوتی:

هەرچەندی شەرم لە دڵمدایە
گیانم فیدات بێ شۆخ و مینایە

وەک سێوی سەردەستانی
تێگەیشتوو، زۆر قسەزانی
تام خۆش و بۆنخۆش، لەبەر دڵانی
حۆری بەهەشتی، بۆ خۆت نازانی.
گەرنت هەڵێنە، وەک حەوزی کەوسەر
زولفانِ دەسوورێن، وەک سوارەی تەتەر
قسەت یەک و دوو لە زار دێنە دەر
شیرن  تامدارن بەوێنەی شەکەر
دەسوورِێ لە گەردنت گەنج هەتا گەوهەر
ئاخر گە بێتو پێت بدەم خەبەر
بۆ من دەست نادا، من قورِم وەسەر
کوتی: هیچ مەخەجڵێ، مەیە سەر شەرم
قسە مەگنخێنە، مەکە قسەی نەرم.
بە مێهرەبانی، ئەرێ جگەردار!
میر سێوەدین بەگ لێم دەکا پرسیار
هەچی دەیزانی تۆ بیکە ئیزهار.
سەعید قسەی کرد ئەو بە شەرمەوە
بەشەرمێونی، بەدڵی گەرمەوە:
دنیای ڕووناکم لێ بووە بە شەو
لە داخی یارم، من لە تاوی ئەو
نایدەن بە گاوان خەزێنەی خەسرەو.
من لەگەڵ تۆمە، سەرمت بە قوربانە
دڵم لە جێگای بڵند کردوویە هێللانە
جێگای پڵنگ و نەڕرە شێرانە.
ئەمن ناوێرم هەنگاوێک بڕۆم

ئەگەر بچمە سەر هێلانەی خۆم.

چونکی ئەمن ئاسکم، ئەوان هەژدیها

ئاسک نێچیرە، هەژدیها دەیخووا

سەعید بۆیە ناتوانێ ئەو قسەیە بکا.

سەرمت بە قوربان هەتا دەتوانم

فیدای گیانت بێ من ڕوح و گیانم

ئەمن عاشقی حاسیەی بەگلەر بەگییانم

ئەویش دەڵێ: کەسرە بە شانم.

ئەو جێی بڵندە، بڵند پەروایە

میر ئەو قسەی پێکردم ئاشکرایە.

سەرزەنیشتم دەکەن ئاغا و نۆکەر

گەورە گەورەی عەسر هەتا پەڕبەسەر

جا چۆن شمقارِ دەبێ بۆ خەرتەل؟

کوتی: مەترسە لەوەی بڵێی گەورەجێیە

میر سێوەدین بەگ دەرمانی پێیە.

دەتوانێ حەوسەت سوارت بۆ بکا سوار

دەرمانی بکا دڵی بریندار

لە حەفسی ئەبەد بتکا ڕزگار

بڕۆ، گیرمەبە ئەرێ خەزنەدار

٩٢

میر سێوەدین بەگ دوو برازای لە ماڵێدا بوو. یەکیان نێوی خونچێ بوو، یەکیان نێوی گوڵخاتر بوو.

بێینە سەر باسی خونچە و گوڵخاتر

مەتای گەردنیان مەتاحی نادر

هەرتک زۆر جوانن، چاو وەکو جابر

بێ عەیب و ڕەعنا، یەک لە یەک چاتر
موسوڵمان بیانبینێ بۆیان دەبێتە کافر.
هێندە شیرنن وەک میوەی جەننەت
بەهیچ پادشایەک نایەنە قیمەت.
چومکی منداڵ و زۆر زانا و ژیرن
ڕۆژێ سێ کەڕەت لەبەر چاوی میرن.
وەخت ڕابرد تا کەوتە شەوێ
ئەو وەختەی ئەگەر دڵ یاری دەوێ.
ئەگەر چۆڵ دەبوو مەجلیس و دیوانە
میر دەگەڕاوە بۆ حەرەمخانە
هێندێکی دەکرد قسە و گوفتوگۆ
بۆو بگێڕمەوە بێ بوختان و درۆ:
ئەمن با لێ و بکەم پرسیار
قسەی ئاشکرا نەبوو کابرای خەزنەدار؟
بە تەسکینەوە بەسمە عەرزی کرد
قسەی دڵی خۆی لە کن ئێمە کرد.
ئەو قسەی کە بووی، کرد بووی پەنهانە
بەئەسەحی و ڕاست لە کن مەی دانا
نەخۆش و مەستی دەستی حاسیە خانە
ئاشقی کچی بەگلەر بەگییانە.
ئێستا ماوەتەوە، ببی بەرقەرار
لەسەر گوفتوگۆی میری کەرەمدار
جا بزانین چۆن دەکەی ڕفتار.
میر بەئەسەحی ئەگەر وای زانی
پەنجەی گرێ گرێ کرد بۆ نێو چاوانی.

کوتی: هیچ زەحمەت نییە، وا بووە خۆڵ وەسەر
غەواس بەهاسانی گەوهەر لە بەحریٚ دێنێتە دەر.
زولفت هاویشتووە ئەم شان و ئەوشان
وەکو ڕیحانە هاتۆتە بۆندان
هەموو کەس ناتوانیٚ بچێتە سەر سکە لێدان.
عومر و حوکمات و قسە لەسەرم
بەهومێدی خودای سکە لێدەرم.
دەبیٚ بۆی بێنم حاسییەی سۆسەن خاڵ
پەرێشان نەبیٚ فەقیری عەبداڵ.
ئەمن دەزانم کە لێی قەوماوە
لە ئێرانێوە پەنای هێناوە
بەئەمینداری کاری تەواوە.
سوێندم بەتانجی پادشای تورک و ڕۆم
من لەو کارەدا کردمە کوڕی خۆم
چومکە ئەمیرم، ئەمن سەربەخۆم.

٩٣

ئەوە سوێندی خوارد. دەنێریٚ لە دووی ماڵە بابی کچەکە، میر سێوەدین بەگ بۆ خۆی نەچوو. میر سێوەدین بەگ کوتی: دەنێرم لە دووی تایەفەی بێنە ئێرەکانە، داوای حاسیەیان لیٚ دەکەم.

ئەوە بەسمە خان پێی گوت:
میری لەب زێڕین تۆ پەلە مەکە
نەوەکو حاسییە مێردی پیٚ نەکا.
پیاو دەبیٚ کاربکا بەخۆش ڕەفتاری
گە ببێتە مەجبووری و زۆرداری
ئەوەش بۆ کابرا دەبێتە شەرمەزاری

له پاشان خوێن له دڵی دەبێتن جاری
بۆ دابنیشێ به لێوبەباری؟
بنێرین له دووی حاسیەی نازداره
بزانین ئەویش دڵی بریندارە
مەسڵەحەت دەزانێ ئەو کاروباره
ئەویش وەکو وی دڵ له هاوارە؟
یانه ئێخەی خۆی هەڵدەتەکێنێ
ئەسرین له چاوی ڕەش دەبارێنێ.
دەبێ بیبینین مەتای گرانبار
قسه و گوفتوگۆی پێ بکەین ئیزهار
زولفی سێ بەنگی دەنوێنن تارتار
کولمەی ڕەنگینی وەک گوڵی بەهار
عەتریان له خونچەی دێ سەر بەرەوخوار
حاسییه غەملاوە وەک بازاڕ و شار.
من لەگەڵ تۆمه میری ڕەندومەند
دەبێ بیدوێنین مەتای سەمەرقەند
بزانین قسەی چییه لەبز نوقرەبەند
ئەوە میر دەڵێ: لەمن وایه ژنان هیچ عاقڵییان نییه
کەللەیان پووک و دایمه خاڵییه
قسەی ژنان هیچ کەلکی نییه.
وەڵڵاهی ڕاسته ئەو گوفتوگۆیه
زۆر بەڕێ و جێیه، بەسمه قسەی تۆیه.

٩٤

جا ئەوە میر کوتی: بنێرن له دووی. بەدزیش بنێرن له دووی سەعید، با چاوی به سەعید بکەوێ، بیبینێ. ئەگەر پێی ڕازی نەبێ، قسەی خۆم خەسار ناکەم.( میر له

هەموو شتێک حاڵی نییە، نازانێ دیویەتی).

هەروا بووە، ئێستاش هەروایە: ژنی پادشا لە دووی هەرکەس بنێرێ، دەستبەجێ حازر دەبێ و خۆی ناگرێ؛ پێی شانازییە.

حەوت چەپکەی نێرگز دایان بەرەهبەر
کڵفەتی شیرن، زۆر ناسک و دولبەر
ئەوان گوڵانە بۆ حاسییەی بەگلەر
بۆ ماڵە میری ڕۆینی کەوتە سەر.
کڵفەت عاقڵ بوو، حاڵزان و چازان
بەخشی بە حاسییە ئەو چەپکەی گوڵان
بۆ تۆیە دیاری کیژی بەردڵان!
لە ماڵە میری دەبی بە میوان.
ئاو پڕژێن کراوە دووکان و بازاڕ
بۆ سەرا دەچن خاسەکەو، کەوباڕ
زۆر مەحتەل ماون باز هەتا شمقاڕ.
حاسییە نەیتوانی بکا خۆگیری
بەعاقڵ و کەماڵ بەهۆش و ژیری
هیچ پرسی نەکرد، بەبێ تەگبیری.
بەسەری دادا تافتەیەکی تار
تافتەی گران قیمەت، وەک گوڵی هەنار
بریقەی وەکو بریسکەی بەهار.
وەختی گەشیەتی کیژەکەی دڵتەڕ
زولفان هاتنە سەر سینەی وەک مەڕمەڕ
زولفان لە هەنیەی دەکەن جەنگ و شەڕ.
ئەوە هات بۆ ماڵە میری.
بەکورتی بڵێم بوو بە گاڵەگاڵ

کڵفەتان بەدڵ کردیان ئیستیقباڵ
بەپیریانەوە هێنا تورمە هەتا شاڵ
گە پۆیلەی لابرد، وەدەرکەوتن خاڵ
وەختە ڕوحی عیسانی، بێ باڵەو، بگرێ باڵ
دینی شێخانی ئەو دەکرد بەتاڵ
بەمژانگی پەیکان، بەدوو دیدەی لاڵ.
بەخێریان هێنا بەسەت ئیحتیرام
گەلێک بەخێرێی ئەی شیرن کەلام!
تۆ بۆچی دیار نی نە سوبح ونە شام؟
سەلمە خان دەڵێ: دانیشە لە لام.
کوتی: خودا بووکا بەرقەرار
بەقسەی شیرن خۆش دەکەن ڕەفتار
بە ئەندازەیەک دەم کەن منەتبار
گەر لە خزمەتو قەت نەبم ڕزگار.
سپاست دەکەم بۆو گوفتوگۆیە
حاسییە هەمیشە کڵفەتی تۆیە.
هەمیشە ڕۆحم لەسەر دەستانە
من نمەک خۆری ئەو خانەدانە
قسە و گوفتوگۆ و لەسەر چاوانە.
ئەتۆ بۆ مەجلیس لەبەر دڵانی
عاقڵ و ژیر و گەلێک چازانی
لە خانەوادەی بەگلەربەگییانی
زولفت هاویشتووە ئەو شانە و شانی
تۆ جەرگی خەڵکی مەکە بریانی.
حاسییە ڕووی لە سەلمە خانە:

سەرم سوڕماوە گوڵی نۆ بەهار!
بە چ خزمەتێک من پێت ببەم چار؟
چاوان دەگێڕی وەک ماندووی ڕێبوار
لە دەستت دایە حوکمات و ئیختیار
قسە و گوفتوگۆت چییە و لێم بکە پرسیار.
ئەمن بەقسەی تۆ زۆر منەتبارم
چومکە کەنیزم من خزمەتکارم.
نمەک خۆری تۆم، گەر بمکەی ڕزگار
زۆر مێهرەبانی خانمی ڕەشتی لار
ئەگەر هەڵدێنی دوو چاوی بەخومار
بە منت چییە بفەرموو کاروبار؟
بم بە قوربانی زولفی شێواوت
هەنیەی گۆناوگۆن، ڕەنگی گۆڕاوت
تا سەر و گیانم بنێم لە پێناوت.
چ دەفەرمووی ئەی خاو و لاوم؟
هەتا قسەی تۆ بنێمە سەر چاوم.
لە تۆ شیرنە ئەو لەچکە و دەسماڵ
وەکو خاسەکەو تۆ ڕشتووتە خاڵ
لە گەردنت دێ دەنگ و گاڵە گاڵ
قۆیتاس و گوارە تا بازنە و خرخاڵ
جارێ دانیشە کیژی خۆش ئەحواڵ.

٩٥

هێندێکیان قسەکرد، هەرچی قسەی زەمانەی خۆیان بوو، ئەگەر ئەو وەختی بەکاردەهات. سەلمە خان کوتی:

لەگەڵ تۆمە، هەلاڵە و بەیبوون!

قسێکم پێیە من بە هاتوچوون
دڵت شلوێ نەبێ وەک دەلیای جەیهوون
دڵت گەرد نەگرێ، نەبێ تاڵ و توون.
بحەسێوە، بەرۆکت بکەوە
ئەوشۆ بە قسەی تۆ لەگەڵ میر شەومان ڕۆژکردەوە.
ئەوشۆ لەگەڵ میر سێوەدین بەگ هەر گوفتوگۆ بوو
هەتا بەیانی هەر باسی تۆ بوو.
ئەلعانیش هاتووی، خانمی ئیختیاردار
زولفت داناوە وەک پیادە، وەک سوار
زۆر جوانە لە تۆ زێڕ و لەرزانە
پیرۆزی تۆ بێ ئەو جێ و مەکانە
کابرایەک هەیە، خەڵکی ئێرانە
عاقڵ و ژیر و گەلێک چازانە
بەدەست و مستی شێری لە لانە
زانا و قسەزان، لەبەر دڵانە
ئەوەش چارەنووسی خودای عەرز و عاسمانە.
شێت و شەیدا و دێوانە بووە
بەتیری دەستت ڕوحی ڕۆییوە
ڕوحی ڕەوانی ئەو لە دەست دەرچووە.
شەو و ڕۆژ دایمە ئەو دەکا خەیاڵ
چاک فکربکە ئەی کیژی چاوکاڵ
ئەبرۆت دەسوورێن وەکو ڕەشەداڵ.
چومکە غەریبە، نەهاتۆتە نێو نێوان
دەنا ئازایە وەک شێری لە لان
بە شان و شەوکەت وەکو قارەمان

بە ئازایەتی ڕۆستەمی زەمان
دەست و چاو پاکە هەر وەکو شێخان.
میر سێوەدین بەگ دایناوە بەکوڕی خۆ
ئەمن ئەوەمە بە تۆ گوفتوگۆ
چومکە لەبەر تۆ بۆتە دێوانە
هۆشی لە خۆی نییە لە خەزنەخانە.
بەمەسڵەحەت و تەگبیر و بە ڕا
تەگبیرمان لێ کرد ئەوەندی عەقڵ ڕێ بدا.
تازە مەمکت خڕ کردووە وەک گۆ
هەرگیز نەشێوێ ڕەنگ و شێوەی تۆ.
تۆ هەر دڵ تەڕبی، ببی سەربەخۆ
ئێمە بەوی مان داوی تۆ.
گەردنت وەکو بەفری کوێستان سپییە
پەڵەت لە گەردنی مینارەنگدا نییە
لەنجە و لارەکەت وەک خاسە سییە
زانا و تێگەیشتووی وەک تۆ هەر نییە
قسەو گوفتوگۆت لەبەر دڵییە
ئەخلاقت خۆشە، تاریفی زیاتر خۆ کەلکی نییە
بزانین ئەتۆ گوفتوگۆت چییە؟
حاسییە فکر کرد ئەو لە دڵی خۆ
زۆر بریندار بوو، ئەو چووی گفتوگۆ
زۆری پێ خۆش بوو قسە و گوفتوگۆ
لەدڵدا پشکووت وەک گوڵی لیمۆ.
کوتی: خان! دیارە بەکەشاکەشی
ڕۆستەم دەیتوانی کە تاج ببەخشی.

بۆت وه دەزانی من عاقلّم کەمە؟
میر سێوەدین بەگ وەکو ڕۆستەمە.
هەچ کەس بشکێنێ قسەی سەرداران
دەبێ دانیشێ وەک شەرمەزاران
خۆی ڕابژێنێ وەک برینداران.
کەس ناتوانێ بترازێنێ قسەی تۆ
ئەمن نەم دیووە کابرای پڕ بۆسۆ.
له کن من نەدیو و هیچ نەزانییه
چومکه ئەو غەریب و کوێستانییه
بێ دیتنی ئێکتری ئەو کاره چاک نییه.
کار له دنیادا دەبێ وەهابێ
بەڵکو ئەو ئەوڕۆ مەیلی ترازابێ
دڵی گۆڕابێ، پێم قایل نابێ.
دەبێ هەرتکمان ببین بەرامبەر
هیچمان دوایه نەبین قەلەندەر.

٩٦

جا لەوەیدا کڵفەتیان نارد له دووی سەعیدی، کوتیان: پێشی بڵێ حاسییه خان له سەرای میرییه.

شێواوی خەزنەدار! دڵت هەڵەشەیه
دایمه ئاوری بێ دووکەڵت لەسەر دڵی هەیه
مزگێنی و ئەنعام بێنه بمدەیه
ئەمن زمانم لەسەر قسەیه.
سەعید خۆشحاڵ بوو، مزگێنی دایه
دەسکی ڕێحانه چت له دڵی دایه؟
قسەی دڵ ئاخری هەر ئاشکرایه

کوتی: ئەلعان حاسییە خان ئەوە لە سەرایە
سەعید چاکی پێ نەکرد متمانە
جەرگ و هەناوی کەوتە جۆلانە
دایمە دڵی لەسەر دەستانە.
ئەوە سەعید هات، گەر گەیشتە جێ
بەرامبەر کران مەجرووم و لەیلێ.

٩٧

ئەوە دەرکی حەرەمخانەیان پێوەدا. سەعید و حاسییە لە جێیەکی یەکتریان چاک دیت. سەعید پێی دەڵێ:

ئەمن عەسڵی خۆی خەڵکی ئێرانم
خزمەتت دەکەم هەتا دەتوانم
قسمەت هێنامی بۆ خزمەتکاری
من لە کن میریم بە خەزنەداری
لە تۆ دەکێشم من منەتباری.
چومکە تۆ شەهێن، هەر وەکو بازی
تۆ جێگا گەورەی، بڵند پەروازی
لە بۆ ئەو کارە تۆ دەبی ڕازی؟
کوتی: ئەگەر پێت بڵێم، مەیلت نەبێ کەم
لێم شێواوە خاڵ هەتا پەرچەم
تازە ڕابردووە، لێم بە خاترجەم
بەو کارەی زانی ڕۆم هەتا عەجەم
من لە تۆ زیاتر مێرد بەکەسی دیکە ناکەم.
ئەوە قسەی خاترجەمی پێکوت، سەنیری خاترجەمی وە بن سەری دا. جا بۆ شەوێ دەنێرن لە دووی بەگلەر بەگییان.

گەردن هەڵێنا بە ناز و نیمناز
جەولانەی زولفان، باڵی قەرەناز
کوڵمەی گەش و جوان، وەک گوڵی ڕێواس
ئەوە گەڕاوە خانمی ڕەند و خاس.
ئەوە میر ڕۆیی بۆ دەفتەرخانە
میرزای چازانی لەسەر کار دانا
میر پێش جڵەوی پادشای سوڵتانە.
قاقەزی نووسی بە سەت دڵ و گیان
بە خۆش زمانی حاڵزان و چازان
چل و حەوت کەس بەگ، ڕمبیان لەسەر شان
کەیخودا و گەورە، لە بەگلەر بەگییان
پێویستە لە میر ببن بە میوان
تەگبیرێک بکەین لەو دنیای وێران.
چەند کەس وەک ئێمە ساحیب ئیقباڵ بوو.
تێکڕا ئەوان چوون بەبادی فەنا
دنیای بێ وەفا بەهیچ کەس نەما.
نامەکە ڕۆیی لە دەفتەرخانە
خەبەردار کران بەگلەر بەگییانە.
بەدەستوبردی تەتەر وە[٣٤] ڕۆیی
بە زمانی شیرن، بە گوفتوگۆیی.
ئەوە هەموویان خەبەردار کران.
گەورە و ڕدێن سپی بوو فەتحوڵڵاخان
هەموو کۆبوونەوە، لەو بوون بە میوان
یاڕەببی خێربێ، نەکەوینە سەر قسان.
بە شادی و خۆشی بگەڕێینەوە. ئەوە میوانەکان هاتن.

٩٩

له دڵی من گەڕێ چەندی له هێشه و چەندی له ژانه و چەندی له کاوه کاوه
سوبحانەڵڵا خوداوەندی میری مەزن چی به میر سێوەدین بەگ داوه
بۆ خەزنەدارێک حەو سەد پەڕ بەسەر و سمێڵ سپی کامەری و جوکلی هەمەوەند بانگ کراوه
مەجلیسی میری وەکو بەهەشتی شەددادی به خزمەتکاران دەڕازاوه
دوو سەد مەڕ و جوانەگا گاو و گەردوون کراوه و سەڕبراوه
پیاوی زانا سەری لێ دەردەچێ، دەنا عالەم لەو کاره سەری سووڕ ماوه
زۆر سەیره! میر بۆ کابرایەکی کوێستانی بۆچی ئەو هەموو زەرەدەی کێشاوه؟
ناڵە، ناڵە، گرمه گرمه، قاوه قاوه
کووچه به عەتر و عەبیر ئاو پرژێن کراوه
شل و مل سایەگەردن سەریان له سایەی پەنجەران دەرهێناوه
زولفیان دەڵێی ئاوریشمی خاوه و نەئاڵۆزاوه
سنگیان دەڵێی کارخانەی فەرەنگه و نەژاکاوه و دەستی لێ نەدراوه
کارێکی وا گەورەیه دەڵێی ئەوێ ڕۆژێیه گه سیاوەش کوژراوه.

١٠٠

ئەوه هاتن شل و مل و سایەگەردن
تێک ڕژابوون چەند کچ و ژن
هەر کەسێ دەیگوت: پۆیله بده به من.
حاسییه زۆر له بەردلانه
کۆتره، لێی ون بووه هێلانه
ئاسکی وەختی سبحەینانه
چاو مەسته، دەڵێی جەیرانه
دەبەخشێ لەعلی ڕومانه.

دەنگ دێن لە کرمەک و گوارە
گۆی کەمبەرە هاتنە خوارە
چاویان وەک قاسید وشیارە
خودا پێکی بێنێ ئەو کارە.
ئەوە هەر سەیر و سەیرانە
شادییە و خەڵات بەخشانە
هەڵپەڕین و شایی و لۆغانە
مەست دەبم بەو چاو مەستانە.
سەحاتێکی ڕۆژ ماوە
دووازدە سوار خەبەریان هێناوە:
میر ڕاوەستاو بێ و بەرقەرار
پەیدا بوون میوانی سالار
پێشە زین وڵات بکەین خەبەردار.
بە خۆشی و بە ئەمینی
هاتوونە سەر خوانی زینی
میر بەگلەر بەگییان دەبینی.

١٠١

خەنجەر پۆڵای جەوهەردارە
دەسکی خەنجەریان پازارە
پاکی ئازا و جگەردارە.
بە سەرڕە و گە هاتنە خوارێ
خوێنیان لە برۆیان دەبارێ.
بە سەت تەعزیم و سەت ئەرکان
نەیان گرت ئیسراحەت و وچان.
زۆر بە زانست و بە ژیری

ئەوە هاتنە دەرکی میری.
گە زانیان گاو و گەردوون کراوە
میر زەرەدی لە خۆی داوە
پاک دەستەونەزەر ڕاوەستاوە.
قرمەی خەنجەران دەهات لە کالان
هەچی دوژمن بێ، ئەمیری چازان
سوێندە بە خودای عەرز و عاسمان
ئێمە لێی دەستێنین ڕووح و گیان
ئێمە نۆکەرین بەمیری حاڵزان
زەهلە چەشمین بۆ دوژمنان
خزمەتکارین بە ڕووح و گیان.
عەداڵەتت بێ بەرقەرار
هەر دەست ڕۆییو بی ئەی سەردار!
زەمانەت بڕوا سەرانسەر
هەر بتبێ نۆکەر و ڕابەر
هەر بتبێ تانووت و هونەر
میری ساحێب غیرەت و جەوهەر
لە مەجلیستن حەو سەد پەڕ بەسەر
هەمووی سورباشە[٣٥] و پاک نۆکەر
هەمووی تەتەرە و عەمربەر
هاتین ئێمە دەستەی بەگلەر.
هاتینە خزمەت میرییە
هەچی کەیخودا و ڕدێن سپییە
نیازت لە حاسڵییە
دوژمنت بێ بێ بەرییە.
ئەوە هاتن دابەزین.

گە دییان ئەو ئێعتیبارە
ئەو مێهمانی و کاروبارە
دەبێ چ بێ؟ چ قەوماوە؟
پێم وڵاتمان شێواوە
ئەو عالەمە تێک ڕژاوە.
نازانم نە شەڕە و نە خۆشییە
پاکی ڕوحی لەسەر دەستییە
پاکی وەک شێری سپییە
ترسیان لە هیچ کەسێک نییە
پاک دەسکی خەنجەر بەحرییە
سەدەفکارە ئاوزەنگییە
لغاویان پاک مروارییە
وڵاغیان کوێتی عەڕەبییە
ڕەش بێ، نێو چاوانی سپییە
گە بۆرە بێ، گوڵ گوڵییە
کوێت تاریفی تەواو نییە.
بە پایز و بە بەهاری
پەسندە کوێتی داوێن تاری.
وڵاغیان هەمووی سێ ساڵە
شێر خەزاڵی و ئاتەگ کاڵە
وەکو باڵدار خاوەن باڵە.
یەکسم چوون بۆ مەیتەرخانە
یەکسم مەعمووریان بۆ دانا
نەیەتن حیلەی ئەسپانە.

مەیتەر هاتن بە ئەهوەندی
بردیانن بۆ بەهاربەندی.
ئەوە پێک هاتن کاروبار
یەک لە یەکێ دەکا پرسیار
وەک شەڕی ڕۆستەم و ئەسفەندیار.
بۆچی تێیدا ڕۆم و عەجەم
شوورەیی نییە، پرسیار دەکەم.
ئەوە مەجلیس گیرا و شەو بەسەر داهات.
هەتا میر کەسێک نەدوێنێ
هیچ کەس قسە ناپەڕێنێ
دەنا زمانی لە پشت سەر دەردێنێ.
پاکی بەڕاو و تەگبیرن
پاکی ڕەنگ پیاو، بێ نەزیرن
چاوەڕێی وتووێژی ئەمیرن.
خودا دنیای وا دانا
سەد کەس لە سەقاو گێڕانە
سەد کەس لە پیاڵە دانانە
سەد کەسیش لەسەر کەوشانە.
ئەو عالەمەی لە وێ دایە
وەک ڕۆژی قالووەلایە
هەر کەس لێی دیارە جێگایە.
میر و بەگلەر هەتا خانی
هەرکەس بەجێی خۆی دەزانی
سەهوو ناکەن، بە پەروانە
هەر کەس بەجێی خۆی حاڵزانە

وەک مەجلیسی قارەمانە
مەجلیسێکی بەئەرکانە.
لەوی شیرنە خەزنەخانە
بێتە سەر خەڵات بەخشانە
خەزنەی میری بێ ئامانە
ئەوە دامەزران. مەجلیس پەیوەست بوو. هەموو چاوەڕێی قسەی میر سێوەدین بەگن.

## ١٠٣

لە بەگلەر بەگییانی کرد پرسیار
پاش چەند قسە و وتوێژ و ڕەفتار
زانیتان چم بوو بەنگۆ کار؟
خێرە؟ پەنا بە شای جەببار
ئەو قادری پەروەردگار.
لە مووسڵێ بووم بە میوانی
هاتە کنم یەک ئێرانی
گەلێک ڕاست بوو بەحاڵزانی.
لێرە من دامێ کاروبار
ئەو بەخواری نەیکرد ڕەفتار
زۆر ئەمین بوو ژیر و وشیار
ئەمن کردم بە خەزنەدار
ئەلعان، ئێستا، خەزنەدارە
ئەمینی منە و لەسەر کارە.
چ گەرمێنی و چ کوێستانی
هەر یەکین ئەی برای گیانی
یەک مەزهەبین، موسڵمانین.

ئەمن ئەوم کەوتۆتە بەردڵان
زۆر ئەمینە و یەکجار حاڵزان.
گەر دەپرسن، دۆست و یاری
قسەی ئاخری، بەیەکجاری
حاسییەم دایە بەیادگاری.
قسەی من ڕەد بوونەوەی نییە
تا ڕوحم بێ لە سنگییە
قسە و وتووێژو چییە؟

١٠٤

پیاوی گەورە کە پیاوی وا دوواند، پیاو تاوێک سام دەیگرێ. میر کوتی:
فەتوڵلا خان بۆ پەشۆکا؟
عاسمانت بەسەردا ڕووخا؟
لە مەجلیسێ قسە ناکا
گوڵخاتر و خونچەی باربەها.
یەکسەر ئەو مەجلیسە سەری سووڕما. خودایە جا چۆن گوڵخاتر و خونچەی باربەها دەدا؟ نە کوڕێتی نە برایەتی نە برازایەتی نە ئامۆزایەتی!
دەو دەمێ گوڵخاتر و خونچێ
مەجرووم شێت ببوو بۆ لەیلێ
دڵی عاشقان دەهێنمە جێ.
تێکرا بوو بە منەتباری
پاڕانەوە و ئینتیزاری
سپاس بۆ میری پەڕبەسەر
بڵند بوون پاک میر و بەگلەر.
میر ئەوە مەجلیسی تۆیە
لێت تێک نەچێ ئەو گوفتوگۆیە.

عافرەتێک قابیلەتی نییە
هەقی سەر بەخشینت هەیە
میر لە تایەفەی بەبەیە
عەرزی پیرۆزبابیمان هەیە.
تێکڕا تەسلیم بوون، گەردن دانا بەرەو خوار
پیرۆز بێ میری جگەردار
زۆر ڕەواجە قسەی سەردار.

١٠٥

ئەوە میر دەڵێ:
زۆر مەکەن قسە و گوفتوگۆ
تێکی مەنێن چاو و برۆ
دەروونو نەگرێ گەرد و بۆسۆ
من ژن دێنم بۆ کوڕی خۆ.
دمنا گوڵخاتر و خونچەی نازدار
قابیلن بە شا و خونکار
لە باربەهای نەم دەکردن قوتار.
نیشانەیان کەن ئەو دووانە
ئەو کیژی گەردن کەشانە.
لێو ببێ بە ئەسەحییە
ئەوان بکەن مارەییە
لە بۆ ڕۆژێ ئاخرەتییە
چۆن دنیا بۆ کەس بەقای نییە.
دەگۆڕێ ئەو چەرخە کۆنە
نیشانەیان کەن بۆرە و سۆنە.
گوڵخاتریان کەمێک کاڵە

زۆر چازان و پڕ کەماڵە.
خونچێ دەڵێی زەردە بێیە
لەسەر کوڵمەی ئەلف و سێیە
خەبەریان دانێ دەست بەجێیە.
نەشێواون، عەیبیان نییە
ناشکێنن قسەی میرییە
چۆن میر لە جێگای بابییە.
دەستبەجێ حوکمیان کرد: مەلا بچن بەحاسییە بڵێن، پرسیاری لێ بکەن و وەکالەتی لێ وەربگرن.

١٠٦

حاسییە وەک نێرگزی ساوا
وەک باغی شەدداد غەملاوە
هەڵدێنێ دوو گۆشەی چاوە
کوڵمەی وەک شووشەی گولاوە
وەکالەتی ئەسەحی داوە.
بە گەردن وەک خاسە سییە
لێو قەیتانی فەرەنگییە
زەردی دەهات لە لێوییە
لە دڵی بوو شادی و خۆشییە
ئەو دەیدا وەکالەتییە
ئەوشۆ شەوی شادمانییە
بە مەلا و بە قازییە
مارەیی حاسییەیان بڕییە
لە سەعیدی کوێستانییە
شیرنی خواردن لەسەر میرییە.

١٠٧

سبحەینێ داوەت گیراوە
هەلاڵ تازە گوڵی داوە
کۆخ و هەنجیر تێک ڕژاوە
هاتن، وەکو لیمۆی ساوا.
زولف وەکو ماری جەنگی
بەحاڵێک داوەت دەلەنگی
سنگ وەک کارخانەی فەڕەنگی.
گەردنیان خەڵات بەخشانە
پاک مەتای بە قیمەت گرانە
شۆڕابەی گۆی کەمبەرانە.
هەمووی ئاڵە و کرچە و کاڵە
زۆر شیرنە ئەو دەسرە و دەسماڵە
ڕیحانە و لاولاو تێک هاڵا
ئەوە بە بەخت و ئیقباڵە.
پیاو دەبێ شێت و دێوانە
زولفیان لەسەر هەنیە دانا
وەک سوور گوڵی دە کوێستانە
هەوەڵ مانگی دە نیسانە.
پیاو مەست دەبێ، جوان تاکو پیر
لەبەر بۆنی عەتر و عەبیر
لە جەرگی پیاوی دەدەن تیر
ئەبرۆ لە چاوان دەبن زیر(٣٦)
مژانگ کەوتنە ڕا وتەگبیر
لە دڵم دەبنە پەیکان و تیر.

خۆش ئەخلاقی، بەچازانی
وەکو عەلی بەردەشانی
سنگیان وەک شەربەت و کانی
بەهرە دەبا کەسێ بزانی.
گوارە کەوتوونە جۆلانە
زولف هەمووی شانە و شانە
ئەورۆکە هەمووی عەتر بەخشانە
پیاوی عاقڵ هیچ نەزانە.
ئەورۆ ڕۆژی شادمانییە
تێکەڵ بوون سوور و سپییە
پەرژینی گوڵ، درۆ نییە
پاکی شێت و لاهۆرییە
پاک وەکو نێرییە کێوییە
پاک وەردۆکی پەڕ سپییە.
لە هەمووی قورینگ ڕێزانە
لە هەمووی خەڵات بەخشانە.
خاڵ لە کوڵمەی وەک گێلاسە!
زۆر خۆش بوو ئەو دەنگ و باسە.
لەبەر ملوێنکی مرواری
لە قۆیتاسی وەستاکاری
کراس کیمخووا بوون چیلواری
زۆر بە ژیری و بە وشیاری
دەنا ناتمینێ ئیغیاری.
دەبێ کاربکەی بەتەڕدەستی
بەبۆنی سینگی وان مەستی

وەک فەرخ و خاتوون ئەستی.

ئەوە داوەتەکە بنەی هات. لێیان مارەکرد. گوڵخاتر و خونچێش مارەکران. تەواوی خەرج و موخاریج، هەموو هەقێک، لە خەزنەی میر چۆ دەرێ. میر کوتی: پاش مانگێکی دیکە، ئەمن سەفەرم لە پێشە، بۆ خزمەت سوڵتان سەلیم دەچم، ئەگەر هاتمەوە، خانووبەرەیەکی بەجوێت بۆ دیاری دەکەم و بۆت دەگوێزمەوە. میر چووە سەفەرێ، مانگێکی پێ چوو، پاش مانگە و دوا لە سەفەرێ گەڕاوە. لە سەروبەندی ئەوەی دابوو ئەگەر بۆی بێنێ.

## ١٠٨

جا پادشایەکی غەفوور و ڕەحیم پەروەردگارە

ڕۆژێکی سەعید بەبازاڕیدا دەهاتەوە بەرەو ژوور و دەڕۆیەوە سەربەرەوخوارە

پێنج کەس مەرگەیی بوون، دەیانگوت: ئەرێ سەعید! ماڵ وێران! ئەتۆ لێرە دەست ڕۆییوی، هەتە دەسەڵات و ئیختیارە

بابت لێت ڕازی نییە، دایکت دەیگوت: ڕەبی لە دیوانی خوداوەندی میری مەزن قەت نەبێتەوە ڕزگارە

دوعای مردنێی لێ ناکەم، بەڵام خودا پێکی نەهێنێ کاروبارە

خانوو بەرێکمان بوو، فرۆشتمان، دامان بەپووڵ و پارە

لە خانووەکەیان دەرکردووین، ئێستا جێگامان کەناری شارە

بابی کوێر بووە، بەخەڵکی زۆر قەرزدارە

یەگجار زۆر لە دەروونی خۆیدا خەجاڵەت و سەر لەبەر و شەرمەزارە.

کوڕە هەزار جار دەستی منت ببێتەوە بەدامانی

خۆ تۆ پیاوێکی عاقڵ و چازانی

ئاخر هەر ئەو سەعیدە نی ئەگەر ڕمبی دەمرەشی هەژدە قەفیت داویشتەوە سەر شانی؟

لە خاکی ئێرانێ هیچ کەس لە ترسی تۆ خەوی نەدەزانی

پیاوی ئازا حەیفە نێوی خۆی ون بکا و شوێنی خۆی بکاتەوە فانی.

سەعید ئەگەر وای زانی، دەستبەجێ بیناهی کەم دەبوو لە هەرتک چاوە
کزێکی لە جەرگی دەهات، دەتگوت ماری تاڵین تۆز[٣٧] بە دڵییەوە داوە
بە هەرتک دەست لە ئەژنۆی خۆی دەداوە
کوڕە دەیگوت: ئەو قسەیە نەکەن! لێرە ئەمن ئیعتیبارم زۆر تەواوە.
با خەجاڵەت نەبم، دانەنیشم بە سەر لەبەرییە
میر تەمەشام بکا بە چاوی سووک و بێ کیفایەتییە
ئەلعان لە پێش چاوی میری سەعید هەژدیهای جەنگییە
چومکە لەو زەمانەدا پیاوی دەس تەنگ هیچ بەڕێز نییە.
جا سەعید لە دڵی خۆیدا کوتی: ئەگەر ئەمن باب و دایکم وا بن، ساڵی ساڵان ساحێبی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ بووین، بنەماڵ بووین، مامساڵی و خدر مامە سێنە و هەرکی بەدەست و مستی من چەند کەسیان لەسەر پشتی ڕکێفێ وەرگەڕان. سەعید کوتی: یان لێرە مەمێنن یان ئەو قسەیە مەکەن. ئەگەر هات بۆ مەجلیسی میری، قسەکەی هێندە لە دڵی گران بوو، شێوا بوو. میریش، هێندی خۆش دەویست بەئەمین دەرچوو بوو، لێی پرسی:

١٠٩

سەعید بۆ ڕەنگت گۆڕاوە؟ بۆ ڕەنگت شێواوە؟
دەڵێی ڕیحانەی و ئاوت لێ بڕاوە
کێ زوڵمی لێ کردووی و کێ زۆری بۆ تۆ هێناوە؟
ئەتۆ لە سەر مرادی، دەبێ ببینی کام و کاوە
بۆ دەستەوئەژنۆی و بۆ لێوت باری هێناوە؟
سەعید کوتی: ڕەبی میر بێتەوە ڕاوەستاو و بەرقەرارە
پیاوێکی کەرەمدار و جگەردارە
بۆ من هەم سەردارە هەم موختارە
دڵی من ئەوڕۆکە زۆر بریندارە
ئەوە سەعید دەیگوت زۆر بە ژیری و بە وشیاری

خووایشتێکت لێ دەکەم ئەمن زۆر بەشێنەیی و منەتباری.
ئەگەر ئیجازەم بدەی سەفەری ئێرانێم لەبەرە
ئەمنت ببمەوە بەقوربانی تانووت و غیرەت و هونەر و جەوهەرە
میر تەمەشایەکی کرد، کوتی: سەعید! چ قەوماوە؟ چ خەبەرە؟
بەتۆ دەڵێن خەزنەدارە
ڕاستیم پێ بڵێ نۆکەرەکەی ئەمین و بەئیعتیبارە
خۆ تۆ لەسەر خەزنەی، لە عالەم ڕا کاری تۆ دیارە.
دەیگوت: ئاغا! ڕاستی مەوجبی ڕەزای خودایە
درۆ و فرڵداغی بەکارنایە.
با بەڕاستی بۆت بگێڕمەوە ئەو جارە
بابم کوێر بووە و بەخەڵکی قەرزدارە
ئەو دنیا ڕووناکە لە من بە ژەهری مارە
جا چۆن لە دەشتی مەحشەرێ ئەمن دەبمەوە ئازا و ڕزگارە؟
ئەگەر ئیجازەم بدەی بۆ ئێرانێ دەچمەوە سەربەرەو خوارە.
قەستەم بەوەی کەم ئەگەر بیناهی چاوە
نمەکی میری تەنافە و لە گەردنم کراوە
شەرت بێ، ئەو سەفەرە بکەم و خزمەت و ئەمەگی تۆم هەر لە سەرچاوە
ئەمن بەدەزگیرانم؛ حاسییەی سۆسەن خاڵم تازە لێ مارەکراوە
ڕێ و شوێن و کاری دایک و بابان پێک دێنم، بە خزمەتکاری و بە پەڕبەسەری و بە ئەمەگ و بە نمەک خۆری و شەرت و ئەرکان، بە ئەسەحی و بە خاترجەمی، دەگەڕێمەوە دواوە.
سەعید ئەگەر وای گوت، میری بەزەیی پێ داهات. جا کوتی:
بۆیە وا کزی، چارت بێ چارە
وا شێواوی و دڵت بریندارە
لەگەڵ تۆمە ئەی نۆکەرەی بەناموس و بەحەیا و بەئیعتیبارە
بڕۆ خەزنەخانەی من، لەوێ پووڵ بەژومار نییە، بە خەشەیە و بە خەروارە

هەڵگرە عەبو تۆپ و مەجیدی، زێڕی ڕەنگ دژوارە
هەڵگرە لە وانەی ئەگەر ئێکن و ڕەواجیان لە بیست و چوارە
مەتاحی بەحری و لە کن من هیچ نایەنێ پووڵ و پارە.
میر کوتی: هەچەندێکی هەڵدەگرێ، هەڵگرێ. ئەگەر سەعید لەسەر خەزنەخانە نەبێ، باوەڕیم بەکوڕی خۆشم نییە. زۆرم خۆش دەوێ، زۆریش لێی ئەمینم.

١١٠

سەعید دەڵێ: هەچ کەسێکی بێ قەول بێ، قسەی خۆی نەباتە سەرێ
ئەمن هەر ئەو کابرایەم ئەتۆ لە بن کوندە کێشانت دەهێنامەوە دەرێ
ئەتۆ بەمنت بەخشیوە گەورەیی و قسە ڕەواجی و جەوهەرێ
ئەگەر بەهاسانی نەگەڕێمەوە، ڕۆژێ قیامەت نەهاتی و بەدبەختیم دێتە سەرێ.
تۆ نەدیو و نەناسیو ئەمنت کرد بەساحێب ئیختیارە
تەمەلوقم پێ دەکەن پەڕبەسەر و جگەردارە
ئاغا خەجاڵەتم لە دیوانی خودای ببیەوە ئازا و ڕزگارە.
ئەوەی تۆ لەگەڵ منت کردووە
ئاخر نەتدەناسیم، تۆ قەتت من نەدیتووە
بە ئەندازێکت بڵندی بە من داوە و چاکەت دەگەڵ من کردووە
لە بەخیلی ئەوەدا چەند کەس لە داخان مردووە.
ڕەبی نەتبینم قەت بە هەڵەنگوتنی دنیا و بە سەرلەبەری
دێمەوە کنت بە هومێدی خودای بە خزمەتکاری و بە نۆکەری
قسەی دایک و بابان لە منیان کردووە هەتەر و لە دڵیان کردوومەوە زەفەری
کەسێک بێ عومری دایک و باب بکا، زەحمەتە لە دنیا و قیامەت بەهرە بەری.
جا من دڵ لەسەر خێڵم
بێ بەهانە و عوزر و فێڵم
زۆر خەجاڵەتم میر بەجێ دێڵم.
بە شادمانی و پەڕبەسەرییە

بە فەتح و نوسرەت، ڕۆژی شادییە
ئیشەڵڵا دێمەوە کنت بە مەمنوونی و بە نۆکەرییە.

١١١

ئەوە میر دەیگوت: بۆی بێننە دەرێ جانو ماینێکی ڕەش کویتی نۆ زینی عەسڵە عەڕەبییە
بچۆ دەرکی حەرەمخانە بەعەزمی خودا حافیزییە
چون خانم و خاتوونان ڕۆین و سەفەری تۆیان پێ خۆش نییە
چون قسەزانی، بەلیغی، خراپەی دنیایەت تێدا مەوجوود نییە
سەعید! چاوەڕێی ڕێگام، ئەو سەفەرە ڕەبی بکەی بەئازادی و بەسەلامەتییە
ئەگەر بێیەوە، لە کن من هەتە دەرەجە و ڕوتبە و بەرزی و بڵندییە
ئەگەر نەیەوە لە دنیای ڕووناک نەبینی چاکە و سرفە و خۆشییە
دانیشی بەلێو بەباری و بەدبەختی و بە سەرلەبەرییە
ئەگەر ئێرانت پێ خۆش بێ، نەیەوە، بۆ تۆ بێ ئەمەگی و خەجاڵەتییە.

١١٢

ئەوە سەعید دەیگوت: ئاغا! ببی بەرقەرار و ڕاوەستاوە
قەستەم بەوەی کەم ئەگەر دونیای داناوە
دایک و باب شتێکە شەرع ڕێگای کێشاوە
دەنا قەت قەت عەزیەت و ئەمەگیان بەقەت تۆ دەگەڵ من نەکێشاوە
ڕەبی هەر دابنیشی بەئەمیری و بەدەست ڕۆییوی و پەڕبەسەری
ئەمنت هێنا کن خۆت بەخزمەتکاری و بەنۆکەری
جا من چۆن لە بیرم بچێ؟ ئەتۆ ئەمنت بڵند کرد بەنمەک پەروەری.
خۆ شەرت هەر ئەو دونیایە نییە ئەگەر ڕووناکە و بەپیاوی ماوە
ئەگەر ئەمن بێ ئەمەکی بکەم، دینیشم دەبێتەوە کەم و کووڕ و ناتەواوە
بۆ خۆم دەڕۆمەوە بۆ ئێرانێ، خاترجەم بە ڕوحم لە خزمەت تۆدا بەجێ ماوە

ئەی ئاغاکەی ساحیب ئەمەگ و بەئەرکان و، دەرەجەی قابیلت بە من داوە

ڕەبی ئەگەر نەیەمەوە، گول بم، بیناهیم ببڕێ لە هەرتک چاوە

ئەمن کابرایەک بووم کوندێکم لەسەر شانی بوو: ڕۆژێ تا ئێواریێ لە کۆنە مووسلێدا دەگەڕام بە هاوار هاوار و بە قاوە قاوە

هەقی کابرای ساحێب شەربەتم دەدا، ئەگەر حیسابم دەکرد ئێواریێ سێ پارەم پێ دەماوە.

ئەلعان لە کن تۆ لێی لە ساتە(۳۸) و پاتۆلان دەدەم وەکو ئەمیرێکی بچێتە سەر حوکماتی

ئێوارە و سبحەینان بانگم دەکەی بۆ خزمەتی خۆت و بۆ جەماتی

ڕەبی ئەگەر ئەمن ئەو ئەمەگەم لە بیر بچێ زەلیل بم، نەقوستان بم، لە کووچە و کۆلانان دابنیشم بە کزی و ماتی

هەڵبەتە ئەگەر بەد ئەمەگی بکەم، هەموو کەس دێتە سەر قسە و گوفتوگۆ، ئەمن دەگەڕێم بە لاتی.

۱۱۳

ئەوە سەعید دەهاتە دەرکی حەرەمخانە

دەیگوت: کەمێک هەوای عاسمان پێکم کزەی شەماڵە

نازانم نە ئەجەل دەمباتەوە بۆ ئێرانێ و نە عاقڵم بەتاڵە

نە زەلیلی دایک و بابانە گەرووی کردووم توون و تاڵە

ئەمن و دەمرمەوە لەبەر زەندێکە پڕ لە بازن و قەدێکە شمشاڵە

خالقی پەروەردگار دەرەجەی زیاترو پێ ببەخشێ و بۆتان بکا حەواڵە

چومکە لە پاڕانەوە زیاتر، لە حاستی ئێوە خەجاڵەتم و زمانم لاڵە

ئەمن دەمرمەوە لەبەر شەدەی فەرەجوڵڵای کورەکۆر حوسێنی

ڕیشوەیان تێکەڵ بووە لەگەڵ لەچکە و دەسماڵە

بۆ ئازادی هاتوومە خزمەت ئێوە، گەرنم ئازاکەن، چومکی بۆ خزمەتی دایک و بابان دڵم عەبداڵە.

لەگەڵ ئێوەمە ئەی خوشکەکەی لە دایک و بابییە
هاتوومە کن ئەنگۆ بەنۆکەری و بە
نمەک خۆرییە
لە کن ئەنگۆم وەگیر کەوتووە ڕوتبە و دەرەجە و بەڵکو ڕێگای تەڕەقییە
بەزمانی شیرنی ئەنگۆ، ئەمن هاتم و کەوتمە سەر مەخسوود حاسڵییە
ئەگەر ئازادم نەکەن سەفەرم سەعادەت نییە و بەدبەختییە.
ئەوە دەنگ دەهات لە کرمەک و لە زێڕ و لە زنجەق و لە قۆیتاس و لە گووارە
لە قاڵدرمانی[٣٩] بیست و حەوت پلەیی میری ئەوە خانم و خاتوونان دەهاتنەوە خووارە
دەیانگوت: گەرنت خۆش و ئازا بێ! نۆکەرەکەی ئەمین و بەئیعتیبارە.
ئەوە بۆیان دێنا و دەیاندا لەعل و ئەشرەفی بە قیمەت گرانە
دەیانگوت: پووڵ بۆ پیاوی ئاواڵی ڕێگای گەورە و گرانە
نەوەکو شەرمت کردبێ، کەمت هەڵگرتبێ لە زەڕڕاب خانە و لە خەزنەخانە
تەلەسم بەندێکیان دەدایە نە دیویەتی سکە و نە چۆتە کارخانە
ئەوە ئاساری قەدیمە، نێوی مەرجانە
حەوت دەسکی پێوەن، شۆڕابەیان دەسووڕێ و دەکاتەوە جەولانە
دەسک و پرپرەی[٤٠] مەرجان لەعلی ڕوممانە
دەیانگوت: ئەوە بەرە بەنێو و بەنیشانە
بیدە بە حاسییە نە وەکو بێتەوە ڕۆژی دڵ گۆڕانە.
نە وەک لەبەر ترسی خولا و تانەی عەبدی نەکاتەوە دەنگێ
شەیتان و شۆفاران قسە بکەن و لە دڵی خۆی باوێژێ لەنگێ
هەتا یازدە ساڵ لە سەرت ڕادەوەستێ، با شەمامە و شەمامە ڕەنگینی باغەڵی لە بن کراسێکە مەحمەڵ دارابیدا هەڵێنن ڕەنگێ
باقەرە زولفانی سێ بەنگی بکا، لەسەر کولمێکە مینا ڕەنگ بکەونەوە جەنگێ
با چاوەڕێی ڕێگای ئێرانێ بێ، بڵێ: بۆ نەهاتەوە؟ زۆر چاوەڕێم، ئەدی کەنگێ؟
ئەوە ئەو مەرجانەیان دایە، بە نیشانە و بە دییانەت و بە یادگار بۆی بەرێ.

سەعید بۆ گەردن ئازایی دەچێتە کن حاسییە خانێ. دڵ ئاوێنەیە، خەبەر بە پیاوی دەدا . کچێکی وەسمان بەگ چووبووە کن حاسییەی بۆ شەیتانی و بۆ شۆفاری. ژن قسە دەکەن. کوتی:

حاسییەی مینا ڕەنگ! کاری دنیا وا دەڕوا و وا دەبێ

کێهە تەعام خۆشە ئەگەر لە وەختی خۆی نەخورا، کۆن بۆوە، پیاو ئیشتیای ناچێتێ

دڵی تەڕی تۆیان بەخۆڕایی خستۆتە زیندان و حەفسێ

کابرا دەڕواتەوە بۆ سەفەری ئێرانێ، خولاّ دەزانێ دەژی، دەمرێ چی بەسەر دێ

ئەتۆ دەبێ لە سەری ڕاوەستی هەتا پشتت کۆم دەبێ.

دڵیش گۆشتە، دەگۆڕێ. ئەوە دەستی بە شەیتانی و شۆفاری کرد. ئەو سەعاتەی سەعید دەچووە وێ، دەهات ئەو کچە بڕواتەوە بۆ ماڵێ. ئەوە سەعید ئەگەر چاوی پێ کەوت، دڵی ناخۆشی ویست، دڵ ئاوێنەیە، خەبەر دەدا ، کوتی:

کیژێ! مەڕۆ دەکەم پرسیار

وەکو کۆتری بەلەنجەولار

زولفت داناوە وەکو تار

خاسە کەوی هەوەڵ بەهار

دوور ئەنگێوی نیزیک خەسار

کیژێ! ڕەنگت ترش و تاڵە

شێواوە دەسرە و دەسماڵە

سنگت کوێستانی خاڵ خاڵە

لە وێ دەفڕن باز و داڵە

ئەبرۆت ڕەشە و چاوت کاڵە

حاسییە بەگلەر بەگی لە ماڵە؟

ئەگەر وای پێ گوت، کوتی: ئەی ئەی! ئەوە خۆ زەمبیشم دەکا و پێشم هەڵدەلێ. مەبەستی چییە؟ ناسی ئەگەر سەعیدە. کوتی:

ئەوە سەحرا و چۆلییە
چوویە سەر خوانی زینییە
بۆ تۆیە بەد ئەمەگییە
ئێرە جێی قسە و وتووێژ نییە.
سوار بووی وەکو دێوانە
وەکو ئاسکی پێش سوارانە
بەد ئەمەگی و بێ ئەرکانە
حاسییە زۆر لەبەر دڵانە
ڕوحت خستە حەفسخانە
بۆ خۆت دەچییەوە کوێستانە.

١١٥

کچەکە ڕۆیی. سەعید بەکڵفەتێکی گوت، کوتی:
بەحاسییە بڵێ: نازانم نە ئەجەلە و نە دەردی پێ مردنە و لە من میوانە!
چومکێ بۆ من و بۆ ئەو، شەریعەت ڕێ و شوێنێکی دانا
بێتە بەر تەکیەی پەنجەرە بێ عوزر و بێ بەهانە
بۆ من دەبێ بەئاواڵی ڕێگایە، بۆ من دەبێ بە حەسانەوە و بە ئەرکان و بە وچانە.
کڵفەتەکە چوو پێی گوت، کوتی:
کیژێ! ئەگەر دڵ دایمە لە داد و بادی
سەر مراوی گەردن سۆنە، ئەگەر لەسەر مرادی.
قەستەم بەوەی کەم ئەگەر دنیای داناوە
ئەتۆی دروست کردووە وەکو وەنەوشەی ساوا
سەعید سواری ولاغێکی شێر خەزاڵی بووە و ئێستا کەس زینی لە پشت دانەناوە
ئەو سەعاتە کاری بەتۆیە و لەسەر تۆ ڕاوەستاوە.
سەعید ڕاوەستا بوو. ئەویش دەرکی پەنجەرەی کردەوە، هاتە سەر پەنجەرەی.
سەعید کوتی:

کیژێ! کیژێ! کیژەکەی گەورەی بەگلەر بەگییانە

تۆق و تەلەسم و زێڕ و زنجەق و گوارە و کرمەک و ئاو دەنگی و خەبەرچیت لەسەر سنگی دانا

ئەتۆ بوویە شەم و ئەمن لە دەورەت دەسووڕێم وەکو پەروانە

ئەمنت ببمەوە بەقوربانی زنجیرەی زولفان گە ڕاست و چەپ لەسەر شانت دانا

تایەکی ورینگەی(٤١) دێ وەک نێرگز و ئەوی دییان لە من بۆتەوە بە ڕەشەڕیحانە

دڵت غاییلەی نەکا، بڵێی: لەبەریەتی سەفەری گەورە و گرانە

نەڵێی نەهاتییە و پێم وایە ڕۆژی دەست لێک بەردانە

خاسەکەوی جۆزەردانە

زولفی سێ بەنگی کردووە و لێوی دەڵێی قەیتانە

شلکە، ناسکە، شەمامە و شەمامە ڕەنگینی باغەڵی دەڵێی فینجانە

ئارەقەی، وەک عەتری خواجە حەسەنی بەسرایە، کەوتۆتەوە مابەینی برۆ و نێو چاوانە

سەعید دەیگوت: ماڵ وێران خۆم! مردن بۆ من خۆشترە نە وەکو ئەو ژیانە

جا ئەمن چۆن بەجێ بێڵم شل و مل و سایە گەردن؟ ڕازاوەتەوە، دەڵێی بازاڕ و دووکانە

پەنا دەبەمەوە بەر ئەو کەسەی ئەگەر بەبێ کەموکوڕی ئەو دنیایەی دانا

لەبەر دای و بابان سەفەرم لەبەرە، سەرێک دەدەمەوە لە ئێرانە.

دەیگوت: گەرنت هەڵێنە! گەرنت دەڵێی بەیداغە و چەقاندوویانە لە عەرزە ڕۆمێ

لە دڵی خۆت ماوێژە ژان و خەم، لە دڵی خۆت مەکەوە لۆمێ

دەبێ شلوێ نەبی، جۆگە نی بە نەختێک گڵ قوڕاو ببی، دڵی خۆت ڕابگرە وەکو جێگای قووڵ و دەلیا و گۆمێ

پیاو لە دنیایەدا پێشاتێکی وەسەرهات نابێ بچۆمێ.

ئەرێ کیژەکەی سوور و سپییە

سەری منت ببێتەوە بەقوربانی سەر و لە دنیایەدا قسوورت نییە
هاتوومە لای تۆ بەعەزمی خودا حافیزییە
دوعای سەعادەت و خێرم بۆ بکە، بێ گرێ بم، جا ئیشەڵڵا دێمەوە بۆ بەشارەتی و خۆشییە.

١١٧

حاسییە دەیگوت: لاوژە! ئاگادارت بێ بەرەکەتی قورعانە
حەسەن و حوسێن ئەگەر شەهیدن لە کەربەلایە، شەهید کران ئەوان بێ گوناح و بێ تاوانە
ئاگادارت شێر عەلی مورتەزا بێ ئەگەر لە دنیا و قیامەت هەیەتی نێو و نیشانە
یاریدەی سەفەرت بکا خدر ئەگەر دایمە مەعموورە و لە چۆلی و بەریانە
بەدڵی یاقووبت لەگەڵ بکا ئەگەر دەگریا بەپیری،ماڵی لە کەنهانە
بەئەسرینی یۆسف بی ئەگەر برایانی بەناهەقی خستیانە حەفسخانە و زیندانە
دەستبەجێ سەعید دەیگوت: بگرە ئەو مەرجان و لەعلی روممانە
کیژێ! ئەوەت بدەمێ، لە کنت بێ بە دییانەتی و بە نیشانە
حاسییە دەڵێ: رەبی دوعام قەبووڵ بێ! ئاگادارت بێ ئەو پێغەمبەرەی ئەگەر خودا لە شەرافەتی وی دونیای دانا
رەبی دانەنیشم بە بابان وێرانی و لەچکە بە خەمی و کچە بەگلەران پێم نەڵێن حاسییە سەرگەردانە
چل سوارەی غەیبی هاورێت بن لەگەڵ عیسای روحوڵڵا، لە عەرزی بوو ئەلعان لە عاسمانە.
هێندە بە دڵی پڕ ئەسرین دوعای بەخێری بۆ کرد، سەعید کوتی:
حاسییە! ئەگەر وا بە زەلالەت دەپارێیەوە و چاوان هەڵدەپاڵێوی
کارەکەت بە دڵی نییە و برۆیانت دەبزێوی
مەمکە بە مەجرووم ئەگەر بۆ لەیلێ شێت بوو، کەوتە کێوی.
ناز و نیمناز و خۆش ئەخلاقیت دێتەوە سەر زار و لێوی

لە دڵتدا مەناڵە! تێکی مەدە سورمەی ئەو دوو مەستە چاوە

عەتر و عەبیر لە سنگ و بەرۆکت مەکەوە پەرێشان و بڵاوە

ئەمنت ببمەوە بەقوربانی قۆپەنی ڕەشەڕیحانە، ئەگەر دەڵێی ئاوریشمی خاوە

ئەمنت دەمرمەوە لەبەر کوڵەجەیەکی قاقومی خاسە ڕەنگ، تازە لە کارخانەی سەمەرقەندییان هێناوە

خەیات چازان بووە، پێش دەستی بێچوە و ئەشرەفی، ڕاست و چەپ، لێ داناوە

ئەمن دەمرمەوە دەبەر کراسێکی موشەجەری مەحمەڵ دارایی، چین چین لەسەر گراویەی(٤٢) پانیەت ڕاوەستاوە

چاوەڕوان بە! ئیدی نازانم ئەو خودایەی ئەگەر ڕوحی بەمن داوە، لێم دەستێنێتەوە، ناکەومەوە سەر مراد و کام و کاوە،

یان بە شادمانی و سەر بڵندی و خۆشی دەگەڕێمەوە دواوە

کاتێکی بڵێن: سەعید لە ئێرانێ گەڕاوە

ئەو کەسەی مزگێنی بۆ هێنای، ئەمنت ببمەوە بەقوربانی گۆشەی ئەو دوو چاوە

ئەمنت لەبەر سنگ و بەرۆکی مرم، دەڵێی بەرانی کاکلاغای گەردییە و ڕەنگاوە

ئەمن دەمرمەوە لەبەر کوڵمێکی شەمامە ڕەنگینت، کەمێک گۆڕاوە و سەرما لێی داوە

دەبێ مەجیدی و عەبو تۆپ لە مزگێنیدا بدەی، ئەوەی مزگێنیت بۆ دێنێ ئەگەر کەمی بدەیەی، دەڵێ: حاسییە پەشیمانە و دڵی گۆڕاوە.

جا ئەوە سەعید ئاگای لە خۆی نییە

لە حاسییەی دەکردەوە ماڵئاوا و خوداحافیزییە.

ئەگەر پشتی تێ دەکرد، حاسییە دەیگوت: سوبحانەڵڵا چۆن تیری

بێ ئەندازەی هاویشتمە مابەینی جەرگ و دڵانە

هاتن و نەهاتنەوە غاییبە، پەنهانە

هەتا ئەو دێتەوە، قەلەندەرم، بابان وێرانم، دڵم سەرگەردانە

لە دوای وی دەبێ کێ شەمامە و شەمامە ڕەنگینی من لێیان بکاتەوە بۆن و بیدەمێ بە نیشانە

هەڕۆ! بڕۆ! ڕەبی بەردی سارد و گەرمت نەیەتە بەر پێی، بەسلامەتی بگەڕێیەوە لاوەکەی شێر دەستوور و بەئەرکانە
بەئیعتیبارە و لەبەر دلانە.
سەعید لە مەجلیسی میری و لە گەورە گەورە و لە ناسیاو و لە هەمووان، خودا حافیزی کرد. ئەوە سەعید گەڕاوە بۆ کۆنە مووسلێ.

١١٨

سەعید کوتی: سەفەرم مووسلە و، وەختی نەخشە کێشانە
پیاو دەبێ بۆ ئاغای خۆی بیبێتەوە ئیعتیبار و متمانە
مووسڵ شارێکی گەورەیە، هەتا حەوت ڕۆژ بیکەمە مەنزڵ و لێی ببمەوە بە میوانە
ئەمن ئەگەر هاتم داپیرێکم بوو، ئەمەگی لە سەر منە وەک ئەمەگی دای و بابانە
دەبێ بیبینم، نەوەک فەقیر بێ، زەلیل بێ، بیدەمێ خەرجێک، پێی ڕاببوێرێ ڕۆژگار و زەمانە
چومکێ کەسێک چاکەی خەلکی لە دەست بدا، بێ ئەمەگە، شوبرە، شەیتانە.
ئەوە هات، پێم وایە بانگی خەوتنانی داوە
لە دەرکی پیرێژن ڕاوەستا، دەیگوت: بزانم ماوە یان نەماوە؟
ولاغی شێر خەزالی سێ کەڕەتی لە کۆڕە کۆڕ و حیلە دەداوە
پیرێژن وەدەرکەوت، ئەگەر دەیدی، سوارێک دەلێی قارەمانە لەسەر پشتی ڕکێفێ ڕاوەستاوە
دەیگوت: عەزیزم! کێی وا ڕێت لێ گۆڕاوە؟ تا شارەزاییت پێ بلێم و مەحتەل نەبی، ئەگەر ناشارەزای و لێت قەوماوە.
دەیگوت: داپیرە! ئەمن وەکو دایک بۆنی تۆ دەنۆشم
ئەی دایکەکەی ساحیب ئیعتیبار و سوڕ پۆشم
ئەمن سەعیدی ئێرانم، کابرای شەربەت فرۆشم.
پیرێژن، وەک کەسێکی ئەگەر عەولادی خۆی ببینێ، ڕوحمی بۆی دەبزوێ و جەرگی ئاور دەگرێ، ئەوە سەعیدی لە باوەش گرت؛ کوتی:

ڕۆڵەی من وە کەس ناچێ و لە گوێن کەس نییە
سەری داپیرەت بێتەوە بەقوربانی سەرییە
هێندە ساحێب نمەکی نەتکردووە حجوب گەورەیییە
هەر لە بیرت ماوە نسیحەت و ئامۆژگارییە
شانازی پێ دەکەم لە دایە پیرەی خۆت هاتوویەوە بە میوانییە
دەنا بۆ کەسێکی ساحیب هەوا بێ، ماڵە من جێگای تۆ نییە
کەسێکی خەزنەداری میر سێوەین بەگ بێ و زاوا بێ بەتایەفەی بەگلەربەگییە.
جێگای وی موعتەبەرە و جێگای وی ماڵە والییە
ئەوە دیارە ئەتۆ زۆر ساحێب ئەمەگی، لێت حەلاڵ بێ ئەگەر دایک بەتۆی داوە شیری سپییە
ولاغی لێ وەردەگرت و سەعید لاقی دێنا خوارێ لە ئاوزەنگییە
دەیگوت: من مەتلەبم تۆ بوو، مەتلەبم جێگای بلند و ئیسراحەت نییە.
ئەوە سەعید لەگەڵ پیرێژن پێک شاد و شوکور بوونەوە. پیرێژن دەستی دە ملی کرد و دوعای بەخێری بۆ کرد. سەعید لە مووسڵێ زۆر شارەزا نەبوو، بەیانی چوو سەیاحەتێکی مووسڵێ بکا.

١١٩

سەعید زرینگ و وشیارە
دەیگوت: بزانم کێ پیرە، کێ ئیختیارە
هەتا من بیدەمێ پووڵ و پارە
ئەوەندەی زانی لە مووسڵێدا بوو بەچارکێشان و بەهاوار هاوارە
خەڵکی دەڕۆیین پێنج پێنج و دە دە هەتا دەگەیشتەوە بەبیست و چوارە
سەعید دەیگوت: شورەیی نییە، ناشارەزام، با پکەمەوە سوال و پرسیارە
سەعید پرسیاری دەکرد: ئەوە چییە وا خەڵک خڕ بوونەوە هەزارە؟
دەیانگوت: مەگەر غەریبی؟ نابەڵەدی؟ ئەرێ بێچارە
ئەورۆ چوار شەممۆیە، خەڵکی دەچنەوە سەر شەخس و زیارەتگا و ئێرەکانە

جێگای پەردەی پیر سوارە.

چومکە شوێنمانە، باب بۆ کوڕی گێڕاوەتەوە، ئێمە چوارشەمۆیان دەچینە زیارەتگا و فاتیحا خوێندن، بۆ ڕێگای بەختەوەری و خێر و خۆشییە

ئەوی بچێتە سەر پەردەی پیر سوار، وە پێش دەکەوێ لە کار و لە کاسبییە

دانانیشێ دەستەوئەژنۆ و خاک بەسەر و بەناهومێدییە

زیارەتگایەکی گەورەیە، چاکەمان لە پەردەی پیر سوار دەدییە

هەم شەخس بوو هەم بەویان دەگوت عولەمای ڕەببییە.

جا سەعید دەهاتەوە، لە پیرێژنێی دەپرسی، دەیگوت: دایە! چ خەبەرە عالەم هەمووی لە خۆی داوە تانووت و حونەرە؟

ڕدێن سپی و پیر و جوان دەچن بۆ ئەو سەفەرە

خانم و خاتوون و مەلەکە هەمووی ئەو بەرەو بەرە

داپیرە پێی دەڵێ: ڕۆڵە! هەچ کەسێ لە ڕێی خودادا خێراتێک

بکاو بچێتەوە سەر شەخسەکەی پەردەی پیر سوارە

گەردنی بڵند دەبێ و لە دنیایە دەبێتەوە ئازا و ڕزگارە

شەخسێکی گەورەیە و خۆشەویستی پەروەردگارە

چەند کەسم دیوە، دەڵێن: نەخۆش، زەلیلە، بیمارە

بردوویانەتە پەردەی پیر سوار، ئازار و دەردی وی بەوی هاتوویەتەوە چارە، ڕزگارە

لە کەسم نەبیستووە، دیتوومە، چەندی چوونە سەرێ دوزام و

زەلیل هەزار بەهەزارە!

لە هەمووی ناڵە ناڵە، گرمە گرمە، خەبەردار خەبەردارە

ئەوە سەعید خۆی لەسەر دوو ڕاستەی ڕکێفێ ڕادەگرت و لەسەر جانومایینی شێر خەزاڵی دەبۆوە سوارە

پووڵی دەبەخشی هەچی بەدەستییەوە دەهات، نەی دەکردەوە بەحیساب و شومارە

دەیگوت: ئەشخاسەکەی ئەگەر خودا کردووتی بە موعتەبەر و لە عالەم ڕا نێوبانگی تۆ دیارە

ئەوە لە ڕێی خودا و بۆ تۆی دەبەخشم، لە کن ئاغای چەلەنگ نەبمەوە خەجاڵەت و

سەرلەبەر و بێچارە

ئەمن بچمەوە بە ڕوو سووری، لە کن ئاغای خۆم پێک بێنم ئەمەگ و ڕوو سووری و ئیعتیبارە.

ئەوە ئەویش لەگەڵ خەڵکی چۆ سەر پەردەی پیر سوار.

غەنیمەتێکی زۆریشی دا بە خەڵکی. سەعید بەرەو قوبڵە ڕاوەستاو هەرتک چۆکی لە عەرزی دانا، دەیگوت:

ئەی پەردەی پیر سوار ئەگەر خەڵک پێت دەکەنەوە ئیعتیبار و متمانە

ئەمن ئەوە دەچمەوە بۆ مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ ئەگەر مەملەکەتێک لە ئێرانە

تەمەنایەکم بۆ بکە، لە کن ئاغای چەلەنگ و ساحێب ئیعتیبار نەبمەوە خەجاڵەت و کەسرم نەبێ شانە

هاوارم وە بەر تۆیە ئەی پەردەی پیر سوارە

دیارە شەخس و پیاوی چاک مەقبووڵی پادشای جەببارە

لە کن ئاغایە چەلەنگ نەبمەوە خەجاڵەت و خەجاڵەت بارە

نەڵێن: سەعید گوناحبارە و شەرمەزارە.

زۆری فاتیحا خوێند و زۆر پاڕاوە. سەعید هاتەوە.

١٢٠

کابرایەک مولاقاتی لەگەڵ میری بوو، سەعیدی زۆر چاک دەناسی،

توجارێکی زۆر قورس بوو. سەعید ئەگەر وەڕەز دەبوو، دەچوو لە دووکانی ئەو توجارە دادەنیشت.

سەعید ڕۆژێکی ئەگەر تەماشای دەکرد دەنگێکی ناسک دێ، ناڵە ناڵ و نارە نارە

دەیگوت: هەر خودا دەمێنێ لەسەر ڕەفتار و قەرارە

دوو سەد کەس ئەو بەرەو بەر ڕاوەستا بوون لە کەنارە

دوو کڵفەت، سینگیان دەڵێی گوڵی هەنارە

دەیانگێڕا بۆ فرۆشتن جووتێک گوارە و قەتارە

دەیانگوت: ئی فرۆشتنە، ئەوە بەئامانەتمان دانا

هەچ کەس بیکڕێ پەشیمانە! هەچ کەسێ نەیکرێ سەرگەردانە و ماڵ وێرانە!
ئەوە ماڵی ئایشە خانمە، بە قیمەت یەکجار زۆر گرانە
قیمەتی ئەوانە دەبێ توجارێک تاجرێک، پیاوێکی تێگەیشتوو، بییان هێنێتە سەر قیمەت و سەر فرۆش؛ بزانێ چەندە قیمەتی ئەو مەتای پەنهانە
نە وەک کەسێک وە تەماح کەوێ و بچێتە دڵیەوە شەیتانە
بە قیمەتی هەرزان بیکڕێ ئەو بە وەزن سووک و بە قیمەت گرانە
چومکە هەمووی مەتای ڕەنگاوڕەنگە و هەمووی بەدری[٤٣] بەحرانە
ساحێب سەغیرە، دەنا نەی
دەهێنا سەر دەستان و سەر ڕۆژی فرۆشتن و گێڕانە.

١٢١

ئەو ئایشە خانمە کچی تۆپاڵ بەگە، مێردی بە میرەڵەیەک کردبوو لە حەریرێ، تەواوی حەریری لە دەست دابوو؛ پاشان فەقیر ببوو. سەغیر باربوو. هەروایە ئەو کۆنە دنیایە! سەعید لە کابرای تاجری پرسی، کوتی:
ئەمن نابەڵەدم، ئەوە بۆ هێناویەتە سەر فرۆش و؟ ئەمن سەرم سوڕماوە لەو کارە!
حاڵیم بکە، ئەمن زۆرم پێیە پووڵی بەقیمەت و بەشومارە
ئەمن بگەڕێمەوە، دیاریم پێ نییە بۆ ئاغای وەلی نیعمەت و بەئیعتیبارە
ئەوانە لیاقەتی ئەوەیان هەیە، لە مەجلیسی میر سێوەدین بەگدا ئەگەر خەڵک نەڵێن: بێ قیمەتە و بێ قابیلەتە ئەو کرمەک و گوارە!
ئەوە توجارەکە پێی گوت، کوتی: برادەری عەزیز! ئەوە قابیلی مەجلیسی شا و خونکار و سوڵتانە
بۆ هەموو کەس نابێ، قیمەتیان یەکجار زۆر گرانە
ئەگەر بیخەیە سەر ڕۆژی قیمەت و کێشانە
هەمووی عەکسی پەپوولەیان تێدایە، مانگ و ڕۆژ نیشانە
میر سێوەدین بەگ قەت مەتای وای نییە لە خەزنەخانە
زۆر زەحمەتە وەگیر کەوێ لە هیچ دەوڵەت و دەوڵەتخانە

بەڵام دەبێ بە قیمەتی بکڕی چومکە ساحێبی سەغیر بارە، دەنا ئەوە شتێک نییە بیهێنێتە سەر فرۆشتن و گێڕانە

مەتایەکی زۆر بەقیمەتە، دەبێ بۆ بەرەکەت دەوڵەتان دای بنێن لەسەر خەزنە و خەزنەخانە

لە موسڵێ دا کەس پێی ناکڕدرێ بەو شەرتەی بێتە سەر قیمەتی بەشەرت و بەئەرکانە

سەعید کوتی: هێندە بەقیمەتە ئەو مەتای هیناویانەتە سەر ڕۆژی فرۆشتن و گێڕانە؟

کابرا کوتی: بەڵێ قیمەتی تەواو نابێ، حەفتەی جارێک دەیهێنن بۆ بازاڕ و دووکانە.

سەعید کوتی: بە عەداڵەت ئەمن دەیانکڕم.

جا ئەوە سەعید بە کێشان و بە وسووڵ قیمەتی گوارە و کرمەکی کردەوە تەواوە

بێجگە لە قیمەتی خۆی چل و شەش مەجیدی سوڕەتداری، زیادی دەداوە

کڵفەت و ئایشە خانم بەرەو قوبلە و دەست بەدوعا بۆ سەعید ڕاوەستاوە:

خودایە! زەلیلی نەکەی ئەو شەنگە پیاوە

چۆن تەماحی تێ نەکردین، لە مەزندەی بازاڕ و قیمەتی خۆی زیاتری داوە.

## ١٢٢

کابرایەک بوو نێوی یاسین بوو. جێیەکە ئەلعان پێی دەڵێن عوممان، ئەو وەختیش هەر پێیان دەگوت عوممان، لە ئۆردۆنێیە. ئەوێ و زۆر جێگای دی بە دەست سەلاتینییانەوە بوو. سوڵتانی ڕۆمێ ساحێب ئیختیار بوو، ڕەوەی لە هەموو جێگایەک بوو. ئەو کابرایە نێوی یاسین بوو، پیر ببوو، هەم ڕەوکەوان(٤٤) بوو هەم بەیتاڵ بوو، سەری چاک لە نەخۆشی وڵاغان دەردەچوو، ئەو یاسینە گەورەی ڕەوکەوانان بوو.

ماینێکیش بوو یەکجار زۆر مایینی چاک بوو، بەڵام دەنێو چوو بوو، پیر ببوو، بەتەڵەبیش بوو. ئەو ماینە و ماینی دی لە دەرەوەی خانووی ڕەوکەوان دەلەوەڕان.

گەرمای نێوەڕۆیە بوو، ئەگەر یاسین چاوی پێ کەوت، شەپۆل لە بەحرێ پەیدا بوو. سامێکی بەسەر داهات یاسین، کوتی: شەپۆلی وام تا ئێستا نەدیوە! ئەوە بۆ وا بوو؟ ئەگەر سەرنجی دایە ئەسپێکی قولە، گوێی بە قەت دمی مەقەستێک بوو، وەکو هەژدیهای جەنگی دەکاتەوە شەڕێ

دەڵێی ئاشە و ئاوی زۆرە و ئاردی دێنێ و دەگەڕێ.

ئەسپەکە ئەگەر لە نێو بەحرێ هاتە دەرێ، چۆ نێو وڵاغەکان؛ ئەو ماینەش بەتەڵەب بوو پشتی تێ کرد، سواری بوو، لە ماینەکە هات. ئەگەر لێی هات ماینەکەی وە بەر سینگی خۆی دا، هات و هاواری ڕەوکەوانان پەیدا بوو، ماینەکەی بە جێ هێشت و خۆی دەبەحرێ هاویشتەوە. جا ئەو یاسینە دەستبەجێ لە دڵی خۆی گرت، کوتی: قسێکی، کارێکی بتبێ، ئەگەر هەموو کەس بزانن، کارەکەت لێ تێک دەدەن. ئەندازەی حیسابی ئەو ماینە ڕابگرم، بۆ خۆم نەمدیوە ئەمما بیستوومە، دەڵێن:

وڵاغی بەحری لە وڵاغی سەحرایی بێ، جوانووەکەی قیمەتی تەواو نابێ.

ئەو کابرایە هێندە پیر بوو، بینایی چاوی کەم ببوو، خەبەری بەگەورەی عەسردا، کوتی: ئەمن لە بینایی چاوان بێ بەش بووم، بەعومری خۆم لە ڕەوەخانەدا بووم، لە خزمەتی دەوڵەتی، بەیتاڵی و کار بە چاوان دەکرێ، لە کەلکی خزمەت کەوتووم، ئەمن نمەک خۆری دەوڵەتم، بەدرۆ ئەمن وا ناڵێم، ئیمتیحانم بکەن. کابرایان بانگ کرد، دیتییان ڕاست دەکا، جا کوتیان: چۆن ئەتۆ بە ئەمینی ئەوەندەت خزمەتی دەوڵەت کردووە، خانەنشینی ماڵە خۆت بە، ئینتیهای مەڕاتیب ماجبی دەوڵەتیشت هەر ببێ؛ لەو ڕەوەیەش ئیجازەت هەیە، هەچی چاک بێ، سێ وڵاغ دەگەڵ خۆت بەری. جا کوتی: ئەمن لە وڵاغێک زیاتر نامەوێ. تاقە وڵاغێک دەوڵەت پێم عەتا کا بەسمە. پاش ڕۆژێ کەس ئیدیعام لێ نەکا. کوتیان: کوڕە سەت جاریش! کێ ئیدیعای ئەوە لە تۆ دەکا؟

یاسین ئەو ماینەی هەڵگرت. ئەوکوتی: قەت پیاوی وا گەوج نییە! ئەوی دی کوتی: چ عاقڵێکی هەیە ماینێکی پیری ئاوسی هەڵگرتووە، بیبەیە بازاڕی بیست و پێنج قران نایەنێ، جا هێنایەوە ماڵێ. ئەو وڵاغەی زۆر بەچاکی خزمەت کرد. هەر کوڕێکیشی بوو یاسین. ماینەکە هاتە سەر زانێ. لە وەختی زانێدا پەردەی بۆ گرتەوە، نەی

هێشت جوانووەکە بکەوێتە عەرزی؛ تا باڵی نەشکێ. نەی هێشت کەس چاوی پێی بکەوێ، هەتا ولاغەکە بوو بە سێ ساڵانە. وەک ولاغی ئێمە پڕ و قەدەستوور نەبوو. نێو قەدی باریک، دەتگوت شووشەیە و شمشاڵە، لە سێ ساڵانەیدا یاسین گرتی، تەعلیمی دا. لە حەساری خۆیدا تەعلیمی دا، نەی هێشت کەس بیبینێ و بزانێ. یاسین شەربەتی مەرگی وەرگرت، نەگەیشت بە سەرفەی ئەو ولاغە.

جا ئەو وەختی ئەگەر سەعید لە کۆنە مووسڵێ بوو، گوارە و کرمەکی ئایشە خانمی کڕی بوو، کوڕەکەی یاسینی کوتی: ئەمن چ لەو ولاغە بکەم؟ دەیفرۆشم، ئەوە بۆ پیاوێکی دەست ڕۆییو، ساحیب ئیختیار دەبێ. هەچ موشتەرێکی دەچووە سەری، پێی دەگوت:

بڕۆ بابم! ئەوە خرید و فرۆشی بۆ نییە

بڕۆ بکڕە لە ئەندازی تاقەتی خۆت بارگینێکی کەم قیمەتییە

هێندێک دەیانگوت: باڵدارە، بەباڵ ڕاوەستاوە و هێندێکش دەیانگوت: نا! پێی لە عەرزییە

سەعید ئەگەر دەیدی، لە تاوی ئەو ولاغە هیچ ئارام و سەبر و قەرار و عاقڵی نییە

دەیگوت: ئەمن بچمەوە، بگەڕێمەوە لە سەفەری ئێرانێ بۆ کن میر سێوەدین بەگ، هیچ دیاریم پێ نییە

دەهات، دەیگوت: عەزیزم! عەڕەب قیمەتی ولاغت چییە؟

کابراش ئەگەر تەمەشای دەکرد، دەیدی غەریبە؛ پێی خۆش نەبوو بیفرۆشێ بەکەسێکی بیناسێ و لێی بکاتەوە شوناسییە

بە سەعیدی کوت: خەڵکی کوێی؟ ناتناسم و شوناسیم پێت نییە

دەیگوت: بابە چت لەوەی داوە؟ ئەمن دەتدەمێ زێڕی سپی و فەرەنتییە

ئەگەر لەوەش دەپرسی، ئەمن خەڵکی ئەو مەملەکەتە نیم و ئەسڵم ئێرانییە

کابرا زۆری پێ خۆش بوو ئەگەر سەعید کردی قسەی ڕاستی و بە ئەسەحییە

کوتی: بەتۆی دەفرۆشم، باوەڕیم بەخەڵکی دیکە نییە

بابم! قەستەم بەو خودایەی کە ئەزەلی و ئەبەدییە

دایکی ئەوە عەسڵە حدودی قەباڵە داری عەڕەبییە

بابی خاترجەم بە ئەسپی بەحرییە
لە بن ڕکێفی هیچ پادشایەک لە دونیایەدا وڵاغی وا نییە
بۆ من بەجێ ماوە بەمیراتییە
هیچ سەعاتێک خاترجەمیم لە خۆم نییە
دەڵێم: یان دەوڵەت لێم بستێنێتەوە یان بێتە سەر حاڵاتی دزییە
چون وڵاغی وا بۆ من نابێ، لە کیفایەتی مندا نییە
خاترجەم بە لەگەڵ باڵدار تەفاوەتی نییە، ئیدی ئەوەتا باڵی نییە.
سەعید ئەگەر چاوی پێ کەوت، بۆ خۆی دەیزانی، قەت قەت شتی وای نەدیبوو.
کلک و یاڵ بەژەنگارە، پاشی بڵندە کەمێک، پێشی نەوییە
پەسندە، بۆ ڕکێفی هەموو پادشایەک دەبێ، خاڵ خاڵە، گوڵ گوڵییە
کەفەڵ پانە، گوێ مەقەستە،(٤٥) قەپۆز بەرانییە
سەعید دەیگوت: قیمەتی بڵێ، بزانین وتووێژت چییە؟
دەیگوت: هەوەڵ قسە لە دوازدە هەزار زێڕ قەت تاقە شایەک کەم و زیادی نییە
کەیفت هەیە لێم بکڕە، پێڵاو پێ داو(٤٦)، قسەی دیکە هیچ کەلکی نییە.
سەعید تەمەشای گەردنی دەکرد، خۆ ئەوە بەگەردنی مارە
هەر پەلێکی، قیمەتی بیست و چوار هەزارە
سەعید خۆ مەست نییە و خومارە
ئاقڵە، بەعومری خۆی دیویەتی وڵاغی دەشت و کێوپارە
بەڵام وڵاغی وای نەدیوە، جوانە، گرشەی دێ دەڵێی ئاور و نارە
سەعید کوتی: نەبادا گەورە گەورەی مووسڵێ بزانن و چەتم بدەنەوە لە کارە
زیادی بکەن لە سەرم! ئەو دیارییەم پێ نەبێ، چار لە من دەبێتەوە بێ چارە
بەبێ وتووێژ سەعید ئەوە دەیدا بەکابرا دوازدە هەزارە
چل زێڕی زیادی دەدایە، دەیگوت: پێیان کوتووم سەغیر بارە.
توجارەکە پێی گوت، گوتی: بەنێو بازاڕیدا مەبەوە، نەوەکو بێتە بەر دەست و چاوە
بڵێین: لە سەعیدیان هەستاندەوە! من خەجاڵەت دەبم، چونکە لە کن ئەمنت هەیە
دییانەتی و ئاشنایەتی و هەنگاوە.

بەجێیەکی وایدا مەبەوە، بەپێش چاوی دۆست و دوژمنان

بەخوڵای هەچ کەس بیبینێ تەماحی تێ دەکا؛ بەگلەر و شا هەتا میر و خان

لە بن ڕکێفی کەسدا نییە پشت ملەی سم تەبەقی کلک و یاڵ بەژەنگاری شێر خەزاڵی گوڵ گوڵی کەفەڵ پان.

ئەوە سەعید بەدزی بەقەراغێکدا هێنایەوە، نەیهێشت خەڵک زۆر بیبینێ. جا دەیگوت:

پەنام وە بەر تۆ ئەی ڕەببییە

کەسێک تۆ مەحتەلی نەکەی، مەحتەل بوونی بۆ نییە

بۆ میر سێوەدین بەگ یەگجار مەقبووڵە ئەو دیارییە.

جا سەعید فکری لێ دەکرد جاروبارە

چومکە ئاغای میر سێوەدین بەگ زۆری چاکە بۆی بووە، سەعید هەمیشە سەرلەبەرە و خەجاڵەتبارە

دەیگوت: دەبێ لێرەکانە ببێ کابرایەکی چازانی وەستا کارە

ولاغی وا لە قابیلەتی دایە ئەگەر کو گوارە و کرمەکی ئایشە خانی بۆ بکەم بە ناڵ و بە بزمارە

بەکار نایە پۆلا و ئاسن و ئەو کاروبارە

بۆ ئاغای میر سێوەدین بەگ قابیلەتی هەیە ئەو دیاری و سەوقات و ڕفتارە

ئەگەر بێتو میر سێوەدین بەگ سوار ببێ لە ولاغی کلک و یاڵ بە ژەنگارە

ئەو حەلی مەگەر بڵێ: بەخێرێیەوە نۆکەرەکەی بەمتمانەو بەئیعتیبارە

جا ئەوە سەعید چوو بەمەبخی بۆ کن توجارەکە، کوتی: زێڕینگەرێکی وات پێ شک دێ دەستی وەستاکاری ببێ؟ کوتی: لە چ ڕێگایەکەوە؟ حاڵیم کە هەتا پێت بڵێم. کوتی: فلانی خەیاڵی ئەوەم هەیە ئەو گوارە و کرمەکە بکەم بە ناڵ و بزمار، لە چوار پەلی ئەو ولاغەی بدەم. کوتی:

ئەمن پێم شک دێ، وای دەتوێنێتەوە ناقیسی نەبێ؛ جێبەجێ دەبێ. جا ئەوە دەستبەجێ بە بەڵەدی توجار کابرایان برد، ئەندازەی سمی بۆری میر سێوەدین بەگی گرت. ئەوە تواندنیەوە. ناڵ و بزماری خڕیم چونی- یانی ئی چوار پەلی، تەواو

کرد، بەڵکو شتێکیش زیاد بوو. جا بەوەستایەکی چازان ناڵ کرا.

بە سەعیدیان گوت: نەیە دەرێ؛ ئەو ولاغەی نەنوێنی بەو جۆرە. ئەوە لە قابیلەتی تۆدا نییە؛ بۆ کابرایەکی سەنتەنەت دەبێ. جا سەعید شەوێ خەیاڵی کرد: ناڵ و بۆر و زین هەمووی تەواو بووە، لغاو و دەسکەوسار ماوە ئەوەی لە قابیلی ئەوە دابێ.

## ١٢٣

ئایشە خانمی میرەڵەی حەریرێ ئەگەر گوارە و کرمەکەی فرۆشت، خەبەری بۆ هات. برایەکی بوو، کوتیان: براکەت لە نێو هەڵگیرا، نەماوە. چاردە پرچی لای ڕاستەی دەرهێنا بوو، هەمووی لە گراویەی پانیەی شەڕی دەکرد. جا بە کلّفەتەکانی گوت: ئەوانە بەرنە بازاڕی، بەقیمەتێکی قورس دەفرۆشرێ. سەری زولفەکانیشی، بێجگە لە ئەشرەفی، ئێکی بەدرێکی بەحرییان پێوە بوو بەقەد فندقێک.

سەعید، هەموو ئەسبابی تەواو بووە، بەلغاو و دەسکەوسار ناباتەوە چارە

ئەگەر تەماشای کرد، لە مووسڵێدا بوو بە خەبەردار و بە هاوارهاوارە

دوو کلّفەت هاتن، مەمکیان دەڵێی هەنارە و، چاویان یەگجار وشیارە

خەڵکی دوور دەکەوتنەوە، ڕادەوەستان کەنار بە

کلّفەت زۆر جوان چاکن، وەکو بولبول لە لێوانیان دەردێ ئاواز و نارە نارە

کوڵمەیان دەڵێی سێوە، تازە وێی کەوتووە نەرمە خوسارە

دەیگوت: موشتەری قەرە زولفی ئایشە خانم. هەریەکەی قیمەتی هەزارە

خەڵکی تەمەشایان دەکرد و هیچ لێیان نەدەکرد قیمەت و پێیان نەدەبردەوە چارە

سەعید فکری لێ دەکرد، زۆر بە عاقڵی و بە ڕەفتارە

دەیگوت: لێیان دەکرم بۆ بەن سامۆرتەو لە زولفی ئایشە خانم تەواو دەکەم دەسکەوسارە

ئەشرەفییەکانی سەری زولفی دەکەمەوە بە لغاو، دیارییە و بۆ میر سێوەدین بەگ، تا ئەورۆ کەس نەیدیوە ولاغی وا، قابیلە ئەو ناڵ و بزمار و ئەو بەن سامۆرتە و دەسکەوسارە.

ئەشرەفییەکانی کرد بە لغاو، بەشەوی تاریک دەدرەوشا.

جا کوتی: خودایە شوکرانەم وە بەر تۆ هێناوە
ئەوە تۆ بووی بەواسیدە، کاری من جێبەجێ بوو، بووە تەواوە
تا ئەورۆکە بۆ ئاغای خۆی هیچ کەس دیاری و سەوقاتی وای نەهێناوە
قابیلی سوڵتانی ئەستەمبوڵە ئەو ولاّغ و ناڵ و بزمار و دەسکە ڕەشمە و لغاوە.
جا ئەوە سەعید چەک و ئەسپابیشی هێنا بوو لە ناسرییە.

١٢٤

سەعید چومکە پیاوێکی عاقڵ و چازانە
دەیگوت: دنیا زۆری هەیە ڕۆژی ناخۆشی و لێقەومانە
دەیکڕی بیست و چوار تیر لەوانی قەرە خۆراسانە
بیست و یەک ئاڵەتی جەنگی، بێجگە لە زیادی ئەگەر بەوم دەڵێن سەرە پەیکانە
دەیگوت: پێی دا دەوێ، دۆست و دوژمنم هەیە، سەفەرم دوورە و ئێرانە.
ئەوە مەنزڵ بە مەنزڵ هات. جا پیاو بەبۆرە بڕوا، وەک ماشێن ڕۆییوە. ولاّغەکەی خۆی بۆ پیرێژن بەجێ هێشت، کوتی: داپیرە! ئەگەر پێداویستیت بوو، دەتوانی بەری بیفرۆشی و بۆ خۆتی خەرج کەی ، سەفحەی ڕۆژگاری خۆتی پێ ڕاببوێری.
ئەگەر هاتە حەریرێ کا حەسەنی دزەیی سەردار عاشیرەت بوو. پاش بانگی شەوان بوو، هات لە دەرکێکی گەورە ماڵ دابەزی. ژنێکیش، دەتگوت جانومایینی کاکلاغای گەردییە تازە زین کراوە، ئەگەر هاتە دەرێ چاوی پێ کەوت، غەرقی تیر و سەرە پەیکانی قەرە خۆراسانە، سوارێک ڕمبی لە خوێنی نەکرد و پڕیشکەی خوێنی لێ هەڵدەوەرێ، ئەوە ژنەکە دەڵێ:
سوارەکەی ئەسپت بەباڵ دەفڕێ و هێندێک دەڵێن لاقی لەسەر عەرزییە
ڕاست و چەپ خۆت هاویشتۆتە سەر ڕکێف و ورینگەت(٤٧) دێ لە لاق و ئاوزەنگییە
پێشی زینت زێڕی سپییە و، لێت چەسپ کردووە وردە فەرەنتییە
لە پێت دایە جووتێک چەکمەی سمایل نامەی بن دەباغی عەسلە وەستا نەسرییە
هاویشتووتە نێو شانی خەفتانێکی هێندێک دەڵێن: قاقومەو، هێندێک دەڵێن: غەزە، هێندێکیش دەڵێن: نەخێر، پێستی پڵنگی کێوی و یاغییە

خەریکی لێرە دابەزی بەقۆناغی و بەمیوانییە
خەجاڵەتم. ئەمن ئی تۆ ناتوانم بکەم خزمەت و پەزیراییە
نا بەڵەدی، با پێت بڵێم ڕێ و و شوێن و ڕوخسەت و بەڵەدییە
پیاوی وەکو تۆ دەبێ میوان بێ لە گەورەی عاشیرەتان، ئەوە جێگا و ڕێگای وییە
گەورەی ئێمە کا حەسەنی دزەییە.
ئەو باڵەخانەی چرای لە دوورەوە داییسێ، شۆق و ڕەونەقی کردووە بڵاوە
لە ڕاستە بیست و دوو کەس نۆکەر و خزمەتکار و لە چەپە چل کەس ڕاوەستاوە
بێجگە لەوەی مەجلیس نشینە و ساحێبی نیشانە و ناوە
ئەوێ جێگای تۆیە، لە وێ دەڵێن: دڵی ماندووی لێ دەحەساوە
دەنا ئەمن خەمی ئەوەم نییە بە وڵاغت بگریەوە وچانە
یان لێرە بۆ خۆت ئیسراحەت بکەی و بخۆی پارووێک نانە
بەشان و شەوکەتت هێندێک دەڵێن: ڕۆستەمە و هێندێک کەس دەڵێن: نەخێر! قارەمانە
جێگای تۆم نییە، خەجاڵەتم! بۆ من کەسری شانە.
ژنێکی زۆر لایەق بوو. سەعید دەیویست میوانی وی بێ. ژنەکە کوتی: ئەمن لە قابیلی ئەوەدا نیم، جێگای تۆ ئەوێیە. کچێکی بانگ کرد وە پێشی خست کوتی: بیبە بۆ دەرکی سەردار عەشیرەت.

١٢٥

سەعید ئەگەر هات خواجانە لێدراوە، ڕاکشاون ئەمبەرەو بەرە
نیوێکی عەمربەرە، نیوێکی ئاغایە، نیوێکی نۆکەرە
هەمووی قەڵسە و خەنجەری نۆگۆی دوپشک نیشانی لەبەرە
هەمووی دەڵێی هەژدیهایە، گرتوویەتی ڕێگا و گوزەرە
هەمووی قەپۆز بەرانی و ڕەنگ پیاو و ڕەشەسمەرە
هەمووی ئی ڕۆژی لێقەومانە و چاکە و خراپە و خوێن ڕێژییان دیوە و پاکی دەڵێی تەتەرە.

سەعید سڵاوێکی دەکردەوە بەشەرت و بەئەرکانە
وڵاغیان لێ وەردەگرت و سەعید پێی لەسەر عەرزی دانا.
سەعید جڵەوی وڵاغی نەدەدا، دەیگوت: براله ئەوە کەتەبارگینێکی قەتارچییان نییە
هەچ کەسێ وڵاغ لە من وەرگرێ، دەبێ کا حەسەنی دزەییم بداتێ
بە ئیعتیبار و بە زامنەتییە
چومکە ئەمن دڵم موتمەئینی لە کەس نییە
بەڵام پیاوی گەورە نێوی خۆی ناکوژێنێتەوە، ئەو دەزانێ عەیبە و شوورەیییە.
چوون بەکا حەسەنی دزەییان گوت. ئەوانەی لە کنی بوون، گوتیان: چۆن کا حەسەنی دزەیی دەکا بەزامنی وڵاغەکەی؟! کا حەسەن هەستا هاتە دەرێ، ئەگەر چاوی بە وڵاغەکەی کەوت بەند بەندی قالبی ڕاچەنی. قەت وڵاغ و سواری وای نەدیبوو.
ماشەڵڵا خوداوەندی میری مەزن دنیای چۆن داناوە
میوان دەڵێی ئەسفەندیارە و بەرامبەر بەرۆستەم ڕاوەستاوە
دەڵێی ئەفراسیابی تورکە و لە سەفەری گوڵستانی ئیرەمێ گەڕاوە
دەڵێی فەرەیدوونی فەرە و سەلم و تووری لێ کوژراوە
بەینەڵڵا عاقڵە، هەقی هەیە وڵاغی خۆی بەکەس نەداوە.
کا حەسەن بەخێرهاتنی کرد، گوتی: ئەمن زامنم، خاترجەم بە بەسلامەتی وڵاغت دەدرێتەوە دەستی. فەرموو قەدەمت ڕەنجەکرد، مەکانت موزەییەن کرد. میوانی زۆر بوو، پیاوی جگەرداری لە مەجلیسێدا بوو. هەموو هاتن بۆری میر سێوەدین بەگیان دی. ئەی گوتیان لەو کابرایە! ئەوە چ کارەیە؟ چ کەسە؟ وڵاغەکەیان زۆر پێ قابیل بوو، چەک و ئەسپایی وایان قەت چاو پێ نەکەوتبوو.
کا حەسەن گوتی: لەوەتی چاوم بەو وڵاغە کەوتووە، هیچ هۆشم نییە! یەکجار ئەو کابرایە پیاوێکی عاقڵە، وڵاغەکەی نەدا بە کەس؛ گوتی: کا حەسەن زامن بێ. قسەی خۆم لە گرێو ناوە، عەیبە لێرە لێی بستێنین. بەڵام چل کەس هەر ئەوشۆ بڕوا، کەڵەکە ڕەشی خۆشناوی لێ بگرن. لێرە دەبێ ئەمن وڵاغەکەی بدەمەوە، لەوێ وڵاغەکەی لێ بستێنن. ئەوە لە قابیلەتی ئەوەی دا نییە ئەو وڵاغەی ببێ. ئەو وڵاغە بۆ کەسێک دەبێ

ئەگەر سەڵتەنەتی مەملەکەتێکی قورسی بە دەستەوە بێ.

عادەتی گۆرانیش شەوە، بەشەو کابرا دەپەشۆکێ و دەست دەدا. سبەینێ سەعیدیان غافڵاند هەتا وە بەر شەوێ بکەوێ، تا ڕۆژ درەنگ نەبوو، ئیجازەیان نەدا بڕوا؛ بۆ خاتری ئەوەی شەو دابێ؛ وڵاغەکەی لێ بستێنن. کا حەسەن دوازدە جار چوو وڵاغەکەی تەماشا کرد، کوتی: لێی دەستێنم و بۆ خۆم سواری دەبم.

١٢٦

دوو کەس بەکەڵەکە ڕەشی خۆشناوێدا دەهاتن؛ سوار بوون. ئەگەر چاویان پێ کەوت، ئەوبەرەو بەر گیرا بوو؛ گەڕانەوە. بانگیان کردن: بۆ سڵەو کرد؟ بۆ گەڕانەوە؟ ڕێ لەنگۆ نەگیراوە. دزی ئەنگۆ نین؛ ئێمە کاری گەورەمان هەیە. وەرن بڕۆن بەڕێی خۆتاندا. ئیجازەی کابراکانیان دا؛ هاتن ڕابردن.

سەعیدیش پاش نەهارێ دڵی تاقەتی نەگرت، کوتی: ئاغا! ئیجازەی میوانی بە دەست خانەخوێیە؛ ئەگەر ئیجازەم بدەی ڕێی من دوورە، دەڕۆم. زۆر بەئیعتیبار و زۆر بەحورمەت و زۆر بەحیسابی ئاغا ئیجازەی دا و بەڕێی کرد. چل کەسی دیکەشی بە دوادا نارد؛ کوتی: بڕۆن پاش و پێشی لێ بگرن؛ بەڵام زۆری لێ نزیک مەڕۆن، نەوەکو کابرا لاڕێ بێ، بەکەڵەکە ڕەشی خۆشناوێدا نەڕوا.

ئەوە دوو سوارەکە هاتن، تووشی سەعیدی بوون، ئەگەر تەمەشایان کرد، دیتیان جارێ خەڵوارێک گڵ لە ژێر سمی ئەسپی سەعیدی دەردەپەڕێ دەچێ بۆ حەوای. کوتیان: بۆ ئەوە لەوێ ڕاوەستاون. بانگیان کرد:

سوارەکەی سوار بووی لە وڵاغێکی دەڵێی شمقارە و بازی برسییە و لە نێچیر دەگەڕێ

حەیفە لە دونیایەدا لە ناخافڵ پیاوی شوجاع و ڕەشید بکەوێتە شەڕێ و لەسەر خوانی زین وەرگەڕێ

پێشات و ئەجەل هەمیشە لەسەر ڕۆحی بنی ئادەم دەگەڕێ.

سوارەکەی تەدارەک و چەک و ئەسپ و مەرکەبت تەواوە

خەنجەری دەسک نێرۆیی پازاری عەسڵە جەوهەر ڕێژت لە کەلەکەی چەپەی ناوە

قەرەبینایەکی گەرو ڕەشی داودی پەپوولە نیشانی کە ماهی بەحریت لە دەسکێ ناوە

وشیار بە! بە سەهوو مەچۆ! ڕەبی بەدوور بی لە دەرد و لە بەلایە، لە کێشە و سەدەمەی کەڵەکە ڕەشی خۆشناوە!

بەخولای عەزیزم خەبەری ئاخریت بدەینێ: کەڵەکە ڕەشی بازخانەی خۆشناوێت لێ گیراوە

هەمووی دەڵێی شێرە و لەسەر نێچیرێ ڕاوەستاوە

چاوەڕێی تۆن، ئەوە خەبەری ئەسەحیمان بە تۆ داوە.

بەوێدا کەس ناتوانێ بکا هاتوچۆ

حەیفە پیاوی وەک تۆ، لە مەیدان دەردەکا گۆ

هەڕۆ، بڕۆ، دایک بۆت نەکا ڕۆ ڕۆ.

سەرکەوتوو بی، دانەنیشی بە شەرمەزاری

ئاگای لە تۆ بێ پادشای پەروەردگاری

دایک لەسەر مەیتی تۆ نەکاتەوە گریان و زاری.

سەعید ئەگەر هاتە پێشێ لێیان، کابرا سڵەمینەوە؛ سامەکەی وابوو.

کوتیان: بەوێدا مەڕۆ، ڕێت لێ گیراوە!

### ١٢٧

سەعید کوتی: وەڵڵاهی ئەو دنیا ڕووناکەم بەبێ غیرەتی ناوێ

ئەو شۆرەتە بڵاودەبێتەوە، دەڵێن: سەعید نەیوێرا بڕوا بەزینوی بازخانەدا و بەکەڵەکە ڕەشی دەخۆشناوێ

وەڵڵاهی من لە دڵی خۆی ناکەمەوە بە ناسۆر و بە فکرێ

حەو سەد کەس کامەری ئەگەر ڕێگا بە پیاوێ بگرێ

دیارە هیچ بە بێ عومری خودای تەعالا ناکرێ

ئەوی وە سەرت بێ، دەبێ بێتو ڕاببرێ

ئەوی خودا نەیکوژێ بەبێ ئەجەل نامرێ.

ئەوە سەعید خۆی گورج دەکرد و دەیهاویشتە سەر پێشی کەوانی دوو تیری قەرە خۆراسانی پەپوولە نیشانە
ئەگەر ئاوازەیان بێ، پڵنگ گوێی لە دەنگی بێ، خەوی هەراسانە
سەعید تیرەندازە، ماسی ناتوانێ بڕوا لەبەر تیری لە شەپۆلی دەبەحرانە
ئەوە خۆی دەسپارد بە پادشای پەروەردگار و بەسوبحانە
دەیگوت: پیاو نابێ بترسێ ڕۆحی خۆی پکا پونهانە.
دوو سەعات لە شەوێ چوو بوو؛ چونکی فێنک بوو، شەو بە سەر دەستاندا هاتبوو، مابووی وەکو ئێرە و وسووکەند، هەستیان کرد، ئەی کوتیان هات. وشیار بن!
لێی دەبوونەوە ئەو بەرەوبەرە
کەسێک لە خەڵکی بکا قەتڵ و قەستە سەرە
خودا بێ بەشی کا لە بەهەشت و لە ئاوی کەوسەرە
ئەوە هەموو لە خۆیان دەدا تانووت و غیرەت و حونەرە
دەیانگوت: بۆ ئەو کابرایە نابێ ئەو ئەسپ و تەدارەک و شیر و خەنجەرە
قابیلی کا حەسەنی دزەیە، دایمە ساحێبی حەو سەد عەمر بەر و خزمەتکار و نۆکەرە.
کابراکانیش سەعیدیان وشیار و خەبەردار کر بۆوە.
سەعید دەیزانی ڕێی لێ گیراوە
ئەگەر نەرمە ئاوزەنگێکی بۆ بۆری دەهێناوە
زۆر کەس دەیگوت: بۆر بە باڵ فڕی، هێندێکیش دەیانگوت: ئەوە جێگای کۆلکە بزمارە لە عەرزی ماوە
دەنگیان دا، ئەو بەرەو بەری لێ گیراوە
لە شانی ڕاستەی سەعید ئەگەر تیروکەوانی دادەماڵی و لەسەر ڕانی دادەناوە
دەنگی بۆری دەدا و قاژەی تیری سەر بەپەیکانی دەبۆوە بڵاوە
یەک بە یەکێی دەگوت: ئەوە دەنگی هەوری عاسمانێ بوو! هێندێکیش دەیانگوت: نەخێر، بەحرە شەپۆلیان لێک داوە
ئەو دوژمنەی لە پێشی ڕێی پێ گرتبوو، لە پێشەوە ڕاوەستاوە

تیرێکی لەب سورخی شازدە مشتەیی عوقاب ڕەنکی لە سنگی دەداوە
ئەوی ئاوەژوو دەکردەوە، لە مێژە لە حەو سالان ڕاست بۆتەوە و ژیانی پێ نەماوە
ئەگەر کەلاکی کەوت، ئەوە کابرا ڕێگای بۆ بەرداوە
هێندێک دەیانگوت: هەورە بروسکە بوو. عاقڵمەندان کوتیان: ئەدی ئەو کابرایە بۆ کوژراوە؟

کابرا کە کەوتە عەرزی، کوژرا، سەریان لێ شێوا، دەستیان لێ تێکەڵ بوو، هۆشیان نەما. سەعید بە نێوانیاندا، بە سەر زگیاندا، هات و ڕابرد؛ خۆی دەربازکرد.

هێندێک تێک هالاوە، هێندێک لاقی ڕاستەی شکاوە
پیاوێکی زۆر موعتەبەریشیان لێ کوژراوە
سەعید زۆر دوور کەوتبۆوە، ئەگەر بەشانی ڕاستەیدا ئاوڕێکی دەداوە
داد و فیغانە، هێندێک دەیانگوت: بابە، ئەوە سوارەی غەیبی بوو. هێندێکیش دەگریان، دەیانگوت: خودا فەتح و زەفەری وەدەستمان نەداوە.

١٢٨

خودای عەرز و عاسمانێ
حاکمی حوکماتێ هەر تۆی، کەس بەسوڕت نازانێ
کەسێک موعتەبەری کەی، بە تانجە و بە دیوانێ
کەسێک تۆ زەلیلی کەی، دەچێتە زەلیل خانێ
موقەددەر هەر بەدەستی تۆن، ئەی جاندەری بێ جانێ
جا ئەوە سەعید موسافەڕەتی کەوتە خاکی ئێرانێ.
ئەوە هاتەوە ئێرانێ.
سەعید ئەگەر گەیشتە ئێرانێ و بای خاک و نیشتمان لە سەری دەداوە
دەستی ڕاستەی لەسەر جڵەوە و دەستی چەپەی دە کەلەکەی دەناوە
هەناسەی ساردی لە دڵی دەهاتە دەرێ و سێ هەناسەی کەسکوونی دەکێشاوە
دەیگوت: نیشتیمانم ئێران ئاو و هەوای خۆشە، بەڵام بۆ من بوو بەقەباعەت و

بەشەڕ و شوڕو لەسەر ڕوفیە، ئێران لە من تاڵ و توون کراوە

فەقیری هیچ نییە، بۆ پیاوان نابێتە بەند و عەیب و باوە

ئەمما گرێیەکی زۆر قورس و بەزەحمەتم لە دڵیدا ماوە

خەڵکی سەرزەنیشتم دەکەن، دەڵێن: بەسەر و سواری دەڵێی ڕۆستەمە و خوڵقاوە

ئەگەر ئەو پیاوەی، ئەدی بۆ دایک و بابت بەقەرزداری و بەشەرمەرازی بەجێ ماوە؟

تانووتی خەڵکی ناخۆشترە لەوەی ئەگەر پیاو ڕۆی بڕژێ بیناهێ هەرتک چاوە

ئێستا دوورە، سەرحەدی ئێرانە، زۆرم بۆ مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ ماوە.

سەعید فکری کرد و گنجی خستەوە نێو چاوانی

خودایە لە کێ ئەمن ببم بە میوانی؟

فکرم بێتەوە بەرێ و بە بۆری گوڵ گوڵی بگرم مەنزڵ و وچانی

چۆن من لە ئێراندا نیمە خاترجەمی و ئیتمینانی.

ئەوە بۆری ڕاگرتبوو، فکری دەکرد، بۆر دەسووڕا، دەکەوتەوە سمکۆڵێ

سینگی دەستی بە تەکاندان کرد وەکو چاوەش بوکتێ دەهۆڵێ

سەعید کوتی: جێگای من کوێیە؟ دەچمە ماڵی فەتحە خان، میوان دەبم لە دزەی دۆڵێ.

ئەما با ڕۆژ ڕاببرێ، شەو بێتەوە سەر دەستانە

خوداوەندی میری مەزن ئەگەر پێی بگرێ قەرار و مەکانە

شەوڕۆ چاکترە، شەو قەڵای مێردانە

ئێرانی ڕەشیدن، هەمیشە ڕووحیان لەسەر دەستانە

هەمووی ساحێبی شیر و تیر و خەنجەری قەرە خۆراسانە

هەمووی نومایش بازن لە شیری قابیل و دەستیان بەتیغ و پەیکانە

نەبادا کەسێک لە من کەوتبێتە قسان و ڕاپۆرت دانە

ساحێب دوژمنم، پیاو نابێ بکاتەوە ئیعتیبار و متمانە

دەبێ لە ڕۆژی خۆشیدا پیاو بترسێ لەو ڕۆژەی ئەگەر باسی سەر و لێقەومانە

چونکی بەتەدارەک و ئەسپاب دەڵێن: ڕۆڵەیە لە زەمانە

ئەوەکو پێم تاڵ بکەن گەروو، بێمە سەر حاڵاتی کوشتن و بڵێن: ڕووحی دانا
چومکی تا نەکوژرێم و تەنم نەبەنەوە بۆ گۆڕ و گۆڕخانە
هیچ کەس نابێ سواری بۆری ببێ و پێی ببڕێ مەنزڵ و مەکانە
ئەمن ساحێب دوژمنم، بۆیە سەری خۆم هەڵگرت و بەجێم هێشت خاکی ئەو ئێرانە.

١٢٩

هەچ کەس تووشی دەبوو، دەیانگوت: ئەوە سەعید تەرگەوەڕییە.
دەیانگوت: ئەو تەدارەک و ئەسپابەی لە کوێ هێناوە؟ کەس زەفەر بەو هەژدیهایەی نابا. ئەوە سەعید بەڕۆژ نەهات، شەوێ تووشی دوژمن یان دۆست بێ قەیدی نییە.
ئەگەر لە بۆری توند دەکرد لغاو و دەسکەوسارە
جار جار بەنەرمە دەڕۆیی و جار جار دەهاتەوە بە وێڵغارە
هێندێک دەیانگوت: ئەوە پەڕندەیە و باڵدارە
هێندێکیش دەیانگوت: نەخێر وڵاغەکەی زۆر قابیلە، ئەو سوارە جگەردارە.
بەڵکو دوو سەعاتی شەو مابوو، سەعید بە کۆ و تەرازووی عاسمانێ(٤٨) بەهەوای شەوێی دەزانی
ئەوە سەری وڵاغی ڕادەگرت لە دەرکی فەتحەخانی
نۆکەر و خزمەتکار و قەرەوڵ ئەگەر وایان زانی
دەیانگوت: بابی خۆم ئێستا شەوی ماوە
ئەتۆ پیاوت کوشتووە یانە لێت قەوماوە؟
بەو نیوە شەوەی پەنات بۆ دەرکی فەتحە بەگی هێناوە
دەیگوت: بابم! نەپیاوم کوشتووە و نەهیچ تاوانێکم هەیە لەسەر شانی
دەبێ پیاو بڕوانێتە قسمەتی پەروەردگار و پادشای ڕەببانی
ئەمن لە فەتحە بەگ دادەبەزم بە میوانی.
سەعید ڕاوەستا. کوتیان: بابە، خەبەر دەدەین فەتحە بەگی

تایەفەی خانی موکری – ئەوە لە تایەفەی خان و خانەودەلی دمدمە – لە خەوێیان هەستاند.

١٣٠

فەتحە بەگ پیاوێکی عاقڵ و وشیارە

دەیگوت: ئێستا شەو زووە، خۆ بە هەوای عاسمانێ ڕا دیارە

چ قەوماوە؟ لە کێ بەر بووە ئاگر و نارە؟

کێ تالان کراوە و کێ هێناویەتی هاوارە؟

پێم وایە دەورەی دزە دراوە بەبیست و دوو هەزار سوارە

کوتیان: ئاغا! میوانێک لەبەر دەرکێیە دەڵێی فەرامەرزە لەسەر دوو ڕاستەی ڕکێفێ ڕاوەستاوە

سمی ولاغی زێڕە، بەو شەوە بریقەی دەداوە

لغاوی فەرەنتییە، زۆر ڕەنگینە سەقاو(٤٩) و دەست و لغاوە

وەزیفەی قەرەوڵە، وەزیفەی خۆمان بەجێ هێناوە

نمەک خۆرین، خەبەرمان بە ئاغایە چەلەنگ داوە

سوار لەسەر فەرمایشت و قسەی تۆ ڕاوەستاوە.

جا کوتی: پیاو میوانی بێ دەبوو دەستبەجێ دەرکی دیوەخانێی بۆ بکەنەوە. کوتیان: کابرایەکی وانییە پیاو بوێرێ تەمەشای نێو چاوانی بکا. فەتحە بەگ سەعیدی چاک دەناسی، بەمنداڵی پێکەوە گەورە ببوون. دەستبەجێ دەرکی وەتاغی دەرێیان بۆ کردەوە. سەعید ولاغەکەی لە نێوەڕاستی حەساری فەتحە بەگی ڕاگرت، کوتی:

ئاغای چەلەنگ لە خەوێدا ماوە یان لە خەوێ هەستاوە؟

کوتیان: هەچی تۆ بفەرمووی سازە، پەزیرایی، قەلیان و قاوە

کوتی: کارم بەوە نییە، حەز دەکەم ئاغا ببینم بە دوو چاوە

دەنگ لە قەڵدرمان و پلیکان و ڕاگیر(٥٠) دەهات، ئەوە فەتحە بەگ لە حەساری ڕاوەستاوە.

ئەگەر چاکی تەماشا کرد، دی سوارێکی بە زین
مەگەر جارێکی لە جاران کاکە مەمی وا دیبێ، ئەگەر دەڕۆیی بۆ جزیرێ بۆ دیتنی خاتووزین
بیست و یەک پەڕەی ئاڵەتی جەنگی وەکو کۆتر لە قەد و باڵای کەرویشکەیان دەکرد و دەفڕین
خەنجەری دەم ڕەشی دەسک نێرۆیی، دەڵێی تازە هاتۆتە دەرێ لە برین
پیاوێکی جوان چاک بەنەزاکەت و ئارامگای گرتووە وەکو
برزووی شێر هەژدەر ئەگەر هاتەوە وەختی داعوایە و سەر غەزرین
ڕمبی دەم ڕەشی هەژدە قەفی لە شانی دایە؛ کەسێک چەپ بدوێ، دێتە سەر ڕۆژی خوێن پرژین.
ئەوە دەستبەجێ فەتحە بەگ دەنگی نۆکەرانی دا، گوتی: سەرو لەبەرد داوە، سەهووتان کردووە
دەڵێی بێ عاقڵن، خزمەتو نەکردووە
بۆ ولاغ و لە میوانی بەڕێز وەرنەگرتووە؟
کوتیان: وەڵڵا لە تۆی پرسیوە و داوای تۆی کردووە.
دەستبەجێ چرا و ڕوناکاییان هێنا حەسارێ
نێو چاوانی سەعید خوێنی لێ دەبارێ.
ڕووناکایی پەیدا بوو، ئەوبەر ئەوبەر، بە فەنەر و چرا
لێک ئاشکرا دەبێ دۆست لەگەڵ دوژمنا.
فەتحە بەگ دەستبەجێ ناسی، زانی ئەوە سەعید مەرگەوەڕییە
دەستی دەنا لە نێو دەستی و دەمی لە نێو دەمییە
دەیگوت: یا خولا بەخێرییەوە سوارەکەی ئازا و ڕەشید و غوربەتییە!
زۆر لە میژە سەعید لە پیش چاوی من دیار نییە
ئەو مەڵبەندەم دەدی بەوێرانی و بەخامۆشی و بەچۆڵییە
چومکە دەنگی ڕکێف و ئاوزەنگی و ئاوازەی تیری سەعیدی دە ساڵە دیار نییە.

جا ئەوە مولاقاتی ئێکتریان کرد. ولاغەکەی بە فەتحە بەگ ئەسپارد، تاقەتی کەن. بۆ خۆی ڕۆیی بۆ سەرێ، قسە و گوفتوگۆ هەچی بوو کرا. مەحرەمانە پرسیاری دایک و بابی لێ کرد. ئەویش مینگاندی و قسەی نەرمە نەرمەی کرد، کوتی: ئینتیها خانووەکەشی فرۆشت، کەسێکی خولا تێری نەکا بە عەبدی تێر نابێ. سەعید بەو قسانە نارِەحەت بوو، کوتی:

ئاغا! بۆ چت سەر داخستووە؟ هەڵێنە چاوە

پێم وایە بایە شایەک غیرەت لە کەللەی ئێرانییاندا نەماوە

پیاو ئەگەر فەقیر بوو، عاقڵی ناقیسە و ناتەواوە

بەڕەببی کابەی ئەو خانووە نە کڕینی هەیە و نە فرۆشراوە

ئەو هەقە دەستێنم بزانم بابی من بۆ دەرکراوە؟

هەڵبەت کوتوویانە: سەعید مردووە و لە دونیایەدا نەماوە

کێیە ئەو کابرایە، ئەو خرِیدارە؟

دەری کردووە ئەو پیرە و ئەو هەژارە

نەیزانیوە زەهلە چەشمی کوڕی قاتڵی هەزار سوارە؟

فەرموو ئەلعان مەعمووری دە سەر کە، بۆی بنێرە پووڵ و پارە

بە چەندی کڕیوە، بیدەیە پووڵ بە حیسابی و بە ژمارە

ئەمن ناچمەوە تا دایک و بابم لە خانووبەرەی خۆیاندا نەگرنەوە وچان و قەرارە

قەستەم بەوەی کەم ئەگەر پەروەردگارە

بیست سەعاتی مۆڵەتە، نابێ ببێ بەبیست و چوارە

بۆ هەچ کەسێک بڵێن: پیرە و هەژارە و فەقیرە و ئیختیارە

دەبێ دەری بکەن و دابنیشێ لە کووچان، کەنار بە؟

ئەوە دەست بەجێ فەتحە بەگ مەعمووری دە سەر کابرای دەکرد و سەعیدیش پووڵی بۆ دەنارد.

پیاوێکی ڕدێن سپی دەنارد زۆر بەشەرت و بەعاقڵ و بەئەرکانی

ڕەبی ئەمن ڕووحم لە دنیایەدا ببێتەوە فانی
بۆ دایک و بابی دەنارد تەدارەک و ڕێ و شوێن و حیسابی زیندەگانی
مەعموور بە، دایان مەزرێنەوە، مەیەڵە دایک و بابی من بە هاتنەوەی من بزانی
باڵا پۆش و بژیوە و تەدارەکیان هەموو بۆ جێبەجێ کە وەکو دەوری دەورانی
ئەمن ناتوانم بچمەوە بە خەجاڵەتی و بە کەسری شانی
ئەمن ڕەبی ڕووحم نەمێنێ، بچێ بە بادی فەنا و ببێتەوە فانی
دایک و بابم دابنیشن بە بێ ڕێ و و شوێن و چاو لە دەست و سەرلەبەر و بەبێ زیندەگانی
خولا ئەو کوڕەیان لێ بستێنێ ئەگەر دێتەوە ڕۆژی شەڕ و مەعرەکە و خوێن پڕژانی
دوژمن بێ ڕووحە، دەترسێ لە ڕووح، نامێنێ گیانی
ئەمن هیچ ناترسم لە ڕۆژی کوشتن و باسی سەر و دڵ هێشانی.

١٣٢

ئەوە پووڵی کابرای ناردەوە تەواو. بۆ ڕاخەر و بۆ پۆشاک پووڵی بۆ بەڕێ کردن. کوتی: ئەمن بەو جۆرەی ناتوانم بچمەوە کن دایک و بابم. فەتحە بەگ ناردی کەیخودا و ڕدێن سپی هاتن. سەعید دە شەو لە ماڵە فەتحە بەگی دزەی دۆڵێ بوو. فەتحە بەگ لە تایەفەی خان و خانی لەب زێڕین بوو. هیچ کەس نەیدەزانی ئەگەر سەعید هاتۆتەوە. کەس خەبەردار نەبوو. کابرا خانووەکەی چۆل کرد دەستبەجێ، کوتی: دەبێ بێنەوە خانووی خۆتان. بردیاننەوە خانووی خۆیان. کەس باسی سەعیدی لە کن نەکردن. بابەکەی شەوێ ئەوە بە ژنەکەی گوت، کوتی:
چییە؟ لە دونیایەدا چ قەوماوە؟
ئەو چاکەیە لەگەڵ من و تۆ کراوە
عەجایب ماوم خەڵکی ئەو زەمانە نییانە ئەو غیرەت و هەنگاوە
خۆ ڕۆژی قیامەت نییە، کەس نەیگوت: ڕۆژ گەڕاوە
ئەدی بۆ کەس نالێ: مەعمووری باری تەعالا، مەنسووری هەللاجە و کێو پەڕە کراوە

لە کەسم نەبیستووە بڵێ: ئیسرافیل نەفخی سووری لێ داوە
لە کەسم نەبیستووە بڵێن: ئاخری زەمانە و خودا دنیای تێک داوە
کێ ئەو ئیسراحەتی و بەشارەتی و خۆشییەی بەسەری پیری بۆ ئێمە داناوە؟
ئەوە ژنەکەی جوابی دەداتەوە، دەڵێ:
وەکو من تێی بگەم، سوێندت بۆ دەخۆم بەخودای عەرز و عاسمانێ
کەس لە دنیایەدا نییە ئەگەر وا ماڵ و بژیوە بۆ من و تۆ دانێ
بمانخاتەوە سەر ئیسراحەت و ژیانی ساڵی ساڵانێ
ئەمن خەونم دیوە، ئەگەر بێتو تۆ لێم وەرگری و بەو قسەیە بزانێ
خاترجەم بە میوەی بەهەشت، ڕۆڵەکەی بەردلانم، هاتۆتەوە خاکی ئێرانێ
دەنا هیچ کەس نەبوو بڵێ: ئەوانە بۆچی دەربەدەرن، سەرگەردانن،
ماونەتەوە لە کووچە و کۆڵانێ
ئەو کارە زۆری پێ دادەوێ، یەکجار بەعینوان و شەرتە
بۆنی سەعیدیم لەبەر دەماری دێ، پێم وایە ئەوە کاری شێری زەردە
دەنا لە دڵی پیاوی لاناچێ بەبێگانە ئەو خەم و پەرێشانی و دەردە.
ڕێ و وشوێنی وا بۆ دامەزراندن، ئەگەر سێسەد سواریان لێ دابەزێ بەخەیاڵیان دانەیە.

١٣٣

جا سەعید بەفەتحە بەگی گوت: دەوران دەورانە، هەر دەمەی دەوری خۆی دیارە
دەبێ ئەتۆ بۆ من ساز کەی بەحیساب و بەژمارە
با نەڵێن: سەعید کابرایەکی شەرمەزار و بێ کارە و بێ چارە
دەبێ لەگەڵ ئەمن بێ سەد پیادە و سوارە
تا بچمەوە کن ئەو بابە پیرەی ئیختیارە.
فەتحە بەگ دڵی سەعید ناتوانێ بشکێنێ
ئەوە سواری ساز کردن، هەمووی ڕەخت[٥١] بۆ سنگی ولاغی دێنێ
هەمووی شێرنە سەر و سواری و تەنگ و پشتێنێ

هەمووی قاقوم و خەز بەسەر شانیدا دێنێ
حوکمی فەتحە بەگە، ئەگەر بۆ خۆشی هێندەی سوار نەبێ، ئازایە
ڕەشیدە، لەبەر حورمەتی سەعید لە ورمێوە خەڵکی دێنێ
بەجورێک ئەو سوارانە ساز دەکا و دەیان ڕازێنێ.
سوارەی ساز کردن، ڕاوەستاون تاق و جووت
دەتگوت ئەو ڕۆژەیە ئەگەر ڕۆستەم دەچووە سەر بەحری کاسە ڕوود.
ئەوە حەوت سوار پێشەکی ڕۆیین، خەبەریان دا کوتیان: فەتحە بەگو لێ
میوانە. دایکەکەشی هەر دەیگوت: بۆنی سەعیدی دێ
ئەهلی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ دەیانگوت: کۆمەگ بەعەزیز بەگ بکەین، پیرە و ئیختیارە
خزمەتی پێ ناکرێ ئەگەر میوانی ببێ سەد سوارە
فەتحە بەگ پیاوێکی ڕەشید و دەستڕۆیی و جگەردارە
لە مەملەکەتی ئێمەدا نێوی لە هەموو عالەم ڕا دیارە.
ئەوە شەک و بەرخ و جووانەگا، ئەگەر وایان زانی
ڕایان دەگرت بۆ و ڕۆژەی کە سواران دێن بەمیوانی.
کووچە ئاو پرژێن کراون، خەڵکی هەر چاوەڕێیە
فەتحە بەگ زۆر دەستڕۆییوە و حوکمی پادشای ئێرانی پێیە
با لێی خەجاڵەت نەبین، بزانین کاری بە کێیە؟
ولاغان زین کەن، لەگەڵمان نەبێ کوڕ و کاڵە
وەختی حورمەت و بەپیرەوە چوون و ئیستیقباڵە.

١٣٤

ئەوە خۆیان ساز کرد بەپیرییەوە بێن. فەتحە بەگ بە سەعیدی گوت: دەبێ ئەتۆ وە پێش کەوی. سەعید پیاوێکی دڕودار بوو، خەڵک لێی دەترسان. چومکی کەسیش پیاوی وای نەدیبوو لە ئێرانێدا بەو تەدارەکەوە. سەعید دەیگوت:

لە دڵێ من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە و چەندی لە هاوار هاوارە

ئەمن خێرێکی زۆرم بۆ تۆ کرد و بەتۆم هەیە متمانە و ئیعتیبارە
هەوەڵین پشت و پەنای خۆم هاویشتە بەر ئەو پادشای ئەگەر پەروەردگارە
دوایە تەمەنام بۆ بکە، چاکە لە تۆ دەزانم، ئەرێ پەردەکەی پیر سوارە
مەخسوودم حاسڵ بێ، لێم وەرنەگەڕێ و لێم تێک نەچێ کاروبار و شەرت و قەرارە
خۆ من دڵم زۆر لە هێش و لە ژانە، تێی دا دایسێ ئاگر و نارە
کەسێک نمەکی خەڵکی لە دەست بدا، لە دنیایە ڕووسیایە، لە قیامەت شەرمەزارە
ئەگەر من هەمە دەستڕۆیوی و قسە لە پێشی و ئیختیارە
ئەوە لە میر سێوەدین بەگە، ئەو ئاغای چەلەنگ و بەڕێوشوێن و بەئیعتیبارە
هەتا دەچمەوە خوداوەندی میری مەزن بەدووری کا لە بەڵا و لە گێچەڵ و لە ئازارە
چومکە دنیا بۆ پیاوی سەدەمەیە و، کەس بەکاری خودا ناباتەوە چارە
ئاغای من خۆش زمان و خۆش ئەخلاق و خۆش ڕفتارە
ئاخ چاوم پێی بکەوتایەتەوە. هەر جارێکە و ئەو جارە
هەچ جارێکی ئەگەر ڕکێفی بۆ بۆرە دادەهێناوە، گلی لە پاشووی دەردەپەڕی بەتەغار و بەخوڵوارە
ئاڵەتی جەنگی ئەوبەر ئەوبەر کردووە، دەڵێی ئیجازەی لە لۆهراسپ وەرگرتووە و ئەسفەندیارە
ڕەبی سەعید بەدوور بی لە چاوی بەد و لە قسەی خەڵکی و دوژمن پێت نەبەنەوە زەفەر و چارە.
دەڕۆیی و دەگەڕاوە سەر عالەم، وڵاغەکەی هێند توند بوو کەس دەگەڵی دەرنەچوو. خەبەریان زانی تەرگەوەڕی و مەرگەوەڕی، ساباتیان دروست کردبوو لە ڕێگایە؛ بۆ فەتحە بەگ بوو، کەس جارێ نەیدەزانی ئەگەر سەعیدی لەگەڵە.
دۆست تا دوژمن ئەگەر سەعیدیان دەدی بەو تەرتیبە و بەو ئەرکانە
دۆست پێی خۆشحاڵ دەبوو، دوژمن بیناهی نەدەما لە چاوانە
بۆرە وڵاغێکە لە ئێرانێدا بەنێو و نیشانە
هێندێک دەیانگوت: هەڵۆیە! هێندێکیش دەیانگوت: نەخێر، تەڕلانە

ئیدی ئەو قسەیەیان نەکرد بە غایب و بە پونهانە
ئەوە چل سوار دەڕۆین، خەبەریان دەدا بە دایک و بابانە:
سەعید هاتەوە، سوارەی دەگەڵن ئەو بەرەوبەرە
لە پاشی دەڕۆن چەند ئاغا و چەند نۆکەرە
فەتحە بەگ بێ رووحە و دەستەونەزەرە.

ئەوە خەبەریان دانێ. دایک و بابەکەی لە خۆشییان حاڵەت گرتنی، جەزم بوون، وەخت بوو لە خۆشییان شاگەشکە و شادی مەرگ بن. بە جارێک خەڵکی دارژانێ. جا ئەوە سەعید وە سەرکەوت بۆ ماڵە بابی.

جا بابی دەگریا و دایکی خۆی ڕادەژێنێ
ڕۆڵە! جەرگمان نەماوە و خوێن دەدەڵێنێ
ئەو کەسی لە پێشدا مزگێنی بۆ ئێمە دێنێ
هەچی لە دڵی دایە، بێ و لێمان بستێنێ.

ئەوە خەبەر بەتەواوی خزم و کەس و کار درا . هەموو کەس خەبەری زانی. وای لێ هات ماڵە بابی سەعید وەک سەحرای مەحشەر. گەورەی عەسر و کەیخودا و ئاغا و ئەمیر لە ئاراڕات و لە سۆما و برادۆست و لە هەنارێوە ئەوە هاتن بەسەعیدییەوە.

هێندێک دەیانگوت: مردووە! هێندێک دەیانگوت: ماوە
هێندێک دەیانگوت: حەیفە بۆو پیاوە شوجاعە، بۆ ئەو پیاوە
خرمەی ئاوزەنگی و دەنگی ڕکێفی لە ئێرانێ نەماوە.
نەتەوییان دەیانگوت: چا بوو، ئێمە عەمری سەعیدمان ناوێ
ڕەبی وە سەر دڵی کەوتبێ تیری غایب و لە نەکاوێ
ئەگەر سوار دەبوو لە وڵاغ و دەکەوتەوە شەڕ و لەشکری دەکردەوە بڵاوە
دەتگوت وەحشییە و خودا بەشی وی ترس نەداوە
ئەوەتی سەعید بووە لە هیچ کەس نەترساوە
ئەلحەملای بێ شوێنە و بەتلاوە و نەماوە

چل شەو سەعید لە ماڵە بابی بوو؛ فەتحە بەگ و هێندێک لەوێ بوون. ئەوی دەچۆوە لە ماڵێوە دیاری و شەک و ئەسپابی پێوە دەنارد. دایک و بابەکەی ئەگەر سی سەریان نان خۆر و خێزان بایە هەتا حەو ساڵ پێی بەرێ دەچوون. بەشی حەو ساڵ دیارییان بۆ هاتبوو. جا لە چل شەوەیدا لە سەعیدیان پرسی، کوتیان: ئەتۆ ون بووی، ڕێ و و شوێنی تۆ لە گەرمێنێ چۆن بووە بۆمان ڕۆن کەوە. سەعید کوتی:

برادەر! خودا دنیای وا داناوە

گەلێک کەس بەدبەخت دەبێ و دەڵێن: لەسەر پشتی ڕکێفێ فرێ دراوە

گەلێک کەس وێی دەکەوێ تیری غایب و لە نەکاوە

خۆ من نەهاتوومەوە لە ئێرانێ بمێنمەوە و لە نێو دۆست و خزمی خۆم ببینم کام و کاوە

میر سێوەدین بەگ ئاغای منە، ئیختیار و حوکم و ڕێوشوێن و زیندەگانی بەمن داوە

ئەو کەسی ئەمەگی خەڵکی لە چاودا نەبێ، زەلیل بێ، ڕووناکایی ببڕێ لە چاوە

قسەی ڕاستی: ئەمن بەئامانەتی هاتوومەوە، دەزگیرانی شۆخ و شەنگم بەجێ ماوە

ئەویش هیچ نییە، قەول و قەراری پیاوەتی و بەئەسەحیم بە ئاغایەکە بەئیعتیبار داوە

ئاوری دایک و بابان زۆری بۆ دڵی من هێناوە

دەنا ئاغای من لە حوکمدا، دەگەڵ سوڵتانی ڕۆمێ سێوێکن لەت کراوە

ئەمن هاتمەوە ڕێوشوێن بۆ دایک و بابم دابمەزرێنم، سەرانسوێی و چاوەدێری و ئاگا لێبوونی ئەوانم وە دەست خزم و قەوم و قاشان(٥٢) داوە

تازە هەتا بمینن مەعتەل نابن بۆ پووڵ و پارە و زێڕ و دراوە

ئەمن لەسەر سەفەرم، دەڕۆمەوە، چون شەرت و شوێن و قەرارم داناوە

لە دڵی من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە و چەندی لە هالاوە

ئەلعان لە من وایە لە بەحرێ دام و سەعید لەسەر تەختە پارێک ماوە

ڕووناکاییم بۆ نییە، دەڵێی دڵم حەفس کراوە
کەسێک بەزمان درۆزن دەرچێ، ڕەبی وێی کەوێ تیری لە غایب و لە نەکاوە
ئەمن هەتا سێ ڕۆژی دی، مەگەر خەبەردار بن، بڵێن:
مەلەکەلەوتی عاسمانێ قەزای گیان کێشانی بۆ سەعید هێناوە
دەنا ڕێ و و شوێنی خۆم دامەزراندووە، خودا حافیز، دەگەڕێمەوە دوواوە.
جا ئەوە سەعید دەگەڕێتەوە.
ئەوە سەعید لە خۆی دەداوە تانووت و حونەرێ
دەسکی خەنجەری پازاری شینە و دەستی داویشتەوە سەر گۆیە خەنجەرێ
دەیگوت: وڵاغی نەدیوی بەحری گوێ مەقەستم بۆ بێننە دەرێ
پیاو، بەدەست خۆی نییە، نازانێ لە دنیایەدا تا دەمرێ دا خوڵا چی بەسەرێ.
لە دای و بابانم وەرگرتووە ئازادییە
دایکم پێی کوتووم: حەڵاڵت بێ شیرێکە سپییە
بابم کوتی: ئازاد بە! هیچ ئەمەگم لەسەر تۆ نییە
خودا حافیز! کاری دیکەم لە مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ نییە.

١٣٦

ماڵە کا حەسەنی دزەیی ئەو غەرەزەیان لە سەعیدی هەڵگرت، کوتیان: ئەوە کابرایەکی یاغییە. هەچ فەسڵێکی ئەگەر هاتەوە، ئەو کابرایە دەبێ بکوژرێ. جا ڕێوشوێنی خۆیان دامەزراند، کوتیان:
خوێنی خۆمانی لێ دەستێنینەوە.
ئیدی لازم ناکا ئەو گوفتوگۆیە
لە باڵەکان ڕا قەرە سۆران گرتوویەتی هەتا دەچێتەوە دۆڵی هەڵشۆیە
ئەگەر سەعید بزانی، ئەوە هەمووی قاتڵی ڕووحی تۆیە
هەچی پیاوی ڕەشید و یەکان یەکانی
هەمووی چاوەڕێن، گیراون کێو و شاخانی
ڕێگا نییە کەسی پێدا بڕوا تا دەچێتەوە وڵاتی شارەبانی

سەعید دەهات هەتا دەگەیشتەوە سەرحەدی گەرمێن و کوێستانی

ڕەشماڵ و چادر و چیغێکی زۆر هەڵدرابوو، ئەوە سمایل عوزێرین، سەعید دەچووە کن وان بەمیوانی

چومکی دەبێ شارباژێر بفرۆشی، بیدەیەوە لە قیمەتی ئەسپ و ناڵ و ڕمبی نێوشانی

دەستبەجێ پیاوی تێگەیشتوو، چون لە عیراقێ ئەو قسەیان بیستبوو، دەیان زانی

کوتیان: پیاو نابێ غەیانەت بکا دەگەڵ میوانی

ئەوە بێ خەبەرە کابرای کوێستانی، با بۆی ئاشکرا کەین قسەی مەخفی و نیانی.

پێیان گوت: براله! لە حەریرێوە هەتا دێتەوە وڵاتی باڵەک و خۆشناوە

سەرحەد هەمووی قەرەوڵ و تەتەر و لەشکری لێ ڕاوەستاوە

کا حەسەنی دزە چەند کەسی لێ هەڵدێردراوە و لێ کوژراوە

ئەو نێوونیشانەی ئەگەر کوتوویانە، دەڵێ: کابرایەک سواربووە، لاقی لە ئاوزەنگی ناوە

شێرە، بەهیچ کەسی بەرناگیرێ و بەکەسی بەر نەگیراوە

بەو نێو و نیشانە ئەتۆی، دەنا کەسێکی دیکەمان نەدیوە وا ئازا و ڕەشید بێ، بەعومری خودای وا خوڵقاوە

ئەو ئەسپەی ئەگەر تۆی سواری بووی، کەس نەدیوە؛ بابیش بۆ کوڕی نەگێڕاوە

بەڕۆژێک دەڵێن: ڕێی حەوت ڕۆژ دەڕوا، تەنافی عەرزی بۆ کێشراوە

باسکی پیاوەتیت لەنگ نەبێ! دایک ڕۆ ڕۆت بۆ نەکا و دەستی نەگرێ بەهەناوە

با ئێمە خەبەرێکت بدەینێ، با بەڵەد بی، چەند کەس بەنابەڵەدی سەری لێ شێواوە

سێ سەت ئاڵەتی جەنگیت ڕاست و چەپ لە خوانی زینی داوە

وشیار بە! نەبادا ڕێگات پێ بگرن لە نەکاوە

مەنزوورمان هیچ نییە لەو قسەیەدا، خۆ ئێمە چمان پێ نەبڕاوە

ئەمما حەیفە پیاوی ئازا لە دنیایە کەم بن، ڕەبی لێت نەکوژێتەوە نیشانە و ناوە.

پێیان گوت، کوتیان: لە شارەبانەوە هەتا دەچێتە دەشتی حەریرێ

ئەوە جوکلی هەمەوەند و سمێڵ سپی کامەری و کا حەسەنی دزە و عاشیرەتی

گەرمێنێ ڕێگایان لێ گرتووی.

مەچۆ دۆڵی هەڵشۆیە

جوکلی هەمەوەند لە عەمری حەفدە ساڵەیاندا، هیچ کەس لێیان ناباتەوە گرۆیە

ئەگەر نێو چاوانیان تێک نا و کەچیان کرد برۆیە

هەڕۆ، بڕۆ. ڕەبی دایک بۆت نەکا ڕۆ ڕۆیە

دایک بۆت دانەنیشێ بە دەردەداری و بە دڵ بریندار و بە دەستەوئەژنۆیە

سێ سەد سوار لەسەر ڕێگات ڕاوەستاون، پاکی خاترجەم بە قاتڵی تۆیە

سەعید دەیگوت: دڵی من زۆر لە هێشە و لە ژانە. ڕاناوەستێ لەبەر ئەوی بڵێسە دان و ناسەوری

ئەمن باوەڕیم هەیە هیچ پێشاتێک بەبێ قەڵەمی هەق دەستی ئیلاهی نایە و ڕانابری

ئەوی خودا نەیکوژێ، بەبێ ئەجەل خاترجەم بە نامری

کەسێک نەمرێ، ئەو قسەیە لە نێو عاشیرەتاندا دێتو ڕادەبری

کۆتر قەت نەبۆتە ئاواڵی سەقری

سەقر دڕندەیە، خاترجەم بە کۆتر دەگری

ئەمن ڕێگای خۆم داوێژمەوە پێشی کوێستانان، سەری هەوار خدری

جا کەسێکی ئازایە بێ ڕێگا بە سەعیدی بگری

سەعید وەکو شێر هەتا بانگی شەوان دەیگرتەوە سانە

دەیگوت: سەفەری شەوێ خۆشە، شەو قەلای مێردانە

شەوێ خۆشە بڵێسەی تیر و شیر هەڵکێشانە

نازانم بەو پێشاتەی ئەگەر خودای تەعالا لەسەر شانی منەی دانا.

١٣٧

هەتیوێکی خوێڕی کە سەعیدی لە ڕێگایە دیبوو، هات خەبەری بەقەرەوڵان دا، کوتی:

بۆ وا دنیاو لێ شێواوە؟

بۆچی شان و ملی خۆتان له قوڕێ ناوه؟
گەورە گەورە و پەڕ بەسەر و لێ هەڵدێردراوە و لێ کوژراوە
کابرای قاتڵو خوێنه خوا له ئیرانێ گەڕاوە دواوە
ئەو ولاغی ساحێب تاریف ئەلعانیش هەر له بنیدا ماوە
به هەر کەسێک قەرزدار بێ، ئەوە قەرزەکەی بۆ هێناوە
ئیدی کەم بێن و بچن، کەم سوار ئەو بەرە و بەر ڕابرێ
کەم تەگبیر و مەسڵەحەتی به خۆڕایی بکرێ
بەهەچ کەس قەرزدارە، بچێ قەرزی خۆی لێ وەربگرێ
ئەگەرچی پێشم وایه به کەم کەس دەکرێ
بۆچی کابرا ئەگەر بێتو ڕاببرێ
خاترجەم به دەست نادا، کوشت و کوشتارێکی زۆر دەکرێ.
هەتیو کوتی: سەعید دێ و بێرەدا دەڕوا.
تا گەیشتە وێ، پێم وایه سێ سەعاتی شەو ماوە
وەکو ئاسک ئەوان لێیان دابەخشێوە ڕاوە
پاکی حازرە تیری، له ماڵی کەوانی ڕاست و چەپ ڕۆناوە
پاکی بۆستەی خەنجەری دەمرەشی قەتڵکەری ترازاوە
هەموو چاوەڕێن، وەکو ڕەشمار گەردنیان هەڵێناوە
بڵێی بەقەت بێژینگێک عەرز دیار نییە، ڕێگا هەمووی گیراوە
هەچ کەسێکی ئەو کابرایە بکوژێ، بڵێن تیری بێ ڕوحمی له جەرگی داوە
ئێمە دەیدەینێ قەباڵەی حەوت دێ، له دەشتی حەریر و له وڵاتەکەی خۆشناوە.
ئەوە سەعید بەسەریان داهات.
دەنگیان دا: چ کارەی؟ چ کەسی؟ شێتی پەتیارەی عەوام
بێ عاقڵی دێوانەی عاقڵ خام
له خەڵکیت هەراسان کردووە خەو سوبح و ئێوارێ هەتا شام
نەچی خۆت هەڵبدەیەوە له مەملەکەتی خۆت، بڵێی: ئەمن به

فەتح و نوسرەت و پەڕ بەسەری ژیام
بە ئەندازێکت لە بەدەنی بکەین برین و زام
سەعید کوتی: بمناسن، ئەمن گۆڵی دێڵەبەبام!
هەچ کەس ڕێ بەسەعید بگرێ، بەخۆی بڵێ:« کوژرام»
غەڵبە غەڵبە، بڵێسەی تیرە لە هەموو بەندەن و کەنارێ
تیر وەکو تەرزەی بەهارێ بڵێسەی دێتو دەبارێ
حەیوانە کێوی پێیان نەماوە ئیسرِاحەت و هۆش و قەرارێ.
سەعید غەدەنگی پیاوکوژی لە ماڵی کەوانی داناوە
لە بۆری توند دەکرد ڕکێف و چاکی دەکێشا لغاوە
دەیگوت: پووڵێکی زۆرم بەتۆ داوە
ئەو پووڵەم بۆیە بە تۆ دا بۆ ڕۆژێکی غەڵەبایی و بڵێن: سەعید لێی قەوماوە
تاقە سوارێک بە سێ سەد کەس ڕێی لێ گیراوە
لە پێشەوە لەبەر بڵێسەی غەدەنگی سەعید زەهلەیان دەچوو، ڕێگایان بۆ بەرداوە
لە پشتەوە هەچ جارێکی ئەگەر ئاوڕی دەداوە
قیلە و قاج تیرەندازی دەکرد و دەنگی غەدەنگ و سەدای بڵێسەی گەروەشین دەبۆوە بڵاوە
هێندێک دەڵێن: ڕۆژی حەشرە و هێندێک دەڵێن: عاسمان ڕووخاوە
هێندێک دەڵێن: دەوڵەتی ڕۆم و فەرەنگستان هێرشیان بۆ یەکتری هێناوە
ئەگە دەنگی بۆری دەدا هێند بەتاقەت و حەرەکەتە، سینگی لە هەچ کەسێکی دەداوە
مەلەکەلەوتی عاسمانی لەسەر حازرە، وا بزانە ڕوحی کێشاوە
لەشکر دادڕ دادڕ بوو، چۆن لێک دوور بوون و شەو بوو، پیاوی بێ زەهلە پێی شل دەبوو هەنگاوە
دەیگوت: ئەمن خۆم بۆ بەکوژ بدەم؟ خۆ ئەمن چ برام نەکوژراوە
بەخودای عیلاجی بەکەس ناکرێ، کێ دیویە بڵێن: سێڵاو بەری بەپێمەرە گیراوە

پیاوی بەغیرەت لەبەر بلێسەی تیران نەی ماوە هێز و تاقەتی چاوە
کەسێکی خولا نەیکوژێ، هەر دەژی، دەڵێن ماوە
بۆ نوێژی سبحەینێ، بەقەوەی ولاغی شێر خەزاڵی، سەعید سێ مەنزڵ خەڵکی وەبەر داوە
لەشکریش، زانییان چییان لەگەڵی پێ ناکرێ؛ شکستەی لەشکر یەک یەک و دوو دوو گەڕاوە
ڕۆ ڕۆیە، گریانە، تابووتیان هێناوە
هەر مەیتە لە سەحرایە دەگەڕێ، بۆیان هیناون تابووت و کەژاوە
خانم و خاتوونان پاکی کەزیەیان بڕاوە، خۆیان دە خمی ناوە
هێندێک کەس دەیانگوت: کەس نەیدیوە بڕوا ئەو دوژمنە، پێم وایە کوژراوە
بزانن کەلاکی لە چ بودڕێک، لە چ بن بەردێک بەجێ ماوە
ئیدی نەیان دەزانی سەعید لە بەروبۆی دوژمندا نەماوە.
ئەوە ڕۆیی، لە دوژمن تێ کشا، لە دەست دوژمن چووە دەرێ. جا ئەو جار دەیگوت:
پەنام وە تۆ ئەی باری تەعالوڵلایە
ئەوە قودرەتی تۆیە، قەبوڵم بووە دوعا و تەمەننایە
سێ سەد سوار لە شەوگوردی من ئەگەر نایە.
ئەوە وەختێکە ڕۆژ لە بورجی مونەووەر دەهاتە دەرە
سەعید تەماشای تیر و کەوان و پەیکانی دەکرد دەگەڵ خەنجەرە
ئاڵەتی جەنگی ڕاوەستان، دەڵێی عەمر بەرە، دەڵێی نۆکەرە
چومکە لە نێو سێ سەت سواردا شێوا بوو، هۆشی دەهاتەوە بەرە.
سەعید مەنزڵ بە مەنزڵ بە شەو و بە ڕۆژ بە بۆری کلک بەژەنگاری نەدەگرتەوە قەرارە
دەیگوت: کەسێکی لە دونیایەدا بێ قەول بێ و بشکێنێ ئیعتیبارە
لە دنیایە ڕووسیایە، لە کن خودای شەرمەزارە
زوو بگەیشتمایەتەوە ئاغایە چەلەنگ و بەئیعتیبارە.
ئەوە لە گوزەری وان دەرچوو.

میـر سێـوەدین بەگ هات لە مووسـڵێ میـوان بوو. کابـرای تاجر شـەوێ هات بۆ مولاقاتی. ئەگەر هات، پرسیاری کرد:

ئاغای موعتەبەری سوڵتان سەلیم داخولا لە مەنزڵێ ماوە؟

هەشتا نۆکەری خەنجەریان دەسک پازارە ئەوبەر ئەوبەر ڕاوەستاوە

هەمووی تورمە پۆشە، کەوڵی قاقومی غەزی بە سەر شانی داداوە

دەیانگوت: بابم! چ کارت بەئاغای میر سێوەدین بەگە؟ مەجلیس گەرمە، دوو سەد کەسی بەگلەربەگی و پەڕ بەسەر و یەکە یەکە لە مەجلیسێ داناوە

مەعلووم نییە ڕێگای تۆ ببێ، بۆ تۆ ببێ ڕوخسەت و هەنگاوە

تاجر دە خەیاڵی ئەوەدا بوو، دوو قەدەم بەرەو پاش گەڕاوە

ئاغای میـر سێـوەدیـن بەگ سـەری لە ڕقـومـی پەنجـەرەی حوکمـەت و ڕێی چاک و خراپ دەردەهێناوە

دەنگی تاجری دەدا و تاجر دەگەڕاوە

دەیگوت: ئیجـازەی بدەن، ڕوخسـەتی هەیە، لە دووم دەنـارد، چومکە کارم زۆر لە کن وی بەجێ ماوە.

ئەوە تاجر چووە ژوورێ.

تاجر بە عەدەب وەزیفەی خۆی بەجێ هێناوە

لە مەجلیس و لە ئاغایەکە چەلەنگی دەکردەوە سلاوە

ئاغا، لە قابیلەتی مندا نەبوو، نەمزانی مەجلیس واگیراوە

مەجلیست هەر وا گەرم بێ، لە دونیایەدا نەتکوژێتەوە ئیسم و ناوە

دەرەجەت بەرز بێ، چومکە هیچ کەس لە تۆ ناگرێتەوە ناحەزی و زاڵمی و کەست لە کن نەبۆتەوە نابوود و سەر لێشێواوە

میر سێوەدین بەگ ڕوخسەتی دەدا، سەندەڵێکیان بۆ تاجر دادەناوە.

ئەوە میر سێوەدین بەگ پرسیاری لە تاجر کرد، کوتی:

عەزیزی لە دڵم! دەوران دەورانە، هەر دەمێ دەوری خۆی دیارە

پیاو ئەگەر عاقڵی ببێ دەبێ بەدەور و زەمانە بکاتەوە ڕفتارە
پیاو دەبێ بەزەمانە عاقڵی بشکێت و پێی بباتەوە چارە
هەچ کەسێ لە ڕێگایەکەوە چاوەڕێیە و دڵی بریندارە
چ فەقیر بێ، چ عەبداڵ بێ، چ بڵێن: سەردارە و موختارە
هەر کەسێ لە دڵدا خەمێک قەراری گرتووە، چۆن قودرەتی کردگارە
کابرای کوێستانی ئەگەر لە کن ئەمن بوو، دابوومێ حوکمەت و سەری بڵندی و ئیختیارە
لە قەننەداری بڵندم کرد، کردمەوە بەخەزنەدارە
زۆرم دایە عەبو تۆپ و مەجیدی و ئەو زێڕی یەکە و ڕەواجی لە بیست و چوارە
خانم و خاتوونان زۆریان دایە دییانەت و دیاری و پووڵ و پارە
کچی فەتوڵلاخانی بەگلەربەگی، ئەگەر دایمە لە دوای دەڕوا دوو سەد پیادە و سوارە
ئەمن بەکوڕی خۆم دانا، لەوم کردووە نیکاح و مارە.
ئەو چاکەی من لەگەڵ ویم کرد، لەگەڵ هیچ کەس نەکراوە
گوڵخاتر و خونچێم لە بار بەهای وی داوە
خونچێ ئێستا نەژاکاوە، دەستی لە سنگ و بەرۆکی نەدراوە
گوڵخاتر قیمەتی بەتەواوی دەوڵەتان نابێتەوە تەواوە
کابرا بێ ئەمەگ بوو، وەعدەی حەوت ڕۆژ ماوە
پێم وایە، ئێران جێگایەکی خۆشە، بەد ئەمەگی کرد و ناگەڕێتەوە دواوە
خۆ من خەمی هیچم نییە، حاسیە خانی شل و مل و سایە گەردنی لێ مارە کراوە
خەمی ڕۆژی دوایەمە، لە دڵم بۆیە بووە بە ژان و هێش و بە کاوە کاوە
ئەو تاجر زۆر بەهۆش و بەفکر و عاقڵ و بەتەسکین جوابی میر سێوەدین بەگی دەداوە
دەیگوت: حەوت ڕۆژان لە مووسڵێ بوو، وەڵلاهی زۆر پیاوێکی مەرد و ڕەشید و توز(٥٣) پیاوە

بەموقەدەری هەق دەستی ئیلاهی، سەعید هاتوچۆی منی دەکرد، لە کن من دڵی دەحەساوە

لە مووسڵێدا بوو بەگاڵە گاڵ و ناڵە ناڵ و هاوار هاوار و قاوە قاوە

ئەگەر خەبەرمان زانی، گوارە و کرمەکی ئایشە خانمیان لە بازاڕی دەگێڕاوە

کەس قیمەتی پێ نەدەکرا، کەس ئەو پووڵەی پێ نەدەبوو تەواوە

ئاغایە چەلەنگ عومری درێژ بێ، خودا بیکا بەرقەرار و ڕاوەستاوە

چون ئەگەر پیاویشی سەخی بێ، هەر بۆ وی دەبێتەوە بەناوە

گوارە و کرمەکی ئایشە خانمی کڕی بەدوازدە هەزار زێڕی سکە لێدراوە

ئاما ئاغا ڕۆژێکی سبحەینێ بوو، تازە خەڵک بازاڕیان داناوە

سەعید لە منی دەکردەوە سڵاوە

وڵاغێکی کەحلانی کلک و یاڵ بەژەنگاریان بۆ بازاڕی دەهێناوە

سەعید تەماشای دەکرد و ئاهی ساردی لە دەروونی هەڵدەکێشا و ئاخی هەڵدەکێشاوە

دەیگوت: ئەمن کڕیاری ئەو وڵاغەم، هیچ کەس پێی لە ئاوزەنگی وڵاغی وا نەناوە.

چووینە کن کابرا، کوتمان: قیمەتی وڵاغت چییە؟

ئەگەر خەڵکی قیمەتیان لێ دەکرد، دەیگوت: بابم! ئەتۆ بچۆ بکڕە کەتە بارگینێکی کەم قیمەتییە

ئەتۆ قیمەتی ئەو ئەسپەت نییە

ئەو جوان و ئەسپی شێر خەزاڵییە

لە شەوگوردی هەموو کەسدا نییە

سەعید لێی پرسی: قیمەتی وڵاغت چییە؟

ئەویش دەیگوت: براله چ کەسی؟ ناتناسم بە شوناسییە

نازانم بە ئەسەحی نێو و نیشانت چییە

سەعید دەیگوت: ئەلعان لێرەم و بەڵام عەسڵم ئێرانییە

کابرا زۆری پێ خۆش بوو، دەچووە بن گوێ، دەیگوت: براله!

پێت بڵێم خەبەری بەڕاستی و بەئەسەحییە:

ئەو وڵاغە، عەسڵ دایکی قەباڵەداری عەڕەبییە
بابی خاترجەم بە وڵاغی بەحرییە
ئەوە بۆ من بەجێ ماوە بەمیراتییە
ناوێرم وە دەری خەم، هیچ کەس نەیدیوە و ئەمن دەترسم یان لێم بستێننەوە یان بێتە سەر ڕۆژی دزییە
لێم بکرە بەدزی و بەمەبخییە
ئەو وڵاغە بۆ من نابێ، لە شەوگەردی مندا نییە
وڵاغی وا خاترجەم بە لە ئێران و لە تووراندێ دا نییە
دەی فرۆشم، کەوتوومەوە سەر ڕۆژی سەغیربارییە.
سەعید دەیگوت: قسەت پکەوە ئیزهارە
بەچەندی دەدەی هەتا بۆت بژمێرم زێڕ و پووڵ و پارە
دەیگوت: ئاخری قیمەتی دووازدە هەزارە
ئالا و پێلاو پێدا[٥٤] نایەتەوە بەحیساب و کارە
بڵێی قەت کەمتری نادەم یەک تاقە پارە.
تاجر تەواو و کەماڵی بۆ گێڕاوە، کوتی:
ئاغای چەلەنگ! زەحمەتە ئەو پیاوە بشکێنێ قەول و قەرارە
یەگجار زۆر لە تۆ مەمنوون بوو، یەگجار لە هیمەتی تۆ منەتبارە
پیاوێکی یەگجار زۆر ئازا و ڕەشیدە، دەڵێی بەرامبەر بە ڕۆستەم ڕاوەستاوە ئەسفەندیارە
سەفەرەکەی زۆر دوورە، دەنا پیاوێکی زۆر زرینگ و وشیارە
پێم وایە یان سەری لە بەین دەچێ یان دەگەڕێتەوە، پیاوێکی ساحێب نامووس و ئیعتیبارە.
جا تاجر تەواوی سەرگوزەشتی بۆ گێڕاوە، کوتی: میوانی ئەو پیرێژنە بوو کە هەوەڵ جار لە مووسڵێ کاڵە و پێتاوی غەریبی لە ماڵە وان کردەوە.

میر سێوەدین بەگ کوتی: دوو خزمەتکارم دەوێ بڕوا ڕانەمێنێ
هەر بەو شەوە شاری مووسڵێ بشڵەقێنێ
پیرێژن لە خەوێ ڕابپەڕێنێ
قەبرغەم وە عەرزی دەکەوێ ئەگەر پیرێژنم بۆ بێنێ.
ئەوە چوون پیرێژنیان هێنا بۆ مەجلیسێ.
پیرێژن ئەگەر دیتی ئەو حاڵە
زمانی گیراوە و گەرووی تاڵە
چون ئەو فەقیرە و ئەو عەبداڵە.
لێیان پرسی بەهێدی و بەهێمنییە
ئەرێ دایە پیرەکەی سەر سپییە
بۆ عەبەساوی؟ ڕێگای ترسێ نییە
سووال و جوابێکت لێ دەکەین، جواب بدەوە بەڕاستی و بەئەسەحییە
ئەگەر درۆ بکەی، دەبینی نەهاتی و بەدبەختییە
ئەگەر ڕاستیش بڕۆی، بەختداری و ڕێگات تەڕەقییە.
جا پیرێژن پێی گوت، کوتی: ئاغا! من بێ قابیلەتم، پیرم، فەقیرم، قابیلەتی ئەوەم نییە
زۆرم پێگوت: ئەتۆ خەزنەداری میر سێوەدین بەگی و زاوای بەتایەفەی بەگلەر بەگییە
ڕۆڵەی خۆم ئەگەر ئیشتیات لە جێگای بڵند و بڵند پەروازییە
جێگای خاسە سی دەم شەتاوانە و چزیرەی بەحرییە
جێگای تۆ ماڵە والییە
چون خودا میر سێوەدین بەگی کردووە بە واسیدە و لەسەر شانی تۆی داناوە دەستی تەڕەقییە.
سەعید کوتی: داپیرە! عاقڵم لەسەرخۆمە، قسە ناپەڕێنم، بڵێن: نەخۆشم
پیاوێکی بەعاقڵ و فکر و هۆشم
ئەمن خۆم لێ ناگۆڕێ، هەمان کابرای شەربەت فرۆشم.

خۆم لێ نەگۆڕاوە، بڵێن: پیاوێکی مەزن و ڕابردووە
پێڵاوی غەریبیم لە ماڵە تۆ داکەندووە
وەکو دایکان ئەتۆ نسحەتی منت کردووە.
ئەتۆ بەمنت پیشان دا ڕێگا و ڕفتارە
ئەتۆ بووی بەواسیدە، ئەمنت خستە سەر کاروبارە
هەر وە دەزانم ئەو کابرایەم ئەگەر لە شانم دابوو مەشکێکی پێش سەدەفی عەسڵە بوڵغارە
هەقی ساحیب شەربەتم دەدا ئەگەر دەکەوتمە حیساب و ژومارە
بەحاڵە حاڵ ڕۆژێ بۆ من دەماوە سێ پارە
ئەمەگ و خزمەت و نسحەتی تۆ لەبەر چاوی من دیارە.
ئەویش تەواوی بۆ گێڕاوە. ئەوە میر نەختێک دڵی لە عەرزی کەوت، پێی خۆش بوو.

١٤٠

سبەینێک ئێستا زووە، بەیانە
مەجلیسی میری گیرا بەمیزان و شەرت و ئەرکانە
ئەوبەرە و بەر ئەوە سەندەڵییان دانا
میر لە کۆنە مووسڵێ لە ماڵە والی میوانە
بوو بەهەرا هەرا و جارکێشان و خەبەردانە
سەعیدیان چاو پێ کەوت، ئەوە خەبەری گەڕانەوەی سەعیدیان بۆ میری هێنا
میر کوتی: چومکە بەجێی هیناوە شەرت و قەرار و قەول و ئەرکانە
بەپیریەوە بچن، ئەوە هاتەوە شێری زەرد لە سەفەری خاکی ئێرانە.
سەعید سێ کەڕەتی تەعزیم دەکرد و سەری دەکردەوە لارە
دەیگوت: ئاغایەکە چەلەنگ ئەگەر نەمکاتەوە ئازا و ڕزگارە
تاوانبارم، لە ڕۆژی قیامەتیش نامهێ عیلاج و چارە
بەدەستی ئاغا بوو ئەمن دایک و بابم دەرهێنا لە ڕۆژە ڕەشی، دەیانگوت: بابت قەرزدارە

کا حەسەنی دزەیی ڕێگای پێ گرتم، چل و هەشت کەسی کوژراوە و بریندارە
لە ئێرانێ ساحیب دوژمن بووم لەسەر ڕوفیە خانم، هیچ کەس پێی نەبردم عیلاج و چارە
ئەوە بەحوکمی تۆ بوو، یەگجار زۆرت بەمن دابوو زێڕ و زێو و پووڵ و پارە
پیاوی فەقیر، درۆیە ئەگەر بڵێن: ڕەشیدە و ئازایە و جگەردارە
هەمیشە لە دنیایەدا سەر لەبەر و خەجاڵەتبارە
ئەوە هاتمەوە خزمەتی ئاغایە چەلەنگ بەشەرت و شوێن و ئیعتیبار و قەرارە.
جا نازانم پاداشتی چاکەت چلۆن بدەمەوە؟ پێویستە شەو و ڕۆژ حازری خزمەتت بم، بڵێن: سەعید خەریکی کەوش دانانە
یان خوێنی خۆم لە ڕێگای تۆدا بڕێژم، بەڵام بەخولای پێم نادرێتەوە ئەو چاکانە
ڕاوەستاو بی، دەست ڕۆییو بی، کوێر بن لە حاستی تۆ ئەو کەسانەی دەبن بەشوبر و شەیتانە
لێت ڕازی بێ ئەو خودایەی ئەگەر بە خەڵکی دەبەخشێ ئیمانە
ڕازی بوونی من لە تۆ مابەینی عەرز و عاسمانە.
ئەوە میریش بەخێر هاتنێکی زۆری کرد، خەریک بوو زۆر لە مووسڵێ بێ! بەڵام لە بەر خۆشی گەڕانەوەی سەعید، کوتی: ساز بن، دەچینەوە ناسرییە.

١٤١

میر سێوەدین بەگ حەوت کەسی بانگ دەکردن، پیاو ماقووڵ ، ئەوی قسەیان دەچێتە سەرێ
ئەوانە خەبەر بەرن بۆ ناسرییە و خەبەر بۆ ماڵێ بەرێ
هاتەوە ئەو سوارەی مەتڵەبمان بوو لە مەملەکەتی ئێران و لەوی گەورە سەفەرێ
بە حاسیە بڵێن، بەگلەربەگییە، سەری لە ڕقومی پەنجەران بێنێتە دەرێ
ئەمن زۆری لێ ڕازیم، بەقسەی کەسی نەکرد، قەراری خۆی بردە سەرێ
ئەو کەسەی مزگێنی دەبا، دەیدەنێ پووڵ و دراو لەگەڵ زێڕ و گەوهەرێ.
ئەوە پێش قەرەوڵ خەبەریان هێنا. میریش ئەوە سوار بوو، بۆ ماڵێ هاتەوە.

ئەگەر قاسید خەبەری هێنا، خۆشحاڵ بوون دۆست هەتا حەرەمخانە
دوژمن هاتۆتە سەر ڕۆژی مردن و پشت شکان و قوڕ پێوانە
خەڵک لە کووچە و دالان خەریکی عەتر و عەبیر و ئاوپڕژانە
هەم میر سێوەدین بەگ دێتەوە، گەورەی عەسر و زەمانە
هەم سەعید دێتەوە، خەزنەدارە، پیاوێکی فەسیح و چازانە
ئەوە میر سێوەدین بەگ ئەگەر سوار بوو شەقە دەهات لە ڕکێف
و ڕێکاب و زرینگە زرینگی ئاوزەنگییانە
دەڵیی ئەو ڕۆژەیە ئەگەر تێک چرژا بوون، شەڕی ئینگلیس و فەڕەنگییانە.
حاسیە گوشادی کردن ئەو دوو چاوە مەستە
زولفانی کرد بەقەرە سۆران، سەر سپییان پێیان گوت: کەمبەرەی ئاڵت توند لە پشتت مەبەستە.
حاسیە خۆی ڕازاندەوە. ئەوە میر سیوەدین بەگ هاتەوە.
دۆستان پێی خۆشحاڵ بوون و هەموو لە بەریان کرد بەرگی تازە
دوژمنان دەیانگوت: ئەو کابرایە ساحیر و سیحربازە

١٤٢

ولاغەکەیان کردە ئێختەرمە، پشتە ماڵێکیان[٥٥] پێ دادا، پشتی و نێرگزی[٥٦] و ملی و هەتا جونگەی گرت. شەیتانان بە سەعیدیان گوت: ساحیرە! جا کوتیان. چ فێڵێکی دەگەڵ بکەین لە پێش چاوی میری بخەین؟ ئەو کابرایە ساحیب ئێختیار بێ، ئەمە ناهێڵێ. وەسماناغا، جەعفەراغا، خاڵنداغا، هەموو لەسەر سەعید لە مەجلیسی میری دەر کرابوون.

جارچی جاڕی دەکێشا: ولاغێکی هێناوە، نەکەس ولاغی وای دیوە و نە لە بن ڕکێفی هیچ پادشایەک دایە. تاریفی ولاغەکەیان دەکرد خەڵک. ئەو کەسی میر ئاخوڕ بوو نێوی ئارەحمان بەگ بوو. مەیتەر نێوی شاڵی بەگ بوو. میر سێوەدین بەگ بۆ کارداری خۆی مەنسەبی وەردەگرت. جا میر شەوێ باسی ئەو ولاغەی کرد، کوتی: تاریفی ئەو ولاغە دەکەن، ئەگەر بەو ئەندازەیە چاک بێ، دیارییەکی چاکی بۆ

هێناوم. ئەمن ئێستا پڕ بەدڵ تەمەشام نەکردووە و ئیمتیحانم نەکردووە، دەڵێن : پیاو زۆر سوار چاک نەبێ، خۆی لەسەر پشتی ڕاناگرێ؛ هێندە گورج و توند و تۆڵ و بدەوە. وەکو دەڵێن، هیچ موباشیرێک بۆ پادشایان دیاری وای نەبردووە.

ڕەبی قەتت شل نەبێ هەنگاوە
چاکەی ئاغای خۆت تەواو و کەماڵ داوە
کەسێک بێ ئەمەگ نەبێ، چاکەی خەڵکی بڵێن لە بیر ماوە
ئەو ساحیب ئەرکانە، پەسندە، گەلێک پیاوە
دەڵێن: وڵاغێکی خاڵ خاڵی شمقاڕ ڕەنگی بۆ من هێناوە
بەمەنزڵێک دەڕوا حەوت مەنزڵی تەواوە
ناڵی زێڕە و وردە بزماری لێ داوە
شیرن ئاوزەنگی و دەست و پاشوو و لغاوە
دەڵێن: ئاسکی لە سەری فریاد و کوێستانان، بەحوکمی ئەو وڵاغە دەگەڕاوە
هەر کەس لە ئەندازەی شانی خۆی چاکەی پێ دەکرێ، ئەوە چاکەی منت داوە.
میر سێوەدین بەگ شانازی پێ کرد بەو وڵاغە، بەو دیارییە.

## ١٤٣

حەوت کەس، هەموو پیاوی گەورە گەورە، لە مەجلیسی میر سێوەدین بەگ دابوون. ماجبیان هەبوو، غایەتی لە قساندا نەبوون، لێ کەوتبوون. میر قەدەغەی قسەکردنی لەسەریان دانابوو، هەر تەنیا هاتوچۆی مەجلیسێیان دەکرد، هەقی قسە و تەگبیریان نەبوو. ئەو حەوت کەسە خڕبوونەوە لە جێگایەک ئەوێ شەوێ ئەگەر سەعید هاتبۆوە. کوتیان:

ئێمە ئەگەر وا دابنیشین ڕەبی نەژین و ڕوحمان ببێتەوە فانی
بێ قابیلەت بووین لە کن میر سێوەدین بەگ، ئەمیری حوکمڕانی
ئێمە ئەگەر قسە بکەین دەبێتە کەسری شانی
لە قسان ئەگەر هەڵبدەینێ، زۆر دەترسێین لەوەی ئەگەر بمان بڕێ زمانی
بێ کیفایەتی ئێمە دەزانی چییە؟ ئەگەر کەسێکی بزانی

کابرایەکی بێ کیفایەتی سیحربازی ئێرانی

چ تەگبیرێک بکەین ئەگەر نەژی، لە پێش چاوی میری بکەوێ،

بەدبەختی بەسەر دابێ و ڕوحی ببێ فانی؟

میر ئەگەر ڕووی لە کەسێک کرد کاری تەواوە

کچی بەگلەر بەگییانی بۆ وی هێناوە

ئێمە کیفایەتمان لە کن میری نەماوە

عومری خۆمان لە کن وی ڕابوارد بە ئەمینی، سەری خۆمان دانا لە پێناوە

ئاغای زەمانە پردە، ئەوڕۆکە لە ئێمە ڕووخاوە.

جا بابە تەگبیریان لێ کرد، کوتیان: کوڕە بەرتیل بەرد نەرم دەکا. بنێرین لە دووی ئاڕەحمان بەگ و شاڵی بەگ. لە دوویان ناردن کە بێن. ئەوانیش مەیتەرخانەیان بەمەیتەران ئەسپارد و هاتن. جا پێیان کوتن، کوتیان: براله! ئێمە خەڵکی ئەو مەملەکەتەین و بەو خاک و هەوایە ئێمە گەورە بووین؛ دەبێ لایەنگیری یەکتری بین، هەموو لایەکمان دەبێ ئاگامان لە یەکتری بێ، لەسەر زەرەرو زیانی یەکتری نەبین.

چاکە و خراپە دەڕوێ لە دنیایەدا، دەبێ شین

ئەلعان ئێمە لە کن میری بێ قسە و نوتقین، زۆر بێ قابیلەتین

هەزار وەرەقە لە دنیایەدا دەگۆڕێ، هەر دەمێنێتەوە خودا و عەرز و زەمین

جا بۆ ئێمە بەناڕەحەتی و تەڵخ ئەحواڵی بژین؟

قسێکمان هەیە بە مەخفی و بە نیانی

هەزار جار وەسمان بەگو ببێتەوە بەقوربانی نێو چاوانی

کارێ وا بکەین ئەگەر هیچ کەس بەسوڕی ئێمە نەزانی

دەرهەق بەکابرای خەزنەداری ئێرانی.

بەتەگبیری پاکمان کار چلۆن چاک دەبێ؟

ئەو کابرایە چۆن لە پێش چاوی میر سێوەدین بەگ سووک دەبێ؟

ئیختیاری لە کن ئاغایەکی دەست ڕۆییوو ساحیب ئیختیار کەم دەبێ؟

کارێکی وا بکەین خولا ئیقباڵی هەڵگرێ لەسەر شانێ

میر سێوەدین بەگ دەری بکا لە خەزنەخانێ
هێندەی بەدەمەوە داوە هیچ کەس بە پیاو نازانێ
بەڵکو میر لێی نەتەوی بێ، بێتەوە سەر ڕۆژی دڵهێشانێ
دەری بکا، وڵاتەکەمان خۆش دەبێ ئەگەر ئەو بچێتەوە ئێرانێ.
جا بەهەموویان تەگبیریان کرد، بەرتیلیان دا، بەرتیل بەرد نەرم دەکا.
ئارەحمان بەگ زۆر چازانە
بەتەگبیر قسێکی دانا
بەڕفتار دەڵێی شەیتانە
پیرێکی سەت ساڵانە
دەیگوت: میر ئەو وڵاغەی سەعید هێناویەتی زۆری لەبەر دڵانە
خاترجەمیش بن کەحلانە
لە نێو وڵاغاندا شا و ئەمیر و سوڵتانە
وڵاغی وا نییە لە مەیتەرخانە.
ئێمە کارێکی وا بکەین ئەو وڵاغە لە پێش چاوی میری بکەوێ
سبەینێ زوو دێ، چاوی پێی دەکەوێ.
ئەگەر لە پێش چاوی کەوت، چۆن پیاوێکی گەورەیە و نێو گەورەیە، دەڵێ: ئەتۆ چۆن نەتدەزانی ئەمن میر سێوەدین بەگم؟ بەبێ کیفایەتیت تەمەشا کردم ئەو وڵاغەت بۆ هێناوم.

جغەی بۆری هەمووی وەک نێزەی کەیکاوس ڕادەوەستا، هێندە وڵاغێکی قابیل بوو! ئارەحمان بەگ کوتی: ئێمە دارِوی تێ دەدەین تووکی لێ بێتەوە، وڵاغی بێ تووک ناحەز دەنوێنێ. پاش ئەوەی ئەمن دەرمانێک دەزانم، بەیتاڵم؛ سەت ساڵم عومرە. هەر لە مەیتەرخانە بووم؛ لە گوێچکەی دەدەین، گوێچکەی دەپووچێتەوە. دەرمانی فەنەی(؟) لە بەدەنی دەدەین، وەکو گورگێکی لە ڕەژی پکەوێ وای لێ دێ. کوتی: کارێکی وای لێ دەکەین لە پێش چاوی میری بکەوێ. وڵاغی وا ڕەنگ گڕوێ بێ لە قابیلی میر سێوەدین بەگیدا نییە. جا ئەو وەختی بە سەعیدی دەڵێ: چۆن ئەتۆ ئەوەت بۆ من هێناوە؟ لەسەر ئەوە دەربەدەر نەبێ قەت دەر بەدەر نابێ.

گامان گرووه هەر هەشکەکانی ماوە(٥٧)، هێندەمان نەماوە.

ئەو قاحبەبابە ئەو مەرکەبی قابیلی ناقیس کرد. یەکێک لە وان لە مەجلیسی میر سێوەدین بەگ بوو. میر سێوەدین بەگ کوتی: شاباز بەگ یەگجار زۆر سوار چاکە. سبحەینێ ولاغەکەی لە دەشتی خورمالغێ ئیمتیحان دەکەین. ولاغەکە لە دەشتی خورمالغێ بچێتە ئەو سەری و بێتەوە؛ کیفایەتە؛ ئیدی زیاتر ئیمتیحانێ ناوێ. ئەوێ شەوێ میر سێوەدین بەگ لە خۆشی ئەو ولاغە خەوی لێ نەدەکەوت؛ بۆ خۆشی چاکی نەدیبوو.

ئەوە چوو بۆ وانی گێڕاوە، کوتی: سبەینێ میر سێوەدین بەگ لە دەشتی خورمالغێ ئەسپەکەی ئیمتیحان دەکا. لە دە دووازدە جێگاوە بەند و سەرچاوەیان شکاند. چومکە ڕەڵم بوو ئاوەکەی هەڵدەمژی، کەس نەیزانی ئاوی لێ ندراوە.

١٤٤

سبەینێ ئەوە دەگیرا مەجلیسی میر سێوەدین بەگ وەک مەجلیسی شاهانە
قاوە و قەلیانی مەجلیسێیان دانا
میر کوتی: ئەوڕۆ دەستوبرد بکەن، وەختی ئیمتیحانە
بۆ من ولاغێک هاتووە، دەڵێن: زۆر کەحلان و تەڕلانە
بەختی من بڵندە، ئیشەڵڵا لە عاسمانە.
سەعید ئەو دیارییەی بۆ من هێناوە، زۆر لە کن من بەئیفتیخارە
تاریفی دەکەن ئی ناڵ و بزمار و سەقاو دەسکەوسارە
دەڵێن: گەردنی بڵندە، دەڵێی قەفی ڕەشمارە

با بچین بۆ تەمەشا کردنی ئەو ولاغە، چومکە گەورە گەورە و پیاو ماقووڵ لێم دەکەنەوە سووال و پرسیارە.

جا عەزیزەکەی شیرنم! بەلانی کەمەوە هەشتا کەس پیاوی گەورە گەورە و ساحێب خاک و ساحێب ئیختیاری عەسر لەگەڵ میری هاتن. ئاڕەحمان بەگ و شاڵی بەگیش «وەزیفەی» خۆیان بەجێ هێنا بوو. سەعیدیش بێ خەبەرە، چوزانێ؟ ماڵە میری بەئەمین زانی. شەوێ ولاغەکەی لەوێ بەجێ هێشت، نەی بردەوە مەزڵی خۆی.

هەشتا کەس پیاوی ساحیب نیشان ڕاوەستابوون ئەوبەرە و بەرە

هەموو لێی جوانە تەنگ و پشتێن و بەر و خەنجەرە

پاکی دەڵێی، ڕۆژی لێقەومانە و لەسەر سەفەرە

میر دەستبەجێ دای فەرمان و تانووت و حونەرە:

وڵاغی بەحری و کالک و یاڵ بەژەنگارم بۆ لە مەیتەرخانە بێننە دەرە

تا شاباز بەگ سواری بێ و بزانین بەدەشتی خورمالغێ دەباتەوە زەفەرە

ئەگەر هێنایانە دەرێ، پێستەیەک! دەم و لەوس ناحەز و گوێ هەڵقرچاو! ئەی ئەگەر دی عەجایەب ما، لەبەر میریش دەنگێ ناکا. ئەگەر بۆ دۆمانت ببردایە نەیان دەویست باری لێ بنێن. ئەگەر میر سێوەدین بەگ چاوی پێ کەوت، عاقڵی لە سەریدا نەما؛ بەو دوو قامکە ئیشارەتی سەعیدی کرد:

سەعید هەڵی گرت هەنگاوە

کوتی: ئەوە چ بووە و چ قەوماوە؟

بەڵکو ئەتۆ کوێرت ببوون هەرتک چاوە

لە ئێرانێ ڕا عەلامەتێکت بۆ من بە دیاری هێناوە

چۆن ئەبەوەت چاکەی من داوە؟

قەستەم بەوەی کەم ئەگەر پەروەردگارە

چومکە وات کردووە، وات پێک هێناوە ئەو کاروبارە

خاترجەم بە وەختی کوشتنتە، دەتدەمەوە لە سێدارە

با لە پاشت بەجێ بمێنێ خانمی شل و مل و ڕەشتی لارە.

چۆن ئەوە بەخزمەتت زانی!

بۆ منت هێناوە بارگینێکی بێ قابیلەتی شەش قڕانی

سواری وەی بم بچمەوە خزمەت خونکار و سوڵتانی؟

بەئە مبوری حیکمەت دەرت دێنم هەرتک چاوانی

لە دنیای ڕووناک ڕووحت دەکەمەوە فانی

چۆن بێ ئەمەگ ئەتۆ بەو کارە خراپەت نەزانی؟

وڵاغەکەش بەدەنی هیچی لێ نەهاتبوو، بێجگە لە تووکەکەی کە ناحەز ببوو.

سەعید دەستی لە سنگی دەدا و سێ هەنگاو پاشەوپاش دەگەڕاوە
دەیگوت: میر! پیاو کانێکی ئاوی لێ بخواتەوە، عەجایەب دەڵێن بەردی تێ خراوە؟
ئەو وڵاغە لەسەر تەرکیب و ڕەنگی خۆی نەماوە
سەرم سوورِ ماوە! کاری شەیتان و شۆفارانە، ئەو وڵاغە گۆڕاوە
وڵاغ دەتگوت تاوسە و سبحەینان چەتری داوە
نەتەویم زۆرن، ئەوە داڕوویان لە بەدەنی داوە
تووکی هەڵوەریوە و گوێی هەڵقرچاوە
بۆ دەنا ئەمن بێ عاقڵم؟ لە شانی میری ئەو وڵاغەم هێناوە.
میر لەگەڵم نەکا زۆری و ناهەقییە
دەسەڵاتدار بی! ڕقت بەرە دەرێ لە مابەینی هەرتک چاوییە
ئەتۆ بپرسە لە گەورە گەورەی هەمەوەند و دزەیی و کامەرییە
لە میللەتی سوورچی و زوراریە، لە هەرکی و لە باڵەکییە
ئەلعان هەمووی لەسەر داد و فیغانن، ئاورم بەرداون لە دڵییە
بۆچی هێندێک دەیانگوت: لەسەر عەرزییە و هێندێک دەیانگوت: بەباڵ دەفرِییە
ئەلعانیش بۆ خۆم خەجاڵەتم، لێم بۆتەوە بە ناگومانی و بە پەشیمانییە.
ئەما ئەمیر! خودا بتکاتەوە بەرقەرار و ڕاوەستاو و جگەردارە
ئیمتیحانێکم بکە، جا ئەو جار بمدە لە قەنارە و لە سێدارە.
خودا بڵندت بکا و خوێنی من بە تۆ حەڵاڵە.
چون هەقتە، ناڵێم: نا، هەقت نییە
شەیتانان چەتیان لە کارم داوە، بۆ منیان کردۆتە ڕۆژی نەهاتییە
تا بۆ من ببێتە نابوودی و باسی سەرییە
ئیمتیحانم کە بۆ ڕۆژی ئاخرەتییە.
میر لە ڕقان چاوی عەرزی نەدەدی، لێوی ئەتڵەسی بە ددانی گرت، جا کوتی:
سەت جارت دەکەم بەقوربانی پیاوێکی خوێرِییە

لەسەر شانت نیشت نەهاتی و بەدبەختیە
دانیشی دەستەو ئەژنۆ و بەکوێرییە
دەڵێی چی؟ مەتڵەبی ئیمتیحانت چییە؟
کوتی: ئاغا! پێنج و دوو ڕۆژێکە؛ ئەوە پشۆرێ، لە هەفتەیەکدا دەڵێن: تووکی هێناوە
لە دەشتی خورمالغێ ئیمتیحانم کە، ئەگەرچی ئاویان لێ ناوە
ئەو کەسانەی ئەگەر خەریکی وەن ئەمن بکەنەوە سووک و بەدناوە
ئەگەر لە دەشتی خورماڵغێ چووە ئەو سەری و گەڕاوە
هەر تووکەکەی خراپ بووە، ڕاپەڕین و باوی هەر ماوە
ئەو حەلە حازرم، مەمکوژە بەڵام هەرتک دەستم ببڕە تا تەواوی دونیا بڵێن: سەعید دەستی بڕاوە
نائەمین بە دەرکی ئاغای خۆی بووە ئەو عاقڵ ناتەواوە.

١٤٦

بەمیر سێوەدین بەگیان کوت، کوتیان: دەستوور بدە ئیمتیحانی کەن. ئەگەر بەیتاڵان سەرنجیان دایە و تەمەشایان کرد، داڕوویان تێ دابوو. میر کوتی: بیشۆن. شوشتیان. نەختێک کەسافەتی لەسەر لاچوو. ئەگەر دەیانگێڕا بەئەندازێک شۆخ بوو، چاوی دەتگوت گەلاوێژە و لە سامال و هەوری دایە. دەگەڵ ئەوەش کە تووکی وەراندبوو، کلکی دەتگوت بەیداغە. لە هەموو کەس دیار بوو کە فێڵیان لێ کردووە. کوتیان: با تاقی کەینەوە بزانین ڕۆین و هەڵاتنی چۆنە؟ بە شاباز بەگیان کوت: چونکە ئەتۆ سوار چاکی، سواری مەبە؛ هەر دەبێ سەعید بۆ خۆی سواری بێ. ئەو زینی بووی لێی کرد. ئەوە عالەم بۆ تەمەشایە ڕاوەستا. سەعید ئەگەر سوار بوو کوتی:
پەنام هەر بەتۆیە بینای تەوانگەر
تۆ بێ مەکانی، بێ یار و یاوەر
ڕوو زەردم نەکەی، قسەم پچتە سەر
لە کن دوژمنان نەبم سەرلەبەر

بۆ دنیا دەچێ ئەو باس و خەبەر
ئەمن ئاخر تازە بۆو دنیایە نابم
بێ بەختم نەکەی، لەسەر مرادم.
ئەگەر سوار بوو دوو سەری بۆرە دەگێڕاوە
هەچەندی ئەگەر ڕکێفی بۆ دەهێناوە
هێندێک دەیانگوت: ئاسکە و بێچووەی بەجێ ماوە
هێندێکیش دەیانگوت: هەڵۆیە و هێلانەی لێ ڕووخاوە
لە شەقەی لاقی، هەچەندی لە بەردی عەرزی دەداوە
وەک تیرەنداز تیر باوێژێ، پڕیشکەی ئاور لە عەرزی هەڵدەستاوە
دەیانگوت: وەڵڵا میر ئەو ولاغە تا ئێستا لە مەیتەرخانەی کەس نەکراوە
بە فێڵ و بە شەیتەنەت ئەو ولاغە گۆڕاوە.
جا کوتیان: لە دەشتی خورمالغێی بدە. سەعید کوتی: لێی نادەم
کوتی: میر شەهین و بازی هەیە، لە قەفەسدان بە حیمایەتییە
چەندی داعبای تیژ باڵ هەیە، سەقر لەگەڵ پۆڕی سپییە
وەردۆکی باڵ شین لەگەڵ خاسە سی لاجیوەردییە
ئەوانە بەربدەن، بازەوان لە گەڵیان بچێ لەبەر ئیمتیحانییە
ئەگەر بۆرە لە پێش دا چووە سەری مەیدانێ و گەڕاوە بەئەسەحییە
ئەوە دیارە ئەمن لە کن تۆ دانانیشم سەرلەبەر و بەبێ قابیلەتییە
چەند ڕدێن سپی لەگەڵ بچن بۆ ڕۆژی شاهیدییە
بزانین قەزا و قەدەری ئیلاهی لەسەر چییە
ئەوان دەگەڕێنەوە، ئیمتیحانیان کە لەگەڵ بۆرە، دیارە ئەوە باڵدار نییە
ولاغێکە دەڕوا بەسەر عەرزییە
ئەگەر باڵدار لە پێشدا هاتنەوە، ئەوە من سەرم ئی میرییە
ئەگەر بۆریش مەیدانی بردە سەرێ و لە پێشدا هاتەوە، دەبێ تەمبێیان کەی
ئەوانەی لەسەر کاری خراپن و لەسەر شەیتانییە

عەزازیل هەر ئەوەندەی کرد خودا غەزەبی لێ گرت و تۆقی عەزازیلی کەوتە سەر ملییە

ئەمن بەوەی نارەحەت نیم میر قسەی ناخۆشی پێ کوتم و پێی کردم بێ فەزیحەتییە

بەخولای بۆ خۆم ئەگەر هێناومە، ئێستا دەمگوت: ئەو ولاغە هەو نییە!

میر کوتی: قسەت زۆر زلە، قسەت لەسەر حاڵ و حالاتی خۆت نییە

ولاغ لە عەرزییە، چی ماوە بەسەر باڵداری عاسمانییە؟

قسەت بلاوە، چومکە رووحت لەسەر دەستییە

لە ئیمتیحان دەرنەچێ، حەزرەتی قابیز دێتە کنت بە میوانییە

کوتی: میرم مەزنە، پەڕ بەسەرە و جگەردارە

خودا بتکاتەوە ڕاوەستاو و بەرقەرارە

سەری منت بێتەوە بەقوربانی قانوون و عەداڵەت و ڕفتارە

ئەگەر من هەر نامێنم لە دونیایەدا، بۆم بەر بدەن باڵندە و باڵدارە

تا بزانین ئەمن چاک دەردەچم یان قسەی شەیتان و شۆفارە؟

ئەو کوتی: ڕاست دەکا و ئەوی دی کوتی: ڕاست دەکا، کوڕە بۆچییان وا لێ کردووە؟

١٤٧

میر چل بازەوانی بوو. بیستیان ئەوە خەریکی داعبا بوون، ڕەقاسیان دەکردن بۆ هەڵفرینێ. شەیتانەکانیش ئەوە دڵیان خۆشە، کوتیان: ئاومان لە خورمالغێ ناوە، لە کوێ دەردەچێ ئەو ولاغە! بیست بازەوان ڕۆیین بۆ سەری مەیدانێ، ئەو جێی ئەگەر ولاغ و داعبای لێ دەگەڕێتەوە. لەو سەری گۆشتیان بۆ داعباکان لەسەر داری بڵیند دانابوو. لەو سەرەش هەر داریان بۆ چەقاندن. قەراریان دانا ئەگەر داعباکان بچنە ئەو سەری دارەکان بخەن و گۆشتەکە بشارنەوە، داعباکان دەنگ دەن تا بگەڕێنەوە بۆ ئەو سەرە. داعباکانیشیان برسی کردبوو. جا ئەوە داعبایان بەردا. داعبا لە شەقەی باڵیان دا، هەڵفرین تیژ؛ بۆنی گۆشتیان کردبوو. ڕۆیین بۆ سەری ئەو سەری؛ ئەگەر گەیشتنێ، دارەکانیان خست و گۆشتەکەیان شاردەوە. لەو سەرەوە بانگیان

کردن؛ دەستبەجێ، لەنگەری باڵیان ڕانەگرت، گەڕانەوە. جا بزانین سەعید چ دەکا؟
سەعید ئەگەر وڵاغی دەگێڕاوە، وڵاغ دەتگوت ماسی نێو ئاوە
دەتگوت قاشەیە و لە جێگای خوڕ تیرەی کێشاوە
سەعید دەیگوت: بیسمیللا، باز و شەهێن و پۆڕ و سییان بەرداوە
سەعید دەیگوت: بەشاهید بن، ئەوە ئەوان ڕۆیین؛ خۆی بەخودای دەسپارد و ئەگەر ڕکێفی بەبۆرەدا دەهێناوە
سەعید فێڵی لێ کراوە، دەشتی خورماڵغی ئاوی لێ ندراوە
بۆر بەجۆرێک ڕۆیی، هیچ کەس لەبەر توندی نەیدەدی بە چاوە
هێندێک دەیانگوت: ئەجندە بوو، غایب بوو هێندێک دەیانگوت: نەخێر لەسەر عەرزی ماوە
داعباکان ئەگەر گەیشتنە ئەو سەری مەیدانێ، زانییان بەشە گۆشتیان لە وێ نەماوە
بۆرە هێند سەرکێش و توند بوو سەعید لە خورمالغێ ڕەد بوو دووازدە هەنگاوە
سەری وڵاغی ئەگەر بەتەڕدەستی دەگێڕاوە
دنیا لە پێش چاوی دەسووڕا، دەیگوت: خودای تەعالا ئەو سەعاتە بولەرزەی بۆ دنیایە هێناوە
سەعات لە سەعاتێ بۆرە سەرخۆشترە، دەهات بەسورعەت و بەپڕتاوە
لەبەر تەکان و حەڕەکەتی، ناڵی پاشووی ئەگەر لە ئی پێشووی دەداوە
هێندێک دەیانگوت: ئەوە هەورە برووسکە بوو. هێندێک دەیانگوت
خێر، وڵات ئاوری تێ بەردراوە
ئاقڵمەندان دەیانگوت: سوبحانەڵڵا! ئەوە سەعید بوو لەو سەری مەیدانێ گەڕاوە
سەعید دادەبەزی، لاقی میری ماچ دەکرد، پاشەو پاش دەگەڕاوە
بۆرەیان ڕاگرت و دەیان گێڕا و کەمێک وچانی گرت و دەحەساوە
تازە مراوی و شەهێن و پۆڕی بەلەک دەهاتنەوە بەناڵە ناڵ و قاوە قاوە
چومکە برسی بوون و گۆشتیان بەوان پێشان دەداوە
هەچەند جارێکی شاباڵی خۆیان لێک دەدا، دەتگوت تفەنگچییان لەسەرە و لێیان قەوماوە

میر دەستبەجێ پەشیمان بۆوە لەو قسەی ئەگەر کردبووی، کوتبووی بە سەعید سێدارە و حوکمی کوشتنی بۆ دانا

لەو قسەیە دەبۆوە بازگەشت و پەشیمانە

دەیگوت: زەللەیان پێ کردم ئەوانەی شوبرە و شەیتانە

خراپە زەحمەتە لە تۆوە دەرکەوێ نۆکەرەکەی بەئیعتیبار و بەمتمانە

پاداشتی ئەو چاکەییەت دەدەمەوە، بۆشت تەمبێ دەکەم ئەوانەی بەتۆ نەتەوین و لەگەڵ تۆ دەبنەوە بەشوبر و شەیتانە.

جا ئەوە ئاقڵمەند کوتیان: دەبێ ئیمتیحانی دەشتی خورمالغێ بکەین، دەڵێن ئاویان لێ ناوە.

ئەوە ئاقڵمەندان هاتن بەتەمەشاکردن و بەقانوون و بەڕوخسارە

هێندێک کوتیان: خێر، بەعەرزی دا نەڕۆییوە ئەو ولاغە، باڵندیە و باڵدارە

هێندێکیش لە جێ جێ ئاقڵیان پێ دەشکا، دەیانگوت: ئەوە جێگای کۆلکە بزمارە

ئەدی عەجایەب، ئەگەر ئەوە بەعەرزی دا ڕۆیی، بۆچی چەند پاش وی پۆڕی بەڵەک و خاسەسی لاجیوەردی و سەقر و وەردۆک لە دوای وی دەهاتنەوە بەناڵە ناڵ و گارە گار و قاوە قاوە؟

میر دڵخۆشی سەعیدی دەداوە. جا دەستبەجێ بەیتاڵی هێنا؛

تەمەشایان کرد، کوتیان: داڕوی تێ دراوە! گوێشی دەرمانی فەنەی لێ درابوو. میر سێوەدین بەگ کوتی: بۆم ڕاگرن تا سواری بم. کوتیان: میر، پڕتاوی ئەو ولاغە دەتخا. کوتی: دامبەستن.

جا ئەگەر سواری بوو ڕکێفی بۆ هێنا، هێندێک دەیانگوت: میر، ڕەبی حوکمات و دەست ڕۆییویت ببێ ڕاگیراو و بەرقەرارە

لە تۆ کوێر بێ نفووسی پیس و شەیتان و شۆفارە

نە لە مەیتەرخانەی کەسدا ولاغی وا هەیە و نە ئەوە قیمەتی تەواو دەبێ بەهەزار هەزارە

به عەرزیدا دەڕوا، بەڵام بەخوڵای ئەوە باوی گەلێک پترە لە وەی ئەگەر پێی دەڵێن باڵدارە.

جا ئەوە دەستبەجێ میر، سەعیدی هێناوە سەر کاروباری خۆی. ئەسپەکەش بە وەعدەی پازدە شەو تووک و مووکی هێناوە. هیچ کەس وڵاغی وای هەر نەدیوە.

دایکی قەباڵەی هەیە ئەگەر عەسڵە عەڕەبییە

بابی خاترجەم بە وڵاغێکی ڕەشی بەحرییە

بەقەت دوو قرانێک نێو چاوانی سپییە

دەست کورتی پاش و درێژی پشت ملەییە

کلک و یاڵ بەژەنگارە و شێر خەزاڵییە

لە نێو گەورە گەوراندا بەوییان دەگوت: وڵاغێکی گوڵ گوڵییە

گەردن مارە و سینگی هەڵکەوتووە و سینگ شێرییە

لازم ناکا، تاریفی تەواو نابێ؛ لە مەیتەرخانەی هیچ کەسدا نییە.

١٤٩

جا ئەو جار میر بەخێرهاتنی کرد و کوتی: ئەشەدوبیللا ئەوڕۆ دنیایە سبەی قیامەت قابیلە ئەو دەست و دیارییە

ئەو جار خاترجەم بە، جێی خۆت گرت، هەتاوەکو میر ماویەتی حوکمەت و ئیختیار و ڕووحییە.

دەستبەجێ میر حوکمی کرد سەد و چل پاڵوپشتی جەمبەری(؟) بەئیحتیڕامیان دانا

پەڕی قاقووم و سی و شالوور و داعبای دەبەحرانە

سوێند بەوەی کەم بێ مەکانە

دنیای بەبێ تەناف دانا

ڕێی حەوت شەو و حەوت ڕۆژانە

حازر بن تایەفەی بەگلەر بەگی و فەتوڵلاخانە

ئەوی چاوڕەشە و گەردن کەشانە

ئەوی ئەگەر بۆنی دێ وەکو ڕەشەڕیحانە
داوەتە، سەعید دەرچوو لەو ئیمتیحانە.
ئەوڕۆکە داوەت وەهایە
شل و ملی زۆر تێدایە
دڵ دەگرێ بەزم و سەمایە.
خەبەر درا بەچوار ئەسناف
بەبێ درۆ و بەبێ خیلاف
هەڵپشکووتن گەردنی ساف
لە کوڵمەیانە ئەلف و کاف
دەبێ بێنە سەیریان لە قاف.
پاکی کوڵمەی وەک چرایە
کوڕ مەجرووم و کچ لەیلایە
کەوشیان پاک پانیەی تەلایە
بەژن وەک چووزەی بیزایە.
وەختێ کە با ڕای دەژێنێ
بۆ پاش و بۆ پێشەوەی دێنێ
ڕابی و ئایشێ و خونچێ و زێنێ
پیاو مەست بێ و هۆشی نەمێنێ
ساقی ئەگەر مەی بۆ دێنێ
مەستە و قسە دەپەڕێنێ.
پاک بەو ئەندازە غەملاوە
باوەڕ بکە لە چل لاوە
سوور و سپی تێک چڕژاوە
زانایان سەریان سوڕماوە
ئەوە چ بووە؟ چ قەوماوە؟

ڕۆژی عەیش و کام و کاوە.
پۆلێک هاتوون بیتوێنینە
وەکو وەردۆکی باڵ شینە
کراسی بەریان پاک چین چینە
برۆ و مژانگ تێک چرژینە
لە کوڵمانیان ئەلف و سینە.
پۆلێک هاتوون خەڵکی کۆیە
چاویان هەر وەکو هەڵۆیە
هەمووی مەستە و سەربەخۆیە.
پۆلێک هاتوون لە هەولێرێ
وەکو شەک دێتە سەر بێرێ
مەرگ بۆ عاشقان دەنێرێ.
پۆلێک هاتوون لە بەغدایە
دڵ بۆ ئەوان موفتەلایە
تاریفی جوانێیان نایە
بازی بەندیان کارەبایە
سەر چۆپی وان زڵەخایە.
پۆلێک هاتوون لە جزیرێ
وەکو باز دەگرن نێچیرێ
دڵ باڵی گرتووە و ناگیرێ
مژانگیان وەک شیر و تیرێ
دەرکی بابیان بەقوڕێ گیرێ
پۆڵێک هاتوون لە تورکستان
سنگیان وەکو باغ و بێستان
کوڵمەیان وک سوور گوڵی کوێستان

دنیایان وەها دەڕەنگاند.
پۆلێک هاتوون ڕەشەسمەرن
گەردن وەک حەوزی کەوسەرن
خەریکن ڕوحی پیاوی بەرن
شیرنن، هەنگوینن، شەکەرن
مەمکانیان ئەوبەر ئەوبەرن
مژانگیان وەکو خەنجەرن
بێ دەسەلآت، خاک بەسەرن.
پۆلێک هاتوون لە زوراری
مەمک هەر وەکو هەناری
عەتریان لە کوڵمەی دەباری.
پوڵێک هاتوون سوورچییە
بەژنیان وەکو شەنگەبییە
عەمریان لە شازدەساڵییە
پاکی مەستە و ئالۆرییە(٥٨)
هیچ ئاگایان لە خۆ نییە
ئەوڕۆکە خۆشی و شاییە.
کوڕ، ئەوی چاردە ساڵانە
پاکیان ولآغیان کەحلانە
سوارە و پیادە تێک ڕژانە
ئەوانیش ڕوحی خۆیان دانا
هاتن بۆ بەزم و لۆغانە
بۆو عەیش و چەپڵە ڕێزانە.
شایەر وسووە و ڕەشیدخانە
ڕەشید گەلێک مێهرەبانە
لە کوتنێدا زۆر چازانە.

ڕۆژ هەتاکو نیوە شەوێ
وەکو باز و قاسپەی کەوێ
کوتنی ئەورۆ پێی دادەوێ.
جانگیر لە مووسڵێ هاتووە
قەدیم بابی شایەر بووە
ئەویش لەسەر هاتوچووە.

١٥٠

شەوێ ئەو کچ و ژنە قەدر و عێزەتی دەگیرا کوتیان: ئێمە سبەینێ پەڵپێک دەگرین، دەبێ خانەوادەی میر سێوەدین بەگ بێنە داوەتێ.

وایان تەگبیر کرد نەشمیلە
قامکیان پڕ لە ئەنگوستیلە
دنیا بۆ من قار و قیلە
عاشق بۆ ئەوان زەلیلە.
تەگبیریان دەکرد تەواوە
پیاو شێتە، بەنگی کێشاوە
دڵ لەو کارە مەحتەل ماوە.
قاقەزێکیان بۆ میری نووسی، نووسییان:
بەرقەرار بی و ڕاوەستاوە
خودا حوکمی بەتۆ داوە
زیاتر بێ ئەو بەند و باوە
خانمان قەرەوڵیان نەداوە
گوڵ شەماڵی لێ نەدراوە.
تەکلیفیان وایە لە میری:
بەر بدا باغی هەنجیری.
بەزمی وا قەت قەت نەکراوە

با بێن ناسک و شیرن لاوە
خودا بەرزی بە تۆ داوە
بڵێن قسەیان نەشکاوە.

١٥١

میر سێوەدین بەگ ئەگەر تەمەشای قاقەزەکەی کرد، ئیمزاشیان کردبوو هەموویان؛ هەمووش گەورەی عەسر بوون کچەکان و ژنەکان. میر سێوەدین بەگ ئەگەر قاقەزەکەی خوێندەوە، کوتی:

ئەگەر کەسێک حوکمڕان بێ
ڕوح دایمە لەسەر دەستان بێ
نابێ لەسەر دڵشکان بێ.

ئەوە میر چۆوە بۆ حەرەمخانە، کوتی:

لە بۆم هەڵێنن دوو چاوی دوژوار
قەتو نەدیوە شینایی بەهار
قەتو نەدیوە هیچ سوار و ڕێبوار
زولفو دابنێن وەکو پیادە و سوار
عەتر بباریێ وەک ڕۆژی بەهار
ئیجازەو هەیە تەلای دەستەوشار

میر سێوەدین بەگ گوتی: دەبێ هەموو بچن دەو داوەتەوە.

خانم و خاتوونان کوتیان: جا ئێمە چۆن بچین؟ شەماڵ و زریان ئێستا سنگ و بەرۆکی مەی نەترازاندووە و تێی نەگەڕاوە. نازیان دەکرد دەنا زۆریشیان پێ خۆش بوو بۆ ئەو داوەتە بچن.

ساز بوون خانم و خاتوونان، سەلە و بەسمە و ئایشەخانە
گوڵناز زۆر لەبەر دلانە
حازر بوو زێڕ و لەرزانە
لەسەر بەرویێی ناسک دانا

له لای جاڕچی جاڕکێشانه:

ڕۆژی عەدەب و ئەرکانه

خانم دێن له حەرەمخانه.

جحێڵ خۆی ڕانەژێنێ

هیچ کەس قسه نەپەڕێنێ.

داوەت به سێ جێ گیراوه

هیچی سنگی نەژاکاوه

گوڵ له پەرژینی هالاوه

عالەم سەری مەحتەل ماوه.

هاتن بەشەوق و دەماغی

پەرژین لاچوو لەبەر باغی.

کەمێک دێتن شوبای زریان

دەسره و دەسماڵیان تێک هالان

ددان وەک سەدەفی دووکان

زەردەخەنه کەوته لێوان.

بەزم و ڕەزم وا گیراوه

بەپیریانەوه هاتن لاوه

دەستیان گرتن: وەرنه ناوه.

کورسییێکیان بۆ میر سێوەدین بەگ له نێوەڕاستی داوەت دانا.

لاقیان ئەگەر دەشته پاشێ و دێته پێشێ

بێ عیلاجم، دڵم دێشێ.

دڵم یەکجار بێ قەراره

تێکەڵ بوون بەندۆکه و گواره.

گوێچکه پەرژینی خشڵانه

تێکەڵ بوون گوڵ و ڕێحانه

ڕەشبەڵەکە، میر و خانە
لاو و جحێڵ و نۆجوانە
داوەتی کچ و کوڕانە.
تاوێک گەڕا بە سەرخۆشی
هیچ کەس پێی نەمابوو هۆشی
کوڕ بۆنی سینگان دەنۆشی.
ئاخر تاریف بوو تەواوە
زیاتر هیچم پێ نەماوە
دەڵێی نەفخی سوور لێدراوە
زولف وەها تێک ڕژاوە
سوورمە دەڕژێن لە دوو چاوە
مەمکان ماندوون هێند سووڕاوە
کراس چینیان لێ گۆڕاوە
ناڵچەی کەوشان فڕێ دراوە
هێندیان لاق لە عەرزی کوتاوە.
ئەوە ژنی میر سێوەدین بەگ بەسمە کوتی:
حاسیە داخولا کەیفی چۆنە؟
وەک هەڵاڵە ساحێب بۆنە
دیار نییە لەو ڕێگا و لەو شوێنە.
گوڵ دەپشکوون لە ئاستەڕێ
سینگ وەکوو بەردی مەڕمەڕێ
با بووک بێ گەڕێک هەڵپەڕێ.
بووک جەیران، پڕ خەت و خاڵە
چاوی ڕەش و لێوی ئاڵە
برۆی پەڕی ڕەشە داڵە

وەک کوێستان سنگی خاڵ خاڵە
وەک ئەستێرەی ساماڵ و گەواڵە.
حوکمیان لێ کرد حەرەمخانە
حوکمی خانمی حوکم زانە
زولفی بدا ئاورینگانە
با بێ ئەویش بۆ نێوانە.
چاوی وەک شەهێن و بازە
دەڵێی کۆتری تەقڵەبازە
زۆر شلک و ناسک و بەنازە.
زۆر شیرنە لەنجەولاری
بۆ داوەت هات بەخوماری
دڵم سووتا بە یەکجاری.
دڵ وەک جۆللانە دەپەڕی
کیژێکی زۆر ساحێب فەڕی
لە داوەتێ هەڵدەپەڕی
هەر وەکو گوڵی گەوەڕی.
شل و مل پاک ماندوو بووە
کوڵمە وەکو گوڵ سوور بووە.
شۆڕ بوونەوە بازنە و گوارە
کار کەوتە وەختی ئێوارە.
قەد باریک و شل و ملە
زولف ڕەشە و چاو بە کلە.
ئەوە وەختی داوەت بەردانە
پاک هەنیەی لە کوڵمەی دانا
بۆ ڕۆژی خەڵات بەخشانە.

ئەشرەفی و زێڕ و هەیت و هووت
خاڵت هێناونەتە سەر ڕووت
ئەو جار نەشەی کەللەم بزووت.
خانم و خاتوون وەک خەرمانە
لە خەرمان شەمامەیان دانا
زولفان پاک هاتوچۆیانە
ئەو جار وەختی دەست بەردانە.
ئەوە هاتن سوور و سپییە
پاکی دەڵێی بەهەشتییە
وەختی داوەتێ نییە.
دەنگ دێ لەو بازنە و خڕخاڵە
پیاو دڵی بۆ وان عەبداڵە
لازم ناکا داخ و ناڵە
لێم تەڵخ دەبێ ئەحواڵە.
پاکی چوون بۆ ماڵە میری
زولف لە کوڵمان بە زیری(٥٩)
بازن چوونە نێچیر گیری
ئەوە هاتنە ماڵە میری.

١٥٢

ئەو جارەکە، ئەلعان تایەفەیەک لە عێراقێ هەن زۆریش ڕەشیدن، زێبارییان پێ دەڵێن؛ زوراریيان پێ دەڵێن؛ زۆر ڕەشید و پڵنگن، هەر دوو تایەفەیەکن، هێندێک پێیان دەڵێن زێباری؛ هێندێک پێیان دەڵێن زوراری.

خالق هەر ئەتۆ هەوی
ڕەبی هەر ئەتۆ هەوی
تۆ بڵندان دەکەی نەوی

مردن هەورازی قەوی
کەسی لێ وە سەر ناکەوی.
کەس پێی نەبردووە زەفەر
پادشا، تا میر و بەگلەر
کاران دەکەی هەتا سەر
دنیات وەها ڕۆناوە، کێوت کردوونە لەنگەر
گوڵ میخە، داکوتراوە تا نەبزوێ، ئەوبەر ئەوبەر.
خالق تۆ بێ نەزیری
ڕەبی تۆ بێ نەزیری
بێ حاکم و بێ وەزیری
بێ فکر و بێ تەگبیری
هەچی ئیرادەی تۆ بێ، هیچ کەس ڕێی پێ ناگیری
ئەوە بەحوکمی تۆیە جوان دێتە ڕۆژی پیری
هەچی وەختی مەرگی هات، بەئەجەلێ دەگیری.
خالق هەر ئەتۆی سوبحان
ڕەبی هەر ئەتۆی سوبحان
هەر تۆی کارسازی کاران
دنیات ڕۆنا سەرانسەر، کردت بەنەخش و نیشان
ئادەمت لێ دروست کرد، پێغەمبەرێکە لەوان
عالەمت لێ ئیجاد کرد، ئەی غەفوور و ئەی ڕەحمان
داوخوازی دیم نەماوە، دەپاڕێمەوە بۆ ئیمان.

١٥٣

ئەوە بووک ئێستا نەگوێزراوەتەوە. سەر سپی و ئاقڵمەندان بە حاسییەی بەگلەر بەگییان گوت: میر سێوەدین بەگ کارێکی وای کردبا سەعید لە گەرمێنێ نیشتەجێ بایە. حاسییە کوتی: میر سێوەدین بەگ قەولی بە من داوە، خونچە و گوڵخاتری

باریەهای من داوە، ئەلعانیش کابرایەکی ئێرانی ئەمن دەگوێزێتەوە. بێ ملک و بێ ئیجاد و بێ خاک و...... ئەوە شەوێکی ڕقی هەستا سوار بوو ڕۆییەوە بۆ خاکی ئێرانێ، ئەمن دەبمە سەر کۆینەی خەڵکی و سەرزەنیشتی خەڵکی. ئێستاش ئەمن چاوەڕوانم میر ڕێگایەک بۆ من پکێشێ دڵم ئاوێ بخواتەوە و بحەسێتەوە. جا میر کوتی: ئەوە بیست دێم دایە لە سەرحەدی سورییە؛ ئەو حەلی شامیان پێ دەگوت. دەستبەجێ دەفتەر و ئیمزا و حیسابات. میر ئەو ملکانەی بەقەباڵە دا بە سەعید و حاسییە خان. سەعید ناردی دایک و بابی هێنا. جێگیر بوو، ئەگەر میر ئەو پیاوەتییەی دەگەڵ کرد.

ئەگەر باوەڕ دەکەی برادەر بە ئەسەحییە

هێندێک پێیان دەڵێن زوورارییە

هێندێک دەڵێن زێبارییە

ئەوانە لە پنج و ڕەگەزی سەعیدن، وەکو شێری سپییە

لە ڕۆژی شەڕێدا ترسی لە هیچ کەس نییە

ئەگەر گەرووی تاڵ دەبوو، دەکەوتە خوێن ڕێژییە

ئیمتیحانی خۆی داوە، ترسی لە هیچ کەس نییە.

سەت ڕەحمەت بێ لە گوێدێران

چەند ڕابردوون جوان و جوانمێران!

بێ بەش بێ شەیتانی کوێری ماڵوێران.

پەراوێزەکان:

١- نیکل: لێرەدا مەبەست پووڵ و پارەیە.

٢- ئەسپەک: جۆرە نەخۆشینێکە بەفارسی پێی دەڵێن «حصبە»

٣- دیارە ئەمە قسەیەکی نەستەقی کوردییە.

٤-کەناره: هەمان کەناری. ئەم ناوە لە کتێبی «ناوی باڵندەکان لە زاراوە کوردییەکان»دا نووسراوەی محەمەد کەیوان پوور موکری نەهاتووە.

٥- قالووەلا: وێدەچێ ئەم تەعبیرە لە ئایەتی الست بربکم قالوا بلی (اعراف، ئایەتی ١٧٢)-وە وەرگیراوە. لە کوردییدا مەبەست لە ڕۆژی تەنگانە و کۆست کەوتنە.

٦- «لە شەو گوردی کەس نایە» واتە بەکەڵکی کەس نایات یان لایق و شایانی کەس نییە و یان کەس شایانی ئەوە نییە. ڕەگو ڕیشەی ئەم دەستەواژەیە دوو ئامراز لە ئامرازەکانی دەزگای جۆلاییەکە یەکیان «شە»و ئەویتر «گورد»ە. «شە» ددانەکانی نێو دەفە و ژێر دەفەیە. تاڵەکان بەنێوان ئەو ددانانەدا دێن. بەگوتەی مام قادری ئیبنی عەباسی کە لە مەهاباد خەریکی جۆلاییە «شە» لە جۆرە قامیشێکە کە پێ دەڵێن «قەرەغو». لە زاراوەی بادینی-دا بەشانە دەڵێن شە. «فەرهەنگی خاڵ ٢/٣٣٣ » جۆلا دوای ئەوەی بە«مەکوک» پۆی خستە نێو تاڵەکانەوە توند بەدەفە دەیکوتێ، ددانەکانی «شە» ئەم پۆیە دەخاتە پاڵ پۆیەکانی تر.

بۆ کاری تەنین پێویستە پۆی بەنێو تاڵەکاندا، بەژێر یەکیان و لە سەرووی ئەویتریانەوە، یان بەپێچەوانە، تێپەڕێت. بۆ ئەم مەبەستە کەرەسەیەکیان بەناوی «گوردە» چێ کردووە.

گورد لە دوو داری تەریب و هەندێ تاڵەبەن پێکهاتووە. تاڵەبەکان کە لە نێو دارەکاندان پێکەوە تەریب و بەشێوەی ئەستوونی بەسەر دارەکاندا دەگوزەرێن. درێژایی «گورد» واتە درێژایی دارەکان دەوروبەری شەست سانتی مەتر و پانابیەکایان نیزیکەی پانزە سانتی مەترە. ژمارەی گوردەکان زۆرتر چوار دانەیە.

داری گورد کە «دار گورد»ی پێ دەڵێن دەشێ زەریف و بەدەوام بێت، کەواتە لە «سەختەدار»ی وەکو «شیلان»یان «بەهێ» کەڵک وەردەگرن.

بە تاڵە بەنەکانی گورد دەڵێن «بەن گورد». ئەم «بەن گوردە» لە ڕێگای کەرەسەیەکەوە بەناوی «ساچین» یان «ساکین» بەشێوەیەکی تایبەت دەچنرێ، ئەگەر ژمارەی گوردەکان چوار دانە بێ بەمجۆرە هەر گوردێک (١/٤)ی ژمارەی سەرلەبەری تاڵەکان بەنێویدا تێدەپەڕێت.

هەر گورد لەسەرەوە لە ڕێگای دوو ڕیسەوە کە پێیان دەڵێن «ژێ» بە«وەلاڵە»و لە خوارەوە بەپێ تاتە دەبەسترێتەوە، «وەلاڵە» غەرغەرەیەکە وەک ئەو غەرغەرەیەی کە بۆ هەڵکێشان و داکێشانی ئالا و شتی تر کەڵکی لێ وەردەگرن. جنسی «وەلاڵەکان» دارە و ژمارەیان چوار دانەیە. هەردوو وەلاڵە لە نێو مەحفەزمیەکی دارین دان کەپێی دەڵێن «چۆلەکە». «چۆلەکە»کان کە دوو دانەن بەبان دەزگاکەوە ئاوێزانن «پێ تاتە» کە وەک وشە لە «پێ» و «تاتە» واتە تەختە پێکهاتووە، لە ژێر پێی

جۆلا دایە. جۆلا لە کاتی جۆلاییدا پێێ تاتە بەرەو خوارێ لێدەخورێ، هەر بۆیە ئەو گوردەی کە پێوەی بەستراوە دێتە خوارێ و پۆلێک تاڵ لەگەڵ خۆی دێنێتە خوارێ، واتە ئەو تالانە لە ئەوانی تر جیا دەکاتەوە، لەم کاتەدا تاڵەکان ئامادەن بۆ ئەوەی جۆلا بۆیەکانی بە نێویاندا بگوزەرێنێ. ئەو گوردەی هاتۆتە خوارێ لە ڕێگای «ژێ» و «ولاڵە»وە - دوای هێنانە خوارێی گوردێکی تر - سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە جێگای خۆی.

٧- گەردالْ: وەکوو تەپ و تۆز، تۆز ئاسا

٨- سۆ: هاوتا فارسیەکی دەکاتە غدە «فەرهەنگی مەهاباد، ل ٣٦٩» سۆی بن هەنگڵی، واتە موزاحیمی، خراپە خوازی.

٩- ئەم وشەیە لە فەرهەنگی مەهاباد، ل، ٤٤٠، بەشێوەی «قۆتاسە» و «قۆتازە» بەواتای «حلی فضی او ذهبی یعلق فی ضفائدر الشعر او عذبە العمامە» هاتووە.

١٠- گەو: بازنە، هێڵ «فەرهەنگی مەهاباد، ل ٥١٥».

١١- بەندۆکە: شتێکە ژنانی «مامەش و مەنگوڕ» بەکاری دێنن.

لە فەرهەنگی ئەورەنگ، ١/٢٨٤، بەگەڕانەوە بۆ سەر فەرهەنگی خاڵ بەواتەی «ژێر چەنە» لێکدراوەتەوە.

١٢- هەنیە: لە فەرهەنگی مەهاباد دا، ل ٦٩٥، بەواتای زغب الوجب هاتووە بەڵام لێرەدا بەمانای دەموچاو یان تەوێڵ و نێو چاوان بەکاربراوە. هەنیە وشەیەکە تایبەت بەژنان، «هەنیەکەر» یان «هەنیە هەڵگر» ئەو ژنەیە دەموچاوی ژنان هەڵدەگرێ.

١٣- نیسار: شوێنی بەرسێبەری کێو.

١٤- سەوڵی خەرامان: هەمان سەروی خەرامانە.

١٥- دێز لە فەرهەنگی مەهابادا، لە ٢٨٩، بەواتای «اکهب» هاتووە کە سپییەکی تار دێت.

١٦- شنۆخاڵ: دبێ هەمان چەقەل بێت. «داعیا» پتر بۆ باڵندە بە کاردێت، وەک چۆن لە قسەی نەستەقی کوردیدا دەگوترێ:

«داعبای گۆشت خۆر دندووکی خوارە».

١٧- بڕوانە: چریکەی مەم و زین، کۆکردنەوەی عوبەیدوڵڵا ئەییووبیان ل١٤٢

١٨- هەناو: هاوڕیشەی هەناسەیە. هەناسە ئەو دەنگەیە لە سینەوە دێتە دەرێ.

١٩- تراوکە: بەڕێی ڕستەکە تراوکە بریتیە لە ڕەشەوە هاتنی چاو ئەم وشەیە لە فەرهەنگی خاڵ و فەرهەنگی مەهابادا نەهاتووە.

٢٠- تێل بەسەر: واتە جوان، تێل جۆرە شتێکە بۆ جوانی.

٢١- کەشان: واتە بڵیند، کێشراو

٢٢- ئەم ڕستەیە قسەیە نەستەقە.

٢٣- کۆست: حەز، بەخت و هات. کۆست کەوتن واتە بەخت وەرگەڕان.

٢٤- «پیر سوار» کە لەم بەیتەدا دیسان دەربارەی قسە دەکرێتەوە لە دەقی ئۆسکارمانیشدا توحفەی مظفریە، ل ٢١٨ بەم چەشنە باسی کراوە.

ئەوە کەمبەر بەستەیە، بەمنداڵی شەهید کراوە، هیمەت و
بەرەکەتی حازر بێ، ئەو. پیر چاکە سوارە
قۆچ عوسمان عاقڵ بوو کە ماڵدارە
دەچوو لە وێندەرێ پیادە دەبوو، جڵەوی دەگرت
پیاوێکی ڕدێن سپی بەقەرارە
سەعاتێکی دەگەڵ ئەو پیاوی ڕدێن سپی دەکرد گوفتارە
دەیگوت: قوربان «ئەوە کێیە؟» دەیگوت: هیمەت و بەرەکەتی
حازربێ، ئەوە پیر سوارە.

٢٥- ئەم ڕستەیە قسەی نەستەقە.

٢٦- قودروور: ئەم وشەیەم نەبیستووە و لە فەرهەنگی مەهابادیشدا نەمدۆزییەوە، وێدەچێ جۆرە دەنگێک بێ.

٢٧- چوار فەسڵ: ژوورێکی گەورە کە ڕووەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باکوور و باشوور پەنجێرەی هەبێت. دانانی پەنجێرە بۆ هەر چوار لای ژوور بە مەبەسی وەرگرتنی زیاتری تیشکی و ڕوناکایی خۆر و هەروەتر بە مەبەستی فێنک کردنەوەی لە وەرزی گەرمادا بووە.
و لە دیمەن و ڕوانگە چوار لایەنەکەشی کەڵک وەرگیراوە.

٢٨- لە فەرهەنگی مەهابادا «پۆیلە» نەهاتووە بەڵام «پۆیلانە» هاتووە و بەم چەشنە پێناسە کراوە: «هدیە تقدم الی العروس». لە فەرهەنگی خاڵ لە بەرامبەر «پۆیلە»دا نووسراوە زڕوزەنگیانەی سەری ژنان، پۆیلانە. لە فەرهەنگی ئەورەنگدا، ٢/١٣٦، «پۆیلە» بە واتای «مۆرە و زیوەری سەری ژنان» هاتووە.

٢٩- بڕوانە بەیتی میهر و وەفا، پێشەکی.

٣٠- ئەم ڕستەیە قسەی نەستەقە.

٣١-ئەم ڕستەیە قسەی نەستەقە.

٣٢- تەعبیرێکی هەتا بڵێی جوان و دڵخوازە.

٣٣- بەراوردی بکەن لەگەڵ «لەنجە و لار»

٣٤- وە، کورتیلەی «ئەوە»یە.

٣٥-سوار و باش: هاوواتا و هاوتای کەیخودا - یە.

٣٦-زیر: ئەم وشەیەم لە فەرهەنگی خاڵ و فەرهەنگی مەهابادا نەدۆزیەوە، من بەواتای «ڕەقیب» و «نەیار» وەرم گێڕاوە.

٣٧-تاڵێن تۆز: وێدەچێ هەر ئەو وشەیە بێت کە لە فەرهەنگی خاڵ -دا ٢ ١/٧٤ بەشێوە و

ڕێنووسی «تالینتووس» هاتووه و ماناکەی بەم چەشنە لێکدراوەتەوە: «گیایەکە وە تاڵیشک دەچێ»

٣٨- ساتە: پێدەچێت هەر ئەو وشەیەیە کە لە فەرهەنگی خاڵ و فەرهەنگی مەهابادا بەشێوەی ساتان و بەواتای پانتۆڵ هاتووە و هەروەتر بەراوردی بکەن لەگەڵ وشەی «ساتن» کە جۆرە پارچەیەکی بەنە کە شێوەی ئەتڵەس دەدات «فەرهەنگی عەمید»١/٧٣٤

٣٩-قاڵدرمە: وێدەچێ تورکی بێت و بەقسەی بەیت بێژ واتە پلیکان.

٤٠-پرپرە: لە لاپەڕەی ١٣٣ فەرهەنگی مەهاباد دا ئەم وشەیە بەواتای «نوعی حلی، نبت» هاتووە و لە لاپەڕەی ١٤١-ی هەمان فەرهەنگدا هەر ئەم وشەیە بەشێوەی «پڵپڵە» بەمانای «جلاجل معلق علی الراس» تۆمار کراوە، «سلسلەو پڵپڵە»شی پێدەگوترێ «سلسلە» بەراورد بکەن لەگەڵ «سلسلە» بەواتای زنجیر.

٤١- ورینگە: بەراوردی بکەن لەگەڵ «خرینگە» و «زرینگە»، پیشاندەری دەرەوشانەوە لە فەرهەنگی مەهاباددا «ورینگەم» نەدۆزیەوە بەڵام لە فەرهەنگی ناوبراودا، ل ٦٥١، «ورینگە» بەواتای «دەرفەت و دەرەتان و تاقەت» هاتووە.

٤٢- لەبەیتی میهر و وەفادا ئەم وشەیە بەشێوەی «گراو» هاتووە، «دەمرمەوە دەبەر شا کەزیانت لە سەر گراوی پانیەت دەکاتەوە شەڕێ»

٤٣-بەدر: شیمانەی زۆر دەکری جێگۆڕکێ کراوی وشەی «بەرد» بێت.

٤٤- ڕەوکەوان: بەواتای ئەو کەسە ئاگای لە ڕەوە بێت. هەروەتر بڕوانە: فەرهەنگی مەهاباد، ل٣٠٥، وشەی «ڕەوگە» و فەرهەنگی خاڵ، ٢٥١/٣ و ٢٠٢/٣ وشەیلی «ڕەوکەوان» و «ڕەوگەوان».

٤٥- قەپۆز: بەراوردی بکەن لەگەڵ «کەپۆ». «قەپۆز بەرانی» بەو ئاژەڵ یان ئینسانە دەڵێن کە لووتی لە لووتی بەران بچێت، واتە گەورە و قوت بێت.

٤٦- پێڵاوی پێ داو: واتە بەیەکجاری، یان شتەکە بکڕە یان کەوشەکەت لەپێ بکە و بڕۆ. من لە وتووێژەی خەڵکیدا ئەم دەستەواژەیەم نەبیستووە.

٤٧- بڕوانە پەراوێزی ژمارە ١

٤٨- «کۆ» لە فەرهەنگی مەهابادیشدا هاتووە، هەمان هەسارەی پەروین یان سورەییایە. وێدەچێ «کۆ و تەرازوو» پێکەوەش هەمان مانایان هەبێت. نموونەی ئەم وشانە لە سۆنگەی سەرنجدان بەهەسێرەکان و ناو لەسەر دانانیان کە لە هەمان کاتدا پیشاندەری لە مێژینە بوونی زمانن گرینگایەتیەکی تایبەتیان هەیە و کۆکردنەوە و نووسینەوە و تۆمار کردنیان کارێکی هەرە پێویستە.

٤٩- سەقاو: لە بەیتی «میهر و وەفا»شدا «سەقاوە» هاتووە: «سەقاوی ئاوزەنگی لەعلی ڕوممان و یاقووتی عەبدولحەسەن و زێڕی سپییە» بەیت بێژ «سەقاو»ی بەو واتایەی کە لە فەرهەنگی خاڵ

و فەرهەنگی مەهاباد دا هاتووە بەکارنەهێناوە و وێدەچێ تووشی هەڵەبوویێت. لە فەرهەنگی «خاڵ»دا ۲۹۹/۲ «سەقاو» بەم شێوەیە ماناکەی لێکدراوەتەوە: «دەردێکە لە مقاو قورسترە تووشی وڵاغی یەکسم دەبێ.»

٥- ڕاگیر: بەیت بێژ «ڕاگیر»ی بەواتای پلیکان بەکارهێناوە.

٥١- ڕەخت: «جۆرە خشلێکی زێوینە بۆ جوانی ئەدرێ لە وڵاخ» فەرهەنگی خاڵ، ۱۹۳/۲

٥٢- قاشان: وشەیەکی مانا ون و بێ واتایە، وێدەچێ بەیت بێژ ئەم وشەیەی لەبری «خزم و کەس» یان «ماڵ و کاشانە» بەکارهێنابێت.

٥٣- توز: بەواتای خوو وخدە هاتووە. ئەم وشەیەم لە فەرهەنگی خاڵ و فەرهەنگی مەهاباد دا نەدۆزییەوە.

٥٤- بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٤٦

٥٥- پشتەماڵ: لەلایەنی پاشگری «ماڵ»ەوە بەراوردی بکە لەگەڵ «بەرماڵ»

٥٦- دەگەڵکو جوانوو لە دایکی بەربۆوە نێرگزی دەکەن یانی بەئەندازەی چوار قامک لە کلکی دەبڕن. ئەو کارە نژدیشی پێ دەڵێن.

٥٧- ئەم زاراوەیە بەواتای ئەوەیە کە کارەکە خەریکە بەکۆتایی دەگات.

٥٨- ئەم وشەیە پێشتر بەشێوەی «لاهۆری» هاتووە

٥٩- بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٣٦

١

کابرایەک بوو نێوی مامەڕەش بوو؛ سەردار عێل بوو. برایەکی بوو جانگیر بەگیان پێ دەگوت. مامە ڕەش وەجاغ کوێر بوو، کچێکی بوو نێوی مەرزینگان بوو. براکەشی کوڕێکی بوو نێوی شۆڕ مەحموود بوو. ڕۆژێکی براکەی بەمامە ڕەشی کوت، کوتی: براله با ئەو کچ و کوڕە لە یەکتری مارەکەین؛ ئامۆزان، بۆ یەکتری چاکن. مەرزینگانیان لە شۆڕ مەحموود مارە کرد. منداڵیش بوون هەرکیان.

ئەگەر هاتوو جانگیر بەگ مرد؛ شۆڕ مەحموود عەمری حەوت ساڵان دەبوو. بەعەمری خودای شۆڕ مەحموود هێندە وێچوو بوو کار دەوەیدا نەبوو. ئەما مامەکەی خۆشی نەدەویست؛ دەیکوت:(١) دەست لە من دەستێنێ، دەسەڵاتم لە چەنگ دەردێنێ.

ئەگەر شۆڕ مەحموود گەورە بوو، هێندە ئازا بوو کەس نەیدەوێرا سەری لەبەر هەڵێنێ. ڕۆژێک لە ڕۆژان بە مامەکەی کوت: ئەو کچە لە من مارە کراوە؛ نایدەی بە من بیگوێزمەوە؟

مامە ڕەش کەیخودای بانگ کردن، کوتی: ئەو کوڕە داوای مەرزینگان دەکا، نامەوێ بیدەمێ. ئەگەر ئەو کچەم لێ بستێنێ، بێشک دڵم دەتۆقێ. هێندەش ڕەشیدە ناوێرم بڵێم نایدەمێ. چارە و تەگبیرم چییە؟

تەگبیریان بۆ کرد، کوتیان: دوو پشت پێش ئێوە، حاکمەتی تەرکە و تورکومان ئی ئێوە بووە. ئەلعانیش تایەفەی ئێوە ئێکێکی لێ هەڵکەوتووە، وەکو شۆڕ مەحموود بێ. بینێرە سەر تەرکە و تورکومان، بی هەستێنێتەوە. جا لە دوایە، ئەگەر شۆڕ مەحموودت بەڕێ کرد، تەگبیرێکی دیکەت بۆ دەکەین.

مامە ڕەش ناردی لە دوی شۆڕ مەحموود و بانگی کرد. ئەگەر شۆڕ مەحموود هاتە ژوورێ، مامە ڕەش لە ڕانی خۆی داو کوتی: ڕۆڵە ئەو کچە مارەکراوی خۆتە؛ ئەما داخێکم لە دڵی دایە. شۆڕ مەحموود کوتی: مامە بۆ لە ڕانی خۆت دا؟ چ حەسرەتێکت لە دڵیدایە؟ کوتی: ڕۆڵە حاکمەتی تەرکە و تورکمان هەر ئی ئێمە بووە؛ ئەما ئەلعان پیاوی وامان نەماوە ڕێ و شوێنی قەدیممان بۆ جێ بەجێ کاتەوە. ئێستاش وام پێ چاکە پچی حاکمەتی تەرکە و تورکومان بستێنییەوە، جا لە دوایە مەرزینگان بگوێزییەوە.

مامە ڕەش بەفریوی دەدا، بۆ تەرکە و تورکومانی دەنێرێ. شۆڕ مەحموود پێی کوت: مامە ئەتۆ هیچ قەباڵەیەکت هەیە؟ مامە ڕەش کوتی: دەفتەری سیلسیلەی تایەفەم بۆ بێنە. ئەگەر شۆڕ مەحموود دەفتەرەکەی هێنا و بۆی خوێندەوە، دیتی دوو پشت پێش وان خەرج و باجی تەرکە و تورکمان بەوان گەیشتووە.

جا ئەوە شۆڕ مەحموود ئەندازەی حەوت سەت سواری سازکرد؛ خەبەری بەتەرکە و تورکمان دا ئەگەر بۆم بەجێ دێڵن چاکە دەنا کەللەپەڕێنی پەیدا دەبێ. مامە ڕەش پێی خۆش بوو؛ کوتی: دەڕوا دەکوژرێ. مەرزینگان پێی زانی. جا ئەوە شۆڕ مەحموود هاتە بەر پەنجەرەی. بانگی مەرزینگانی کرد و کوتی:

٢

کیژێ بێ بەعسەتی، بەعسەت پێ نەدراوی

ڕەشەڕێحانەی، ئێستا دەست لێ نەدراوی، نەژاکاوی و هەڵ نەکەندراوی

زەرد مەمانت حەفس کردووە لە ژێر کراسی مەحمەڵ دارایی دا، بە

میسالی هەرمێ گولاوی

تێشوی تەرکە و تورکومانم دەیە، بۆم هەڵێنە گۆشەی چاوی

مۆئمینی، دوعای بەخێرم بۆ پکە؛ ئێستا نەژاکاوی، لێ نەقەوماوی

ئەمن دەچم بۆ سەفەری تەرکە و تورکومان، ئەتۆ دەبێ جۆگەلەی

خوێنت بێن لە هەردووک چاوی

تێی ناگەم بە سلامەتی دێمەوە یان بە برینداری و بە ئەنگوواوی؟

٣

مەرزینگان ئەگەر چاوی بەشۆڕ مەحموود کەوت، بەرۆکی ئاواڵە

کرد و کوتی:

ئەوە کاری بابمە دەنێرێ بۆ جەنگی جوکلی هەمەوەند و سمێڵ سپی کامەرییە

ئاگاداری تۆ بێ ئەلیاس لە بەحرێ و خدر لە چۆلی و لە بەرییە

بە ئامانەتی دەتدەمە دەست ئیمامی کازم و وەیسەلقەرەنییە

دووازده ئیمامی دەشتی بەغدایە ئاگادارت بن، ئەگەر ماونەتەوە بە شەهیدییە
لە پاشت بەجێ نەمێنێ بەژنێکە باریک و دووکولمەی لیمۆییە
خەبەری ناخۆشم بۆ نەیە، سەرم بەرمەوە سەر کوپەڵەی خمییە
خودا ئاگادارت بێ! پاش تۆ زیندەگانیم بۆ چییە
ئەمن ئیفتیخاردەکەم هاتوویە کن من بەعەزمی خوداحافیزییە
ئاگاداری تۆ بن ئیسماعیل و میکائیل و جوبرائیلی عاسمانییە
شەرت بێ تا دەمرم بۆت پکەم ئەڵڵا ئەڵڵا و ڕەبی ڕەبییە
ڕەبی هەر تۆ بەقسمەتی من بی، پاش تۆ قسمەتی دیکەم نییە
ڕەبی کۆمەگت پێ پکەن چل سوارەی غەیبییە
هەتا تۆ دێیەوە لە من وایە بێنار[٢] چۆلە و ئاوەدان نییە
دادەنیشم بە سەری بەتاڵ و بە ملی بەکوێن و بەدڵ شکستییە
خەڵک لەبەر چرا دادەنیشێ، چرا ڕووناکاییە
گە تۆ لە بێنارێ نەبی، دەکەومە تاریکییە.

٤

زەینێکە خۆی دەدا دەرکی مامە ڕەش، لە سواران گرمە گرم و ناڵە ناڵە
ئەوڕۆکە دەروون خۆش نایە، زارم یەگجار زۆر تاڵە
دڵم وەکو هەوری عاسمانێ گەواڵ گەواڵە[٣]
پێم خۆش نییە پچییە سەفەری تەرکە و تورکومان بەبێ سەنەد و قەباڵە
بەردی سارد و گەرمت وە بەر ڕێگای نەیە، حەیفێ شۆڕ مەحموود کەمێک منداڵە
بەدوور بی لە دەرد و لە بەڵایە، ڕەبی زمانم ببێتەوە لاڵە
بەمیراتی بەجێ نەیەڵی بەژنێکە باریک و دوو چاوی کاڵە.

٥

ئەمن قسێکت پێ دەڵێم، ئەتۆ بمدەیە گوێیە
لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لەژانە دەڵێی بەحری شلوێیە
لاوژە ڕەبی بەردی سارد و گەرمت نەیەتە سەرە ڕێیە
خودا بەوی ڕۆژێ نەکا، ئەگەر لە دنیایەشم بۆ نەبێ، لە قیامەتێ
هەر تەمام پێیە.

٦

لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە، چەندی لە ژانە، ڕاناوە ستێ لەبەر ئەوی ناسەوری
لاوژە برۆ، ڕەبی عومرت بە سەت ساڵ ڕابری
چاوت بە من بمێنێ بە چاوی باز و ئەبرۆت بە من بمێنێ بە تیژە
پەڕی دە سەقری
شەماڵی دێ، جار جار خۆی داوێتە ساماڵی و جار جار خۆی داوێتە
بن گەواڵی هەوری
مامە ڕەش پەڵپی لێ گرتووی، لە خودام تەڵەبە بە ئیسقا(٤)یەکەی شێر
مەمەندی مری
تەماداربووم ئەو ساڵ پچینە کوێستانێ، چیغ و چادرمان پچێتە هەوار خدری
موقەددەری هەق دەستی ئیلاهی نەیهێشت، تەواو نەبوو خەیاڵ و فکری
ئەما لە تەرکە و تورکومان بێیەوە پێم چاکتری
ئەورۆ منداڵی، پێم ئەو وەختی لەورۆ چاتری.

٧

ئەتۆ زەمینێکە خۆت بدەوە کراسێکی مەحمەڵ دارایی ئەگەر لە
سەر گراوی(٥)پانیەمە وەکو فەرەنگی
تەماشای زەرد مەمانم کە لە بن کراسێکە مەحمەڵ داراییدا هەڵدێنن ڕەنگی

هەتا دێیەوە دادەنیشم بەخەمناکی و بەبێ دەنگی
لە خودام تەڵەبە سەفەرت سەعادەت بێ، لەبەر بەڵای عەرز و عاسمانێ نەلەنگی.

٨

لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە فکرە و چەندی لە خەیاڵە
خوداوەندی میری مەزن تەڕەقیت بدا بە بەخت و بە ئیقباڵە
زەینێکە خۆت بدەوە ئەبرۆی کەمەن کێش و دوو چاوی کاڵە.

٩

لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە و چەندی
لە کاوە کاوە
زەینێکە خۆم دەداوە کۆسرەتی شاڵە بەگییان، لێی دەپشکووتن هەڵاڵ
و بەیبوون و شلکە گیاخاوە
نێرگس بۆنی خۆشە و تازەی دەم بەگڵیەوە ناوە
لە خواوەندی میری مەزن دەکەم لێت ببینم کام و کاوە
ئەتو نازانی تازە ئەمن بنی مەمکانم داناوە؟
لە خەڵکی حەرامە، خودای تەعالا بۆ پەنجەکوشین بەتۆی داوە
چومکە دەڵێن: مەرزینگان لە شۆڕ مەحموود مارەکراوە
تەمەشای کوڵمەت نەکردووم دەڵێی شەمامەی حەوت ڕەنگە و شەختەی
پایزێی لێ داوە
تەمەشای بەژنیم ناکەی دەڵێی چنارە و بەعومری خودای بەبێ گرێ
خوڵقاوە؟
خودای تەعالا ئاگاداری بێ، ئەو پێغەمبەرەی خودا لە شەڕافەتی
وی دنیای داناوە
ئەتۆ دەزانی زۆر زۆر ناڕەحەتم، جەرگ و دڵم لەوێدا سووتاوە
دەسەڵاتی بابم نییە، دەنا کارێکی وام دەکرد نەچی، پێم دەڵێن:

مەرزینگان حەیای نەماوە.

شۆڕ مەحموود لە پشتی وڵاغی دەکرد زینێکی مورڕەسەع و لە زاری دەکرد ددانە لغاوە

هاواری دەکرد وێنس و ساڵح و ئەگەر ئەلیاس لە بەحرێ داماوە

ئەوانە تکاکار بن، سەفەرم هات و نەهاتە، شۆڕ مەحموود، بڵێن:

خودا تۆفیقی داوە، ئەوە حاکمەتی تەرکە و تورکومانی هەستاند و گەڕاوە

جا دەبێ سینگتم[٦] بۆ پکەی بە باغی شەدداد و بۆم هەڵبێنی دوو گۆشەی چاوە

هێندێک بڵێن: حۆری عاسمانە و هێندێکیش بڵێن: خێر، کۆترە و سەری لێ شێواوە

قەرە زولفت دەڵێی ڕەشەڕیحانەیە و شەواوی لێندراوە

کەس دەستی نەکردۆتێ، نەژاکاوە، دەستی لێ نەدراوە

سینگت بەمن بمێنێ بەدووکانی خوواجە حەسەنی موسڵێ، دوکانی عەترە و جووتێک فینجانی لێ داندراوە

کوڵمەت بەمن بمێنێ بەگوڵی دەکوێستانان، غونچەیە و تازە شکۆفەی داوە

بولبول لەبەر گوڵ دەخوێنێ، حەیفێ عەتری با دەیبا، دەبێتەوە بڵاوە

هاوارم وە بەر دووازدە ئیمامی دەشتی بەغدایە لەو سەفەرە بگەڕێمەوە دوواوە

لووزەوی سوواران هاتن، پاکی لە پێشی ڕاوەستاوە

شۆڕ مەحموود دەیگوت: کیژێ دەستی منت دامێن بێ! بێمەوە کەس نەڵێ سینگ و بەرۆکی ژاکاوە.

جا خودا حافیزیت لێ دەکەم، دەوڵەت زییاد و ماڵ ئاوا

نازانم نە ئە جەلە و نەخودا تەڕەقی لە شانم ناوە.

١٠

ئەما ئێوارە و سبحەینان بۆم پچۆوە گۆشەی دیوانێ، ئەو جێی لێی دانیشتبووم لە حوکماتی

کوڵمەت بەمن بمێنێ  بە شانەی هەنگوین و بە وردە نەباتی

تا ئێستا ڕۆژێ سێ جارم دەدیتی، پێم وایە لە من دەبییەوە بە قاتی

چومکی دەچمەوە بۆ سەفەری هات و نەهاتی.

١١

لە دلێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە

گەردنت بەمن بمێنێ بە بەیداغی ڕۆمییان، ئەگە با دەی شەکێنێ و چلەی زستانە

چاوت بە من بمێنێ بەئەستێرەی ڕۆژێ، ئەگەر ئەوە هەلات لە پیرە کوێستانە

دوعای بەخێرێمان بۆ پکەن، پێم وایە وەختی دەست لێک بەردانە.

لە دلێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە و چەندی شێواوە

ئەگە خودا دەکا لەو سەفەرە دەگەڕێمەوە دوواوە

سینگمت بۆ دەکەمە باغی خوواجە حەسەنی، ئەگە تازە ڕیشەی هەناری لێ داوە

تورونج و نارنج لە وێدا بەریان هێناوە

ئێوارە و سبحەینانی لێ پکەوە شەوڕاوە

جا ئەو جار ئیشەڵڵا لە خۆت دەبینی کام و کاوە

پێغەمبەرانی عالەمی ئیختییار، ئەگەر پێغەمبەرێکی شادەمان بە شانی وی هێناوە

بەدوور بی لە بلێسەی گەروە شین و لە شێلینگی قەرەبینا و لە دەست و ڕمبی عەولای عەسۆی ئەگەر خراپ خولقاوە.

ڕەبی بەدوور بی لە دەردێ لە بەلایە

بەدوور بی لە بلێسەی گەروەشین و تەنکەزیو و شێلینگی قەرەبینایە

جا من چۆن کوێر نەبم دەنگی ڕەخت و خلخال و ئاوەزەنگی شۆڕ

مەحموود لەبەر دەرکی مامە ڕەشی نایە

جا چۆن ئەمن ئازارێک نەگرم ئەگەر سینگ و بەرۆکی من نەڵێن

دەستی «شۆڕ مەحمودی» تێدایە

شەرت بێ ئەمن سینگم حەفس پکەم، با نەچێتەوە نێو سینە و مەمکان

هەتا شۆڕ مەحموود لەو سەفەرەی نەگەرێتەوە دووایە.

لە دڵێکە من گەرێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە، بۆ دەرمانی

نییە و دڵم ژانی نابێ هێدییە

شۆڕ مەحموود دەپێی کردووە جووتێک چەکمەی سمایل نامەی بن

کودەری وەستا نەسیرییە

سووار بووە لە ولاغێکی خاڵ خاڵی عەسڵە شێر خەزاڵییە

سم تەبەقی گۆ مەقەستی عەسڵە بەحرییە

لە شانی کردووە ڕمبێکی دەم ڕەشی هەژدە قەفییە

لە خوێنی نەکرد و لێی دەتکێ دڵۆپە دڵۆپی دەخوێنییە

لە بەری دایە خەنجەرێکی دەببانی عەسڵە وەستاکارییە

قەدیمی زەمان دەڵێن لەبەر کەس دا خەنجەری وا نییە

لە سەری ناوە چەپکێک پەڕی تاوس، زەردە، کەسکە، سوور و سپییە

ئەگەر کەمێکی شەماڵ بێ گەواڵ گەواڵیانە لەگەڵ هەورییە

سەری منت ببێتەوە بەقوربانی سەرییە

ڕەبی بەدوور بی لە موقەددەری هەق دەستی ئیلاهییە

بەجێ نەیەڵی بەژنێکە باریک و سینگێکە سپییە و دووچاوی بەنگییە

خۆ قەستەم بەوەی نە لە گوێن کەسە و کەسی لە گوێن نییە

خۆ لە تۆ زیاتر ئەمن تەمام بە کەسی دیکە نییە
دەترسم خاتر خۆیەکە و جوان چاکێکەم بەرمەوە بن بارستی گڵییە
ئیشەڵلا قسمەتی تۆیە و قسمەتی هیچ کەسی دیکە نییە
ئەدی نایەی ماچم کەی لە بری لوقمە قازی و نانە شەکرییە
ئەگەر مەنزڵ دەگری، ئەتۆ بڵێی: زەخیرەی خۆم پێیەو، بڵێن:
ناهومێد نییە.

١٥

ئەدی ناڕوانیە تۆقان، تەلەسمان، زێڕان، زنجەقان، گوواران،
کرمەکان، ئاودەنگییان، خەبەرچییان، لەگەڵ بەندی دەپیرە گوواریێ؟
ئێواران ئەگەر وردە پەرچەم بە سەر کوڵمێکە ناسکدا دێنە خوارێ
گژنیژی گوواران دەپشکوون وەکو گوڵی دە بەهارێ
بەعەمری هەق دەستی ئیلاهی زوقم و وردە خوساری پاییزێیان
لێ دەبارێ
ڕەبی خوداوەندی میری مەزن ئاگادارت بێ، بەجێ نەیەڵی جووتێک
مەمک، تازە خڕ بوون وەکو هەنارێ
جا بابان وێرانم، قەلەندەرم، پاش ئەتۆ فرمێسکم لە چاوان دەبارێ.

١٦

لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە و چەندی
لە بەندی بەندییە
جا خۆ من هەچەند تەماشا دەکەم لە سمێڵێکە خورماییە
جا خۆ لە تۆ زیاتر کەسم لەماڵە باب و باوانی دا نییە
ئامانەت دارت بێ حوسێنی شەهید و خدری لە چۆل و بەڕییە
شاهی نەخشبەند و غەوسی گەیلانییە
عومەر و عوسمان و عەبوبەکر و عەلی، هەر چوار یاری نەبییە
ئامانەت داری تۆ بێ حەزرەتی وەیسەلقەرەنییە

یۆنس لە دەریایە، ئەگەر لە زگی ماسی دا قەراری نییە
موقەددەری وە سەر هات لێی تێک نەچوو زیکر و فیکری ئیلاهییە
دەجا وەرە ماچێک پکە لە بری لوقمە قازییە
هەڵی بگرە بە ئەمانەتی و بە دییانەتییە.

١٧

لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە، بەخوڵای
ناسرەوێ بە شەوی پاییز و بە ڕۆژی دە بەهارێ
لادە وردە پەرچەمان ئەگەر بە سەر کوڵمێکە ناسکدا دێنە خوارێ
عەکسم پکێشە، لە جێگایەکی چۆل و بەڕییە بلێ ئەمن هەمە
دۆست و یارێ
بۆ تۆ دەبێتەوە بە قنیات و بە حەسانەوەت هەموو سوبح و ئێوارێ.

١٨

تاجی و توڵە دەهاتن، لە ملیان دەکرا قەلاتی زێڕییە
هەڵۆ هەڵۆ و فەندی فەندی و گەردی گەردییە.
ئەمن تەمەننام دەبەمەوە بەر پادشای ڕەحمانە[8]
ئەوە کردیانەوە دەرکی نەسیر خانە
فەندی فەندی و جەیران جەیرانە
تاجییەوان هاتن، دەستیان لەسەر سینگییان دانا و (کوتیان):
ڕەبی ئاگادارت بێ وەیسەلقەرەنی ماهیدەشتی بەغدایە، بێیەوە لەو سەفەری
گەورە و گرانە.

١٩

ئەوە حەوت کەس هاتن، لە خۆیان داوە تانوت و حونەرێ
تەعزیمیان کرد و دایان نوواند سینگ و سەرێ
ئاغا ئیجازەی لەسەر بێ تا باز لە قۆشخانەی بێنینە دەرێ.

٢٠

باز ئەوە هاتە دەرێ لە قۆشخانە
شمقارِە و بازە و شەهێنە و تەرِلانە
خوداوەندی میری مەزن جووتێک هەناری لەسەر سینگی من دانا
وەختی ئەوەیانە، کامڵن، وەختی دەست لێدانیانە
یان دەبێ ماڵی شۆرِ مەحموود بن یان دەبێ پچنەوە گۆرِ و گۆرِخانە
سەلای گەورە و گرانم لێ رِابوو، کڵفەتان بگێرِن شینگا و بۆم دابنێن خمخانە
دڵم یەکجار زۆر لە هێش و لە گەرمە ژانە
زۆر دەترسم شۆرِ مەحموود، پێم وایە وەختی دەست لێک بەردانە.

٢١

بوو بە هەڵڵا و گرمەگرمی سواران، هەر کەس لە خزم و عەقرەبای خۆی دەکا خوداحافیزییە
لەشکری وا لە هیچ خاکێک نییە
شۆرِ مەحموود دەگەرِاوە بۆ حەرەمخانە بەعەزمی خوداحافیزییە
دەیکوت: کیژێ، لە خولای زیاتر ئەمن کۆمەگم نییە
ئەما زۆرم هومێد بەبەژنێکە باریک و داو و دەلینگی حاجی حوسێنییە(٩)
قوربانی دوو چاوی شەهێنت بم دەگەڵ سینگێکە سپییە
هاوارم وە بەر حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی ئیسماعیل، ئەگەر بۆ وی داندرا کابەتوڵڵا بە ئەسەحییە
لە پاشم بەجێ نەمێنێ بەژنێکە باریک و دووچاوی بەنگییە و سینگێکە سپییە.

٢٢

ئەوە خەبەریان بە مامە رِەش دا ئەگە شۆرِ مەحموود لەسەر سەفەرە

و دەڕوا.
هەڵڵا هەڵڵا و گرمەگرم و بێنە بێنە
مەرزینگان دەگری بە دوو چاوی باز و بە ئەبرۆیەکە شەهێنە
خوداوەندی میری مەزن ئەتۆ شۆڕ مەحموود لە من مەستێنە
چل شەکی یەک ددانم نەزری مەولوودی پێغەمبەرییە، بڵێن بۆ فەقیر و سەغیر و هەژارانی بێنە.

٢٣

ئەوە سوار وەڕێ کەوتن. مامە ڕەش هات، ئەوە بەڕێی دەکا و دوعاشی لێ دەکا، دەڵێ:
خالقی میری مەزن بەیەک کفلەکون دنیات دانا
وە جەرگی کەوێ تیری سەر بەپەیکانە
بە میرات لە پاشی بەجێ مێنێ کیژی وەکو مەرزینگانە
دوعام لێ بەناهەقی قەبووڵ نەکەی ئەی ڕەحمانە
چومکی بە هەق بە تۆم هێناوە ئیمانە.

٢٤

ئەی خودایەکی ئەزەلی و ئەبەدییە
خەڵقەندەی زەمین و عەرزییە
پڵنگە، پیاوی وا لە دنیایەدا نییە
سووری پکەیەوە لە خوێندا سمێڵێکە خورماییە.

٢٥

ئەی خودایەکی بێ مەکانە
ئەگە تۆ عەرز و عاسمانت دانا
تابووتی ببینم، شۆڕ مەحموود بێننەوە گۆڕ و گۆڕخانە
ئەو وەختی دەبێتەماڵی خۆم بەکچی شلکە مەرزینگانە.

٢٦

وە پێش کەوتن جڵەودار بۆ ڕۆینێ. مەرزینگان چوو لەسەر
منارەی خانووبەرە ڕاوەستا.
مەرزینگان لە دەستی دایە نارنجێکی بە قیمەت گرانە
بە دەستی خۆی نووسیوەتی و لاپی(١٠) عاشقانەی لێ دانا
هاڕەی نارنج دەهات، شۆڕ مەحموود زەبری دەکەوتە نێو شانە
لەو وایە خولا خەنی دەکا، چومکی نارنجە ئی جانانە.

٢٧

شۆڕ مەحموود بە شانی ڕاستەیدا ئاوڕێکی دەداوە
مەرزینگان دەتگوت جەیرانە و سەری لێ شێواوە
بە زاری زەردەخەنەیە و فرمێسکی دێن لە هەردووک چاوە
دەیکوت: لە دوعای بەخێر زیاتر، من چ دەسەڵاتی دیکەم نەماوە
خودایە ئامانەتت بێ ئەو لاوە.

٢٨

ئەوە سوار حەڕەکەتییان کرد.
بەعەمری ڕەحمانی
تۆز بڵند بوو، بوولێڵی(١١) خستە بەری عاسمانی
خودا ئەتۆ بەسوڕی مار و مێروو دەزانی
دەردی دڵ بۆ حەکیمی نییە و وە دەست ناکەوێ دەرمانی
چاوەڕێی ئەوەم ئەگەر بێمەوە و دەگەڵ مەرزینگان ببمەوە بە
کامرەوایی و بەئاملانی
مەلا محەمەدە کرووزە لەگەڵ عەولای عەسۆی، ئەوان لەسەر تەرکە
و تورکومان بوون بەحاکمی و بەنیشتیمانی
لەوێ خەبەری وە ڕێکەوتنی شۆڕ مەحموودیان دەزانی.

٢٩

دەجا سواران با وەخرِ بن، جلّەو گیری دوژمن پکەن، ڕۆژی لێ قەومانە(١٢)

کەلاک دەکەوێتە گۆڕێ و، ڕۆژی دڵ هێشانە

خافڵی شۆڕِ مەحموود مەبن، پیاوێکی دەست گەرم و زۆر چازانە

ئابڕووم نەبەن: ئەو لێمان بستێنێ مەملەکەتی تەرکە و تورکومانە.

٣٠

سەفی سواران دەگیراو، هەموی نۆ دووپشکی(١٣) زێڕی لە خەنجەری داوە

زیددی شۆڕِ مەحموودن ئەگەر لەو سەفەرەی نەگەڕێتەوە دواوە

لەشکر بەرامبەری یەکتری دەبوون، دەنگی قەرەبینایە و ڕمبی دەمرەشی هەژدە قەفی، قەوماوە

شۆڕِ مەحموود هەر جارێکی ڕکێفی بۆ ولاغی شێر خەزاڵی دەهێناوە

دووازدە کەسی لە ئەمیر و سەردار عێلان لەسەر پشتی ڕکێفێ فڕێ دەداوە

مەستی مەرزینگانە، دەربەستی مردن نییە، هیچ ئاگای لە خۆی نەماوە

وا دەزانێ دەستی لە گەردنی مەرزینگان دایە، هەر نازانێ ڕۆژی دڵ هێشانە و قەوماوە

سەنگەر بەتاڵ بوون، لەشکری عەولای عەسۆی شکاوە

جۆگەلەی خوێن جارییە بووە، دەڵێی سێلاوە

بابە هیچ کەس لەبەر دڵ هێشانێ، ئاگای لە خۆی نەماوە

شۆڕِ مەحموود تەنگەی زینی شل نەکردەوە و لە زاری ولاغی دەرنەهێناوە ددانە لغاوە

وە بزانم سامی نەریمانە و تازەی سەر لە بن گڵی دەرهێناوە

یا نە حەزرەتی عومبەرە و ئەگەر لە شەڕێ یەزدەگوردی گەڕاوە

یان خاڵندی بنی وەلییە ئەگەر سی و دوو لفکەی بەسەر عەرزیدا
بەردەداوە
یان حەزرەتی عەلییە ئەگەر لە غەیبەرێ دەروازەی لە ڕیشە دەرهێناوە
کردی بەپرد و تەواوی ئەسحابەی پێدا دەپەڕاوە.
یان ئەحمەدی شەنگە ئەگەر سوار دەبوو لە وڵاغی لەیلک، لەو
وایە لەو زیاتر کەس لە دنیایەدا نییە
ئەوە عاشقە، هیچ ئاگای لە خۆی نییە
چون بۆ خۆی لە شەڕێیە و ڕۆحی لەکن مەرزینگان حەفسییە.

٣١

چون سبحەینان ئەگەر سوار دەبێ، پێی لەسەر ڕکێفی دانا
بڵێسەی گەروەشینە و قرمەی خەنجەری دەببانە
بۆ خۆی لە شەڕێیە و ڕوحی لەکن مەرزینگانە
مەرزینگان دڵی بردۆتەوە حەفس خانە
بەرنابێ، بەستوویە بەزنجیرەی دە زولفانە
قنیاتی شۆڕ مەحموودە ئێوارە و سبحەینێ وردە خاڵی نێو سینە و مەمکانە
ئەگەر تێکەڵ دەبن دەگەڵ زنجیرەی دە زولفانە
دەڵێی زێڕینگەرە ئەگەر وردە گژنیژی لە سەری گواران دانا.

٣٢

جا بابە بەعومری باری تەعالڵا شۆڕ مەحموود شێری لە لانە، لە
بەر کەس هەڵنایە
چومکی دەگەڵ یاری خۆی گرتووە شەرتی وەفا، وە نازانێ ئەگەر
ئەو دنیایە کەسی تێدایە
بەپەلەیە زوو بگاتەوە بەژنێکی باریک و کوڵمێکی شەو چرایە
پێکی بێنێ ئەوەی ئەگەر لە دڵی من دایە

حەزرەتی عەبباس و حوسێنی شەهیدی کەربەلایە
تەمەننایەکم بۆ پکا فاتمەی زارایە
ئەشخاسن دووازدە ئیمامی لە دەشتی بەغدایە
هەر چەند فیکر دەکەم بەهیچ شتێکم سوکنایی دڵی نایە
ڕۆژێکی مەرزینگانم دی دەچوو بۆ سەرگەڕی دەریایە
زەینم دایە ملوێنکێکی(١٤) زێڕی لە گەردنی دایە
لەعلی ڕوممانە و یاقووتە و ئەشرەفی، ئەوی لە هەمووان کەم قابیلەتر کارەبایە
بۆچی خۆشە ئەو کاولە دنیایە؟
شل و مل و ناسک بەدەنی تێدایە
ئاخ بۆم پێک هاتبا شەرت و دەگەڵ وەفایە
خودایە غەمناکم نەکەی ڕۆژی عاقیبەت و دووایە
ڕەنجی عەزیەتی زییادم نەدەی بە زایە
بەژنی مەرزینگان دەڵێی چووزە بیزایە
ئارامی دڵمە، کەسی دی لە قابیلەتی من نایە.

٣٣

ئەوە شۆڕ مەحموود لەشکرەکەی شکاند.
جا بابە کەلاک دەکەونە مەیدانێ
مەگەر خودا دەنا کەس بەو سفەتە نازانێ
ڕۆژی هەڵاتن و تیر پێوەنانێ
بۆی بەجێ ما حاکمەتی تەرکە و تورکومانێ.

٣٤

ئەو عێل نشینە لەبەر دەردی خۆیان تا ئەورۆ ئاگایان لە خۆیان نییە
ئەوە هاتنە کنی بۆ پیرۆزبایی و مبارەک بادییە

قەبوڵیان کرد بەحاکمەتی و بەسکە ڕەواجییە
دوژمنی شۆڕ مەحموودی کوێرە، هیچ کوێ دوژمنی شۆڕ مەحموودی تێدا نییە
هەموو کەس بترسێ، خودا بەشی وی نەداوە خۆف و ترسییە
ئەوە مایەی بەژنێکە باریک و دوو چاوی بەنگییە
شەوێ دێوانەیە و ڕۆژێ شیددەتی دێ لە دڵییە.

٣٥

مەرزینگان زۆر نیگەرانە، ئێستا خەبەری فەتحی شۆڕ مەحموودی
نەزانیوە، جا دەڵێ:
لە دڵێکە من گەڕێن چەندی لە برینە، چەندی لە هێشە، چەندی
لە ژانە
تا شۆڕ مەحموود دێتەوە، مردن خۆشترە بۆ من لەو ژییانە
باز لە هیچ کوێ ناحاوێتەوە و ناحەسێتەوە هەتا نەچێتەوە سەر هێللانە
عەجایەب ماوم! شۆڕ مەحموود ئەگەر مابێ، دەبێ بۆم بنێرێتەوە
خەبەری خۆی و لەگەڵ نام و نیشانە
هەتا ئەمن زولفی بۆ سێ بەنگی پکەم و شۆخیان پکەم قەرە زولفانە
سنگی خۆمی بۆ پکەم بە دەفتەرخانە
مەمکی خۆمی بۆ پکەمەوە بە فینجانە
چاومی بۆ پکەم بە ساقی، وەختی شەراب گێڕانە
سنگمی بۆ پکەم بەسەنیری قوو، وەختی پاڵەوەدانە
بەڵکو پحەسێتەوە لەو سەفەری گەورە و گرانی تەرکە و تورکومانە.

٣٦

لەو عەینەدا بوو ئەگەر دەرکەی لەسەر خۆی دادەخست، گاڵە
گاڵە، ناڵە ناڵە، قاوە قاوە
دوو سورای پەڕ بەسەر لە دەرکی مەرزینگان ڕاوەستاوە
قاقەز و خەبەر و مزگێنی شۆڕ مەحموودیان هێناوە.

٣٧

جا مەرزینگان دەیگوت: ئەمن دەمگوت سوکنایی دڵم نایە
کڵفەتان ئابداری هەڵگرن هەتا پچینە سەحرایە و مەزرایە
با بە سەرماندا بێ بۆنی هەڵاڵە و بەیبوون و گیاخاو، لەگەڵ
شلکە بیزایە
ئۆخەی! خەبەرم بۆ هات، ئارامەکەی دڵم نەچۆتەوە بادی فەنایە.

٣٨

جا ئەوە مەرزینگان بۆ شۆڕ مەحموودی دەنارد دیاری و ئامانەتییە
لەعلی ڕوممان و یاقووتی عەبدولحەسەن و زێری سپییە
عارەقەی بن پرچانە و وردە عارەقەی مابەینی سنگ و هەردووک مەمکییە
ئەگەر ئەوەت لە کن بێ، دەرمانە و حەکیمت لازم نییە
ڕەبی بەدوور بی لە دەرد و بەڵایە و لە تیری نەبەدییە
لێت مبارەک بێ حاکمەتی تەرکە و تورکومان، خەبەرم زانیوە بە
ئەسەحییە
سنگی خۆمت بۆ دەکەمەوە بە باغچەی خوواجە حەسەنی، شەو و
ڕۆژ تێیدا دانیشە وەکو دێوانە و بەنگییە
شوکرانەی خولام زۆر کردووە، دوعای من بوو کاری خۆی کردییە
دوژمنت کوێر بوو، وە دەستت کەوت فەتح و نوسرەتییە.

٣٩

مەرزینگان وڵامی بۆ شۆڕ مەحموود دەنارد، دەیگوت: بەوەی کەم ئەگەر بیناهی
چاوە
شەوێ، بێ خەوم، لەبەر خەیاڵات خەوم ناکەوێ لە چاوە
وەختە دڵم بتۆقێ و بۆگەنیوم پکەوێتە جەرگ و هەناوە
کەسێکی خەبەرم بۆ بێنێ، بڵێ شۆڕ مەحموود لە سەفەری تەرکە و تورکومانێ
گەڕاوە

سەت زێڕ و چل عەبو تۆپ و چل مەجیدیم بۆ داناوە
با لە دنیایەدا بۆ خۆی، کەسافەت نەبینێ، لێی ببینێ کام و کاوە
گە شۆڕ مەحموود بدینم، وە دەزانم تازەکانێ خودا دنیای داناوە
ئاخ بمدیبایە سمێڵێکە خورمایی لەسەر کوڵمێکی پەڕی گوڵ و
ناسک داناوە.

٤٠

جاکێ بوو لە شۆڕ مەحموود ئەگەپێی دەگەییشت قاقەزی مەرزینگانە
وەک ڕیشەی دڵی پکێشن، وەک حەزرەتی قابیز بێتە سەری بەعەزمی
گیان کێشانە
وەکو مەوت بێ، بیبەنە سەر قەبرانە
لە بن گوێی بێ خرڕەی پاچ و پێمەڕانە
بڵێ: ئەوە ماڵۆکەی بەتەنێیە، خلاس بە لەزیندەگانی و لە ژییانە
چرمکە قسەی مەرزینگان بۆ وی ئیحتیبار و متمانە
شل و مل و گەردن بەخاڵ و خاسەکەوی جۆزەردانە
ماچی وی بۆ من دەبێتە ئیحتیبار، لازم ناکا بۆ من حەکیم و لوقمانە
چومکی خەیاڵ و مۆڕاوەدەی دڵمە، ئارامە، لەبەر دڵانە
وەکو ئەو حۆریانەی ئەگەر خودا لە بەهەشتی باقی داینا
وەکو پەری، هێندێک دەڵێن لە عەرزین و هێندێکیش دەڵێن لە عاسمانە.

٤١

ئەوە جا شۆڕ مەحموود دێتەوە، بە دزی مامە ڕەش، چاوی بە مەرزینگان پکەوێ.
جا ئەوە شۆڕ مەحموود بەدەست و پێوەندی خۆی دەڵێ:
گەلی دەدۆستان، ئەی کەسێکی لە دنیایەدا نۆکەرێکی بە ئیحتبار
و بەمتمانە
وەسێتی ئاغای خۆتان بەجێ بێنن، لێ و وە دەرنەکەوێ بێ

ئیحتیباری و نەزانە

ئەنگۆ دەزانن دڵی من شێتە، دایمە بووە بە دێوانە

دەترسم وەکو لەیلە و مەجرووم ببینەوە بە ئەستێرە و پچینەوە بە پەڕڕەی عاسمانە

ئەلعان سەفەرێکم لە بەرە، دەچمەوە عێلی مامە ڕەش و چاوێکم پکەوێ بەشلکە مەرزینگانە

عەمرم لە نوێ دەنووسرێ، شەرت بێ بیکەمە خێر دوو سەت شەکی یەک ددانە

هەموو خەڵات بکرێن، بییاندەنێ خەنجەر و تفەنگ و دەمانچە و دەمەر قۆپانە(١٥)

بۆچی من دەچمەوە باغی شەددادی بۆ سەیرانە

قەرە زولفی دەبێتە دەسرەی بەر خەنجەرانە

سینگی بۆ من دەبێ بەمێهمانخانە

مەمکی بۆ من دەبێ بە ئیستیکان و بە فینجانە

کوڵمەی شەرابەنتەهوورە، وەختی قوم لێدانە

بەژنی چناری عەڕ عەڕە، وەختی ئاوێزانە

جا ئەو وەختی لە سەری دەبژێرم شوکرانە

چومکی حەرام نییە، شەریعەت بەمنداڵی ئەو حیسابەی دانا

پەرژینم گرتووە باغچەی گوڵانە

شل و ملە، بۆ من لەبەر دڵانە

ئەگەر نەیدینم، مردنم پێ خۆشترە لەو ژیانە.

٤٢

ئەوە شۆڕ مەحموود دێتەوە. بەدزی سوار بوو، چل کەسی دەگەڵ خۆی هێنا.

ئێوارێیە، وەختی ئەوەیە هیچ کەس شۆڕ مەحموودی نەدییە

هات بەر سابات، مەرزینگان ڕاوەستابوو لەسەر جووتێک کەوشی
پانیە فەرڕاشی سەر نوقرە بەندییە
دەبباغی وەستا داودە، لە پێی هیچ کەسدا کەوشی وا نییە
چاوی دەڵێی ئەستێرەی زۆرە و موشتەرییە
کوڵمەی دەڵێی بەفرە و بەسەریدا باریوە دڵۆپی خوێنییە
کەوایەکی دە بەر دا، کاری سەمەرقەندە، لەبەر کەسدا نییە
ئەوی گەزی لە چلە و لە وانی بیست و چوارییە
سبحەینان شین دەنوێنێ، شەوێ ڕەنگی سپییە
ئەگەر تیشکی تاوێی لێ دا ئەتڵەسییە
لە وێدا مەمکی دەڵێی هەنارە و تازە هاتۆتە خوارێ لە دارییە
دەجا چپکەم لە کن خەڵکی ئازاد بێ ببینن، لە کن من زۆر دوور
وەتەن و قاتییە
لە شانی کردووە چارشێو شانێکی موشەجەجەری قیمەت گرانی عەسڵە
کارخانەی فەرەنگییە
ڕیشوەی کیمخووایە و ڕێشوەی نیو گەزییە
ئیدی ئەو نەیزانیوە و ئاگای لە من نییە
ئەگەر جەرگم سووتاوە وەک قەقناز و بۆتە بریانییە.

٤٣

ئیدی ئەمن ناخافڵ[١٦] بووم، بەسەر شانی ڕاستیدا ئاورێکی دەداوە
چاوی دەڵێی مانگی چاردەیە و لە خزمەت خولای ڕا هاتووە و
گۆشەی کێشاوە
ئەبرۆی دەڵێی کەمانە و لە دەستی کەیخوسرەو وە دەرکەوتووە و ژێی
لێ کێشاوە
شلکە پێکەنینی وەکو دەنگی قاز و قولینگ لە گەردنی دەبۆوە بڵاوە
بە پێکەنینی مەست بووم و هیچ ئاگام لە خۆم نەماوە

دەستێکی لە گەردنی دەکردم، دەیپالاوت فرمێسک بەدوو چاوە
ئۆخەی ئارامی دڵی من لە سەفەری تەرکە و تورکومان گەڕاوە
ئەو ئامانەتەم نەبردە بن گڵی و تەحویلم بەساحێبی خۆی داوە
دە سینگم پکە بەحەمایاڵ[١٧]، بڵێن: شۆڕمەحموود لە بن هەنگڵی ناوە
توخلا دەستت بێنە، بەڵکو غەریبایەتێکەت لە کۆڵ پکەوێ، زۆرت عەزیەت و عازاب کێشاوە
گەردنم وەکو کووپەی هەنگووینە و ئەوە وردە وردە ڕەقاوی[١٨] لە سەر ڕاوەستاوە
کوڵمەم هەر دەڵێی سێوە و وردە خوساری لێ دراوە
پێت قەرزدارم، فەرموو وەربگرە کام و کاوە
با بە پەردەی مرواری بەندییان بەعەدەب هەڵدەداوە
دەرکی بورجی بەڵەکییان دەکردەوە، کڵفەتان خەبەریان زانی
مزگێنی و خەبەرداری و قاوەو قاوە
بەحوکمی مەرزینگان زێڕ و زەنجەقیان دەکردەوە بڵاوە.

٤٤

ئەوە سمێڵێکە خورمایی لەسەر کوڵمێکە ناسک و شلک دانا
وردە وردە لێوی دەبزاوت لەو مەست و خەرامانە
هێندێک دەیانگوت: ڕۆژی عەشرە و هێندێک دەیانگوت: خێر، ئاخری زەمانە
هێندێک دەیانگوت: لە عەرزییە و هێندێک دەیانگوت: خێر، لە گەواڵ گەواڵی دە عاسمانە
هێندێک دەیانگوت: دەنگی قاز و قولینگانە لە گەواڵی عاسمانێ،
هێندێک دەیانگوت: خێر، ئەوە دەنگی شەپۆلی بەحرانە
هێندێک دەیانگوت: خێر، قافڵەیە، کاروانە، هێندێک دەیانگوت:
نەخێر، پاییزە وەختی لەیلە و مەجرووم خۆ لێکدانە

ئەوە گوارە و کرمەک و وردە گژنیژ، ئەوانن دەنگیان دەچێ بۆ
حەوقی عاسمانە
هێندێکیش پێیان وایە: کارە کارە، شەڕە بەرانە
شۆڕ مەحموود میوان بوو هەتا سێ ڕۆژانە
هەقی خۆی وەگیرکەوت ئی عەزیەت و عازاب و سەخڵەتی و ساغاوی
تەرکە و تورکومانە.

٤٥

سبحەینەیە، ئێستا گزینگ لە سەرانی نەداوە
شەربەت خۆریانە و پڕیشکەی ئاو پڕژێنی شووشەی گوڵاوە
چومکە[١٩] مەرزینگان شلکە و ناسکە و قەت نەشەمزاوە.
لێتان مبارەک بێ ئەو عەیش و ئەو لەززەت و نۆشێ
ئەو توڵفە لە ئەکوانی دڵمدا دەخرۆشێ
مەرزینگان ڕۆژ نییە ئەگەر ئەو بەدرە بەپەشمینە نەپۆشێ
لەسەر هەر کەمانی ئەبرۆی بەڵێ خوێنە دەجۆشێ.

٤٦

مامە ڕەش خەبەری زانی ئەگەر شۆڕمەحموود هاتۆتەوە. شۆڕمەحموود شەوێ مەرزینگانی بانگ کرد، کوتی: عەیبە ئەمن لێرەکانە بم، دەچم و وڵات دادەمەزرێنم، جا پاشان دێم دەتگوێزمەوە، لازم بەو ترس و لەرزە ناکا. جا ئەوە شۆڕ مەحموود لەسەر ڕۆینە، دەڵێ:

کیژێ بۆنی تۆم لە دەروونی قەت نابێ بلاوە
فیدای دوو زولفی تۆم، دەڵێی سومبولی خاوە
قوربانی دەمت بم، دەڵێی شووشەی گوڵاوە
وەختێک دەبێ خەبەرت بۆ بێنن، بڵێن شۆڕ مەحموود گەڕاوە
وەختی عەروسییە و خودا بماندات ئەم کام و کاوە
دەرکی خەزێنەت بشکێنە، بڵێن: لە عێلیدا فەقیر و داماو نەماوە.

شۆڕ مەحموود ڕۆیەوە. لەوێ بوو چل شەوان. هێند عەداڵەت بوو، لە وێ گورگ و مەڕ پێکەوە ئاوی دەخواردەوە. ڕۆژێکی شۆڕ مەحموود بانگی یارانی خۆی کرد، گوتی: یاران! ئەمن دەمەوێ بگەڕێمەوە، ئامانەتو ملک و ماشی خۆتان بێ، ئەمن عەرووسیم بەدەستەوەیە.

هەتا ئەو عەرووسییە بەدەست ئەمنەوە نەبێ تەواوە
ئەمن لە خۆم نابینم کام و کاوە
ڕەش مار گازی لە دڵم داوە
ژەهری ڕشتۆتە جەرگ و هەناوە
دەرمانی دەردم بە مەرزینگانەو ئەو وەختی دەڵێن عیلاجی کراوە
بەخودای وەختێکی ئەگەر سوار دەبم، دەچم بۆ ڕاوە
ئەو وەختیش پەرێشانم، کەس نەڵێ بێ خەمە و دڵی کراوە.
جا ئەوە شەوێکی شۆڕ مەحموود فکری دەکرد و ئاوی دەهات لە چاوە
سێ کەڕەتی لەسەر یەک دەستی لە ڕانی خۆی دەداوە
دەیگوت: ئازاری دڵ زۆر گرانە، ئەمن بەوە جەرگم بڕاوە
شل و مل و سایە گەردنێکی وەکو مەرزینگانم لە بێناریێ بەجێ ماوە
بۆیە هەر ماندووم و دڵ پڕ لە بۆسۆم و ماندووم نەحەساوە
سەفەری بێنارێم لەبەرە، نەتەوی پێم دەڵێن داخولا شۆڕ مەحموود بۆ گەڕاوە؟
نازانن زنجیرەی زولفی مەرزینگان تەنافە و لە گەردنم کراوە
هەچەند ئەوم وەبیر دێتەوە، لێم شل دەبێ هەنگاوە، ئەژنۆم شکاوە
ئەو تیرێکی لە گرێی پشتی من داوە
عیلاجی بەکەس ناکرێ، مەگەر بڵێن مەرزینگان بەدەستی خۆی دەری هێناوە
دەنا ئەو تیرە تەشەنداره، جەرگم پڕ دەکا لە خوێن و لە زووخاوە

مەڵێن: شۆڕ مەحموود پیاوێکی بێ عەقڵە و عەقڵی نەماوە
من دەچمەوە بۆ سەفەری ،بێناریّ، ئیشەڵڵا تەڕدەست و زوو دەگەڕێمەوە دواوە
چاری من مەرزینگانە، لێی دەبینم کام و کاوە.

٤٨

شۆڕ مەحموود گەڕاوە بۆ بێناریّ. نۆ سەت سواری دەگەڵ بوو، هەمووی وڵاغی سێ ساڵ بوو، هەمووی پەڕی شەهێنی بەسەریەوە بوو، هەموو خەنجەری نۆ دووپشکی زێڕی لەسەر بوو.

نەقێبی دووپشکی زێڕ زۆر بەقیمەت گرانە
قیمەتی لەکن کەس تەواو نابێ لە سکەخانە
پەیدا نابێ لە خەزێنەی پادشا و سوڵتانە
چون «بێجگە لە زێڕی» پیرۆزەیە و زمڕووتە و لەعلی ڕوممانە
خەنجەریان هەمووی نیو گەزییە، چوار قامک دەمی پانە
دوژمنی نەبەز لە بەری بێ روح و هەراسانە
ڕمبیان هەمووی هەژدە قەفییە، ئەگەر ڕۆژێکی دەگرن سانە
دەبێ بڵێی: ڕەبی ئاگادارو بێ مەلەکی دە عاسمانە
شۆڕ مەحموود بەجورێک ساحێب هەیبەتە، دەوڵەتان تا پرس بەوی
نەکەن ناتوانن سکە پخەنەوە سکەخانە
هێندێک دەڵێن جارێک لە جاران مەگەر وا بوو بێ ڕۆستەمی زەمانە
هێندێکیش دەڵێن فکری لێ مەکە، سامی نەیرومە و قارەمانە.

٤٩

مامە ڕەش خەبەری زانی کە شۆڕ مەحموود دێتەوە. لە دڵی خۆیدا کوتی: لەبەینم دەبا. جا مامە ڕەش ڕدێن سپی فەسادی بانگ کرد کوتی: پێم خۆش نییە مەرزینگان بدەم بە شۆڕ مەحموود. میراتی باب و باپیرم باردەکەم، گیر نابم، دەڕۆم بۆ بەلَخ و بوخارا. ئەگەر بچمە وێ دەستی بەمەرزینگان ڕاناگا؛ جا هەر قورێکی وە سەر خۆی

دەکا بکا. ئەوە مامە ڕەش باری کرد، چوار سەت ماڵی دەگەڵ ڕۆیی. مەرزینگانیان دەکەژاوەی نا و چاویان بەست و یەکسەر ڕۆیین.

شۆڕ مەحموود هاتەوە بە نۆ سەت کەس بووک بگوێزێتەوە. خەبەریان دایە، کوتیان: مامت ڕۆیی بۆ بەڵخ و بوخارایە.تەواوی خەڵکی بێناریّ بەپیریەوە چوون.

چا بەکەس ناچێتە سەریّ ئەو دونیایە، بۆ کەس نابێتەوە تەواوە

حەوسەت شەکی یەک ددانی کەوەسێریان[٢٠] گاو و گەردوون بۆ دەکرد، شۆڕ مەحموود لە سەفەری تەرکە و تورکومان گەڕاوە.

٥٠

چا ئەوە شۆڕ مەحموود دەڵێ، کوتی:

بەهارە، لە خەڵکی بەهارە، قاسپەی کەوە و، مراوی دەکەنەوە گارە

گار و نارە نارە

لە لا نووایان[٢١] دەپشکووتنەوە هەڵاڵ و بەیبوون و گیابەند و خاوە،

سبحەینان لێیان دەدریّ نەرمە خوسارە

خەڵکی سەرزەنیشتم نەکا، نەڵێن: نۆ سەت سوار سمێڵ سپی

کامەریان و جوکلی هەمەوەندی لە دوا سوارە

ئیدی خەڵکی نازانن، ئەمن نەخۆش نیم، لەنێو زگمدا دڵم بریندارە

بەدیاری بۆ مەرزینگانم هێنابوو گوارە و کرمەک و تۆق و تەلەسم

و قەتارە

مامە ڕەش چاوی بەست و بەیەخسیر بردیان بۆ بوخارا.

٥١

خەڵکی سەرزەنیشتم نەکا، نەڵێن: سوڵتانی ئەستەمبۆڵیّ لە ترسی

دەست و تیغ و شان و ڕمبی شۆڕ مەحموود خەوی نەدەز انی

مەجبوورم لەوەیدا ئەمن ڕوحی خۆم پکەمەوە فانی

خەڵکی دەچنە ڕاوە حەیوانە کێوی و ئاسک و جەیرانی

ئەمنت دەمرمەوە لەبەر قەرە زولفانت، ئەگەر وەکو ڕەشمار دەیهاوێیەوە
سەر شانی
ئەمنت دەمرمەوە لەبەر قوڵکەی گەردنت، ئاوی کەوسەرە. سنگ
بازارِ و دوکانی
مەجبوورم وە دوات دەکەوم، یا دەژیم یا لەو دنیایە دەبمەوە فانی.

٥٢

بەهارە، لەخەڵکی بەهارە، لە من ناتەواوە
لە کۆسرەتی شاڵە بەگییان هەڵاڵ و بەیبوون و گیا خاو تێک چرژاوە
لە باغی مەرزینگان هەنار و هەنجیر گوڵیان داوە
جا ئەمن سەت داخ و مخافەتی ئەوە دەمکوژێ، زۆرم عەزیەت و
عازاب و سەخڵەتی و ساغاوی لە دوای بەژنێکە باریک و دووچاوی جوان کێشاوە
ئەبرۆت بەمن بمێنێ بەپەڕی ڕەشە داڵ، دەڵێی فەقێ، موستەعید،
بەقەڵەمی کێشاوە
چاوت بەمن بمێنێ بەئەستێرەکەی گەلاوێژ، ئەگەر لە پێش مەلای
ماوەراندا لەسەری هەواری بێرییان گۆشەی کێشاوە
کوڵمەت بەمن بمێنێ بە شەمامەی حەوت ڕەنگ، لە کوڕە بێستانچییان
بەجێ ماوە
هەک لالانم کەن گراویە بابم! شەختەی پایزێ لە لایەکی داوە
بەدەستی باب و برایانی چاوی مەرزینگان بەستراوە
خۆ من پیاوێکی نامەرد نیم، خەڵک دەڵێن لە شۆڕِ مەحموود
ئێخسیر کراوە
هەتا شۆڕِ مەحموود لە سەفەری تەرکە و تورکومان گەڕاوە
سبحەینێ سەرزەنیشتم دەکەن، دەڵێن: مەرزینگانی لێ ئەستێندراوە
قەسەم بەوەی کەم ئەگەر بیناهی چاوە
هەتا زیندووم و ڕۆح لەسەر یەخەی کراسم ماوە

ئەمن دەست هەڵناگرم لەو مژانگەی ئەگەر دەڵێی تیرە و لە
کەوانت ناوە
گراویە بابم، نەتزانی ئەمن عەزیەت و عازابم زۆر کێشاوە؟

٥٣

سەرم دێشێ، دڵم ڕاناوەستێ لەبەر ئەوی ژان و لەبەر ئەوی ناسەوری
لەبەر دڵی من چاوت وەک چاوی بازە و ئەبرۆت وەک تیژە پەڕی سەقری
ئەگەر جار جار دێتە ساماڵی و جار جار خۆی داوێتە بن گەواڵی هەوری
ئەگەر ماندوو بووبێ، دەنیشێ لەسەر بەردی هەوار خدری
لە ڕۆژێکەوە عومرم ئەگەر بەسەت ساڵ ڕابری
دیارە شۆڕ مەحموود دەست لە بەژنێکە باریک و دوو چاوی کاڵ
هەڵناگری.

٥٤

لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە و چەندی
لە برینە
ئەمنت دەمرمەوە لەبەر بەژنێکە باریک، پۆڕی بەڵەکی سەر باڵ شینە
کاکە مەم ئەگەر خۆی بەهیلاک دا کەنگێ وەک تۆ جوان بوو ئەو
خاتوو زینە.

٥٥

لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە، چەندی لە ژانە، بەهیچ
دەرمانێک ژانی نەشکاوە
هێندێک دەڵێن بریندارە، هێندێک دەڵێن ئەنگوواوە
هێندێک دەڵێن دەردی موفاجایە، هێندێک دەڵێن: دڵی سووتاوە
هێندێک دەڵێن ئازاری سەرعە، هێندێک دەڵێن پەرییان دەستیان
لە دڵی داوە

هێندێک دەڵێن زولفی مەرزینگانە، تەنافە و لە گەردنی کراوە
هێندێک دەڵێن خێر، تیرە و لە جەرگی دراوە
ئەما من بۆ خۆم دەزانم، دەردی بێ دەرمانمە، کارم کراوە
مەگەر بەدیتنی مەرزینگان ئەو خەم و پەژارەیە لە من ببێ بڵاوە
دەنا وە بزانن پێمەردی میرانم لەسەرە، گیانی شۆڕ مەحموودیان کێشاوە.

٥٦

جا خۆ مەرزینگان لە کن من مەرزینگانی
لە کن خەڵکی بێ قیمەتی، لە کن من زۆر بە قیمەت گرانی
لە کن خەڵکی ڕەواجێکت نییە، لە کن من لەعلی ڕوممانی
بە منداڵی لە جەرگی منت داوە تیرێکی نییانی
لە کن تۆ نەبێ، لە کن کەس وەگیر ناکەوێ دەرمانی.

٥٧

مەرزینگان هەر لە کن من مەرزینگانە
لە کن من چاوی کۆترە و لێی ون بووە هێلانە
لە کن من بەرخە کۆرپەڵەی دوای مێگەلانە
لە کن من گەوهەری خەزێنەی شاه و سوڵتانە
هەر لە کن من موحتەبەرە، لەبەر دڵانە
یان دەبێ سەری خۆم بەرمەوە گۆڕ و گۆڕخانە
یان دەبێ سەری خۆم پکەم بەگۆی مەیدانە
نازانم هەق دەستی ئیلاهی چارە و قەڵەمی منی لە ئەزەل چلۆن دانا
یان وە دوات دەکەوم بۆ بوخارایە لە وێ لەگەڵت دەبم بەهاوڕاز
و ئاملانە.

٥٨

بریا سبحەینانم بدیایەی کە هێندێک دەڵێن: ڕۆژە و هێندێک
دەڵێن شەوە
چەند خۆشە دەنگی باز و ناڵەی مراوی و قاسپە قاسپی کەوە.
ڕاوکەران ئەسپیان ساز کردووە جووت جووت پێکەوە
شل و مل سایە گەردن هەستاون، ئەما چاویان ئێستا پڕ لە خەوە.

٥٩

ڕاوکەران ولاغیان زین کردووە، حازر بوون بۆ ڕاوێ
ئەمن فکر لە گەردەنێکی بەخاڵ دەکەم، ئەگەر سبحەینان دێنێتەوە
ورینگەی خوناوێ
ئەمن ئەو دنیا ڕووناکەم، بەخودای، خاتر جەم، بە بێ تۆ ناوێ.

٦٠

جارچی جاڕ پکێشێ، ولاغان لە مەیتەرخانە بێننە دەرێ
شۆڕ مەحموود لە خۆی داوە تانوت و حونەرێ
لە تەپڵی سەری ڕا تا بەری پێی، لێی دەڕژێ غیرەت و جەوهەرێ
خەونم دیوە، داخولا ئەو سەفەرە چم بە سەرێ؟
ڕەبی مامە ڕەش هەر ڕۆژەی مەیتێکت لە ماڵێ بەرنە دەرێ
مەرزینگانت لە من دوور خستۆتەوە، چۆنی پێ بەرم زەفەرێ
بەژنت بەمن بمێنێ بەغەڵفی یەک ساڵە گەدێتەدەر لە دەرکی میر
و بەگلەرێ
بۆ نۆکەرێکی متمانە، لە پێشدا قاقەزێکم بەقاسیدی بۆ بوخارا بەرێ
با بەس بە خەمناکی، لە دوو چاوی بەڵەک وردە خوناوکەی فرمێسک
هەڵوەرێ.

٦١

ولاغی سواران هەموو لە مەیتەرخانە هاتنە دەرێ، پاکی چوونە
سەر سانێ
ئاورِەحمان بەگ و ناجی بەگ و شاڵی بەگ و تۆپاڵ بەگ، حوکمیان
هاتە سەرێ؛ با برِۆن بۆ بەندەرگەی قۆشخانێ
سازپکەن باز و شەهێن و شمقارِ و با بێتە سەر حاڵ تەرِلانێ
هەتا پۆرِی بەڵەک و کەو بێنەوە سەر رِۆژی لێدانێ
لەبەر چریکەی بازان کەروێشک ئیسراحەت نەگرێ لە گەرمەلانێ
هەم بەعینوانی رِاوێ و هەم بۆ پەیداکردنی شلکە مەرزینگانێ.

٦٢

چومە سەفەری تەرکە و تورکمان بەپرِیشکەی خوێن و بەگەروو تاڵی
چومکە مەرزینگانیان لە من مارە کردبوو بە منداڵی
دابوویان بە من  بە خۆشی و بەشارەتی و بە حەلاڵی
بۆیە دایمە ئەمن دڵم لە ژانە، بۆ وی دەناڵی
نەمزانی لێم ون دەبێ بەژنێکە باریک و دوو چاوی کاڵی
ئەلعانیش دەبێ وە دوای بکەوم، هەوەڵێن بە شیر و بە خەنجەر و
بەگۆپاڵی
ئەو جار ئەگەر نەمدییەوە، دوازدە ساڵی بۆ دەکەم فەقیری و گەدایی
و عەبداڵی
با بۆ کەسێکی دیکە بەمیرات بەجێ نەمێنێ دوو چاوی کاڵی،
قەدی شمشاڵی.

٦٣

لە پشتی ولاغان دەکرا زینێکی مورِەسەع و لە زاری ولاغان دەکرا
ددانە لغاوە

شۆڕ مەحموود لە پێشدا پێی لەسەر ڕاستەی ڕکێفێ دادەناوە
بەبێناریێ دا دەڕۆیی، جار جار بە نەرمە و جار جار دەیخستە پڕ تاوە
دەیگوت: ئەهلی بێناریێ! ئەوی لەگەڵم هاتە تەرکە و تورکومان
لەگەڵم گەڕاوە
ئەوان لەگەڵ من سینگی خۆیان بەمەودای خەنجەرێوە ناوە
ئەوان لەگەڵ منیان دیفاع کرد، لەگەڵ منیان لێ قەوماوە
هەرکەسێ دوژمنێکیان لەسەر پشتی ڕکێفێ فڕێ داوە
ئەوان پێشیان لە سمێڵ سپی کامەریان و جوکلی هەمەوەند و میری
گێلانگێسییان و سوورچی و زوراری و داودی دەگێڕاوە
دوژمنیان لێی شل دەبوو هەنگاوە و ئەژنۆی شکاوە
ئەمن بۆ ئەو سەفەرە دەڕۆم، دەوڵەت زیاد و ماڵ ئاوا
ئەگەر هات و لەو سەفەرە مەرگ نەبوو، بڵێن شۆڕ مەحموود گەڕاوە
ئێستا هاچەرم لە دەرکی خەزێنە نەداوە
عەبو تۆپ و مەجیدی و فەرەنتی و زێڕی سپی، بەخەڵات دەکەمەوە بڵاوە
جا خەڵک دەڵێن شۆڕ مەحموود بناغەی دەوڵەتێی لە بناریێ داناوە
ئەلعان بۆیە خەڵاتم بە کەس نەداوە، سەرم لێ شێواوە، ڕێم لێ
گۆڕاوە، برینی دڵم کولاوە مەرزینگان لە من ئێخسیر کراوە
بابی بۆ بوخارایەی بردووە، نازانێ شۆڕ مەحموود لەسەر خوانی
زینی هەر ماوە
مەگەر عومر تەقازا نەکا، دەنا بەخەنجەری دەم ڕەش هەڵی دەکەنم
هەردووک چاوە
کاتێکی خەبەرو زانی، کوتیان کەژاوەی مەرزینگان لە بەڵخ و
بوخارا گەڕاوە
جا ئەو حەلە گاو و گەردوونە، دەڵێن چوار سەت ئاسک و جەیران و
شەکی بێ ددان لە پیش کەژاوەی مەرزینگان کوژراوە

مامه ڕەش بەد بەختەو بەشی بەدنیاوه نەماوه
پیاو نابێ بۆ ژنان له دەستی خۆی بەرێ غیرەت و جەوهەر و میری و پیاوه
ئەما چبکەم وه نازانم ئەو دنیایه ئەگەر خودا ڕۆیناوه
بێ مەرزینگان بێ ئاقڵم، ئاقڵم له کەللەیدا نەماوه
چومکه مەسته، شل و مله، سایه گەردنه، تەعامی بەهەشتێیه خودا له دنیایه بۆ منی داناوه
به بێ مەرزینگان دنیای ڕوونم ناوێ، تاقەتی پیاوەتی و بیناهی چاوانم کەم له کن ماوه
سەرزەنشتی من مەکەن، تیری عیشقه ڕاست و چەپ له جەرگم دراوه
ئەو برینه بێ دەرمانه، کەس ئەو دەرمانەی بۆ من نەهێناوه
ژن و پیاو، خان و بەگلەر و ئاغا و نۆکەر تێکڕا له کۆڕەی گریانێیان دەداوه
دەیانگوت: شۆڕ مەحموود شێته، نازانێ یازده هەزار کەس چاوەڕێی وین، حوکماتی له تەرکه و تورکومان بەجێ ماوه
وه دوای مەرزینگان دەکەوێ، هەقیشیەتی مەرزینگان حۆری بەهەشتێیه و خودای تەعالا بۆ سەر ئەو دنیایەی هێناوه.

٦٤

سواران سوار دەبوون لەسەر خوانی زینییه
له شۆڕ مەحموود جوانه سەر و سواری و ڕەخت و ئاوزەنگییه
سوار بووه له وڵاغێکی شێر خەزاڵی عەسڵه گوڵ گوڵییه
یۆسفی میسرییه و زولەیخا دیار نییه
ڕەبی بەدوور بێ له دەرد و له بەڵایه، له تیری غەیبییه
ڕەبی لەو سەفەره بێتەوه بەساغی و بەسلامەتییه
ئاگادارت بێ چوار یاری نەبییه

عەبابەکر و عومبەر و عوسمان و عەلییە
ئاگادارت بێ سەهیدەل مورسەلین، کە بۆ وی بەخەڵات هاتووە
قورعانی عاسمانییە
چون مەقبوڵ و موعتەبەری دەرگای ڕەببییە
ڕەبی شۆڕ مەحموود شانت نەگرێ بەد بەختی و نەگبەتییە
ئاگادارت بێ وەیسەلقەرەنییە
ئاگادارت بێ خدر، ئەگەر دایمە لە چۆل و بەڕییە
ڕەبی مامە ڕەش بگرێ ئازاری گولییە.

٦٥

شۆڕ مەحموود سوار بوو. بێنار هەمووی ڕێگای حەو سەعات لەگەڵی هاتن، بەڕێیان کرد.
جار جار شۆڕ مەحموود ئاوری عیشق دەهاتە نێوی دڵییە
تەکانی دەدا بەوڵاغی شێر خەزاڵی سم تەبەقی عەسڵە بەحرییە
جار جار لاڕێ دەبوو بۆ ڕاوی حەیوانە کێوییە
ڕەبی تاوت نەدرێ لە خوانی زینییە
جار جار تیرەندازی دەکا لە قورینگ و قاز و خاسە سییە
پەڕندەن، ئەوان دەفڕن، بەوان دەڵێن: باڵندەی عاسمانییە
تیری بەخەتەر ناچێ، لە ڕاوی نێریە کێوییە
پێنج و شەش بە تیری شۆڕ مەحموود قورینگ و خاسە سی دەهاتنەوە سەر بەحرییە
ئاگاداری بێ ئیمامی ڕەبانییە
موسای کەلیموڵڵا، کە گوفتوگۆی بوو لەگەڵ ئیلاهیە
ڕەبی ئاگادار و هاوڕێت بن چل سوارەی غەیبییە
دوژمن زۆر خۆشحاڵن، دەڵێن: شۆڕ مەحموود لە گۆڕێ نییە.

٦٦

مامە ڕەش نیوەی ڕێگایە ڕۆییبوو. گەیشتنە دەشتێکی پان و بەرین و کاکی بەکاکی، جێگایەکی یەگجار خۆش و زەمەند و شیناوەرد بوو، چیمەن و مێرگ و ئاو و لەوەڕێکی زۆری هەبوو. چۆمێکی گەورە بەوێدا دەهات، لە هیچ جێیەکەوە بواری نەدەدا. لەسەر ئەو چۆمە پردێکیان ساز کردبوو کە یەگجار زۆر کۆن و لەمێژینە بوو، بە بیری کەس نەبوو. هاتوچۆیەک بووبایە، بە سەر ئەو پردەدا بوو.

مامە ڕەش لەو دەشتەی چادری هەڵدا، چەند ڕۆژان لەوێ ماوە.

٦٧

ئەو چۆل و بیابانە کابرایەکی لێ بوو، لێیان پرسی: چکارەی؟ کوتی: پردەوانم، ئی وا هەیە شتێکم دەداتێ و ئی وا هەیە نامداتێ، ئاگام لەو پردە دەبێ. مامە ڕەش عێلەکەی بەڕێ کرد و بۆ خۆی گەڕاوە کن کابرای پردەوان. بانگی پردەوانی کرد و کوتی:

پردەوان، ئەمن عیلاجم نایا

پێم وایە ئەمن دەبمەوە تووشی ئازاری دەردی موفاجایە

ئەمن قسێکی زۆر گەورە و گرانم لە دڵی دایە

ئەمن بەتۆ دەڵێم و ئەتۆش دەسپێرم بەو خودایە

ئەگەر دوروست کونەندەی عەرز و عاسمان و تەواوی دونیایە.

٦٨

پردەوان کوتی: بەوەی کەم ئەگەر ئەبەدییە

قسەی تۆ لە کن کەس ناڵێم ڕاستییە

سۆراغی لە کن کەس نییە

بەمن بڵێ قسەی خاترج

ەمی و ئەسەحییە.

٦٩

جوگمەی[٢٢] دەگرت و دەیگوت: پردەوان دەستی منت ببێتەوە بەدامانە

تۆ ئەو کەسەی خالقی عەرز و عاسمانە

کوڕە خاترجەم بە ئەنعامت دەبێتەوە سێ سەت زێڕی بە قیمەت گرانە

پاش سێ ڕۆژی دیکە دەبینی لە دەورەی ئەو پردە دەبێتەوە بە ڕۆژێ عەشر و ئاخری زەمانە

نۆ سەت سوار دێن، سوارێکیان لە پێشەوەیە، گەورەی ئەوانە

خەنجەرێکی دەم ڕەشی عەسڵە دەببانە

ڕاست و چەپ لە کەلەکەی چەپەی دانا

با دەستی پچێت بۆ هەڵکێشانە

بۆ ڕۆژی دڵ هێشان و لێ قەومانە

چومکی لەسەر مرادە دایمە لە ڕاوی قەندیلی مامە کۆییان و حەساری سەکرانە

شەو ڕاوی دەباتە هەواری بێریان و کۆسرەتی شاڵە بەگییانە

وەختی نیوەڕۆیە دەچتەوە ڕووباری جودیانە

ڕاوی وی ئاسکە و کەوە و کەروێشک و جەیرانە

عەسڵی مەتڵەبی منە، کیژێکم هەیە نێوی مەرزینگانە

ئەگە بێتو بمگاتێ بەقەتڵم دەگەیەنێ، دەمکاتەوە بێ گیانە

دەگێڕێتەوە شل و مل و سایەگەردن و ئارامی دڵانە.

٧٠

پردەوان! وەرمرە مەرد بە قسێکت پێ دەڵێم مەیخەوە پشت گوێیە

ئەمن زۆرم بەو قسەیە تەما پێیە

نەڵێی: مامە ڕەش هات و دیتم لەو پرد و لەو ڕێیە

چومکە تووشی کێشەی دەبی، قسێکی بێ ئیحتیبار و بێ جێیە.

٧١

ئەگەر هات و ئەو سوارانەت چاو پێکەوت و لە تۆ بوونەوە بەمێهمانە
نابەڵەدن، لێت دەپرسن گوفتوگۆ و قسانە
بڵێ مامە ڕەش ڕۆیی، کیژێکی دەگەڵ بوو نێوی مەرزینگانە
لە کەللەی خۆت بدە و دەستت بدەوە لە ڕانانە
بڵێ: ڕەببی نەمێنم، نەژیم بە ژییانە
کوتی: چیکەم ئەوە ئەمن دەبەن بۆ سەفەری گەورە و گرانە
شۆڕ مەحموودیش ئەوە لە تەرکە و توروکمانە
قاسیدێک نییە بەعەرزیدا خەبەرم بۆ بەرێ، خۆ مەگەر خەبەری
بۆ پچێ لە عاسمانە
ئەمن بۆ بەڵخ و بوخارا دەبەن و ڕۆژی هەناسە ساردی و دەست
لێک بەردانە.

٧٢

پردەوان! بڵێ زۆری بەخۆی هەڵکوت و هەڵی پالاوتن ئاوی چاوە
قەرە زولفی پەرێشان کرد بوون، هیچ ئاگای لە خۆی نەماوە
دەیگوت: پاش شۆڕ مەحموود ئەمن پەرییان دەستیان لە دڵم داوە
چیکەم، چم لێ قەوماوە، بۆ عەقڵم پەشۆکاوە
مردن خۆشترە نەوەکو بڵێن: مەرزینگان ئێخسیر کراوە.

٧٣

مامە ڕەش نسحەتی پردەوانەکەی کرد، کوتی:
پردەوان، هەزار جار دەستی منت بەداوێن بێ، ئەو ڕێیە کەسێکی
دیکەی پێدانایە
ئەگەر ئەو دەستە سوارە هاتن، لە سەریان دەڕوا پۆلێک شەهێن و
لە داوێنیان بزەن بزەن و هەڵڵا هەڵڵایە

کەمتر ئەو دنیایە پیاوی وا شۆخ و شەنگی تێدایە
بگری، ببارێنە، بلێ: مەرزینگان خۆی هاویشتە گێژاوی دەلیایە[٢٣].

٧٤

دەستی منت داوێن بێ، قسەکانم هەمووی بەجێیە
هەچ قسێکی کردم، سێ سەت زێڕم پێیە
کارم بۆ پکەی جێ بەجێیە
سوێندی بۆ بخۆ، بلێ: مەرزینگان خۆی هاویشتە گەڕی پردێیە.

٧٥

دەستی منت داوێن بێ پردەوان، بگری و بباری
بەهارە، تازەکانە ئەنگوتووە گوڵی هەناری
عاشق دڵیان بریندارە وەکو گازی ماری
بلێ: مامە ڕەش ڕۆیی، ئەمما بەخولای مەرزینگان خۆی هاویشتە
نێو گەڕی ڕووباری.

٧٦

مامە ڕەش شەش سەت زێڕی یەک سکەی دا بەپردەوانی و گەڕاوە. مەرزینگانیش بە دزی گەڕاوە کن پردەوانی. نەحلەت لە پردەوانی، سڵاوی لە پردەوانی کرد، کوتی:
پردەوان دەستی منت بەداوێن بێ، ئەمن خراپم لێ قەوماوە
دڵی من هەنارە و سەری ئەو هەنارە پساوە
وەختێکی ئەگەر شۆڕ مەحموود هات، عەجیب شیرین لاوە
پێی بلێ: مەرزینگان دەگەڵ مامە ڕەش ڕۆیین بۆ بەڵخ و بوخارا
ئەمما گەڕاوە، لەگەڵ من تاوێک ڕاوەستاوە
چاوەڕێی شۆڕ مەحموود بوو، هەڵی دەپالاوتن گۆشەی چاوە
دەتگوت پۆڕی بەڵەکە و قاز و قوڵینگە و سەری لێ شێواوە
دەتگوت سوورە قورینگە و شەوارە[٢٤] و داویان بۆ داناوە.

٧٧

دەستی منت داوێن بێ، بڵێ: یەگجار زۆر کیژێکی سەربەخۆیە
شل و مل و چاو هەڵۆیە
یەگجار زۆر چاوەڕێی تۆیە
دەردە دارە، بریندارە، دەروون پڕ لە بۆ سۆیە.
دەستی منت بەداوێن بێ پردەوان، خاتر خۆمە
زۆر چاوەڕێ و دڵ ڕەنجەڕۆمە.

٧٨

ئاخر بەوەی کەم ئەگەر ئەبەدییە
شەمامە و شەمامە ڕەنگینی من بۆ کەس نابێ بەمیراتییە
خاترجەم، لە شۆڕ مەحموود زیاتر، بەشی کەسی دیکە نییە
باب وەلی نێعمەتە و، ئیختیار لە دەستی خۆمدا نییە
ئەوە دەڕۆم و لێت دەکەمەوە خوداحافیزییە
ئەوە بیست زێڕ و شەرت بێ ئەگەر هاتمەوە بتدەمێ حەو سەت
زێڕی یەک سکەی زێڕی سپییە.
مەرزینگانیش گەڕاوە، ڕۆیی. پردەوان، ژنەکەی کوتی، پێی کوت:
بەقسەی مامە ڕەش بکە. ژن هاسانی مێردییە.

٧٩

شۆڕ مەحموود لە تاو مەرزینگان ئەوی عەقڵ مەعنا بێ نەی مابوو، دەیگوت:
نەمێنم، کیژی بەلەک زەردیان برد.
بەوەی کەم ئەگەر بێ مەکانە
عەرز و عاسمانی بە کفلەکونێک دانا
نە بە وڵاغم دەگرمەوە وچانە
نەبۆخۆشم دەخۆم پارویێک نانە

خەڵات هات بۆ نۆکەرانە
دەیکوت: مام دەبێ لە جێگای باب بێ، تەماشای چی لەگەڵ ئەمن
کرد. لە دەستم دەرچوو کیژەکەی نێو مەرزینگانە
مەگەر بە سێ ڕۆژی دیکە پچێتەوە پەڕڕەی عاسمانە
دەنا شەرت بێ سەکەتی پکەم و بیکەمەوە بێ گییانە
چومکە شەو ڕۆ بە مەرزینگان دەکاو لێی تێک دەچێ زنجیرەی
دە زولفانە
ئەڵماسی سپی ژەنگ دێنێ لە مابەینی سینگ و مەمکانە
هەک نەمێنم! نەوەکو خەوی بشکێ لە چاوانە
عاجز ببێ ئەو شل و ملی لەبەر دڵانە
مردن بۆ من چاکترە لەو حەسرەت کێشانە
هەک نەمێنم! نەژیم بە ژییانە
بە سێ ڕۆژێ دیکە دەگێڕمەوە کەژاوەی یاقووتی عەبدولحسەن و
لەعلی ڕوممانە
جا ئەو هەلی گەردنی دەکەمەوە حەوزی کەوسەر و بەژنی دەکەمەوە
بەیداغی ڕۆمییانە
لە بن ویدا ئیستێراحەت دەکەم، ئەو هەلە دەگرمەوە ئارامگا و
وچانە
چومکە بەخۆم نییە، لە جەرگی داوم تیرێک لە پشتم بۆتەوە بەپەیکانە
بەخودای جوانم ئەمما وەختە ڕووناکیم ببڕێ لە هەرتک چاوانە
بۆچی ئەوی کیژێ شل و ملی نێو مەرزینگانە
تەرحی ئەو حۆریانەیە ئەگەر خوداوەندی میری مەزن لە بەهەشتی
باقی دانا.

٨٠

ئەوە شۆڕ مەحموود هاتە پردێ. پیاوێک بوو وەک زێڕی. پردەوان عەبەسا.
شەوکەتی پوری پەشەنگ یانی ئەفراسیاب وا نەبووە. کوتی:

پردەوان! تۆ ئەو خودایەی ئەگەر ئەبەدییە
بمدەیە خەبەرێکی بە ڕاستی و بە ئەسەحییە
ئەمما بڵێن قسەی تۆ ڕاستە و درۆی تێدا نییە
کوڕە درۆ بکەی دەتبەستم لە کلکی ئەسپییە
بەخوێنی تۆ عەرزی دەکەمەوە کەسک و سوور و لیمۆییە
چونکە دڵی من لە ژانە، کەس ئاگای لە دڵی من نییە
زووبە بمدەیە خەبەری بەمتمانە و بەئەسەحییە
مامە ڕەش هات و ڕۆیی، سەرداری بێناریٚ، بۆ سەفەری بەڵخ و
بوخارا، تۆ بەچاوی خۆت دەتدییە
کەژاوەت دی، دەگەڵی بوو شلکە بیزا، ئەگەر دەڵێی تازە هاتۆتە
دەر لە بن ڕندووی دە بەفرییە
مەلەکەی گەوهەر تانج سوور و سپییە
کەژاوەت یاقووتی عەبدولحەسەنە و پێشی کەژاوەی زێڕی سپییە
کەژاوەیان ناوە لە دوو وشتری جانی بنی جانییە.

٨١

ئەتۆ توخلا پردەوان پێم بڵێ لەگەڵی بوو هیچ حورمێ و کچ و ژن
بۆ خۆت چاوت پێکەوت بەشل و مل و سایەگەردن
ئەگە کەس چاوی لەبەر هەڵ نایا، دۆست هەتاوەکو دوژمن
چۆنت خانە خراپ کردم ئارامی دڵی من!
باغچەی هەڵاڵە و بەیبوون و سوێسن
بۆ جەرگ و دڵی منت هیلاک کردووە، کردووتە کون کون؟
ئەگەر ئەو دەستی پێ دابێنێ ئەو هەلە ژانی دەشکێ برینم، ئەمن
دەبمەوە هێدی و هێمن.

ڕوی بابی ڕەش بێ پردەوان، بۆ نەگریا
کوتی: ئەمیر، بەو ئەلیاسە کەم ئەگەر دایمە خەریکە، مەعمووری بەحرانە
بەو خدرە کەم ئەگەر دایم فەریادڕەسە و مەعمووری چۆل و بەڕیانە
بەو محەممەدە کەم ئەگەر خودا لە خۆشەویستی وی دنیای دانا
بە نوحی نەبی کەم ئەگەر عومری وی گەیشتەوە بە نۆسەت ساڵانە
لە خزمەتی تۆدا درۆ ناکەم، هیچ ناش کەمەوە بوختانە
بۆچی بۆ من ئیعتیرازە، پێم بڵێن درۆزن بوو ئەو پردەوانە
دەستی دەدا لە ڕانانە، ئاوی دەهات لە چاوانە
بە لەعنەت بێ وەک ئەزازیل تۆقی لە عنەتی بێ لە ملانە
جا هیچ فەرقی نییە، ئەویش هەر شوبرە و هەر شەیتانە
لە تەپڵی سەری خۆی دەدا و دەستی دەکرد بەگریانە
پردەوان دەیگوت: برینت کولاندمەوە، ئەو دەردەم تازە ناکرێ دەرمانە
کیژێکیان لەگەڵ بوو، شل و مل، نێوی مەرزینگانە
باڵا بڵند بوو، گەردن کەشانە
یەگجار زۆر قسەزان و عاقڵ و لەبەر دڵانە
لە ڕێگایە گەڕاوە، نازانم شۆڕِ مەحموود کێیە، ئاخ و حەسرەت و داخی بۆ شۆڕِ مەحموود دەکێشانە
دەیگوت: پاش شۆڕِ مەحموود، مردنم پێ خۆشترە، نامەوێ ئەو ژیانە
گەردن باغێکی لە ملیدا بوو، ئەوی بە قیمەت گرانە
شل و مل و سایەگردن، تام خۆش و بۆن خۆش و لەبەر دڵانە
هەک نەژیم! نەمێنم بەمانە
بەخۆی و بەژنی لە بانگێیان دەدا و دەستیان دەکردەوە بە گریانە
کوتیان: مەرزینگان زۆری بە خۆی هەڵگوت، دەیگوت هاتوومە

سەرخۆ کوێرکردن و سەر ئەوەی خۆ پکەمەوە بێ گیانە
گەلێکی بەشۆڕ مەحموود هەڵگوت: گەلێکی ئاخ هەڵدەکێشانە
ئاخ! دەیگوت چبکەم! گەلێک عەزیەت و عازاب و سەخڵەت و
ساغاوی کێشا لە تەرکە و تورکومانە
ئاخری ئەوڕۆکەم چاو پێکەوت، پێم بۆتە ڕۆژی ئاخری و دەست
لێک بەردانە
تازە چاومان بە یەکتری ناکەوێ هەتا ئەو ڕۆژەی خودا دەکاتەوە دیوانە
ماڵم خرابوو، ڕەبی کوێر بم لە چاوانە
خۆی لە چۆمی هاویشت و ئەلعان قەبری وی زگی ماسییانە!
شۆڕ مەحموود دە عەبەسا، هیچ لەکنی نەدەما ڕوح و گیانە
قرمەی لە خەنجەر دەهێنا، دەتگوت ئەمیر ئەرسەلانە
سەعاتی هەوەڵ پردەوانی هەڵدڕی، دەیکردەوە بێ گیانە
دەیگوت: بە ئاواتم خواستبوو ئەتۆ دەمدەیەی خەبەری مردنی
مەرزینگانە!
کوتی: ماڵەکەی ئاور تێبەردەن، وە دەرنەکەون ماڵ و خێزانە.

٨٣

جا شۆڕ مەحموود هاتە سەر پردێ و کوتی:
مەرزینگان، چبکەم هەتا ڕۆژی قیامەت لە من بوویەوە قاتی
چاوت بە من بمێنێتەوە بەئەستێرەکەی ڕۆژێ، ئەگەر گەز و
نیوێک لە پێش بانگی مەلای ماوەراندا دەهاتی
قەرە زولفت بەمن بمێنێتەوە بە گەز و نیوگەزەکەی ڕەحیم خەیاتی
بەژنت بە من بمێنێتەوە بە داری فندق، ئەگەر بەئەمری خودای
لە عەرزی دەردەهاتی
شل و مل و سایەگەردن لەوێ نیازیان دەکرد و کەیخودا و ڕدێن
سپی لەوێ دەیانگرتەوە مەجلیس و جەماتی

ئەوە مبارەکی تۆیە لێی دەبارێتەوە وردە نوقڵ لەگەڵ ڕێزەی شەکر
و نەباتی
ئەو کەسانەی ئەگەر سبحەینان زوو دەچنە مەجلیس و جەمات و حوکماتی
ئەگەر بێنە بن ئەو دارە دەیان بێ هونەر و غیرەت و زاتی
چۆن ئاخری وام لێ هات لە من بوویەوە قاتی!
جا ئەمن لە بۆچمە حاکمەتی کاولە وڵاتی.

٨٤

کوڵمەت بەمن بمێنێ، هێندێک بڵێن لەعلەو هێندێک بڵێن گەوهەرە
قوڵکەی گەردنت بۆ من حەوزی کەوسەرە
ماچی تۆ بۆ من گۆ لە دنیا دەرکەرە
جا خۆ نەمانی تۆ بۆ من باسی سەرە.
کوتی: میراتی من بۆ سەردار عێلان بەجێ دەمێنێ. لەسەرڕا خۆی دە دەریایە هاویشت.

٨٥

مەرزینگان ئەگەر زانی شۆڕ مەحموود نەهات، سەت زێڕی دا، کوتی:
بمگێڕنەوە بۆ سەر پردێ. ئەگەر هات، دیتی سوار هەموو کلکی وڵاغیان شین کردووە. ئیدی زیندەگانی لێ حەرام بوو، کوتی: ماڵم بەقوڕێ گیرا! جا کوتی:
سوارینە! وەرن لە دڵێکە من گەڕێن، ئەوە چ بووە، چ قەوماوە
ئەی لەوی خەبەری لە نەدیوو و لە نەکاوە
کۆرە! خۆ ڕاستە دەڵێن: شۆڕ مەحموود لە گێژی دەریایەدا خنکاوە
سەلای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، کەسم لە ماڵە باوانی نەماوە
شەرت بێ پاش تۆ یەخەی کەتانی من بۆ کەس ئاواڵە نەکراوە
تا ئەو ڕۆژی دەڵێن: ڕۆژی قیامەتە و ڕۆژی عەشر و خودا دیوانی داناوە.

٨٦

کوڕە گەڕی سواران، بۆ من پکەنەوە شەڕ ناخێوی و جلیتانێ
تا من سەرم بەرمەوە سەر شێلینگی کووپەڵەی دەخمخانێ
لە بۆ سوارەکەی تەرکە و تورکومانێ
لە گێژی دەریایەدا خنکاوە و بۆتەوە بێ گیانێ.

٨٧

لە دڵێکە من گەڕێن چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە
جا ئەمن بۆ چیمە ئەو زیندەگانی و ئەو ژیانە
کەسێکی دیکە لە سینگ و بەرۆکم بگێڕێ پەنجانە
میراتی شۆڕ مەحموود لەگەڵی ببێتەوە بە ئاملانە
هەڵبەتە مردن خۆشترە لەو ژیانە.

٨٨

سوار بۆم پکەنەوە جلیتان و شەڕ ناخێوییە
بۆم بگێڕن گەرمەشینێک، ئەگەرچی هیچ شتێک لایەقی شۆڕ مەحموود نییە
چۆن ئەلعان شۆڕ مەحموود کفنی وی زگی ماسییە
جا ئەمن ئەو جارەکە دابنیشم بەزیندەگانییە
چەپڵە لێدەن، بڵێن مەرزینگانیان برد بەبووکییە
عاقڵمەندان بڵێن: عافرەت هیچ نییە و بەقای بۆ نییە
وەڵڵاهی کفنی منیش زگی ماسییە.
لە چەپڵەی دا و ئەویش خۆی دە دەریایە هاویشت.

٨٩

مامە ڕەشی تولەباب پرسیاری کرد، کوتی: مەرزینگان کوا؟ کوتیان:
سێ ڕۆژە گەڕاوەتەوە. مامە ڕەشیش گەڕاوە. سوارەکان ئەو بەرە و بەری پردێیان

لێ گرت. پرسی: چ بووە، چ کراوە؟ کوتیان: حاڵ و موقەدەرێکی وایە. گریان و داد و فیغان دەستی پێ کرد. مامە ڕەش لەسەر پردێ هات و چوو. حەوت برازای دیکەی بوو، ئەوانیش گەڕانەوە، کوتیان: مامە ڕەش بۆ نەهاتەوە؟ ئەوانیش هاتنە سەر پردێ، کە وایان زانی، مامە ڕەشیان گرت، لە نێوە ڕاستی بەحرێیان هاویشت.

جا هەر میرزای بانگ کرد خۆی حاشیەی دانا

دانای عاقڵمەند ڕوویی زەمانە.

جا کوتیان: فکر ئێمە چۆن ئەو جەنازانە لە دەریایە بێنینە دەرێ؟ چاوەش و دەهۆڵ و زوڕنایان هێنا، لێیان دا. جەنازە وە قەراغ ئاوێ کەوتن. شۆڕ مەحموود و مەرزینگان دە باوەش یەکتریدا بوون. بەحەسرەتێکی زۆر تەسلیم بەخاکێیان کردن.

٩٠

ئەی دنیای وێران، بناغە ڕووخاوە

دڵ بە کوێت خۆش کەم دنیای ناتەواوە

جێگا و ڕێگای شێران تێک دراوە

لە دەریایەدا شۆڕ مەحموود و مەرزینگان خنکاوە.

نۆ سەت کەسی بوو هەر لە جەماتێ

لەوی شیرن بوو حوکم و حوکماتێ

دنیای بێ وەفا کەست ناگاتێ

یان ساحێب جەوهەر یانە بێ هونەر

یان فەرمان بەردار یانە ئەمر بەر

تا شا تا سوڵتان تا میر و بەگلەر

دنیای بێ وەفا بۆ کەس ناچتە سەر.

ئەی لەوی کاولە دنیایە

بۆ کەسی نەبوو شەرت و وەفایە

جوانان دەستیان پێ دەگرت، پیران دەستیان لێ بەردایە.

چەند خانم و خاتوون، زولفی عەمبەر بۆ

ناسک جەبینان، شیرن چاو و برۆ
ساحێب جەوهەران، کوڵمە وەک لیمۆ
عاقیبەت مەرگە، من دەستە و ئەژنۆ.
چەند ڕۆڵەی جوان چاک باڵا نەستەرن
هەمووی چاوەڕێی حەوزی کەوسەرن
چەند میر و بەگلەر چەند پەڕ بەسەرن
عاقیبەت دەبێ خەبەری مەرگ بەرن.

پەراوێزەکان:

(١) «دەیکوت»، «دەیگوت»یش بێژ دەکرێ و هەردووکیان ڕاستن.

(٢) لەم دەقەدا باسی (بینار) زۆر دەکرێ و وێدەچێ بینار ناوی ولاتێک بێت. حکایەتە کوردییەکان باسی ئەوە، دەکەن کە ئەمیرێک بەناوی سوڵتان ئەحمەد لە بینار سەری هەڵداوە و بەیتی سوڵتان ئەحمەدی بینار کە هێشتاش هەرماوەتەوە ئەم بۆ چوونە دەسەلمێنێ. لەسەرەتای ئەم کتێبەدا گوتمان کە «مەڵکەتی» و «خڕناڵ» چوونە لای «وسوو شایەر» و ئەو بەیتە لەو فێربوون. بەیتی سوڵتان ئەحمەدی بینار، لە زمان مام ئەحمەدی لوتفییەوە بەم شێوەیە دەسپێدەکات:

سالێکی هەوەڵی بەهارێ
باران لە سەدر دەبارێ
گوڵ پشکوتن لە نسارێ
خون لە چاوم دەبارێ
لە سبحەینێ تا ئێوارێ
ئەمن ناگرم سەتارێ
بەیتێکم هاتە سەرزار، یا پادشای جەبارێ
ئەو بەیتەم بۆ پکەی ڕەوان، نەبێتە بەند و درۆ
خولا وای لە دڵی ناوم، بەیتان دەکەم سەربەخۆ
ڕەبی زمانم لەنگ نەبێ، دانەنیشم دەستەو ئەژنۆ.
ئەو جار ئەی دۆست و خزم و یارێ
خوناوکەی زووقم لەسەر گولان دەبارێ
بەیتێکم هاتە سەرزار، تاریفی سوڵتان ئەحمەد یبێنارێ
هەم میرە و هەم خانە
زۆر پیاوێکی چازانە

گەورەی سەرپاک کوردانە
بێ تانجە، بەشایان دانا
موحتەبەری سوڵتانە.

(۳) هەقیقی، شاعیری هاوچەرخ، قەسیدەیەکی دووروودرێژی هەیە کە لەبەیتی دووهەمیدا ڕێکرە وەندی «گەواڵ گەواڵ»ی بەکارهێناوە، چونکی ئەو قەسیدەیە هەتا بڵێی جوان و بەرزە، لێردەا دەقەکەی دەنووسینەوە:

دیسان شنەی نەسیمی بەهار و کزەی شەماڵ
دیسان بەبەرگی تازەیەوە تازە بۆوە ساڵ
تۆقی سەراوی کانی لەبەر گرمە گرمی ڕەعد
شین بوو زەوی بەنم نمی هەوری گەواڵ گەواڵ
غەمڵی چییاو چەمەن بەسپی و سەوز و زەرد و سوور
دار و دەوەن بووە بەهەزار ڕەنگی ئاڵ و واڵ
لاچوو بەجارێ پەردە لە ڕوی جەننەتی ئیرەم
ڕازاوە تاقی ئەتڵەس و کیمخووا و حەریر و واڵ
کۆستان لە بۆی هەلاڵە و بەیبوون، عەبیری خاو
ڕەنگاوە باخچەکانی وەکوو بوکی چاردە ساڵ
ئەشکەوت و کێووکەژ بەخڕی قاسپە قاسپی کەو
گۆ کەڕ دەبێ لە قاڕەیی قاز و قوڕینگ و داڵ
یا بارە باڕی بێچووە یا کارە کاڕی مەڕ
یا قارە قاڕی قومرییە یا هارە هاڕی باڵ
دێن و دەچن بەدوند و قەدی زەرد و ماهەوە
گا کێوی تاق و جووت و بەگەل مێگەلی مەڕاڵ
پێش ئەو دەمەی گزینگ لەسەران دا بەری بەیان
یا ئەو دەمەی کە زەردە لە کێوان دەدا بەحاڵ
بنوارە عەینی قەوزو قوزەح دێتە بەر نەزەر
خاش خاشکی سور و سەوزەیی سەوزی بنارو یاڵ
پۆلی کچان بەیانی دەمێ دەچنە گوڵ چنین
وەک حۆریان دەچن هەموو لێوئاڵی چاو خەزاڵ
قەدیان وەکو بلوورە برۆیان وەکو هیلال
چاویان میسالی نێرگسە مەست و خومار و کاڵ
دەم چەشنی غونچەیی گوڵەباغی بەری بەیان

ڕوومەت دەڵێی شەهیدە لەخون دا بووە شەلاڵ
عەینەن دەڵێێ بەمێخەکی نەخشاوە سێوی سوور
وەختی کە دێن دەبینی لەسەر کوڵمە وردەخاڵ
جووتەی مەمک بەڕاست و چەپی سینەوە دەڵێی
پەیوەندی داری عەڕ عەڕە نارنج و پورتەقاڵ
ئەو بەحسە بەزاییقەیی شیعر و شاعیری
زۆر خۆشترە لە نۆبەرە سێو و هەناری کاڵ
بۆ باس و خواسی زەڕڕەیەک ئاساری کردەکار
فکری بەشەر دەوەستێ، زمانی لە وەسفی لاڵ
ئەو سۆسنە و وەنەوشە و نەسرینە بۆ چییە
ئەو ڕەنگ ڕەنگی سور وسپی و زەرد وشین و ئاڵ
بۆیەن هەتا لەبیرچێ خەمی بەفری نەگبەتی
بۆیەن هەتا نەمێنی نیشانێ لە دڕک و داڵ
بۆیەت شەواوی باغی دەدات و نمی کەڕەم
تا گەش ببێتەوە گوڵی عومرت لە ژینی تاڵ

٤- «ئیسقایی»، وێدەچێ هەمان نەخۆشینی ئێستیسقا بێت. ئەم ناوە لە فەرهەنگی مەهابادا، کۆکراوەی گیوی موکریانی، و هەروەتر کتێبی «کۆلکە زێڕینە»ی هەر ئەم نووسەرەدا نەهاتووە.

٥- کراو، لێرەدا بەواتای پاژنەیە.

٦- لەم دەقەدا وشەی سینگ جاری وایە هەر بەم شێوەیە و جاری واشە بەشێوەی «سنگ» بەکار هێنراوە.

٧- لووزەو: انصباب، هطول (للماء و الحبوب). فەرهەنگی مەهاباد.

٨- بەگوتەی بەیت بێژ (نەسیرخانە) شوێنێکە تێدا تاژی و توڵە ڕادەگرن.بەشی یەکەمی ئەم وشەیە واتە «نەسیر» بۆ من زۆر نامۆ و نائاشنایە.

٩- دەستەواژەی «داو و دەلینگ حاجی حوسێنی» هێشتاش کەموزۆر لە ناوچەی مەهاباد لەسەر زمانی خەڵکە. واتە ئەو پانتۆڵەی کە دەڵێن ئی حاجی حوسێنە، بەڵام کەس نازانێ حاجی حسێن کییە و چ کارە بووە. بەکورتی «داو دەلینگ حاجی حوسێنی» بەکچ یان ژنێک دەگوترێ کە پاو پەل و پانتۆڵی ڕێک و پێک و جوانی لەبەردابێت.

لەفارسی و کوردیدا وشەی «لینگ» بە«دی دەکرێ. لەوانەیە وشەی» «دەلینگ» پێوەندی بە«لینگ»ەوە هەبێت [واتە دەرەلینگ، بەشی دەرەوەی لینگ]. وشەی «داو»یش لێرەدا وێدەچێ کورتکراوەی «داوێن» بێت.

١٠- «لاپ» لەفزێکی عامیانەیە و ئێستا بەکار نابردرێ. وێدەچێ ئەم لەفزە بەڕای بەیت بێژ مانای

نیشانه و هێما و شتێکی لەمجۆرەی هەبێت.

١١– بوولێڵ بەواتای تاریکایی بەرەبەیانە. ئەم وشەیە لە فەرهەنگی مەهاباد دانەهاتووە. «لێڵ» بەتەنێ بەواتای ون و نادیارە لێڵی وشەی بوولێڵ لە گۆرانییەکی کوردیدا هاتووە:

چاوت ئەستێرەی بوولێڵیی

لە غەریبیات بەجێم دێڵێ

لەیلی ڕۆیی لەگەڵ خێڵی

عاقڵ و هۆشم پێ ناهێڵی.

١٢– عەشیرەتەکانی دەوروبەری مەهاباد لەبری «لێ قەومان».

دەڵێن «لێ قەڵمان»

١٣– لێرەوە بەم ئەنجامە دەگەین کە مێخی خەنجەر لە شێوی دووپشک دابوون.

١٤– ملوێنک: گەردەن بەند، ملوانکە.

١٥– دەمار قۆپان واتە پانتۆڵ. ئەم وشەیە لە فەرهەنگی مەهابادا دا هاتووە.

١٦– ناخافل: لەناکاو، لە پڕدا

١٧– حەمایاڵ لە کوردیدا بە دوعا نووشتە دەگوترێ کە لەسەرشانی دەدەن.

١٨– ڕەقام: وێدەچێ «ڕەواق»بێت و «ڕەواق» لە فەرهەنگی مەهاباد دا بەم شێوەیە لێکدراوەتەوە:

العسل المصفی

١٩– لەفزی «چومکە» لێرەدا زیادەییە.

٢٠– شەکی کەوەسێر، بەبەرخی دووسالآن دەگوترێ کە لەشی سپی و سەروگوێ و چاوی ڕەشە. «قەرەقاچ»یشی پێ دەڵێن. «قەرەقاچ» وشەیەکی تورکیە و بەواتای چاو ڕەشە.

٢١– لانووایان، کۆیە و تاکەکەی دەبێتە «لانووا» بەبڕوای من «لانوایە» بە قەڵشت و پەناگەی کێوان دەگوترێ و لە دوو وشەی «لا» و «نووا» پێکهاتووە. «لا» بەواتای نزیک شتێکە. وەک دەڵێن «لای کێوی» واتە نزیک کێو «نووا» دوومانای هەیە یەکێک لە ماناکانی «پەنا»یە، وەک دەڵێن: «پەناو نووای نییە»ماناکەی تری بریتییە لەو هێندە بەفرەی عەرز دادەپۆشێ، وەک دەڵێن «نووایەکە باریوە.»

٢٢– جوکمە، جونگەشی پێ دەڵێن.

٢٣– دەلیا، هەمان دەریایە بەیت بێژ جاری وایە ئەم وشەیە بە «ل» و جاری واشە بە«ر»بێژ دەکات. لە فارسیشدا «ل» و «ر» جێگا دەگۆڕن، وەک: الوند و اروند یان سوراخ و سولاخ

٢٤– شەوارە، بە ڕاوی شەوانە دەڵێن: لێرەدا «شەوارە» هاومانای «داو»ە.

١

پادشایەک بوو لە قەیسەری ڕۆمێ؛ ساحێب ئیختیار و دەسەڵات بوو؛ یەگجار دەست ڕۆییو بوو؛ قاقانێکی زۆر گەورە بوو. ئەو پادشایە سێ ژنی بوو. هەر کچی دەبوو، کوڕی نەدەبوو. تەمەننای کرد، کوتی:

ئیلاهی ئەمن پادشایەکی دەست ڕۆییوم، پادشایەکی دەوڵەمەندم
ئەمن لەسەر ڕوحمی تۆ بەندم،
حەیف! بێ ڕۆڵە و فرزەندم.

٢

پادشا ڕاوەستا لەبەر ئەکبەری
ئەڵڵا فرزەندێک بەمن بدەری
پەنام وەبەر تۆ پەنا و خودایە
لە بۆ لێقەومان، جلیت[١] و ئاڵایە
لە بۆ دڵ هێشان[٢]، ڕۆژی داعوایە.

٣

دوعای قەبوڵ بوو بەعومری ڕەحمان
پادشای لەم یەزەل، سەعید و سوبحان.
نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ داخڵ بوو تەمام
خولا کوڕێکی دایە، نێویان نا بارام.

٤

حەو جار نۆ گامێش قوربانی و خێر بێ
فەقیر و هەژار پاکی پێی تێر بێ
لە ڕێی خودادا بارام نێو دێر بێ[٣].

٥

حەو جار نۆ گامێش دەگەڵ سەت مەڕی
لە دەرکی مزگەوت پاکیان سەربڕی
خێراتی شایە، شادیانەی کوڕی.

٦

دەرکی خەزێنە ئاچغ[٤] بێ تەمام
با خەڵک بیبا (بەرێ)[٥] خەڵات و ئەنعام
بەڵکو نێودێر بێ فرزەندم بارام.

٧

ئەلحەمدولیللا کەوتمە سەر قسان
خولا کوڕێکی دا وەکو قارەمان
بۆ ڕۆژی شەڕ و وەختی دڵ هێشان.

٨

مەلای بانگ کردن بۆ گوێزەبانە[٦]
زێڕ و زیوی شا زۆر فراوانە
لە ڕێی خودادا دای ئەو بەوانە.

٩

بەخەڵکی دەگوت: دڵتان وشیار بێ
بێ زوڵمم ئەمن، خۆشتان ئەحواڵ بێ
بەڵکو ئینشەڵلا بارام بەرقەرار بێ.

١٠

عومری بارامم ئێستا سێ ساڵ بوو
گەلێک بەهۆش و عەقڵ و کەماڵ بوو

قۆڵی ڕاستەی بازی بەندی[٧] لاڵ بوو
بەشان و شەوکەت ڕۆستەمی زاڵ بوو.

١١

ڕۆڵەی زەمانە، دەورەی ژیانە
بەشان و شەوکەت وەک قارەمانە
پادشا سوجدەی برد لەبەر ڕەحمانە
تۆ لێم نەستێنی ئارامی دڵانە.

١٢

لە سێیە هەڵ برد، ئەو بوو بە حەوت ساڵ
ساحێبی بەخت و کەماڵ و ئیقباڵ
شا بەشانی دادا تورمە دەگەڵ شاڵ
فرزەندە بۆ تۆ من بووم بەعەبداڵ
خودایە لێم نەستێنی دوو چاوی کاڵ.

١٣

لە یازدە ساڵە ئەو دەبوو بە سوار
یەگجار مەزبوت[٨] بوو وەک ئیسفەندیار
تورکی خوجەندی، ئەو مەردی سالار
وەکو ڕۆستەمی ئەو دەکرد ڕەفتار.

١٤

عومری بارامم چاردە ساڵان بوو
ئیشتیای لە ڕاو و چۆڵ و بیابان بوو
پیاوێکی عاقڵ و گەلێک زۆرزان بوو.

١٥

مەتاڵ و کەمەند لەگەڵ تەرکەشی
پاکی قایم کرد لە پشتی ڕەخشی
بارام دەچتە ڕاو بۆ چیا ڕەشی.

١٦

جارچی جارکێشا لە چوار کەنارە
دوازدە هەزار سوار دەبێ بن سوارە
ڕێگای بارامم چومکە دیارە
ئەورۆ بەڕاوێ دڵ گرفتارە.

١٧

مەنسوور پادشایەک بوو؛ پادشای حەڵەبێ بوو. جحێڵ بوو؛ تازە دەگەیشتێ. لە مەملەکەتی حودزەمین[٩]، پادشایەکی زۆر گەورە هەبوو؛ نێوی عادل شا بوو. ئەو پادشایە کچێکی بوو نێوی گوڵندام بوو. کچێکی برازای بوو نێوی فیدایی بوو. فیدایی لە بەردەستی گوڵندامدا بوو.

خودا وای دروست کردبوون؛ وەکو دوڕڕی یەک دانە. تەواوی پادشای دنیایە دەهاتن بۆ سەیاحەتی ئەو دووانە. ئەو شا مەنسوورە و خەڵک دەهاتن، عاشق بوون، خێوەتیان هەڵدەدا لە دەورەی شاری هەتا بزانن عادل شا ئەو دوو کچە دەدا بەکێ؛ جارێ قەولی بەکەس نەداوە.

گوڵندام ڕۆژێ دەسکێک گوڵ دەنێرێ. فیدایی ڕووبەند دەپۆشێ، دێ دەیدا بەعاشقان؛ دەڵێ: ئەوە گوڵی گوڵندامە. عاشقان فەرامۆشییان پێی دێ[١٠].

ئەو مەنسوور شایە؛ ئەگەرچی گوڵندام لایق تر بوو؛ عاشقی فیدایی بوو؛ عەقڵ و هۆشی نەما بوو. پرسیاری لە قسەزانان کرد، کوتی: ئەمن داوای فیدایی بکەم چۆن دەبێ؟ ئایا دەمدەنێ؟ دیارە پادشام و جوانم. کوتیان: نەکەی بەدبەخت! دەبێ قسێک لە فیدایی بزانی. مەبە باعیسی ڕۆحی خۆت لەسەر دڵی بریندارت.

جارێکی فیدایی گوڵی گوڵندامی هێنا بیدا بەعاشقان. لە گەڕانەوەدا ئەو مەنسوور شایە وەدوای کەوت تا گەیشتە جێگایەکی پەسیو و نەدیو؛ جا کوتی:

١٨

دایمە لە دڵمدا داد و فریادە
دەردی بێ دەرمانت بەجەرگم دادا
فیدای چاوت بم، چارشێوت لادە.

١٩

بەڵکو بیدینم دوو چاوی کاڵت
بەژنی بلوور و قەدی شمشاڵت
ئەبرۆی کەمەند و پڕ ئەحواڵت.

٢٠

بەڵکو بیدینم، جەرگم بوو کەباب
دوو چاوی ڕەش و دوو ئەبرۆی جەلاب
بۆ ئەڕواحی من بوون بە قەساب
چیدیکە جەرگم مەکە بە کەباب.

٢١

تۆ شێتم مەکە ئەی باغی سێوان
من وەکو مەجنوون مەنێرە کێوان.

٢٢

لێت خاترجەم بێ تاڵە ئەحواڵم
دەروون پڕ لە ژان، زۆر گەروو تاڵم
گەر خودا بدا بەخت و ئیقباڵم
لە دوای باڵای تۆ ئەمن عەبداڵم

وەک لەیلی و مەجنوون تێک نەدەی ماڵم
سێوی نەگەییو، هەڵووچەی کاڵم.

٢٣

ڕووت ناری نمرود، باسی ڕووت مەکە
ئەگریجە لە برۆت تاق و جووت مەکە
فەقیرم، تۆ دڵی من نابود مەکە.

٢٤

وەرە لە هانام، دڵ داد و فریاد
سنگ ئاواڵە کە وەک باغی شەدداد.

٢٥

پێم بڵێ: فەقیر تاڵە ئەحواڵت؟
توخڵا پێم ببەخشە هەناری کاڵت
با تامێک بکەم لە لێوی ئاڵت
لەو دڵی ناسک دایمە عەبداڵت.

٢٦

دایمە گوڵ بەدەست وەکو موشتەری
لە پێش چاوی من زێڕی، گەوهەری
ئەمنت ببم بەقوربانی سەری
ئەتۆ خانمی یان کارەگەری یان عومربەری؟

٢٧

بەقوربانت بم گەنجی شانە و شان[١١]
پێم نەڵێی: شێتە و نەفامە و عەوام
ئەتۆ دەبەخشی گوڵی گوڵندام.

٢٨

بەسەرگەردت بم سنگ تەختی خونکار
ئەگەر ئەگریجەت لە گۆنەت دێنە خوار
گەلێک لە شەڕن هەر وەکو ڕەش مار
بەزەیەکت بێ بەدڵی منی هەژار
جارێکم پێ بڵێ: هەر ئەتۆمی یار
خەم و پەژارەم با ببێ قوتار.

٢٩

عیلاجم ناکرێ ئەمن قەت بە قەت
بەجێم هێشتووە تەختی زومەڕڕەد
ئەمن پادشاهم جەرگم بووە لەت لەت
لە سوێی دوو چاوت، خاڵی هەنیەکەت
جەرگ و هەناوت پاک کردووم لەت لەت.

٣٠

گوارە و کرمەک و زێڕ و قۆیتاست
خوێنی گەش دیارە لە بن کراست
زۆرم بیستووە من دەنگ و باست.

٣١

بەقوربانت بم ئەرێ جانانە
تۆ وەکو مەجروم[١٢] مەمکە دێوانە
بەجێم هێشتووە تەختی شاهانە
مەجروم بۆ لەیلێ شێت و دێوانە.

٣٢

ئەو بوو بەعەبداڵ
دایمە بێ عاقڵ و بێ حاڵ و ئەحواڵ.

٣٣

تۆ وەکو مەجروم قەت لە من نەکەی
بەقسەی کاڵ و کرچ تۆ جوابم نەکەی
خەزێنەی خۆت بەخەڵکی تالآن نەکەی
بەسەرزەنیشتی پادشایانم نەکەی.

٣٤

ئەوە فیدا جوابی دەداتەوە:
بۆ وا دێوانە و دڵ پڕ لە تاوی
وەک داری بێ ئاو کز و شکاوی
دەڵێی کاروانی جەردە لێی داوی
دەڵێی هەڵاڵەی بن هەڵکەندراوی
ئەتۆ عاشقی یان ئەنگوواوی؟

٣٥

چاکت گوێ لێ بێ ئەرێ نەفامە
ئەگەر حەز دەکەی کامە
لە دەستت بگری لیمۆ و شەمامە
بەخشینی ئەمن بەگوڵندامە.

٣٦

سنگی گوڵندام بەفری سپییە
لە کن هیچ شایەک ئەو مەتاحە نییە

له لای عاشقان گوڵندام قاتییه
بەو عاشقانه ئەو بەکەس قایل[١٣] نییه
دەڵێ: ئەوانه خواردنی من نییه.

٣٧

جا ئەوە ناکرێ ئەو درەنگە بەو زووە
نازانم دڵی کەوبارە و لە کوێ نیشتووە
کێ ڕاوکەرە و دڵی وی گرتووە؟

٣٨

گەر تۆ حەز دەکەی بۆ لاپی[١٤] عاشقانه
ئەگەر شێت نەبی و نەبی دێوانه
تۆ وەکو مەجنوون نەگری بەهانه
بچی بۆ شاخان، سوبحان سوبحانه
لەیلێت نادەنێ ئەرێ جانانه.

٣٩

دەبێ بەهۆش بی، پڕ عاقڵ و پڕ فام
دەبێ تۆ بڕۆی هەتا میسر و شام
دنیا بگەڕێی عەیام بەعەیام
کەسێک پەیدا کەی قابیل گوڵندام.

٤٠

فیدا خوداحافیزی کرد و ڕۆیی؛ لەسەر ڕۆینێ کوتی: ئەگەر گوڵندام ئەمن بە خەڵات بە تۆ ببەخشێ، مێردت پێ دەکەم. مەنسوور شا فکری کرد، کوتی:
دەبێ بپۆشم بەرگی دەروێشی
ئەگەر دەروێش بم، بمبێ دڵخۆشی

له تەخت چاکترە و پادشای دڵ هێشی
بەو شەرتە فیدا بمداتێ خۆشی

٤١

جا ئەوە مەنسوورشا کڵفەتێکی وەگیر کەوت؛ ڕای ئەسپارد: ئەگەر بێتو فیدا عەکسی گوڵندامم بۆ بکێشێ و بمداتێ، ئەمن وەکو ئەو دەڵێ وەدووی ئەو کارە دەکەوم. فیدا بەگوڵندامی کوت:

لوتف مەرحەمەت کەی کوڵمەی هەنارت
چاوی جەللاب و ئەبرۆی دیارت
ئەتۆ بمدەیە عەکسی ڕوخسارت
سنگ و بەرۆکی بازاڕ و شارت.

٤٢

گوڵندام کوتی: لە لام قاتییە
عەکس و شێوەی منت ئەتۆ بۆ چییە؟

٤٣

پێی کوت: گوڵندام! ئەتۆ نازانی
دنیا ئەوەندە خۆشە هەتا جەوانی
وەردۆکی[١٥] باڵتەڕ هەتا تەڕلانی
دەنا بە پیری تۆ بێ ژیانی.

٤٤

له وەختی جوانی، شەفافی چاردە
قسمەتی خودای، بەقسمەت ناردە
چاوەڕێی قسمەت حاڵ و ئەحواڵ بە
بێ ڕوحم مەبە ئەتۆ عەبداڵ بە.

٤٥

جارێک لە کەسێک ئاوڕت نەداوە
عالەم لە سوێی تۆ دڵی سووتاوە
لەشکر و قشون و خەزێنەیان هێناوە
پاک لە حودزەمین یەخسیر کراوە
هەتا بدینن وەنەوشەی ساوا
دەنا ئەوانەی هاتوون، ماڵیان لێ نەدزراوە
پاکی دڵیان بە زولفی تۆ بەستراوە
دڵیان بە چاوت حەفس کراوە.

٤٦

تۆ بۆچی عالەم دەکەی دێوانە
دڵیان دەنێری بۆ بەندیخانە
جا چۆن ئەوە ڕوحمە و ئەوە ژیانە؟

٤٧

بەسەرگەردت بم گەردن میسلی باز
پەرچەم شانە و شان وەکو قەرەنداز[١٦]
تاقی ئەبرۆکەت کردووە تیرەنداز
با لە دڵی عاشقان بکا ژان و گاز!

٤٨

دیارە گوڵندام ناسک جەمینە
ئاگری عیشق گەلێک بەتینە
گەلێک لە ژان و گەرمە برینە[١٧]
جارێکی بچۆ ئەو عالەمە ببینە.

٤٩

بەزمانی شیرن میهرەبانییان کە
جار جار بەلوتف میوانییان کە
کەمتر هاتوچۆی بیابان بکە
کەم قەتڵی ناحەق بێ تاوان بکە
کەم ئەبرۆی کەمەند لانە و لان بکە
کەم دڵی عاشقان تۆ وەژان بخە.

٥٠

کردووتە عادەت بەبورجە و نیشتن
ئەبرۆت کردە تیر بۆ عاشق کوشتن.

٥١

گوڵندام عەکس و وێنەی خۆی دەکێشێ، دەیدا بەفیدایی. ئەویش شێوەکەی دەدا بەمەنسوور شا. مەنسوور شا شێوەکە هەڵدەگرێ، بەرگی دەروێشی دەبەر دەکا و سەری خۆی هەڵدەگرێ و دەڕوا. دەبەرگی دەروێشیدا بارام دەبینێتەوە؛ تووشی بارام دەبێ. بارامیش لە ڕاوێیە.

٥٢

بارام ڕاو دەکا لەو عەرد و هەردە
گە دی دەروێشێک خەرقێک لە بەردا

بەهەرتک چەپۆک دەیدا بەسەردا
بارام دەیزانی دەروێش گران دەردە.

٥٣

پادشا حوکمی کرد ئەو پڕکەماڵە
ڕاوکەر ڕاوەستن ڕاومان بەتاڵە
تا بزانین دەروێش بۆ تاڵ ئەحواڵە
بۆ ئاوارەی کێو، بۆچی عەبداڵە؟

٥٤

بارام منداڵە لە چاردەی ماوە
تازەکە خەتی سمێڵی داوە
قسمەت هێناویە، ئەوڕۆ لە ڕاوە.

٥٥

بارام ئەگەر هات دەروێشی یاران
فەقیری مەزڵووم ئەرێ هەژاران
چت لێ قەوماوە دەگری و دەباران.

٥٦

چ بووە بروسکەیە؟ هەورە؟ سێڵاوە؟
لە کوێ ناحەقیت تۆ لێ کراوە؟
هەتا عیلاج کەم ئەو بەند و باوە.

٥٧

بارام لێی پرسی زۆر بەموشتەری
بارامی کیشوەر کوڕی قەیسەری

ئەگەر پێم بڵێی ، بەهرە ببەری،

٥٨

کێ لە تۆی کردووە ئەو زوڵم و زاڵە
تۆ وەها دەگری، وا گەرووت تاڵە
پێم بڵێ لەبەرچی حاڵت بێ حاڵە؟
ئەگەر بۆ کەمی دنیا دەکەی بەیرەمێ[١٨]
تا زێڕ و زیو و خەزێنەت دەمێ.

٥٩

بەدوور بی لە دەرد، کاری دونیایە
ئـیشەڵڵا سەدەمەت بەسەر نایە
ئەمن دەروێشم، شاهم پادشایە.

٦٠

ئەگەر تۆ ببیەی دەردی گرانم
بۆت دەگێڕمەوە هەتا دەتوانم
فەقیر و هەژار، دڵ بریندارم
ئەمن موفتەلای چاوی بەغومارم
عاشقی دوو کوڵمەی سێوی خوسارم[١٩]
لە ڕێی خودادا پێک بێنە کارم.

٦١

تیری نەبەدیان[٢٠] لە جەرگم داوە
دایمە دەروونم خوێن و زووخاوە
دەروێش نیم، تەختم لێ بەجێ ماوە
تیری ئەبرۆیە و لە جەرگم دراوە.

٦٢

مردنم خۆشترە نەک ئەو ژیانە
ئەو پیادەڕەوی و عەزیەت کێشانە
لە جەرگ و دڵم خەدەنگ کێشانە.

٦٣

عەزیزم شاهم جەرگم وەژان مەخە
دەردی دوو دەردم تۆ دەرمان بکە
زیاتر دڵی من پەرێشان مەکە.

٦٤

بارام قـۆڵی گـرت، کـوتی: وەرە بزانم، چی دەڵێی؟ ئەمن زگم بەتۆ دەسـووتێ.
دەروێش کوتی:

هەر لێم مەپرسە دڵی پڕ تینم
مردن خۆشترە نەوەکو ژینم
من عاشقی فیدای وڵاتی حودزەمینم.

٦٥

من لەگەڵ تۆمە ئەرێ شەهریار
ئەبرۆی فیدایە کردوومیە ڕێبوار
بەتیری ئەبرۆی بووم گرفتار
جەرگی بڕیوم سنگ بازاڕ و شار
باغی گوڵانە، کۆخە تا هەنار
تەیران دەخوێنن، بولبول جاروبار
سنگی لێم بووە بەتەختی خونکار
لە ڕێی خودادا پێکم بێنە کار.

٦٦

بارام گرتی، کوتی: دەردت چییە؟ شێوە و سورڕەبەندی[٢١] گوڵندام و فیدای پێ نیشان دا. ئەگەر بارام وای چاو پێ کەوت:

بارام تەعزیم کرد، بێ عاقڵ و کەماڵ
دەروێشی فەقیر شێتی دڵ عەبداڵ
دڵی منیشت خستە حەفس و چاڵ.

٦٧

بەتیری عیشقی من سەرگەردانم
جەرگت بڕیوم، ماڵی وێرانم
کەمتر بەحسەتی[٢٢] دنیا دەزانم
ئەمن شێت بوومە، عاشقی چاوانم.

٦٨

قەستەم بەڕەحمان پادشای کردگار
نامەوێ بورج و بارو و تالار
حوکماتی شایی، دوازدە هەزار سوار
دەبێ گەدا بم، فەقیر و بێ کار
هەتا دەبینم ڕوخسەتی[٢٣] نازدار.

٦٩

ئەوجار بنووسە، دانیشە لە لام[٢٤]
هاتە سەر زارم گوفتی خۆش کەلام
با بۆت بگێڕمەوە سەرگوزەشتەی بارام
عەزیەت کێش دەبێ لە دوای گوڵندام
شێت و شەیدا بوو دێوانە و عەوام
بۆ خاڵی سونبول، بۆ خاڵی بادام.

٧٠

گە دی سورِەبەند ڕاست ڕاوەستاوە
دەڵێی ڕیحانەی شەواو لێ نەدراوە
وەک وەنەوشەیە، ئەو نەژاکاوە
دەستی لە سینە و بەرۆک نەدراوە
ئامانەتییە و هەر ڕاوەستاوە
کولمەی هەروەکو شووشەی قەنداوە
چاوی بەمیسال پیاڵەی گوڵاوە
ئاخ لەگەڵ حەسرەت هەر بۆ من ماوە.

٧١

ئەرێ دەروێش، ئەرێ غەرقە لەبەر
سەت جار من سوێندم بەشیت[٢٥] پێغەمبەر
من دەست هەڵناگرم لە کولمەی گەوهەر
هەتا دەکەومە ڕۆژی قەستە سەر.

٧٢

تۆ ئاواڵم بە، وەرە دەگەڵ خۆم
هەتا بچینەوە بۆ قەیسەری ڕۆم
من زیاتر لە تۆ دەروون پڕ بۆسۆم
ئەمنیش عەبداڵم دەگەڵت دەڕۆم
ئەلعان من یەکێک پادشای سەربەخۆم.

٧٣

بارام هێنایەوە بۆ کن دایک و بابی. دەروێشی میوان کرد. ناردییە قەڕاعەخانەیەک، کوتی: لەوێ بێ. ئەوە بارام هاتە کن بابی، کوتی:

ئەمن شوکرانەم وەبەر ڕەببیە
بابە دەست ڕۆیی و شایی بۆ چییە؟
بۆ جێگای خەتەر مەعموور بنێری
یان کامی دڵتی لەسەر ڕابوێری
پێت نەڵێن ڕێوی، هەر بڵێن شێری.

٧٤

ڕۆڵە شوکرانەم وەبەر ڕەببیە
من لێت دەپرسم: مەتڵوبت چییە؟

٧٥

کوتی بەوەی کەم بیناهی چاوە
ئەو عاقڵی پوختم وا بووە خاوە
ڕەهبەتی دینم لە کن نەماوە
کارێکی گەورە لە من قەوماوە.

٧٦

بۆ خزمەتی تۆ ئەگەر هاتووم
دوو زولفی کەمەند دەستیان بەستووم
خوێنی پڕ حەسرەت لە جەرگیان کردووم.

٧٧

وەکو ئەمن دیم ئەو سوڕەبەندە
ڕیشەی دڵەکەی من لە ئەبرۆی بەندە.
دەبم بەعەبداڵ بەمیسلی مەجنوون
دەبێ پەیدای کەم بە بوون و نەبوون.

٧٨

بەئیـزنی خودا پادشای کردگار
ڕەحیم و ڕەحمان، غەفوور و سەتتار
ئەمن عاشقم بەئەبرۆی ڕەش مار
لە جەرگی داوم تیری بێ ڕەفتار
جەرگی بڕیوم، لە دڵی کردووم کار
چیدی پـێم ناکرێ دانیشتن و ڕەفتار.

٧٩

بابی کوتی: ئەوە چ قسـەیەکە دەیکەی؟ بەمنیـان کوت: دەروێشـێکی گەدا دەگەڵی بوو! نەچی، وەدووی کاری سەهو نەکەوی.

٨٠

ئەتۆ دەزانی من شەهریارم
پادشای ساحێب حوکم، حوکم دیارم
دەستم داوێنت تێک نەدەی کارم.

٨١

دڵ بکە سەرپشک تەواوی دنیا
نەکەی بەقسێکی دەروێش و گەدا
هەچی تۆ بتەوێ دەبم گیانفیدا
خەزێنە و نوقرە و بە ماڵی دنیا
ئەگەر لە قاف بێ ئەو ژنەت پێ دەگا.

٨٢

ئەتۆ بێ عاقڵی گەلێک عەوامی
چومکە منداڵی گەلێک نەفامی.

٨٣

تەماتە بەهیچییە ببی بەشەیدا

ئێستا بەڵەد نی سەرچاوەی دنیا

هەچی تۆ بتەوێ بایی خۆت تێدا

خاترجەم ببە بۆت حازر دەکا

بە ملک و بە ماڵ بەرێ و شوێنی شا

بە شەهریاری هەر بە عولەما

نەوەک گوێ بدەیە دەروێش و گەدا.

٨٤

هەرچی بابی گوتی: بارام نەیبیست؛ پێی لەو جێگایە نەدەنا. شا گوتی: فایدەی نییە، لەسەر ڕۆینی بێ کەڵکە و بەخۆڕاییە. شا گوتی: ڕێ و شوێنی چۆنە؟ بارام حاڵ و قەزییەی بۆ گێڕاوە، شێوەکەی پێ نیشان دا.

٨٥

جا بارام دەهات بۆ خەزنەخانە:

بارامی کیشوەر پەردەی لەبەر نییە

هەڵی دەگرت عەبوتۆپ و مەجیدی و ئەشرەفییە

دەیگوت: ئیشەڵڵا دەچم بۆ ڕێی عاشقەتییە

حاڵم بێ حاڵە و ژیانم نییە

گوڵندام بەنازە، ئەو خاسە سییە

دەڵێی کارمامزی چۆلی و بەرییە

هەر دەڵێی ئاسکی تیرەندازییە(٢٦)

ئاگای لە دەرد و حاڵی من نییە.

٨٦

جا بارام هاتەوە کن دەروێش و کوتی:

چت دەگەڵ کردم دەروێشی هەژار

منیش وەکو خۆت دڵم بوو بریندار

بە زاتی ڕەحیم بە پەروەردگار

ئەمنیش نامەوێ تەختی زەڕنیگار

ئەمنیش وەکو تۆ بووم دڵ گرفتار.

٨٧

جا بابە بارام سێ کەسی ئاواڵی خۆی ساز کرد. ئەوە کوڕەی خڵخاڵی (خاڵ خاڵی؟) دەریا نەوەردی حازر کرد بۆ سواربوونی خۆی. سێ نۆکەری مەزبووت، هەمووی کەمبەر زێڕینیان شازدە قەدی بەدری[٢٧] بەحری بوو. ئەوانە پیاوی وی بوون. بەرگی شەوگەردی و بەرگی ئاشکرایی حازر کرا. بەدزی نەیهێشت بابی بزانێ، شەوێ بارام ڕەگەڵ دەروێش کەوت. کوتی: دەچم بۆ حودزەمین، بۆ حیسابی گوڵندام.

مەنسوور ئەوەندەی پێ خۆش بوو کە حەد و حیسابی نەبوو؛ دەیگوت: بەڵکو لە سایەی ویدا گوڵندام فیدا بەمن ببەخشێ.

دەروێش و بارامی کیشوەر، پەڕڕەی بیابانیان گرت. یەکسەر بەسەراسیمەیی ڕێگایان گرت و هاتن. بەجێیەکی چۆلدا هاتن، هەتا حەوت ڕۆژ هیچ ئاوەدانییان نەدیت.

سبەینێ دەنگی قەتار دەهات؛ دەنگی زەنگوڵە و کۆس و کەڕەنای قەتار دەهات. بارام بەوانی کوت: لاڕێ دەبم، دەچم دەپرسم بزانم ئێرە چ جێگایەکە؟

بارام چووە نێو کاروانەکە، پرسیاری لێ کردن و کوتی: ناشارەزام. ئێرە کوێیە؟ ڕێگای حودزەمین بەکوێ دایە؟ کوتیان: بابم ئێمە ئەوەندە کەسەین دەخەتەر داین، دەگیرێی، سەرت تێدا دەچێ. کوتی: بۆ؟ کوتیان: ئێرە جێگای تایفەیەکە، دێو و غوول بەچەن. سێ بران: ئەرژەنگە و کاڕوبایە و سەڕسەڕە. خوشکێکیان هەیە نێوی

سەمەن بۆیە. ئەگەرچی غول و دێو بەچەشن، چەند پادشا لەسەر سەمەن بۆ کەللەی بەهیلاک چووە. ئەو ڕێیە خەتەرە؛ تووشت دەبێ. ئەو ڕێگایە کەس پێیدا نەڕۆییوە، کەسیش ناتوانێ پێیدا بڕوا. باغێکیان دروست کردووە وەک باغی شەدداد. هەمیشە ئەوانە لە ڕاو و شکارن. ئێستاش ئەمە مەحتەل مەکە؛ بمانبینن، تێدا دەچین. شارەکەیان نێوی خەتەرە؛ هەر شاری خەتەر مەنشوورە. سێ سەعاتە ڕێی دەمێنێ بۆ شاری، حەوز و کوفارەیان دروست کردووە؛ ئەو باغ و حەوز و کوفارە ئیسرِاحەتگایانە.

کوڕە بەو ڕێگایەیدا بڕۆی تووشی کێشە دەبی. مەڕۆ نەوەک تووشی محاکەمە و کێشەی ئەو دێوانە ببی.

بارام هاتەوە کن سوارەکان، کوتی: ئەو کاروانییانە وا دەڵێن؛ ئەما ئەمن لە ڕێگای خۆم بەخوڵای لانادەم؛ هەر دەچم. بارام کوتی:

من یارەمانم، ساحێبی تیخ و گورزی گرانم
ئەمن دوژمنی وا بە پیاو نازانم.

ئەوانیش ناعیلاج دەگەڵ بارام هاتن. لە نوێژی نیوەڕۆیەدا گەیشتنە وێ. جێگایەکی خۆش و سێبەر بوو. نان و خوان و شەراب لەوێ داندرابوو. چاویان بە قەدەح و پیاڵە کەوت. ئەوانیش ماندوو و پادشازاد. دابەزین؛ دانیشتن بۆ نان خواردن و ئیسرِاحەت. کەسیش لە دەورەی حەوزەکە نەبوو. نەشیاندەزانی بورجەکە کێی تێدایە.

٨٨

بارام بانگی کرد: دەروێش با بڵێم وا
ئەمن بۆ گوڵندام، ئەتۆ بۆ فیدا
هەرتک لامان بووین شێت و مفتەلا
لێرە دانیشین بۆ ئیسرِاحەتگا
تاکو بزانین خوڵا چ دەکا.

٨٩

دایکی سەمەن بۆ لە بورجەکەدا بوو؛ بارامی چاو پێ کەوت، کوتی: بەخولای پیاوێکی زەریف و عەجایەبە! سەمەن بۆ لەبەر خۆیەوە کوتی: یارەببی! ئەو کابرایە لە بەلای برای من دوور بێ.

٩٠

سەمەن بۆش وەک پەری گول، تازە شکۆفەی داوە. وەک وەنەوشە، تازە پەلکەی لێک بۆتەوە. بارامی کیشوەری وەبەر دڵ کەوت. دەرکەی پەنجەرەی کردەوە، کوتی:

ئێوە کێهەتان پادشا و شەهریارن؟
کێهەو مەخشووش و دڵ بریندارن؟
کێهەو شکست و دڵ برینداری یارن؟
کێهەو فێری دانیشتنی بورج و تالارن؟
کێهەو بەدنیا زۆر ئینتیزارن؟
من لەگەڵ تۆمە پادشای سەربەخۆ
میوان بە، جارێ لێرەکە مەڕۆ
وەرە لەگەڵ من بکە گفتوگۆ.

٩١

بارامیش لە قاڵدرمان (پلیکانان) وەسەرکەوت. سەمەن بۆ دەتگوت ئاوریشمی خاوە، هێندە جوان چاک بوو. مێشی لێ نەنیشتووە. ئەوە بارام وەسەرکەوت، چووە کنی، بە سەمەن بۆی کوت:

بۆچم دەکوژی بەگۆشەی چاوان
مەستی خەرامان، مراوی شەتاوان.
قسمەتی خودای ئەمنی هێناوە
ئەمن میوانم لەو مەستەچاوە
هەر دەڵێی گوڵە و شکۆفەی داوە

تەختی شاهانەی بۆ من داناوە
دیارە ڕاوکەری، ئیشتیات لە ڕاوە.

٩٢

سەمەن بۆ عاشقی بارام بوو. ئەوە هاتنە سەر گفتوگۆکردن. بارام کوتی:
زولفت کەمەندە بۆ ڕێبوار گرتن
ڕێبوار دەخەیە حالاتی مردن.
پێم وایە نێوی تۆ سەمەن بۆیە
هەنار و نارنج، سێو و لیمۆیە
ئەمن کەمێکم دڵ لەسەر تۆیە.

٩٣

میوانی عازیز، ئەی تەنیا سوارم
پادشای ساحێب تانج، ئەی شەهریارم
زۆر کەس بەمنیان کوت: ببە بە یارم
سەری وان نەما، پێک نەهات کارم
ئەما من بە تۆ زۆر منەتبارم.

٩٤

نەوەک هەر قسەت قسەی میوان بێ
بەو شەرتەی قسەت قسەی پیاوان بێ
وەکو من دڵت لە هێش و ژان بێ.

٩٥

ئاخر عازیزم، هەرتک چاوانم
میوانی عازیز، دەردت لە گیانم
من بریندارى تیر و پەیکانم
تەکلیفی تۆ چییە دەگەڵ براکانم؟

٩٦

هەمە برایەک نێو کارِوبایە
زۆر بێ ڕەزایە، لە گوتن نایە
ملی وی وەکو ئی هەژدیهایە.

٩٧

یەکی دیم هەیە ئەرژەنگ ناویەتی
بیست و پێنج گەز جاو کەللەی کلاوێتی.

٩٨

یەکی دیم هەیە نێوی سەرِ سەرِە
ددانی پێوە وەکو پێمەرِە
حاسەبانییە، دایمە لە شەرِە
سەت بەلای لێدا، چەندە بەدفەرِە!

٩٩

دابنیشە، دایکم ئەوە چۆتەوە
ئەتۆ چاک ماندووت با بحەسێتەوە
خاترجەم ئێستا دایکم دێتەوە.

١٠٠

قسەیان یەکتر گیر بوو. دەستیان ئاوێزانی یەکتر کرد. یەکتریان هەڵدەمژت. دایکەکەی لەنەکاو هاتەوە. دەو حاڵەدا ئەوانی چاو پێ کەوت. ئەوان لەبەر عاشقێنی خۆیان ئاگایان لە خۆیان نەما بوو. پاشان سەمەن بۆ کوتی: بچۆ خوارێ با دایکم نەتبینێ. بارامی بەرِێ کرد.

دایکەکەی بانگی کردە خوارێ. پەردەیەک لە کن حەوزێ کێشرا بوو. سەمەن بۆ هات. دایکەکەی تفێکی دەنێو چاوانی کوتا، کوتی: بۆ ئابرِووم دەبەی؟ دیتم دەستت لە ملی دابوو.

سەمەن بۆ کوتی: برۆ برۆ سەفی بووی، پیر بووی. برای من بوونە عینسان خۆر،
ئەو ڕێگایەیان لە بەند بردووە. کورتی ببڕینەوە لێیان بوو بەکێشە.
بارام خۆی بێ دەنگ کردبوو، لەسەر حەوزێ شەرابی دەخواردەوە.

١٠١

دەبێ عالەم بەو کێشە بزانێ
گرمە گرمێک دێ لەبەر مەیدانێ
شەڕی دایک و کچ کەوتە هەیوانێ
لە گێرە و کێشە و پرچ کێشانێ
لە گرمە گرم و بەرچیغ لێدانێ
بارام سەر سوڕما لەبەر لێدانێ.

١٠٢

بارامی کیشوەر بۆ کن ئەو شەڕە دەهات، دەیگوت:
ئەوە چ باسە، ئەو داد و فریاد؟
کێ زوڵمی کردووە، کێماڵتان دەبات؟
لێدان و شەڕە، ئەو داد و فریاد؟

١٠٣

پیرێژن کوتی: ئەتۆی سەربەخۆ
لە دەستت دابوو مەمکی سەمەن بۆ
چاڵ هەڵ دەکەنم من بۆ عەمری تۆ.

١٠٤

پیرێژن چۆوە، زیز بوو.
سەمەن بۆ کوتی:
ئەمن نازانم بۆ لێرە بەندم

ڕیشەی دڵەکەت لە بێخ هەڵکەندم.
بەهیچیە جەرگت کردم موفتەلا
تیرت بەپەیکان وا لە جەرگم دا
قەت قەت ئەو تیرە ژانی نەدەشکا.

١٠٥

لە کوێ پەیدا کەم حەکیمێک، بێنێ
بە گاز پەیکانی جەرگم دەرێنێ
ئەو بە دەرمانێک ژانی بشکێنێ
بارامی کیشوەر کەنگێ من دێنێ؟
جەرگم کون کونە و خوێن دەدەڵێنێ
ڕەببی خودا ئەو سێ برایەم لێ بستێنێ.

١٠٦

بارام پێی گوت:
گەردنەکەت وەک قۆنگرەی قەڵای سەمەرقەندە
گەلێک زەریف و هێدی و ئەهوەندە
بەدەن دار مێخەک، گوڵ پێوە بەندە.

١٠٧

مەترسە من قارەمان دەستوورم
لە بەڵای دنیا ئیشەڵڵا دوورم.
گە بێتو خودا پێک بێنێ کامم
بێ تەمەدود نیم، پڕ عەقڵ و فامم
شێت و دێوانە، بۆیە عەوامهم
من شێت و شەیدا بۆ گوڵندامم.

١٠٨

بەزایە نەچوو ڕەنج و زەحمەتم
چا بوو خولا تۆی کرد بەقسمەتم.

١٠٩

ئەتۆ نەترسی مەتای فراوان
تەڵای دەستەو شار، سێوی دەست لاوان
تازە کەس ناتوانێ تۆ بستێنێتەوە لە پیاوان.

١١٠

ئەمن مەردێکی گۆشەی مەیدانم
وەکو قارەمان شای دێو قڕانم
شەڕی برای تۆ هەڵبەت دەتوانم.

١١١

لەو خۆف و ڕجا، لەو نەهاتییە
ڕێگایەکی چۆل، ترس و بەدییە
ئەوە بزانە من باکم نییە
مەرگ و کوشتنم بە ئیلاهییە
دەنا برای تۆ وجوودیان نییە.

١١٢

دایکەکەی چۆوە. بوو بەڕۆژ ئاوا، کاڕوبا هاتەوە.
لەو بگرە بگرە داد و بستێنە
دایکی بەگریان شامی بۆ هێنا
بیناهی چاوم، هەرتک گلێنە
پێت دەڵێم قسێک، دڵ مەڕەنجێنە.

١١٣

بەدبەختم نەکەی، نەمکەی دەربەدەر
لە خۆت هیچ نەدەی تانوت و حونەر
ڕاوەستە لەسەر گفتوگۆی خەتەر.

١١٤

دەیگوت: ئەی دایە چییە جانانە
ئەو داد و فیغان، شین و گریانە
ئەو بێ مەیلییە و ئەو لە خۆ دانە؟

١١٥

کێ هەیە لە تۆ گەر زوڵمێک بکا
تا کوڕت بە شیر کەللەی لەت بکا
لە دنیای ڕووناک بەدبەختی بکا
قەل و داڵ کەلاک بۆ قافێ ببا.

١١٦

کاڕوبای عیفریت هەتا سێ سەعات
بەفکر و بە ڕا بەدڵ خۆیدا هات
جا ئەوە ناردی دایکی بانگ دەکات.

١١٧

پێم بڵێ چییە دەردی گرانت
داد و واوەیلا و ئەو دڵ هێشانت
فریاد فریاد و شین و گریانت
هێندە نارەحەتی، بێزاری لە گیانت؟

١١٨

دەیگوت: ئەی ڕۆڵە خراپ قەوماوە
دوور بێ لە گیانت، عومرت نەبێ تەواوە
گورز و گۆپاڵت لە ماڵ داناوە
سەمەن بۆی خوشکت ئێخسیر کراوە.

١١٩

جا سوارێک هاتبوو ئەو بە میوانی
یەکێ جوان چاک بوو، لاو و مەستانی
نازانم چلۆن بۆ ئێرە توانی
لەسەر تەختی تۆ بوو بە میوانی.

١٢٠

ئەمن لەو کارە زۆر بێ خەبەر بووم
من لەوێ نەبووم، من دەربەدەر بووم.

١٢١

ئەگەر چوومەوە بۆ قەڵای حوکمات
سێ چوار نەفەرێک گربویان جەمات.

١٢٢

دەبێ چ کەس بن، ئەوە چ قەوماوە
کێیە قسمەتی بۆ ئێرە هێناوە
کوڕم بێ خەبەر هەرسێک لە ڕاوە.

١٢٣

بە پارێز من چووم بزانم کێیە
شێرە یان بەورە هاتووە لەو ڕێیە؟

١٢٤

ڕۆڵە باوەڕ کە، دوورت بێ لە گیان
سەمەن بۆی گربوو میسلی خەرامان
وەک کەو لە دەستی عاشقی دەی قاسپاند.

١٢٥

گە چاوم پێی کەوت، قرچەی هەناوم
وەخت بوو کوێر بێ من هەرتک چاوم
تەختی میراتی و کوڕ بەجێماوم
کچی نۆڕەسید شل و شێواوم
جەرگی بڕاوم، قرچەی هەناوم.

١٢٦

سەت جاران عەمری دایکت نەمێنێ
دەست لە بۆ لیمۆی سەمەن بۆ دێنێ
وەک توولە نەمام ئەو دەیگەوزێنێ.

١٢٧

چومکە دێوانە بوو، لەسەر قسێک بەند
کاڕوبا ئاخێس[٢٨] کرد، جە بەستەش کەمەند[٢٩].

١٢٨

گورزی گران وەزن گرت بەدەستەوە
بەتوند و تیژی کەمەند بەستەوە.

١٢٩

سێ سەت و شێست تیر دانا (دانە)ی زەڕ نیشان
بەست لە بازووی وێشت[٣٠] چون شێری ژیان.

١٣٠

قەدارە[٣١] و قەڵغان[٣٢]، نێزەی ژەهراودار
ئەو حازری کرد چوون شێری شکار.

١٣١

موهمیز دا لە ڕەخش، نەیکرد مودارا
دەست برد پای شەمشێر قەبزەی قەدارە.

١٣٢

پای دوژمنی نەبەرد، کاری هەڵاوارد[٣٣]
پەی پەی مەکێشۆ هەناسانی سارد

١٣٣

ئەگەر دەتگەمێ دوژمنی گومڕا
دەبێ ئەڕواحی ئەو بۆ کوێ ببا
پۆستی بکەنم وەکو هەژدیها.

١٣٤

ببڕم سەری ئەو شێت و دێوانە
کەوڵی بنێرم بۆ دەباغ خانە
بیکەم بەدەهۆڵ بۆ ڕووی ڕەزمگا
بەو دەهۆڵ لێ دەن بەهەرسێک برا.

١٣٥

ئەو حەرامزادەیە هات. ئەگە هات، بارام چاوی پێ کەوت. سەمەن بۆ بە بارامی گوت: عەیشی لێ تێک داین. ئیدی دەستبەجێ بڵێسەی شیر و تیرەندازی پەیدا کرد. کورتی ببڕینەوە:

هەر یەک پەرەی[٣٤] یەک کەمەند حەوا دا
یەکێ وێنەی شێر، یەک چون هەژدیها
ئاخر وەسسەلام بارام زۆردار بوو
کاڕوبا بەدەست ئەو گرفتار بوو.

١٣٦

بە جەنگ و جودال، بەچەند شەڕ و قین
بە فەرمانی حەق جیهان ئافەرین
پشتی کاڕوبای دەدا لە زەمین.

١٣٧

دەست و پێی دەبەست، لە قرمەی خەنجەر
قەهری وا بزووت کە بیبڕێتن سەر.

١٣٨

کاڕوبا بەبارامی گوت:
دەستت ڕاگرە ئەی لاوی میوان
قەتڵی من مەکە، ئەمن نۆجوان
لەسەر دەستی تۆ دەبمە موسوڵمان
من زۆردارترم لە نێو براکان
سەمەن بۆت دەمێ وەک باغی گوڵان
سنگی سەمەن بۆ بازاڕ و دوکان
تێیدا ڕاو بکە پاییز و زستان
پێشکێشی تۆ بێ، نابم پەشیمان.

١٣٩

ئەگەر زۆر هات. قەباڵە بەتاڵە[٣٥]. کاڕوبا موسوڵمان بوو، بارام نەیکوشت. کاڕوبا گوتی: مەترسە، براکانی دیکەم لە تۆ زەبر بەدەستتر و زۆردارتر نین.

براکانی یەکە یەکە هاتنەوە. هەرسێکیان لەسەر دەستی بارام موسوڵمان بوون. بارام سەمەن بۆی مارە کرد. حەوت ڕۆژان بارام لەوێ ماوە. یەگجار جوان چاک بوو سەمەن بۆ.

١٤٠

بارام شەوێکی بەسەمەن بۆی گوت:
ئەمن پێت بڵێم دڵ بکە وشیار
ئەمن عەبداڵم، فەقیری هەژار
ئەمن سبەینێ لێرە دەبم سوار
بەمنت چ ماوە، پێم بڵێ کاروبار.

١٤١

دایمە لە دڵمدا هێش و گەرمەژان
دەچمە حودزەمین بۆ نێو عاشقان
گە بێتو سەرم بێتە وەختی بڕان
لە تاو گوڵندام پێم نادرێ وچان.

١٤٢

سەمەن بۆ لە جوابی بارامدا کوتی:
دەبێ شین ببی وەکو شەنگەبی
نەکەی لێم دیدار ئاخرەتی ببی
ئەمنیش قەبوڵ کە بەکڵفەتی وی.

١٤٣

ئەوە بارام ساز بوو. خوداحافیزی لە براکان کرد؛ بەڕێیان کرد. بارام ئەوە هات بۆ حود زەمین، بۆ نێو دوو سەد عاشق کە هەر کەس پادشای جێگایەک بوو. ئەوانە لە دەورەی شاری خێوەتیان هەڵدا بوو. بارام چادرێکی لبادی هەڵدا. لە نێو چادرەکەدا خوری ڕاخست، لەسەری دادەنیشت.

بارام هەتا وەکو قەدەرێک خۆی دەکاران نەدەگەیاند؛ دەیگوت با چاو و گوێم بکرێتەوە، شارەزایی پەیدا بکەم. ئەمان مەنسوور شای لە کن بوو.

دایک و بابی مەنسوور شا هاتبوون؛ پرسیاریان دەکرد، دەیانگوت: دەبێ مەنسوور چی لێ هاتبێ؟ مەنسوور شا خۆی لە دایک و بابی ئاشکرا نەکرد.

مەنسوور شا، عاشقان پێوەی دەهاتن. خەڵک بە بارامیان دەگوت: پێمان وایە نێوی لبادە و تایفەی خوری! نەیاندەزانی کوڕی قەیسەرە. تا حەفتەیەک، گوڵندام گوڵ دەنێرێ بەفیدا دا بۆ بەخشین بەعاشقان.

١٤٤

بەدڵی ناسک بەڕوویی کەژی[٣٦]
دڵی عاشقان بۆ وی دەبرژی

١٤٥

سنگ ئاواڵە کرد وەک بەفری کوێستان
بەفری یەک شەوە نیشتە سەر لکان
زولفی داو داوی کردبوو پەرێشان
دیسان عاشقان کەوتنە دڵ هێشان
کڵفەتی ناردوون بۆ بەستنی گوڵان
هەر کەسێ دەسکێک، بۆ ئارامی گیان.

١٤٦

ئەوە بەفیدادا دەینێرێ.
وەکو وەنەوشە فیدا غەملاوە
فەغفور قەرە پۆشین[٣٧] بەسەر داداوە
پۆشیە (ڕیشو)ی وەک گوڵی بەهار بەرداوە
کەسێک دەردەدار بێ، بڵێن لێی قەوماوە
ئەگەر بیبینێ، دەردی نەماوە

چومکه دەغەملێ وەک باغی ساوا
ترونج و نارنج بەریان هێناوە.

١٤٧

بزەن بزەنی تۆپز[٣٨] بەدەستان
ئارام ئارامی جگەر چاو مەستان.

١٤٨

ئەوە هات خەلات، نوقرە بەندی شا
خەلک بێ دەنگ بێ، کەس قسە نەکا
با هەر کەس تەواو بەشی خۆی ببا.

١٤٩

با بەس هیلاک بین بەبرینی خەنجەرێ
چومکە ئەو گوڵە لە دەستی گوڵندام دێتە دەرێ
لە ئێمە بۆتە ئاوی کەوسەرێ
خۆشی لەو کەسەی ئەو بەختە بەرێ[٣٩].

١٥٠

ئەوە فیدا هات، هەر عاشقەی دەسکێکی گوڵ دایە. پادشای مەنسوور وەخت بوو دڵی بتۆقێ؛ هاتە بەر دەرکێ. بەفیدایان گوت: ئەو کابرایە (بارام) دەڵێ من عاشقم. فیدا هاتە بەر دەرکی خێوەتەکە، بارام دەدوێنێ:

کوتی: عەزیزم ئەتۆش عەبداڵی
ئەتۆش عاشقی، ئەتۆش دەناڵی
ئەدی تۆ بۆچی بێ ماڵ و حاڵی؟

١٥١

عاشق هەموویان وەکو دێوانە
تەپڵ و بەزم و ڕەزم، شێوەی شاهانە
پاکیان پێیانە خەزێنەخانە
چومکە حود زەمین جێی خەرج کێشانە
چۆن ئەتۆش هاتووی هەر بۆ جانانە
تۆش دڵت دەسووتێ وەکو پەروانە
بۆ گوڵندامت دڵ پەرێشانە؟

١٥٢

لە بارام وایە کڵفەتە، ئەوە پێی گوت:
بەتەسکینەوە بارام جوابی دا
دڵم مەشکێنە کارەکەری شا
هەچ کەس ئەندازەی خۆی ڕفتار دەکا.

١٥٣

هەڵبەتە ئەمن حاڵم بێ جانە
من نیمە لەشکر، خەزێنە خانە.

١٥٤

چاوەڕێی لوتفی ڕێگای ڕەحمانم
ئەمنیش عاشقم ئەوەند بتوانم
ڕێگای پاشەڕۆژ ئەمن نازانم.

١٥٥

فیدا گوڵێکی پەلکە وەریوی دایە، کوتی با زگی بەخۆی نەسووتێ. فیدا گەڕاوە؛ مەنسوور شا کوتی بڵێی ئەوە فیدا نەبێ؟ وە دوای کەوت، گەییشتێ. هاوین بوو، گەرما بوو، ڕۆژیش درەنگ بوو، کوتی:

نازانم نه سییه و نه کۆتره
ئەبرۆت جەللابە، گەلێک جابرە
تاوێک لە سەر من هەنگاو ڕاگرە.

١٥٦

لەو قرچە قرچە، لەو ڕۆژە گەرمە!
کیژێ سنگەکەت دۆشەگی نەرمە
چارشێوت لادە، چ وەعدی شەرمە؟

١٥٧

دڵ و هەناوت کردووم دەربەدەر
تۆ گەوهەر تانجی، تێلی زێڕ بەسەر
چارشێوت لادە، لیمۆت بێتە دەر.

١٥٨

بەشانی ڕاستەی ئاوڕی لێ داوە
دەڵێ: بێ عاقڵی، عاقڵت نەماوە
چ کەس تەعلیمی تۆی وەها داوە
چ دایکێک مەمکی دە زارت ناوە؟

١٥٩

وەکو بزانی من سووک و گەدام
من موحتەبەرم، من کەناچەی(٤٠) شام
ئەگەر نامناسی من خانم فیدام
کوتی گەر وابێ دەردت بەدڵی دام
گە تۆ فیدا بی دانیشە لە لام
گە تۆ فیدا بی ئەمنیش مەنسوور شام.

١٦٠

خەرقەی دەروێشی کردت لە شانم
دارعەسا و کەشکۆڵ خستتە دەستانم
جەرگت سووتاندم گەر بۆ خۆم بزانم
گفتوگۆم دەگەڵ بکە ئارامی دڵانم.

١٦١

ئەوە نۆ مانگە من دەربەدەرم
دەروێش و فەقیر، خەرقە لە بەرم
لە لام دانیشە ئاوی کەوسەرم
با ژانی بشکێ جێگای نەشتەرم
با بحەسێمەوە ئەی تانجی سەرم.

١٦٢

دایک و باب دایمە هەر هەڵلایانە
شین و گریان و واوەیلایانە
کوانێ مەنسوور شا، شای حەڵەب زەمین
ماوە یان مردووە، نەماوە بە ژین؟

١٦٣

دایک لە گریان، دڵ پڕ گەرمەشین
دانیشە لە لام، ئەلف و واو و سین.

١٦٤

با خشڵی بەروێت بکەن ئەوبەر ئەوبەر
گەردنتم بۆ بکە بە ئاوی کەوسەر
سنگت بۆ من بۆتە سەحرای مەحشەر

چراغی شێوەت بەمیسلی گەوهەر
ژیانم بۆ چییە؟ ئەی خاکم بەسەر!

١٦٥

ئەوە نۆ مانگە من پەرێشانم
دەروێش و فەقیر، گەدای شارانم
لەسەر چاوی تۆ من لە بیابانم
هیچ بە عەزیەت و عازابی خۆم نازانم
چومکە بێ ڕووحم، زۆر پەرێشانم.

١٦٦

قەدەم ڕەنجەکە بالآ سیما کار(٤١)
زولفت پشانۆ(٤٢) چون قەدی ڕەش مار
بالآت ببینم چون داری هەنار
گەنجی باداوەر، تەلآی دەستەو شار(٤٣)
با بحەسێتەوە فەقیر و هەژار.

١٦٧

گوڵی کوێستانان دەم بنێ لە کانی
بۆ دەردی کەسکون(٤٤) ئەتۆ دەرمانی
بیکە بەشەربەت بۆ ئاوەدانی.

١٦٨

کەسێک نەخۆش بێ، چاری بێ چار بێ
گە دەردەداری پاییز و بەهار بێ
بەڵکو ئەو کەسەش لە دەرد ڕزگار بێ.

١٦٩

بەشیلەی[٤٥] زارت، باڵای زێڕ ستوون[٤٦]
یەگجار هیلاکم، مەکە چەندوچوون
قەزات لە گیانم هەڵاڵە و بەیبوون
مەمکت لە سنگت هاتنە هاتوچوون
وەکو کارمامز جار جار دەبزوون.

١٧٠

زولفت داناون لە ئەبرۆت جووت جووت
کوشتمت، من نەشئەی کەللەم بزووت.

١٧١

ئەتۆ دەزانی خەرقە لە شانم
ئەمن پێ بەستی هەودای زولفانم
بەهێشی دەردم تازە دەزانم
لە جێی تەخت و تانج، شاهی شاهانم.

١٧٢

تۆ بۆچی زگت بە من نەسووتا
عەزیزەکەی من زەڕ و سیم سیمە[٤٧]
ئاخر پادشا بووم، کردتمە گەدا
داری گەداییت بە دەستی من دا.

١٧٣

ئەو جار فیدا پێی دەڵێ، ناسێوە، چارشێوەکەی لادا، کوڵمەی بۆ هێنا پێشێ و کوتی:

ئەتۆ وەرگرە مەتای ڕەنگاوڕەنگ

با لێی خلاس بێ خەم لە دڵی تەنگ
ئەنگوستیلەی لاڵ[٤٨]، کارخانەی فەرەنگ
بە دییانەت[٤٩] بگرە شەیدای شۆخ و شەنگ.

١٧٤

دەجا بگرە لیمۆی نەژاکاوم
هیچ کەس نەدیوی تاو لێ نەدراوم.

١٧٥

شەماڵ بۆ لیمۆم ئارەزوو کارە
لیمۆی نەدیوم، لە عالەم دیارە.

١٧٦

بزانە گەر تۆ کارت تەواوە
لیمۆی ڕەنگاوڕەنگ قەت نەژاکاوە
مەگە بڵێن: شا مەنسوور دەستی لێ داوە.

١٧٧

قەول و قەراریان دانا. کوتی: ئەتۆ نەچووبووی کابرایەک بێنی بۆ گوڵندام کە دەنێو ئەوانەدا پەڕ بەسەر[٥٠] بێ؟ دیسان کوتی: ئەتۆ دەزانی لە فەرەنگستان لەشکرێکی گەورە و گرانیان کردووە، دەیانەوێ بەدەستی زوڵم گوڵندام ڕاکێشن؟

١٧٨

گوڵندام سێوێکی زۆر خان و مانە
نەختێک ماندووە و دڵ پەرێشانە
سبەینێ ئەو دێ بۆ نێو عاشقانە
دوژمنمان لەشکرێکی گەورە و گرانە
کافری دین دوژمن، ئەو بێ ئیمانە.

١٧٩

سبحەینێ گوڵندام ڕەنجەکارییە
عەیش و نۆشی عاشقان یادگارییە
سەفەری ڕاستی و بەیەگجارییە.

١٨٠

ئەوە فیدا بە مەنسوور شا دەڵێ:
چون لە سەفەر بووی، لە من ببووی قات
ئەوە هاتیەوە یاری دوور وڵات
ماچێکت دەمێ لەباتی خەڵات
لەباتی شایی و دەبدەبە و حوکمات.

١٨١

ئەوە مەنسوور شا پێی دەڵێ:
بە قیمەت گرانی، بیجادە و دوڕی
نەکەی وەک باڵدار لە دڵم هەڵفڕی
مەمکت لە دوو جێ کراسیان دڕی.

١٨٢

لەبەر ئەبرۆت دەمرم هەر دەڵێی تەڕلانە
هەر دەڵێی خاسە کەوە و لە گەرمێنە و لە کوێستانە
مەمکەکەت دەڵێی دوکانە، سنگ قاقەزی مەرجانە
سووچ و تاوانم نییە، پێم نەگری تۆ بەهانە
جا خۆ ئەمن پادشا بووم، خەرقەت لە شانم دانا
عەسا و کەشکۆڵم هەڵگرت، بۆ تۆ بووم بەدێوانە
ئیدی دەردەدارم نەکەی، دەردم کراوە دەرمانە

چاوت ئەستێرەی ڕۆژێ، سنگت وەک خەزنە خانە
دەرکی خەزنەت دانەخەی، بێ تۆ ماڵم وێرانە
چاوت دەڵێی جەللابە، وەختی قەتڵ ڕێزانە
زولفت کەمەندی زۆهراب، هاویشتت شانە و شانە
ئەمن نەوەکو بمرم، جەنگەی دەست لێک بەردانە
ئیحتیبارت پێ ناکەم، بمدەیە نێوونیشانە
ئەگە هاتوو نەمێنم، لە پاڵی قەبریان دانا
بڵێن ئەوە ئی فیدایە، هەتا ئاخر زەمانە
بۆ من دەبێ بە مایە، مردنیشم هەر ژیانە.

١٨٣

ئەمن لەگەڵ تۆمە ئەرێ ناسک جەمینم
لە ڕێگای ڕووناکاییم، مەڵحەمی سەر برینم
تایەک لە زولفت ببڕە، بینێمە ژێر سەرینم
بۆ قیامەتیشم چاکە، پێی قایم دەبێ دینم
خۆتم لێ بزر[٥١] نەکەی، ڕۆژێ جارێک بتدینم
با نەبێتە پەژارە، ئەرێ ڕوحی شیرینم
ئاوری عیشق وایە، وا دەدا تاو و تینم
ئەمن دێوانە و شێتم، نازانم مردن و ژینم
بوویە خەیاڵی دڵم، بوویە گریان و شینم.

١٨٤

لێم بووی بە فەڕروخ لەقا، بۆیە من وا شێواوم
هەمیشە چاوەڕێی تۆم، تەخت و تانج بەجێماوم
گەلێک پەرێشان حاڵم، لە دڵدا زۆر شێواوم
ئەگەر ماچێکم دەیەی، دەبێتە کام و کاوم.

١٨٥

ئەوجار فیدایی بەمەنسوور شا دەڵێ:
قسەی خاترجەمیت پێ بڵێم، تەڵخت نەبێ ئەحواڵە
با مزگێنیت بدەمێ، خودا داویەی ئیقباڵە
ئاوری عیشق تیژە، بەسەر مندا زۆر زاڵە
حەڵاڵم لێ حەرام بێ، مەنسوور بۆ من حەڵاڵە
ئەگەر عومر باقی بێ، ئەی دێوانە و عەبداڵە
ئیدی خاترجەم ببە، لە دڵی خۆتدا مەناڵە.

١٨٦

سنگم پیاڵە فەغفوورە، بەزولفی وەرشە چەمی(٥٢)
ئەوجار هیچ خەمت نەبێ، برۆ بە خاترجەمی
لەکن من یەکجار زۆری، خەڵکیش پێت بڵێ کەمی
فەرامۆشیت گەر نییە، دەمت بنێمە نێو دەمی
ئەگەر ئەمن لەیلێ بم، تۆ مەجرومی عەمر کەمی.

١٨٧

دەزانی مەجروم کێ بوو، دێوانە و سەر شێواوە
لەیلێی یەکجار لێ دوور بوو، کەمتر جوابی دەداوە
لە ترسی دای و بابان، ڕێگای وەبەر نەناوە
خاترجەم بە تۆ لە من، سنگم بۆ تۆ بڵاوە
قادری قودرەت نوما، دوو گەوهەری داناوە
لە ڕاستە و لە چەپەی من، دەڵێی هەرمێ گولاوە
سنگم تەختی خونکارە، قاقەز لەسەر نووسراوە
هەروەکو دەفتەرخانە، ڕێگای خەڵکی بەستراوە
ئەوە تەحویلی تۆم دان، فکرت نەکەی بڵاوە

ئەوەندەم من لە بیرە، مەجروم وای لێ قەوماوە
لەسەر لەیلێی سۆسەن خاڵ، فکر و هۆشی نەماوە
خاترجەم بە نایەڵم، بڵێن: ئەویش وای لێ قەوماوە
خودا قسمەتی کردی، زۆر چاکی بەتۆ داوە.
خوداحافیزی لێ کرد، ئەوە فیدا گەڕاوە.

١٨٨

ئەوە بانگی دەکاتەوە مەنسوور شا:
قسێکم لە بیر چووە، حەیفێ زووتر نەمزانی
چاوت ئەستێرەی ڕۆژێ، سنگت بەفری کوێستانی
ئەبرۆت ماڵی کەوانە، دەمت شەربەت و کانی
دەبێ ئەتۆ بمبەخشی، بۆ ڕاگری و وچانی
ئەمن عەرزێکم هەیە، بە مەبخی و بە نیانی
هەتاو مکو پێت بڵێم، تۆش بەو کارە بزانی.

١٨٩

فیدا ئەوە ڕاوەستا، باکی نەبوو لە خەڵکی
چارشێوی شانە و شان کرد، شەدەی بەستووە خێڵەکی(٥٣)
هەنگاوی لەسەر ڕاگرت، لەسەر کەوشی کوڕەکی(٥٤)
تازە دەباغ خانەیە، داوێنی نوقرە بەندی
گە بینێریە بازاڕی قیمەتی تەواو نابی.

١٩٠

ئەوەم فەرامۆش کردبوو، سنگت دەڵێی دەفتەرە
ئارامی دڵی منە، دوو جەلابی لەسەرە
ئێکیان حوکمی قەتڵێتی، ئێکێکیان عومر بەرە
زۆر قسێکی مێهرەبان بە دیاری بۆ گوڵندام بەرە

ئەوەی دەگەڵ من هاتووە، زۆر مەرد و بەهونەرە
هەروەکو ئیسفەندیار، هەمیشە پەڕ بەسەرە
وەک ئەفراسیابی تاجکەند (تاشکەند) گۆ لە مەیدان دەرکەرە
وەکو ڕۆستەمی زەمان، پێستی بەوری لەبەرە
بەچەکمەی گەرشاسوپی، لە خۆی دەدا هونەرە
دارای ڕەخش و گۆپاڵە، ئەو گورزی گاو و سەرە
ئەگەر شوناسی ناکەی، ئەوە شازدەی قەیسەرە
ساحێب تەخت و جەلالە، ساحێب گەنج و گەوهەرە
خێوەتێکی هەڵداوە، دەنا زۆر موحتەبەرە
دەڵێن هەڵبەت گەدایە، فەقیرە و خۆڵ بەسەرە
تۆ وا بەگوڵندام بڵێ، بۆ حود زەمین ڕەهبەرە
تەواو دنیا دوژمن بێ، کەس پێی نابا زەفەرە
پیاوێکی بەغیرەتە، ساحێب شیر و خەنجەرە
بەوە بەسەهو مەچن، بێ قۆشەن و ئەسکەرە.
فیدا ئەوە چۆوە.

١٩١

گوڵندام ئاخێس کرد، شەدەی بەستەوە
جامی جەوهەر ڕێز، گرت بەدەستەوە.

١٩٢

ئەنگوستیلەی لاڵ، چوون لەعلی ڕوممان
مەتای ڕەنگاوڕەنگ، بە قیمەت گران
ئەشرەفی و یاقووت، مەتای فراوان
بە خەلات بەخشی، بیبەن بۆ عاشقان
چومکە پاش چەند ڕۆژ، دێتە لێ قەومان
ئەو ڕۆژە بۆ عاشقان، کەوتە زگ سووتان

گەلێک غەریبن، ئەگەر هاتوون وان
چاوەڕێی منن، غەریبی شاران.

١٩٣

هەستا بە لەنجە، ئەو ناسک چەمین
هەستا لەسەر تەختی ئاڵتوونی شین
بریندار برینی بێ، چاکی دەبێ برین
نەیزانی لەگەڵ بارام، دەبێتە مەم و زین
جا ئەوە گوڵندام حازر بوو.

١٩٤

دەمرم لەبەر ئەو خەتە، لەبەر ئەو خاڵە
بازی بەندەکەی یاقووتی لاڵە
گوڵندام چومکە لەسەر خەیاڵە
تاوسان بەچەتر، بولبول بەناڵە
تەڕلان بەفڕینە، تووتی گەواڵە.

١٩٥

گوڵندام خەڵات بەخش بۆ ئەو مەزلوومانە
بۆ ئەو غەریبی بێ خانە و لانە
هەموو بۆ گوڵندام بوون بە دێوانە.

١٩٦

قەفەس بێننە خوار، داعبای دەنگ زوڵاڵ
لە ڕێگا دانێن جووت جووت و خاڵ خاڵ
ئەوان بخوێنن، ناز و ناڵە ناڵ
گوڵندام لە قۆڵ کرد بازی بەندی لاڵ.

١٩٧

گەردن لغی گەردنی، مەتای گرانبارە
شۆڕابەی سنگی لە عالەم دیارە
مەمکی بەمیسال، کاڵە هەنارە
جارچی جارِ کێشا، داد و هاوارە
مەعموور ڕاوەستان، کووچە و کەنارە
لە سێ جێ، هەڵدرا بەندی سێدارە
نەوەک حوکم بکا، ئەو چاو بەخومارە
فتوای قەتڵ بدا، داخوا کێ چاری بێ چارە.

١٩٨

نەوەکو کەسێک حەڕەکەت بکا
ئەو قسەی کاڵ و نازیبا بکا
لە دڵی گران بێ، لە سێدارەی دا.

١٩٩

عاشقان زانیان خەڵات بەخشانە
ڕۆژی خۆشی و نەخش و نیشانە
هەموو حازر بوون، ئەو مەزڵوومانە
ڕوحیان حازر کرد بۆ گیان کێشانە.

٢٠٠

ئەو دنیای وێران هەر دەچێ بە با
نەوەک گوڵندام فتوای قەتڵ بدا.

٢٠١

هەموو فکریان کرد، هاتنە سەر عاقڵان
هەموو ڕاوەستان سێ سێ و دووان دووان

بەعاقڵ و ئەدەب، ئەدەب و ئەرکان
وەکو گوستەهەم وەزیری شاهان
وان بەئەدەب بوون بەمیسلی پیران.

٢٠٢

ئەوە گوڵندام هات، نۆ کڵفەتی دەگەڵ بوو، خەڵات دەبەخشن.
نوقرە و ئەشرەفی، گەنج وەک کەللەی کەو
سکەی بیست و چوار، خەزێنەی خوسرەو.

٢٠٣

حەوسەد کەس ڕاوەستان هەمووی عومر بەر
پاکی دەستی نا لەسەر گۆی خەنجەر
حەوسەد کەس ڕاوەستان ئەوبەر ئەوبەر
هەموو دەستیان نا لەسەر گۆی خەنجەر
گەردنی ئاچغ کرد وەک حەوزی کەوسەر
عاشقان دەسووتێ ئەڕواح و جگەر.

٢٠٤

ئەوە گوڵندام پێیان دەڵێ:
کوتی عەزیزم لێتان قەوماوە
خەزێنە و ماڵو پاکی هێناوە
تەخت و تانجی خۆتان فڕێ داوە
لەزەتو ناوێ، دڵو شێواوە.

٢٠٥

خونچەی گۆناگۆن دەبێ بەڕێ بێ
داخولا بزانین قسمەتی کێ بێ.

٢٠٦

به زمانی شیرن کردی مەرحەبا
هەرکەسێ خەڵات، بەشی خۆی دەبا.

٢٠٧

چاو ئەستێرەی سوهەییل بەتەماشایە
هەتا بزانێ کێی قابیلی تێدایە.
کێ بۆ وە دەبێ بۆ کامڕانی
ئەگەر ببێتە ئارامی دڵانی
تا خۆی تەسلیم کا و ئەویش بزانی.

٢٠٨

گوڵندام هاتووە، عەتر بەخشانە
هەڵاڵە و بەیبوون، ڕەشە ڕەیحانە
زێڕ و ئەشرەفی خەڵات بەخشانە
پاک کەوڵی سەنبوری قاقومی لە شانە
هەریەکی پادشای مەملەکەتانە.

٢٠٩

ئەوان بەو کارە زۆر خۆش و زاڵ بوون
هەموو پێی مەست بوون، زۆر خۆش ئەحواڵ بوون
هێندێکیان پیر بوون، هێندێک منداڵ بوون.

٢١٠

هێندێک جوان بوون، هێندێک جوانمێرە
هێندێکیان پەست بوون، هێندێک وەک شێرە
کوڵمەی وەدەرخست، گوڵی کەنێرە

چاوی لێ کردنە مانگ و ئەستێرە
لوتفی زیبا ڕەنگ، بۆ ئەوان خێرە
عاشق هەموویان شوکر بژێرە.

٢١١

ئێمە هەموومان کارمان بوو تەمام
بە چاوی خۆمان دیتمان گوڵندام
بۆتە قنیاتی(٥٥) سوبح و عەسر و شام
ئەوە دەرمان کرا برینی کەسکوون و زام.

٢١٢

شەو لە من زیندانە، بەندە، ڕۆژ لە من تاریک و ڕەش
داد لە دەست شای ترک و ڕەندان، ساحێبی هیند و حەبەش.

٢١٣

ئەگەر بۆ عاشقان خەڵات بەخشان بوو
بارام هیچ نەبزووت، بۆو کارە نەچوو
مەتا و خەڵاتی بۆ هەموو عاشقان بوو
بارام لەو کارە هیچ بەشدار نەبوو
ساحێب دەمار بوو، مەتڵەبی نەبوو
دوایە وەک ڕۆستەم سواری ڕەخشی بوو
خەیاڵی چۆل و ڕاو و شکاری بوو.

٢١٤

مەنسوور شا پێی گوت: ئەرێ سەوداسەر
خەیاڵت چییە گیانم برادەر
ئەوڕۆکە ڕۆژی عیشق و سوباتە

گوڵندام بۆ عاشقان ئاوی حەیاتە
لەو هونەرییە و لەو زۆر و زاتە!

٢١٥

عەمرم بۆ هاتی، بۆچی شێواوی
بۆچت بەجێ هێشت دەبدەبەی شاهی
ئاخر بۆ گوڵندام قسمەت هێناوی.

٢١٦

وەک ئاوی حەیات لە خەڵکی قاتە
ئەتۆ بۆ گوڵندام هاتیە ئەو وڵاتە
کوڵمەی هەنگوین و شانەی نەباتە.

٢١٧

عەزیزم مەچۆ وەختی ڕاو نییە
چەپکەی هەڵاڵە ئەوڕۆ دیارییە
تازە نایبینین، لێمان قاتییە.

٢١٨

بەڵکو کەسێک خەڵاتێک بێنێ
بەلەبزی شیرن گوڵندام بماندوێنێ
پەیکانی بەژان لە دڵت دەرهێنێ
ئاخر ڕوح لە قەلبی پیاو دەستێنێ.

٢١٩

وەرە بگەڕێوە ئەی ساحێب ئیختییار
وەک سانی نەریمان وا بووی سوار

دەڵێی بێ عاقڵی، نەتماوە ئیختییار
هاتۆتە مەیدانی عیشقت یار.

٢٢٠

گوڵندام کوڵمەی وەک زەردە بێیە
دەڵێی جەللابە و خوێنڕێژی پێیە
گوڵندام پرسی: ئەو سوارە کێیە؟

٢٢١

ئەوە سوار بووە، بەختی بووە بەد
خەڵکی خۆی دەداتە بەر بای ڕەحمەت.

٢٢٢

بۆ ئەو بێ بەشە لەو خەڵات کاری
هیچ وەری نەگرت دیاری و یادگاری
نەهات خۆی بکا مەعلووم و دیاری.

٢٢٣

عاشقان پێیان گوت: ئەوە هەژارە
بێ مڵک و بێ ماڵ، هەر تەنیا سوارە
ئەویش هەڵبەتە دڵ لە هاوارە.

٢٢٤

قوربانی تۆ بم، شەدەی فەغفوورت
هەڵبەت شەرم دەکا بێتە حزوورت
ئەگەر بدینێ دوو کوڵمەی سوورت
چاوی ڕەنگاوڕەنگ، پیاڵەی فەغفوورت
حوکمڕانییەکەت، پادشا دەستوورت.

٢٢٥

گوڵندام بە فیدای گوت: ئەوە شەرم دەکا، بچۆ بەمێهرەبانی بانگی بکە.

بەخۆشی و مەردی چاکی بدوێنە
چومکە غەریبە دڵی مەشکێنە
بڵێ بێ بەش بووی لەو چاو شەهێنە
جلەوی بگرە و بۆ ئێرەی بێنە.

٢٢٦

فیدا لەنجەی کرد بەسەت ناز و ناز
تاوسان بە چەتر، بولبول بە ئاواز
قاسپەی کەوە و دەنگی قەرەناز
لە دڵی عاشقان زولفی دەگرێ گاز
شەیدای شۆخ و شەنگ ئەی یاری ممتاز
لە بەخت دەنیشێ تەڕلان دەگەڵ باز
مەنسوور شا دیتی هات یاری دڵخواز.

٢٢٧

پرسی: سوارە! غەریبی فکر نەماو
بۆ وا بێ هۆشی بازی سەرشێواو
تۆ بێ بەش ماوی، خەڵات پێ نەدراو.

٢٢٨

بارام وای پێ گوت، وەک شەکر و شیر بێ
کارکەرەی دەوڵەت ئەو قسەت لە بیر بێ
با زێدە لە عاشقان لباد فەقیر بێ.

٢٢٩

بۆیە من ناگا هیچ فکر و دادم
شکایەتی دڵم، داد و فریادم
چومکە فەقیرم، خێوەت لبادم.

٢٣٠

دڵم وای پێ کوتم، کوتی: لێرە نەمێنێ
بۆ جێگای چۆڵی خۆی بڕەنجێنێ
زێدە لە عاشقان گوڵندام نایدوێنێ
هیچ کەس نییە خەڵات گەر بۆ تۆ بێنێ.

٢٣١

ئاخر بەخۆم نییە دڵم ڕەنجاوە
وەک شووشەی ناسک دڵم شکاوە
گوڵندام ئاوڕی لە من نەداوە.

٢٣٢

ئاخر عاشق دڵی بەخۆی دەمێنێ
زێدە لە عاشقان ئەمن نەدوێنێ
وەک دەستی غەیبی دڵم دەڕفێنێ
زێدە لە خەڵکی من دەسووتێنێ.

٢٣٣

مەنسوور شا گە دی نیم نازی فیدا
جەرگ و دڵی هەر وەکو شەم دەسووتا
پێشی ئیراد بوو گەر قسە بکا
لەبەر هەیبەت و فکری بارام شا.

٢٣٤

ئەوە فـیـدا کـوتی: گـوڵندام بـانگت دەکـا، دەڵێ بێ بزانین ئەوە چ کـارەیـە. بارام هەستا چووە کن گوڵندامێ. گوڵندام بارام دەدوێنێ.

بارام شا ئەگەر هات، شێت و شەیدای کرد
گوڵندام بەچاوی عاشق چاکی تەمەشا کرد
لیمۆی گۆناگۆن خاڵ خاڵ جودا کرد
کەمبەرەی ئاڵتوون لە پێش ڕەها کرد.

٢٣٥

کەمبەرە یەگجار بە قیمەت گرانە
قیمەتی تەواو نیوەی جیهانە
یاقووتی حەسەن بە قیمەت گرانە
چاک تەمەشای کرد بەو دوو چاوانە
بە جووتە ئەبرۆ تیرەندازیانە
چاوی وەک کۆترە، لێی ون بووە هێللانە
هەر دەڵێی ئاسکی پێشی سوارانە.

٢٣٦

پرسی عەزیزم ئەتۆ کوێندەری
وا خاکەسار و لباد لەبەری؟

٢٣٧

بارام جوابی داوە، کوتی:
بۆ وەعزی دونیا لباد لەبەرم
چاک لێم حاڵی بە ئەی تانجی سەرم
ئارامی دڵم، ئەرێ دولبەرم
حەز دەکەی ئەو دونیایە بە سەربەرم
عەسڵ شازادەم، پادشای قەیسەرم.

٢٣٨

ئەگەر لە جێی خۆم ئەمن بزووتم
دڵ پڕ لە ژان و پڕ گەرمەسووتم
من بۆ تۆ هاتووم، بۆ تۆ نابووتم.

٢٣٩

مردن خۆشترە لە ئاواڵ کەمی
دایمە داییسێی، هەر دەڵێی شەمی
نابێ تۆ بپرسی لە زۆر و کەمی.

٢٤٠

عەزیزم ئاخر تەڵخە ئەحواڵم
ماڵم بۆ چییە، بێ ماڵ و حاڵم
زمانی لاڵم، بەو گەرووی تاڵم
لەبەر خاتری تۆ ئاخر عەبداڵم
حەقم بەدەستە هەر بۆت بناڵم.

٢٤١

خاڵی دەمەکەت وردە ڕێز مەکە
ئەمن شازادەم، لێم پارێز مەکە
دەسماڵت لە من ئەتڵەسی دێز مەکە
وەک جەیران لە چۆم شەو ئاخێس مەکە(٥٦).

٢٤٢

مەمکە بەمەجنوون، شکست بێ حاڵم
بڵێن: دێوانەیە، هەر دڵ عەبداڵم
ئەمن موفتەلای دوو چاوی کاڵم
لەبەر خاتری تۆ بێ ماڵ و حاڵم.

٢٤٣

سکەم سپی کرد من لە حەیفی تۆ
هێندەم خەیاڵ کرد بە بچۆ و مەچۆ
ئاخ لەبانی ئاخ ڕۆ لەبانی ڕۆ
با بنیشم لە سایەی زولفانت ئیمڕۆ.

٢٤٤

مەدە لە جەرگم ئەبرۆی پەیکانت
سێ بەنگی[٥٧] مەکە قەرە زولفانت
هەنیەت[٥٨] هەڵێنە، دوو چاوی جوانت
پێم بڵێ: ساکین بێ دەردی گرانت
بەس ناڵە ناڵ کە، هانێ دەرمانت.

٢٤٥

وەکو دێوانان، من شێت و هار مەکە
چاوت گۆناگۆن، لێم بەخومار مەکە
بە زەردەخەنەی لێو بۆ من کار بکە.

٢٤٦

تەشەکور دەکەم ئەمن بەو حاڵە
بەو دڵی پڕ هێش، بەو گەرووە تاڵە
لوتفت مەرحەمەت کرد، کوتت: ئەوەش عەبداڵە؟
بەو ئەبرۆی خەدەنگ، قەدی شمشاڵە
بەو لیمۆی بەروێت، هەناری کاڵە
بەو ڕەنگ و ڕوخسەت، هەوری گەواڵە.

٢٤٧

عەزیزم بەسە ئیدی کیفایەتە
دیارە زۆر عاشقی، جەرگت لەت لەتە

دڵت وەک دەلیا، وەک چۆم و شەتە
ئەوە قنیات و حەسانەوەتە.

٢٤٨

خوداحافیزی، ئیدی گەڕاوە
بەدەن عەڕعەڕە، شوبا لێی داوە
دەڵێی نەمامە، تازە چەقاوە
سێ جار لەسەر یەک ئاوڕی دەداوە
عاشقی بارامە، مەیلی پێ داوە.

٢٤٩

چومکە جێگاکەی غەڵەبی و گەرمە
بەدڵی حەز لێ کرد، بەزاری شەرمە.

٢٥٠

شەوێ بارام لە خۆشی گوڵندام کە جوابی داوە بەخۆشحاڵی دانیشتبوو. شەوێ لە مەجلیسێ عادڵ شادا گرمە گرم و هەڵڵا هەڵڵا پەیدا بوو.
شەش سەد کەس هاتن، پاکی بەرگی سپی لەبەر کردبوو؛ هەمووی دەستی لە خوێندا بوو، سێ پەنجەی خوێنی لە سنگیدا بوو. هەمووی دوو شیری لە خۆی قایم کردبوو؛ یەک لە ڕاست و یەک لە چەپ. ئەوانە قاقەزێکیان هێنا بوو، خالیس بەخوێنی چاوی بولبول نووسرا بوو. ئەوە مەلیک ئەختەری فەرەنگ بۆ عادڵ شای نووسیبوو؛ ئاوای نووسیبوو:

ئەگەر مەتڵەبتە ڕوحت دەربەری
نەکەویە هیلاک، بۆ باسی سەری
لەبزی شیرن و خاڵی عەمبەری[٥٩]
مەمکی هەنار و لەبزی شەکەری
هەرتکیان وەکو زۆرە و موشتەری

هەوەڵ هاتمە کنت من بەنۆکەری
فیدا و گوڵندام بەمن بدەری.

٢٥١

من لەگەڵ تۆمە پادشای ساحێب سان
دولێری دونیا، مەردی نێو مەردان
مەبە بە باعیس ڕووحی جوانان
گوڵندام و فیدا ساز کە هەرتکیان
بە دیاری بیانبەم بۆ فەڕەنگستان
شار بغەملێنم وەک باغ و بێستان
لە کن من هەیە گەرمێن و کوێستان.

٢٥٢

خەڵوارێک لیرە، زیبایی گەردن کەشان[٦٠]
مەتاحی بەحرێ بە قیمەت گران
پێشکێشت دەکەم من بە وشتران
دەبین بە خزم ئەرێ ڕوح و گیان
لە مێژە کەوتمە سەر مان و نەمان.

٢٥٣

من لەگەڵ تۆمە پادشای خۆش کەلام
ئەرێ عادڵ شا، پڕ عاقڵ و پڕ فام
دەبێ بۆم بنێری فیدا و گوڵندام.

٢٥٤

ئەو وەختە ئەمن نۆکەرم
دایمە لە پشت سەر فەرمان بەردارم.

٢٥٥

دایم دەست نەزەر

خزمەتت دەکەم وەک ئاغا و نۆکەر

دەنا دەی هەستێنم بەزەبری خەنجەر

بەقەووەی لەشکر دەتکەم دەربەدەر

بێ ملکت دەکەم، تۆ خۆڵت وەسەر

مەبە بە باعیس سەد هەزار نەفەر

لەسەر مەتاحێک لەعلی بەدەخشان

گوڵندام وێنەی ئەستێرەی عاسمان

فەرەنگستانم خستۆتە شێوان

من دەردەدارم، دەکەومە کێوان.

٢٥٦

باقی وەسسەلام، ئیدی دیار بی

تەخت و ئەملاکت با بەرقەرار بی

ئەگەر حەز دەکەی تۆ دۆست و یار بی

یانە بکوژرێی یان بریندار بی

بەدەستی دوژمن تۆ گرفتار بی

حەفس و دێوانە، تۆ چار بێ چار بی

ماڵ و منداڵت جاریە و بیمار بی

دەنا بۆم بنێرە سەوڵی دڵ ئارا(٦١)

شەو و ڕۆژ دڵم زۆر بێ قەرارە

دنیای ڕووناکم لێ ژەهری مارە

دەبێ پێک بێنی ئەو کاروبارە.

٢٥٧

گوڵندام (لەبەر خۆیەوە ئەوانە) دەڵێ:

ساحێبی هیند و سوپایە

مەعدەنی شەرت و بەقایە

ڕێگای شەرت و وەفایە

خوێن وا بە دڵمدا نایە.

٢٥٨

دەبێ کار وەدەرکەوێ

دەبێ وەدەرکەوێ ئەو کارە

دڵ ئەوەندە خوشم و بیمارە

جارێکم پێ بڵێ بە زارە

لێم شێواوە ئەو ڕوخسارە

ڕووم گوڵی سیمین عوزارە

بۆیە دڵم ناسرەوێ.

٢٥٩

گوڵندام بەخەندە جار جار بەگریان

زولفی ڕیحانەی پاک کرد پەرێشان

بە پەنجەی شمشاڵ ئەو بە لەخۆدان

لە سنگی خرمەی دێ یاقووت و مەرجان

لەعلی ڕوممانە، خەزێنەی شاهان

ئەوانی بچڕین، لە عەرزی ڕژان

عاشقان لەبەر کەن لیباسی ژنان

ئیغیار من دەبا بۆ فەرەنگستان.

٢٦٠

گوڵندام بەعاشقان دەڵێ:

نێچیری ئەنگۆم، دەمبا بێگانە
جا ئەوە حاڵاتە، ئەوە ژیانە!
وەکو جوولەکان بچنە خمخانە.

٢٦١

قەستەم بە زولفی نێرگسی خاوم
بەو سنگ و بەرۆک دەست لێ نەدراوم
جۆگەلەی بەستووە من خوێن لە چاوم
ئەوەند لە حەسرەت زاری و گریاوم
چومکە نەگەیشتم بە مراد و کاوم
وەک غەڵفی ساوا من بن بڕاوم
چاوم بۆ ببینێ، با کوێر بێ چاوم
بۆ فەرەنگستان یەخسیر کراوم.
ئەگەر دەتوانن جەرگو داغ بکەن
لە ڕێی ئەو کارە چاک دیفاع بکەن.

٢٦٢

بارام گە زانی وەزعی ئەو کارە
لە پشتی ڕکێف ئەو دەبوو سوارە
تەعزیمی دەکرد، دڵم بیمارە
بە منی بسپێرە ئەو کاروبارە.

٢٦٣

سەری هەڵێنا سەوڵی دڵ ئارا
بە مەردی دەدی ئەو تاقە سوارە

سەقاوی زێڕە، گشت سەدەفکارە
ڕمبی بێ ڕوحمی لە شانی دیارە.

٢٦٤

ڕاست و چەپ لە شان وای کرد ئامبازی
ژێ چەرمی گەوەزن، بۆ تیرەندازی
بۆ مردنی خۆی زوو دەبێ ڕازی.

٢٦٥

بارام بەگوڵندامێ دەڵێ:
فیدای گیانت بم ئارامی دڵان
بۆ دەکەی زاری و واوەیلا و گریان
لەبەرمان دەکەی لیباسی ژنان
پیاو دیاری ناکا تا ڕۆژی مەردان
تا کەلاک کەوتن، کەلاک فڕێ دان
خوێن عەرزی نەگرێ و کەلاک نەگرێ سان
وەک بازی برسی بکەویە دڵ هێشان
باز ئامادەیە وەختی کەوقڕان.

٢٦٦

ئەمن بازم، دوژمنت کەوە
ڕۆژگاری ڕووناک لە کن من شەوە
دەجەرگی بڕاو ئەتۆ بسرەوە
مەردی و نامەردی جا وەدەرکەوە.

٢٦٧

ئەو حەلە دەزانی کێ گیانفیدایە

کێ جەرگ بڕاو، دڵ موفتەلایە
بۆ کوژرانی خۆی ئەو بێ پەروایە.

٢٦٨

گوڵندام ڕازی بوو بەو حاڵ و باڵە(٦٢)
لەبزی شیرنە و شیرن جەماڵە
بەشان و شەوکەت ڕۆستەمی زاڵە.

٢٦٩

بە ڕەنگ و ڕوخسەت، باڵا و هەیکەلی
وای هاتە پێش چاو وەک خاڵندی وەلی
شێر دەستووری دی وەک ئیمام عەلی.

٢٧٠

هێند بەدەستوبرد، قسەی کەوتە سەر
ڕاسان و جۆشان وەک ئیمام هەیدەر
وەهای لە خۆی دا تانووت و حونەر
نێزە و مەتاڵ و شیر هەتا خەنجەر
هەمووی لێی دەتکێ ڕەونەقی جەوهەر.

٢٧١

ئیدی دەستبەجێ گوڵندام دڵخۆشی بەوە پەیدا کرد، کوتی:
خاترجەم ئەمن بۆ تۆ سەربەخۆم
ئەلعان مەجبوورم لە کن تۆ دەڕۆم
هەتاکو دەمرم من بەهەویای تۆم
ئەتۆم پێ مەردی شای قەیسەری ڕۆم.

٢٧٢

چون تۆ ھاتیە پێش وا بەموشتەری
من ئەو عاشقانە دەکەم بێ بەری
چاوت بۆ بکەمە زۆرە و موشتەری
ڕاستە، درۆ ناکەی، پادشای قەیسەری.

٢٧٣

سوێندت بۆ دەخۆم بە زاتی خودا
شاھی لەم یەزەل، شای عەرز و سەما
پادشای بێ نەزیر، ئەو شای بێ ھامتا
لەبەر خاتری تۆ پادشای موستەجا
شەرت بێ فیداش بدەم من بە مەنسوور شا.

٢٧٤

قاقەزەکە ڕاگیرا بوو؛ ئەختەر شا جواب نامەی بۆ نەچووبۆوە. بارام بەگوڵندام دەڵێ:

بە تیری دەستت جەرگت کردم کون
لەکنە خۆی دۆستی، لێم بوویە دوژمن.
بۆ جوابی نامە بپرسە ئەحواڵم
ئەرێ حەیاتم، ئەی مەھ جەماڵم
لە جێی پادشایی و بەخت و ئیقباڵم
لە جێی جحێڵی و دڵی پڕ ناڵم.

٢٧٥

لە دووم بنێرە بۆ ئەو دەستوورە
چاوەکەت دەڵێی پیاڵەی فەغفورە

کوڵمەت داییسێ، ئاوری جێی دووره
دەروون داییسێ، هەروەک زەنبووره[٦٣].

٢٧٦

جارچی خەبەر دا بەمەجلیسی شاه
دێته مەجلیسێ کەناچەی وەک ماه.
گفتوگۆی هەیە لەگەڵ مەجلیسێ
ئارایيش بگرن، نەبێ ناقیسێ.

٢٧٧

مزگێنی بدەن، کەناچەی قاقان
تەشریفی دێنێ بۆ نامە جوابدان
بۆ جوابی نامەی شای فەرەنگستان.

٢٧٨

بەناز و نیم ناز، عیشوە و شەکەری
چاوی کردبووە زۆره و موشتەری
ئەبرۆی کورِ لە باب دەکا بێ بەری.

٢٧٩

سڵاوی دەکرد لە مەجلیسی شا
مەجلیس شڵەقا و لە بەری هەستا
لە گەڵی هاتبوو مەلەکەی فیدا
لە شانی پادشا، کورسییان بۆ دانا.

٢٨٠

گوڵندام لە شای دەکرد سڵاوە

به مێهرەبانی دڵخۆشی داوە
جوابی نامەکەی ئەختەر شاو داوە؟

٢٨١

شا کوتی: نەخێر، ئەتۆ چ دەکەی
مەحتەلی تۆ بووم تەگبیرێک بکەی.

٢٨٢

گوڵندام کوتی: بەمن ناکرێ جوابی نامەی ئەختەر شا بدەمەوە.
پێم نادرێتەوە جوابی نامەی وێش(٦٤)
بەکەسێک دەکرێ بەوری بێ ئەندێش
بۆ ڕۆژی دەعوا سنگ بباتە پێش.

٢٨٣

لە نێو عاشقان لباد لەبەرە
ساحێب زۆر و زات، زۆر بەهونەرە
پێم وایە ڕۆڵەی پادشای قەیسەرە.

٢٨٤

ساحێب کەماڵە، پڕ عاقڵ و کەماڵ
هەروەکو شێرە مەردی پڕ ئەحواڵ.
ئەگەر بنێری، ئەو کارە کامە
ئەو بداتەوە جواب و جواب نامە.

٢٨٥

وام هاتە بەر دڵ، وام پێ کەوت چاو

هەروەکو شێری بێچووە هەڵگیراو
شیرنە سواری و سەقاوی و لغاو
پێم وایە مەردە، ئەو دەبێتە پیاو.

٢٨٦

بۆ جوابدانەوە، ئەو تانجی سەر بێ
مەگەر ئەو خەمی پادشای لەبەر بێ
پێت وابێ گەر ئەو پادشای قەیسەر بێ.

٢٨٧

ئەوە دەنێرن لەدووی بارام. گوڵندام کوتی:
عاشق هەموویان خۆیان پێ شێرە
لە دوای شای قەیسەر فیدا بنێرە
چومکە لایەق و جوان و جوانمێرە.

٢٨٨

یەکێکیان پادشای حەڵەب زەمینە
پڕ زۆر و زاتە، وەک شێری شینە
پەنجەی وەک پڵنگ، هەر پڕ لە خوینە
ئەو دێتە ئێرە، ئەتۆ بیدینە.

٢٨٩

مەردی پڕ هونەر، پڕ زۆر و زاتە
پێم وایە تەختت بەوی نەجاتە
زۆر ساحێب عاقڵ و هۆش و بنیاتە
ئەویشیان پادشای قەیسەر وڵاتە.

٢٩٠

بەو دووانە دوژمن دەکەم موفتەلا
بە زاتی یەزدان، بە هومێدی خودا
هەرتکیان شێرن، شێری بێ هامتا
جار جار بە شیر و جار جار بە تیر و بە گورز گاھ گاھ
بارام دوژمنی تۆ زەلیل دەکا
بارام دوژمنی تۆ فەنا دەکا
تە فرەقە و شکست، موفتەلا دەکا.

٢٩١

ناردیان لەدوویان و ئەوە دێن.
بارام تەعزیم کرد، کردی سڵاوە
بەتەسکینەوە جوابی شای داوە
چومکە پادشا بوو، هیچ نەشەمزاوە.

٢٩٢

من لەگەڵ تۆمە ئەرێ شەهریار
بەیداغ و تانجت ببێ بەرقەرار
ئەوە من هاتم وەک شێری وشیار
ناردتان لە دووی من، بەمنتانە چ کار؟
هەتا پێی بکەم کار تاکو ڕفتار.

٢٩٣

شا فەرمووی: فەرموو ئەی مێهرەبانم
ساحێبی ڕمب و گورزی گرانم
خزمەتت دەکەم هەتا بتوانم

ئێخسیر و شکست دەستی کافرانم
بەرامبەر دوژمن حاڵ پەرێشانم
جوابدانەوەی قاقەز ئەمن نازانم
وەکیلی من بە ڕووحی ڕەوانم.

٢٩٤

بارام جوابی دا: ئەمن میوانم
غەریبی شاران، دڵ پڕ لە ژانم
دەنا خوێڕی نیم، شێری لە لانم
جوابدانەوەی وی بە سەر چاوانم.

٢٩٥

بارام جوابی ئەختەر شا دەداتەوە:
شاهم وا نابێ، ئەمن وا ناکەم
من یەخسیری خۆم تەسلیم وی ناکەم
ئازای بەدەنت لە هەم جوداکەم
سەرتاپای تەنت بە تۆتیا کەم.

٢٩٦

سوێندم لێ خواردی بە زاتی ڕەحمان
کەللەت دەشکێنم، من دەتکەم بێ گیان
کالانەی چاوت بیکۆڵن مورغان
بێ عاقڵ و شعوور، ئەبلەی هیچ نەزان
ئەتۆ دەستێنی نێچیر لە عاشقان؟

٢٩٧

ئەتۆ نازانی من یارەمانم
ساحێبی تیخ و گورزی گرانم

لێرەم خەرج کرد ڕووح و گیانم
مردنم پێ چاکترە، نەکو ژیانم
سێ سەتی وەک تۆ بە تولّە نازانم.

٢٩٨

ڕۆژی دڵ هێشان، شەقەی ئاوزەنگی
ناڵە ناڵی بێ هازەی خەدەنگی
گەروو تاڵ دەبێ ڕۆژی دڵ تەنگی.

٢٩٩

تەمەڕرودت کرد کافری دین بەتاڵ
بە شیر و نێزە بە گورز و مەتاڵ
دنیای ڕووناکت وەها لێ بکەم تاڵ
سوعبەتت پێ بکەن ژن تاکو منداڵ.

٣٠٠

قسەت کردووە پادشای سەربەخۆ
وەزیرێک نەبوو نسیحەت کا تۆ؟
شەرت بێ بە سەرت شەقێن بکرێ و گۆ
دایکت حەوت ڕۆژان بۆت بکا ڕۆ ڕۆ.

٣٠١

لەشکرت شکست وا جێبەجێ[٦٥] کەم
نیوەی بکوژم، نیو لە بەحرێ کەم
هەمووی بڵاو و شێواوی ڕێ کەم.

٣٠٢

ئەما عەزیزم دڵ بریندارم
بەو شەرتەی خودا ببێ بەیارم.

من خولاناسم، تۆ هیچ نەزانی
ئەبلە و بێ عاقڵ، تۆ بێ ئیمانی
زۆر دەربەدەر و ئەجەل هاسانی.

٣٠٣

نامەی چاک نووسی بە غوربەتییە
لە پشتی نامەی عەکسی نووسییە
بگەڕێوە، ئەو کارە کاری تۆ نییە.

٣٠٤

کورتی ببڕینەوە، بوو بەشەڕ.
کافرن ددان بوڵغار
ڕمبیان پێیە سپیدار
سەر ئەڵماسی نووک مکار
لەشکرت هات بۆ قەراغ شار
دەورەی شاریان گرت، هەر وەکو حەسار
لەشکری پادشا لەوان دەبوون سوار
بارام خۆی نەکرد ئەبەدا دیار.

٣٠٥

مەنسوور شا پادشای حەڵەب
پادشای عالا نەسەب
ساحێبی تەخت و کەوکەب.

٣٠٦

یازدە ڕۆژان شەڕ بوو. بارام و مەنسوور شا بە لەشکری حود زەمین و بە لەشکری عاشقان لەشکری ئەختەر شایان شکاند. هێندێک لە عاشقان هەڵاتبوون؛ نەیانوێرا بچن دەو شەڕەوە.

سبحەینێکی بارام گەیشتە سەر ئەختەر شا، یەک تیری لە گرێی پشتی دا؛ شۆڕی کردەوە، کەوتە نێو چۆم. لەشکر گەورەی نەمێنێ دەبێتە مەڕی بێ شوان. لەشکرەکە شکا. ئەو هەموو خێوەت و ئێختەرمە پاکی لێیان بەجێ ما.

ئیدی بارام ڕانەوەستا لەسەر تالان، مەتڵەبی تالان و بڕۆ نەبوو. بارام سەری ئەختەر شای بڕی و هەڵیگرت؛ بەمەنسوور شای گوت: با بگەڕێینەوە، زێڕ و پووڵ و جەلال بەکاری ئێمە نایە.

زێڕ و پووڵ و ماڵ بۆ من بێ فامە
خەزێنە و گەنجم چاوی گوڵندامە.
ماڵ و زێڕ و زێو بەکارت نایە
خەزێنەش بۆ تۆ چاوی فیدایە.

ئەوە گەڕانەوە. ئەو عاشقانەی هەڵاتبوون لە کەلێن و قوژبنان وەدەرکەوتن؛ ئەوانە کیسەڵیان دەکوشت هەتا ڕمبیان خوێناوی بێ. لەشکری شکست پیاوی خوێڕیشی لێ وەخۆ دەکەوێ. ئەوانەش وەدووی شکستەی لەشکری ئەختەر شای کەوتن، کارێکی وایان پێ کردن با بە دەواری[٦٦] پاییزێ نەکا.

تەلایەچی جاڕیان کێشا: ئەی کۆمەگی گەورە ئەی موسوڵمانان ئەی عاشقان سەری بڕاوە ئەختەر شا. هەرکەس سەری ئەختەر شای بڕیوە، گوڵندام ئی وییە. چون دوژمنی وا گەورە، بەدەستی وی لە بەین هەڵگیراوە.

٣٠٧

زولفی تار تار کرد، چون بەندی کەوان
ئەبرۆی کردە تیر، وەختی کێشان
تەماشاکردنی پیاو دەکا بێ گیان.

٣٠٨

عادڵ شا گوڵندامی لەسەر بورجێ ڕاگرت، گوتی: گوڵندام پێشکێشی ئەو کەسەیە نیشانەی بێنێ. سەری ئەختەر شا لە کن هەر کەس بێ، ئەوە ئەو هونەر و فەتحەی کردووە. عاشقە هەڵاتووەکان دەیانگوت: سەری نەماوە، فەرەنگییان بردوویانەتەوە.

شا بەردێکی مەعلوم کرد لە دەروازەی پادشایی، شێوەی گوڵندامی لەسەر بوو،

فەخرییە (؟) کاری بوو. جا شا ئەو بەردەی دانا؛ گوتی: هەر کەسێکی ئەو فەتحەی کردووە، سەری ئەختەر شا بێنێ لەو بەردەی بدا، لەوێ نێوونیشانی خۆشی مەعلوم بکا.

شەوێ بارام کەللەی ئەختەر شای لە ڕمبی دا؛ ڕمبی لە بەردی خارا بردە خوارێ. قاقەزێکی نووسی، لە قەبرغەی بەردەکەی دا. نووسیبووی: هەر کەس ئەو ڕمبە دەرێنێ، ئەو کەسە ئەو حونەرییەی کردووە.

بۆ سبحەینێ پادشا جاڕی کێشا: ڕووی ئەو کەسە سپی بێ، ئەو کەسە بێ ڕمبی خۆی دەرێنێ، بێ گوڵندامی پێشکەش کەم.

عاشقان تێی دەنووسان، ئەبەدا ڕمبیان بۆ وەدەر نەدەکەوت. هەموو خۆیان تاقی کردەوە، بۆیان دەرنەهات. ئی وا بوو قڕانێکی نەدەهێنا، ئەویش تێی دەنووسا. بارام مەنسوور شای دەگەڵ خۆی هێنا و هات.

بارام جاڕ کێشا، عاشقانی شار
بۆ کەس نەیکێشا ڕمبی سەوزەوار
هەتا بیدەنێ ناسک و نازدار.
کوا قاوە و قلیان، پیاڵەی فەغفووری
کوا بگرە و بێنەی حاکم دەستووری
ئەمن بێ لەشکر، سپا و فریادم
ئەگەر نامناسن خێوەت لبادم.

پەنجەی لە ڕمبەکە دا، تەکانی دایە؛ خەڵوارێکی بەرد پێ هێنا دەرێ. پادشا ئافەرینی پێ گوت، هەتا چل شەو ئەوی کردە خودموختار، ئیختیاری هەموو کارێکی دایە لە مەملەکەتدا.

بارام گوتی: پادشا ئەمن ئەو عەزیەتەی کێشام بۆ گوڵندام بوو. گوڵندامیان لەو مارە کرد. بارام گوتی: گوڵندام لە من حەرام بێ هەتا فیدا لە مەنسوور شا مارە نەکەن. فیداشیان لە مەنسوور شا مارە کرد.

بارام گوت شاهم دڵ بێ ئارامە
وەسڵی گوڵندام لە من حەرامە

بۆ وەک بزانی شوان و گەدامە؟
دڵ پڕ لە ژان، دەروون پڕ بۆسۆم
هەتا نەنێرم بۆ قەیسەری ڕۆم
خەبەردار نەکەم دایک و بابی خۆم
بابە بیژوو نیم، ئەمن کوڕی تۆم.

٣٠٩

دایک و بابی مەنسوور شا لە حەڵەبێ ڕا هاتن. بابی بارامیش بە شێست هەزار لەشکرەوە هات. کاڕوبا و سەڕسەڕ و ئەرژەنگ و سەمەن بۆش خەبەریان زانی و هاتن بۆ وێ.
لەبەر سواران، لەبەر پڕ حونەر
حود زەمین بووە بە سەحرای مەحشەر.
داوەتەکە دەست پێ کرا، پاش چل شەوان عەروسییان خلاس بوو.

٣١٠

هەزاران درووود و هەزاران سەلام
زما بەر محەمەد عەلەیهی سسەلام.
پەراوێزەکان:
١- جلیت، جۆرە کایەیەک بووە کە وەک پیشاندەری شەڕ و پێکدادان دەهاتە ئەژمار کایەکە بەم شێوەیەیە: سوارکارێک چەند دارێکی تایبەت کە پێیان دەگوترا «دار جلیت» یان «دار تەقڵە»، بەدەستەوە دەگرت و دوای سوارکارێکی تر دەکەوت و ئەو ئەو دارانەی بەدەم سوارەیەکەیەوە بەرەو لای ئەو سوارەی تر دەخست.
خوالێخۆشبوو حەسەنی سەیفی قازی بۆ مبارەکبادیی زەماوەندی عەلی خانی حەیدەری ناسراو بەسالار سەعید قەسیدەیەکی خوێندەوە و لە بەیتێکدا وشەی «جلیت»ی بەکارهێناوە و گوتوویەتی:
جلیت بازان لەلایێ هاتە هاتە    لەترسی داری وان پشتی فەلەک کووڕ
٢- دڵ هێشان، مام ئەحمەدی لوتفی ئەم دەستەواژەیە بەواتای شەڕ و شۆڕ بەکاردێنێ.
٣- نێودێربێ، ڕستەیەکە لەکاتی ناولێنانی منداڵ وەک پیرۆزبایی بەدایک و باوکی منداڵ دەگوترێ.

٤- ئاچغ، وشەیەکی تورکیە، بەواتای ئاواڵە و کراوە.

٥- ئەم وشانە کە پاش نیشانەی = خراونەتە نێو کەوانەوە بەشێک نین لە دەقی بەیتەکە، بەڵکە من خۆم پێم زیاد کردووە.

٦- گوێزەبانە، جێژنی ناو لێنانی منداڵ.

٧- بازی بەند، واتە بازووبەند

٨- مەزبووت، واتە دلێرو هێزا

٩-ڕوون نیە «حود زەمین» کام وڵاتە.

١٠- هەناردنی گوڵ لەلایەن مەعشووقەوە بۆ ئاشق یان ئاشقان، کە تەعبیرێکی ئەدەبیی ناسکە، لە زۆربەی بەیت و گۆرانیە کوردییەکاندا وەبەرچاو دەکەوێ، بۆ نموونە:

شەرت بێ گوڵی کەس نەکەم بەبۆوە تا گوڵم بۆ دێ لە خزمەت تۆوە

١١- شانەوسان، ئەم دەستەواژەیەی کە ئاوەڵناوی وشەی «گەنج»ە دەستەواژەیەکی عامیانەیە.

١٢- مەجرووم، بێژکردنی عامیانەی وشەی «مەجنون»ە.

١٣- مەتاح، بێژکردنی عامیانەی وشەی «مەتاع»ە.

١٤- لاپ، وێدەچێ بێژکردنێکی عامیانەی وشەی «لاف»بێت.

١٥- وەردۆک، باڵندەیەکی ئاوییە، لەوانەیە هەمان ئۆردەک بێت.

١٦- قەرەندار، دەبێ هەمان قەرەناز بێت. لە لاپەڕەی ٩٨ - ی کتێبی «ناوی باڵندە لە زاراوەکانی کوردیدا» لە تیرەی باڵندەی ماسیخۆرە کە دنووکی سپی و پەڕوپۆی ڕەشە.

١٧-گەرمە برین، ئەو برینەی تازە بێت. دەڵێن برینی وا سەرەتا ئێشی لەگەڵ نییە. بەڵام لێرەدا بەپێچەوانە «گەرمە برین» واتە برینی بەئێش.

١٨- ئەم وشەیەم لە ئاخافتنی خەڵکدا نەژنەفتووە. بەپێی زەمینەی ڕستەکە دەبێ بەمانای ناڵە و شیوەن بێت.

١٩- خوسار، واتە ئەو شەونمەی بەستوویەتی. مەبەست لە سێوی خوسار، سێوی پایزانە کە «خوساری لەسەر دەنیشێ»و باق و بریقی تێدەخات و دەیدرەوشێنێتەوە.

٢٠- نەبەدی، واتە ناپەیدا و غەیبی، دژی بەدی.

٢١-سوڕەبەند، بەقسەی بەیت بێژ واتە وێنە.

٢٢- بەحسەت، بەواتای هەلومەرج و کەش و هەوا و بارووذۆخ هاتووە.

٢٣- ڕوخسەت، وێدەچێ بێژکردنی زارگوت و عامیانەی ڕوخسار بێت.

٢٤- وێدەچێ ئەم نیوە بەیتە زیادکراوبێت و مام ئەحمەدی لوتفی خۆی پێی زیاد کردبێت.

٢٥- شیست، وا دیارە مەبەست «شیست»ی پێغەمبەرە کە لە تەوراتدا گوتراوە ٩١٢ساڵ ژیاوە، بڕوانە کردشناسی، نوشتەی م، اورنگ، ل١٥

٢٦- واته ئاسكێك تەقەی لێكرابێ و ترسابێت.
٢٧-بەدر، وێدەچێ ئەم وشەیە شێوەی جێگۆڕكێ كراوی بەرد بێت.
٢٨- ئاخێس، ئامێز، لە فەرهەنگی مەهاباد دا وشەی «ئاخێز» هاتووە و لەگەڵ «خاست» هاوڕیشەیە.
٢٩- ئەم نیوە بەیتە و دە نیوەبەیتی دواتر كاریگەرێتی زاراوەی هەورامی یان گۆرانیان لەسەرە، بەیت بێژ دەستەواژەی «جە بەستەش كەمەند»ی بە«دەستی كەمەندی» لێكراوەتەوە، لەم حاڵەتەدا وێدەچێ دەستەواژەكە دەبێ «جەدەستەش كەمەند»بێت نەک «جەستەش كەمەند».
٣٠- بازووی وێشت، واتە بازووی خۆی، وێشت یان وێش یانی «خودی»
٣١- قەدارە، كەرەسەیەكە، لە شمشێر دەچێ، تیخەكەی پان وراستە، كەتار و كەتا لە و غەدارەشی پێ دەگوترێ.
٣٢- قەڵخان، وێدەچێ توركی بێت و بە واتای سپەر بێت، لە كوردیدا بەگیایەكی دڕوودارێش هەر دەڵێن قەڵغان.
٣٣- هەڵاوارد، واتە هەڵبوارد
٣٤- پەرە، واتە بۆ لای
٣٥- ئەم دەستەواژەیە قسەیەكی نەستەقە
٣٦- كەژ، لێرەدا جوان
٣٧- فەغفوور قەرە پۆشین، بەپێی مانای ڕستەكە دەبێ ناوی جلوبەرگ یان كۆتاڵێک بووبێت، لە كتێبی « گۆرانی یان ئاوازە كوردییەكان» و نوسراوەی دوكتۆر محەمەد موكری، پۆشین بەم شێوەیە لێكدراوەتەوە: «جۆرە دەسماڵێكی سەر» بڕوانە ل١٤٦
٣٨- تۆپز، تۆبز، جۆرە گورزێكی ئاسنیە. «تۆبز» لە كوردیدا بەواتای زۆر لێكردنیش بەكاردێت، وەک دەڵێن: «نەدەچوو، بەتۆبزیان برد» واتە بەزۆر بردیان.
٣٩- بەراوردی بكەن لەگەڵ ئەم شیعرەی سەعدی -دا:
بخت جوان دارد آنكه با تو قرين است پير نگردد كه در بهشت برين است
٤٠- كەناچە، واتە كچ
٤١- باڵا سیماكار، بەراوردی بكەن لەگەڵ «باڵای زێڕ ستوون»
٤٢- پشانۆ، بەگوتەی بەیت بێژ «پشانۆ» «پەرێشان» كە»
٤٣- تەلای دەستەوشار، وێدەچێ ئاماژە بێت بەو لەتە زێڕەی كە خەسرەو پەروێز بەدەستەوەی دەگرت. لە كتێبی «ئێران لە سەردەمی ساسانییەكاندا» نووسراوەی ئارتۆر كریستن سن، وەرگێڕاوی ڕەشیدی یاسمی، ل٤٨٧، دەربارەی ئەو لەتە زێڕە گوتراوە: لە شتە سەیر و سەمەرەكانی دامودەزگای پەرویز ئەو لەتە زێڕە بووە كە قورساییەكەی ٣٠٠ میسقاڵ بووە و

(مستی ئەفشار) کە وەک مۆم نەرم بووە و دەیانتوانی بەهەر شکلێک پێیان خۆش بێت دەری بێنن.

٤٤- کەسکون، بەو دەردە دەڵێن عیلاجی نەبێت.

٤٥- شیلە، هەمان شیرەیە.

٤٦- ئەم نیوە بەیتە لەلایەنی ماناوە دەگەڵ نیوە بەیتەکانی پێشوو یەکدەگرێتەوە و لەلایەنی سەرواوە دەگەڵ نیوە بەیتەکانی دوای خۆی هاو سەروایە.

٤٧- مەنسور شا سیمای «فیدایی» بەزێڕ و زیو دەشوبهێنێ.

٤٨- لاڵ، وێدەچێ هەمان وشەی «لەعل»بێت.

٤٩- دیانەت، واتە یادگار، چاکە بەخشینەوە.

٥٠ پەڕبەسەر، مەبەست کەسێکی ڕێزدار و گەورەیە.

٥١- بزر واتە شاراوە، ناپەیدا بڕوانە فەرهەنگی مەهاباد، کۆکراوەی گیوی موکریانی.

٥٢- بەزولفی وەرەشەچەمی، بەگوتەی بەیت بێژ مانای ئەم بەشە ئەمەیە:

«بەو زولفەی کە لەسەر چاوان بڵاو و پەرێشانە»

٥٣- واتە بەگوێرەی داب و نەریتی عەشیرەتەکان

٥٤- کەوشی کوڕەکی، بەقسەی بەیت بێژ جۆرە کەوشێک بووە،

٥٥- قنیات، واتە حەسانەوە، هێمنی

٥٦- وێدەچێ لەم نیوە بەیتە لەبری «چۆم» دەبێ «چەم» بێت.

٥٧- سێ بەنکی، جررە ڕازاوەیەکی زولفی ژنان بووە، کەمو زۆر لەسەر لەبەری ئەو بەیتانەی کە مام ئەحەمەدی لوتفی دەیانگرێتەوە ئەم تەعبیرە هاتووە. لێرەدا چەند دێڕێکی بەیتی «شۆڕ مەحموود و مەرزینگان»، کە لە یەکێکیاندا زاراوەی «سێ بەنکی»تێدایە دێنینەوە

باز لە هیچ کوێ ناحەوێتەوە و ناحەسێتەوە هەتا نەچێتەوە سەر هێلانە عەجایب ماوم؟ شۆڕ مەحموود ئەگەر مابێ، دەبێ بۆم بنێرێتەوە خەبەری خۆی و لەگەڵ نام و نیشانە

هەتا ئەمن زولفی بۆ سێبەنکی بکەم و شۆخیان بکەم قەرە زوڵفانە

سنگی خۆمی بۆ بکەم بەدەفتەرخانە

٥٨-هەنیە، ئەم وشە لە فەرهەنگی مەهاباد دا بەواتای «زغب الوجهە» واتا مووی دەموچاووە و ئەم واتایە راستە، بەڵام لێرەدا «هەنیە» بەمانای دەموچاو و ڕوخسارە.

٥٩- عەمبەری واتە عەنبەری یان عەنبەرین

٦٠- زیبایی گەرد کەشان، بەقسەی بەیت بێژ جۆرە سکەیەکی زێڕ بووە « زیبایی» لای من نامۆیە. بەڵام «گەردەکەش» و «گردن کەشان» بەمانای خاوەن گەردەنی جوانە، هەروەتر جاری وایە بەشێوەیەکی رەها بەمانای «جوان».

لێرەدا چەند دێری بەیتی «شۆڕ مەحموود و مەرزینگان» کە لەیەکێکیاندا زاراوەی «گەردن کەشان» هاتووە دێنینەوە:

پردەوان دەیگووت:

برین کولانەوە ئەو دەردەم تازە ناکرێ دەرمانە

کیژێکیان لەگەڵ بوو، شل و مل، نێوی مەرزینگانە

باڵا بڵند بوو، گەردن کەشانە

یەکجار زۆر قسەزان و عاقڵ و لەبەر دڵانە

لە ڕێگایە گەڕاوە نازانم شۆڕ مەحموود کێیە، ئاخ و حەسرەت و

داخی بۆ شۆڕ مەحموود دەکێشانە

دەیگووت پاش شۆڕ مەحموود، مردنم پێ خۆشترە، نامەوێ ئەو ژیانە

٦١- مەبەست لە «سەوڵی دلارا» گولندامە. لە فەرهەنگی مەهاباد دا «سەوڵ» بەم شێوەیە لێکدراوەتەوە: «مجداف نوع من النباتات المعطوه قامتها مثل الیاسمن»

٦٢- باڵ، لە «حاڵ و باڵ»دا جووتەن.

٦٣- زەنبورە، بەقسەی بەیت بێژ بەمانای «سۆیە»یە.

٦٤- وێش، بەواتای «ئەو» ئەم وشەیە لە مەهاباد دا برەوی نییە.

٦٥- جێ بەجێ، واتە بڵاو و پەڕاگەندە وەک دەبینین «جێ بەجێ» لێرەدا مانایەکی تایبەتی هەیە و مانا ئاساییەکەی درووست کردن و کارڕێخستنە.

٦٦-دەوار، پارچەیەکە لە مووی ڕەش تەندراو کە ڕەشماڵی لێ دروست دەکەن.

«گۆرانی یان ئاوازە کوردییەکان، کۆکراوەی دوکتۆر محەمەد موکری، ل١٦٠»

وێدەچێ لە مەهابادا وشەی «دەوار» بەمانای ئەسڵی خۆی بەکار ناهێنن بەڵکو بەواتا مەجازییەکەی بەکاری دێنن. ئەوەندەی من ئاگادارب «دەوار» لە مەهابادا تەنیا لە دوو حاڵەتدا بەکاردێت، یەکێک لەوان هەر ئەم ڕێکەوەندەیە کە لەم دەقەدا بەکارهاتوە، حاڵەتەکەی تر ئەوەیە کە دەڵێن «بەدەواربی!» و ئەم ڕێکەوەندە بۆ تووک لێکردنە. ئەم دوو ڕێکەوەندە لەنێو خەڵکدا وەک قسەی نەستەقی لێهاتووە.

١

شێخ فەرخ، بابی نێوی شێخ مەجید بوو؛ مامی نێوی شێخانی شێخ داود بوو. مامی دوو ساڵ لە پێش بوونی شێخ فەرخی کچێکی بوو، نێوی نا خاتوون ئەستی. خاتوون ئەستی یەکجار زۆر جوان بوو؛ گەردنی زیڕاحێک بڵند[١] بوو.

خاتوون ئەستی پێی هەڵگرتبوو، شێخ فەرخ لە دایک بوو. کوتیان: دەبێ عەلامەت بێ! شێخ فەرخ کوتی:

٢

ئەوە مانگ لە من دەنگوتەوە[٢] بە یەکە

پشت و پەناهم وەبەر تۆ ئەی فەلەکە

ئەگەر بە منت ڕەوا دیوە دەست و پەنجە و قالب و بەلەکە

نوسرەتێ دوایەم لە دوای خاتوون ئەستی چاو بەڵەکە.

٣

ئەوە مانگ لە من دەنگوتەوە بە دووە

پشت و پەناهم ئیلاهی وەبەر تووە

بەمنت ڕەوا دیوە دەست و پەنجە و قالب و ڕووە

ئەمنت بە ناقیسی دوروست نەکردووە

نوسرەتێ[٣] دوایەم لە دوای خاتوون ئەستی ڕۆییوە.

٤

ئەوە مانگ لە من دەنگوتەوە بە سێیە

پشت و پەناهم وەبەر تۆ ئەی خودێیە

کە بەمنت ڕەوا دیوە دەست و پەنجە و قالب و گوێ و پێیە

نوسرەتێ دوایەم لە دوی خاتوون ئەستییە.

٥

ئەوە مانگ لە من دەنگوتەوە بەچووارە
پشت و پەناهم وەبەر تۆ ئەی جەببارە
کە بە منت ڕەوا دیوە دەست و پەنجە و قالب و ئاکارە(٤)
نوسرەتێ دوایەم لە دوای خاتوون ئەستی نازدارە.

٦

ئەوە مانگ لە من دەنگوتەوە بەپێنجانە
پشت و پەناهم وەبەر تۆ ئەی ڕەحمانە
بەحەق بەتۆم هێناوە ئیمانە
بەمنت ڕەوا دیوە دەست و پەنجە و قالب و چاوانە
نوسرەتێ دوایەم لە دوای خاتوون ئەستی مامانە.

٧

ئەوە مانگ لە من دەبنەوە بە شەشە
خودایە بەمنت ڕەوا دیوە دەست و پەنجە و قالب، داوتە بە من بەشە
نوسرەتێ دوایەم لە دوی خاتوون ئەستی چاوڕەشە.

٨

ئەوە مانگ لە من دەنگوتەوە بەحەوت، یا حەوتەوانان(٥)
ئەمنت داناوە لە ڕێزەی موسوڵمانان
نوسرەتێ دوایەم دەچێتەوە سەر خاتوون ئەستی مامان.

٩

مانگ لە من دەنگوتەوە بە هەشت، دەڵێن پیاو ناژی لە هەشت مانگانە
نیشانیان داوم خاتوون ئەستی، سینگی دەڵێی بازاڕ و دوکانە
محەللی تاجران لەوێ دەگرنەوە سەودا و معامەلە و سانە

خوداوەندی میری مەزن لەسەر سینگی خڕ کردووە جووتێک فینجانە
تام خۆش و بۆن خۆش، گەلێک لە بەردلانە
ئەمن زۆرم کەیف چۆتە خاتوو ئەستی مامانە.

١٠

ئەوە مانگ لە من دەنگوتەوە بە نۆیە
کەس نەڵێ فەرخ عەلامەتە و سەربەخۆیە
ئەمن دەمرمەوە لەبەر جووتێک زەردەمیانت[٦]، دەڵێی زەردە لیمۆیە
دەمرمەوە لەبەر شەدێکی ئەڵوان، ڕیشوە شەڕیانە لە مابەینی چاو و برۆیە
کەس نەڵێ فەرخ عەلامەتە، درۆیە
خوداوەندی میری مەزن ئیختییاری داوەتە دەستم گۆیە
دایمە دەروونم پڕ لە بۆسۆیە.

١١

ئەگەر فەرخ لە دایکی بوو، دایەن[٧] کوتیان: ئەوە عەلامەتە. خانەدانی شێخ مەجیدی کوتیان خۆ ئەوە بۆمان بەئەستی هەڵدەڵێ، ئێمە شێخین، ڕێمان ناوەشێتەوە شتی وامان دەنێو تایەفەیدا هەبێ؛ بیهاوێینە بەرپێی وڵاغان تا زگی بدڕن.

شێخ فەرخ کوتی:
ڕەبی حەوتەم نەچێ دایکم بمری
چلەم نەچێ بابم بمری
ئەستی لە بۆ من دەبێتەوە بەلوقمان و بەئاش پەز، بەنازری
بەمیرات بچمەوە سەر ماڵە مامم؛ بەڵکو خاتوون ئەستی تێرم بە کۆڵێ[٨] هەڵبگری.

ئەوە شەوێ شێخ فەرخییان لە تەویلەی فڕێ دا بەرپێی وڵاغان، هەتا وڵاغ زگی بدڕن. زستان بوو؛ هەوای سارد بوو. وڵاغ کەپۆیان بەسەر داگرت تا سەرمای نەبێ. هیچ تخونی نەکەوتن، بۆ وەی پێی لێ بنێن و عەزیەتی کەن. سبحەینێ چوون دیتیان وڵاغ کەپۆیان بەسەردا گرتووە بەنەفەسی زاریان گەرمیان کردۆتەوە و پێشیان لێ

نەناوە و فەرخیش ساغ و سلامەتە؛ زەق و زیندووە. جا ئەگەر وایانزانی هەڵیان گرتەوە، بردیانەوە؛ بێشکە و لانکەیان بۆ ساز کرد.

دوعای فەرخی قەبووڵ بوو. لە حەوتەیدا دایکی نەخۆش کەوت؛ مرد. لە چلەشدا بابی مرد. فەرخ بێ کەس ماوە؛ کەس نەبوو بە خێوی بکا. ماڵە مامی بردیانەوە. کوتیان: خاتوون ئەستی دەبێ بە خێوی بکا و ئاگای لێ بێ. ئەستی لانکەی ڕادەژاند و خۆراکی دەدایە و دەیحاواندەوە. ڕۆژێکی خاتوون ئەستی سەری هەڵدابۆوە، فەرخ کوتی:

١٢

کوێستان ڕەنگین بوون و، ئەوە ڕەنگین بوو سەری ئاستەڕێ
سینگی سپی بەتەرحی بەردی مەڕمەڕێ
ئەگەر کافر بدبینێ بۆت لە دین وەردەگەڕێ
میر و بەگلەران لەسەر دوو چاوی کاڵ دەکەونەوە شەڕە خەنجەر و شەڕێ.

١٣

خەبەریان برد بۆ شێخ داود، کوتیان: بۆیان بەخاتوون ئەستی هەڵدەڵێ. ئەستی زۆر جوان و چاک بوو. فەرخ چومکە شیر سوتو بوو، شیری دایکی نەخواردبوو؛ نیوە نەخۆش بوو هەمیشە. شێخ فەرخ گەورەش ببوو، ئەستی لە کۆڵی دەکرد.

کافرێکیش نێوی وسوو بوو، لە تایەفەی بەکر شەیتانی[9] بوو. کابرا هێندی دڵ بەخاتوو ئەستیوە بوو وەخت بوو گیانی بۆی دەرچێ؛ نەشیدەوێرا زۆر توندی بکێشێ. دەیگوت: خولایە چاوم پێی بکەوێ، چاوی خاتوون ئەستی جەرگی بڕیوم.

بازاڕ و دوکان داندرابوو. وسوو تاجر بوو. خاتوون ئەستی فەرخی لە کۆڵ کرد بیباتە سەر حەوزی شێخان. فەرخ پەڵپی لێ گرت، کوتی: دەبێ بەبازاڕێمدا بەری. خەڵکی موتەحەییر مان. ئاخر مەلەکەی تۆپ بەسەر نێوبانگی بوو.

عەجیب تێل بەسەر
چارشێوت لادە و خەرجت کەوتە سەر.

بەبەر دوکانی وسووی داهاتن. وسوو بانگی خاتوو ئەستی دەکا شێخ فەرخ

کەچەڵیش بوو. وسوو دەڵێ:

١٤

بارگەی خاتوو ئەستیم ئەتڵەسە و قوتنییە و کیمخووایە و گوڵاوە.
خوداوەندی میری مەزن وای دوروست کردووە، وەک حۆری عاسمانێ خوڵقاوە.
ڕوحی منت بێتەوە بە قوربانی دوو گۆشەی چاوە
ئەمن لە سوێی تۆ جەرگم نەماوە و جەرگم سووتاوە
شۆخ و شەنگێ خودا بت کا بەرقەرار و ڕاوەستاوە
نازانم ئەو سیسارکە کەچەڵە چییە، دایمە ئاشییانە و هێللانەی
لەسەر پشتی تۆ داناوە؟

١٥

بارگەی خاتوو ئەستی ئەتڵەسە، قوتنییە، کیمخووایە، موشەجەرە
دەک سەری وسووت بێتەوە بە قوربانی سەرە
زەر(١٠) مەمیان کراسییان دڕیوە، سەریان هێناوەتە دەرە
نازانم نە لیمۆیە و نە شەمامەیە و نە گەوهەرە
نازانم ئەو سیسارکە کەچەڵە چییە، دایمە لەسەر پشتت گرتوویە لەنگەرە؟

١٦

بارگەی خاتوو ئەستی ئەتڵەسە و قوتنییە و کیمخووایە و قیمەتی لە دونیادا نییە
دەک سەری منت بێتەوە بەقوربانی دوو چاوی بەنگییە
چاوت دەڵێی ئاسکە، تازەی دیوە تفەنگچییە
مەگەر تۆ قرچەی سووتانی دڵی منت ئاگا لێ نییە؟
ئەمن زۆر دەوڵەمەندم، ماڵ و زێڕ و پووڵم بۆ چییە؟
ئازاری سەرع دەگرم، خودا دەمداتێ دەردی شێتییە
ئەو سیسارکە کەچەڵە فڕێ دە، ئاخر خۆ قابیلەتی نییە.

١٧

بارگەی خاتوو ئەستی ئەتڵەسە و کیمخووایە و بە قیمەت گرانە
دەک سەری منت بێتەوە بەقوربانی زنجیرەی زولفانە
ئاورینگ[١١] دارن، هەمیشە بۆنیان دێ وەک ڕەشە ڕێحانە
ئەمن مردنم پێ خۆشترە، نەوەکو ئەو ژیانە
ئەو سیسارکە کەچەڵە چییە دایمە لەسەر پشت کردوویەتەوە هێللانە؟

١٨

بارگەی خاتوو ئەستی ئەتڵەسە و قوتنییە و کیمخووایە، بەڵێ گوڵاوە
کاری خودای کەسی تێ ناگا، ماشەڵڵا خاتوون ئەستی چۆن خوڵقاوە!
دەڵێی گیابەند و خاوە، تازەکانەی سەر لە بن ڕندوی[١٢] بەفرێ دەرهێناوە
فیتنەگێڕن ئەگەر هەڵی دێنێ دوو گۆشەی چاوە
دەڵێن: بەهەڵێنانی چاوی حاجی لە ڕێگای مەککە گەڕاوە
دە چ بکەم؟ چ دەسەڵاتم لە دەستدا نەماوە.
نازانم ئەو سیسارکە کەچەڵە چییە دایمە لەسەر پشتی تۆ ماوە؟

١٩

خاتوون ئەستێ ڕۆیی، تێپەڕی. شێخ فەرخ گریا، کوتی: بمگێڕەوە بەر دوکانی وسووی، بمگێڕەوە. خاتوون ئەستی ناعیلاج گێڕایەوە.

ئەو وەختیش، چونکی بەکر شەیتان کارێکی زۆر خراپی دەگەڵ تایەفەی برایم پادشای یەمەنێ کردبوو، لە وسووی دەگەڕان: بەخوێنی سەری توونی بوون. بەڵام لەو شارەیدا کەس وسووی نەدەناسی، نەیدەزانی کە لە تایەفەی بەکر شەیتانە، دەنا لەمێژ بوو لەت و کوتیان کردبوو، کەوڵیان لە حاجەت خستبوو. فەرخ کوتی:

٢٠

وسوو[١٣]، گەورە توجارەکەی وسووی موغانی
خودا مەنزڵی نییە، بێ مەنزڵی و بێ مەکانی[١٤]

قەستەم بەزاتی سوبحانی
گەلێک ئەبلە و هیچ نەزانی
ئاورت داوێمە خەرمانی
خۆشی نەبینی لە گیانی
لێت تێک چێ سەر و سامانی
ئازای بەندەنت بگرێ ژانی
بەقورێ داچی تا دەتوانی
داست ون بێ لە سەپانی(١٥)
دایکت بۆت بدا لە ڕانانی
بۆت بکا هاوار و فیعلانی
ئەتۆ ئەمنت بە پیاوێکی بێ قابیلەت زانی!
تەمای ئەوەت بوو دەگەڵ خاتوون ئەستی ببیەوە بە ئاملانی؟
ئەوە خەڵک نەیزانیوە ئەگەر ئەتۆ لە تایەفەی بەکر شەیتانی.

٢١

وسوو ئافەریم! پێکت هێناوە کاروبارە
خاتوو ئەستی سێوە، هەرمێیە، هەنارە
خاترجەم بە نابێ بۆ ئەو دەم و زارە
فەرخ ئەگەر منداڵیش بێ لە کاری خۆی وشیارە
وەبزانە بەجەرگییەوە داوی شوججە مارە
عاشقی خاتوو ئەستی بووی، ئەگە لێک دەدرێ تۆق و تەلەسم و زێڕ و زەنجەق لەگەڵ بەندی گوارە
هێندێک دەڵێن: زەلزەلەیە و، هێندێک دەڵێن: ڕۆژی قیامەتە و،
هێندێک دەڵێن: قەتارە
مەڵێ منداڵە فەرخ، لە کاری خۆیدا وشیارە.

٢٢

وسوو نەڵێی: توجارم، ئەمن پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند و ساحێب ئەرکانم
ئەمن سەبارەت بە خاتوو ئەستی هەتیوم، لە ماڵە مامانم
عاشق بە وردە خاڵی نێو زنجیرەی زولفانم
هەزاری وەکو تۆ بە سەگ نازانم.

٢٣

توجارِ و خەڵک ئاگایان لێ بوو، عالەم لێیان وەخرِ بوو. مەعمووری دەوڵەتی زانییان، هاتن و گرتیان. وەختایەکی سیلسیلەیان خوێندەوە، لە تایەفەی بەکر شەیتان بوو؛ هاتن بیکوژن. لە پاشان شێخان تکایان بۆ کرد. کورتی ببرِینەوە، وسوو بە هەزار جەرِڕی سەقیل نەجاتی بوو.

خاتوون ئەستی دوو خوشکی گەورەتری هەبوو، یەکیان نێوی ناز بوو، ئەوی دی نێوی نازەنین بوو. ئەوانە کوتیان: دەچینە باغی شێخان، شیو و کوڵ دەکەین، لە حەوزێ هەڵدێین.

فەرخیشیان بردە باغی کەڵەکە بەردیان بۆ ساز کرد تا لە بنیدا بحاوێتەوە، وەرِەز نەبێ. جێگاکە چۆڵ بوو، هەرسێکیان خۆیان رِووت کردەوە، چوون دەحەوزێوە مەلەی بکەن. فەرخ لەوێرِا چاوی لێ بوو.

٢٤

جا فەرخ کوتی:
ئەگەر بژیم و بمێنم
ئەمن ئەو کەڵەکە بەردە دەرِووخێنم
با بۆ خۆم لە بنیدا بمێنم
تە بەرِووتی بێتە سەرم بەژنێکە باریک و دوو چاوی شەهێنم.

٢٥

فەرخ پێلاقێکی بەکەڵەکە بەردەکە دادا؛ تێکی ڕووخاند. کچەکان کە وایان دی لە تاوان دەرپەڕین، بەڕووتی هاتنە سەری. هاوار هاوار پەیدا بوو. فەرخ لە قەستی خۆی مراند. ئەسنتی هەڵی گرت بردیە سەر حەوزێ. فەرخ هەر خۆی مراندبوو، هیچ هەست و خوستی نەبوو. ئەگەر وا قەوما سازبوون بچنەوە بۆ ماڵێ.

لە ڕێگایە کوتیان: بیدوێنین، تا وەهۆش بێتەوە. بەبێ هۆشی بیبەینەوە خراپمان پێ دەکەن. وەرن ئێکی بەندێک بڵێین، بزانین وە جواب نایە؟

٢٦

ناز دەڵێ:

قەستەم بەزاتی فەلەکێ

ئەگەر بترازێنم دوگمەی سینگ و بەرۆک و مەمکێ

حەجاجان دەگێڕمەوە لە ڕێگای مەکێ.

٢٧

نازەنین کوتی:

قەستەم بەو خودایەی بێ مەکانە

ئەگەر بترازێنم دوگمەی سینگ و بەرۆک و مەمکانە

زنجیرەی زولفان لە سینگم ببێتەوە بە نیشانە

سینگی من دەڵێی بازاڕ و دوکانە

ئەوی نابەڵەد بێ لێی دەکاتەوە شوکرانە بژێری و سوبحان سوبحانە

مردووان زیندوو دەکەمەوە لە گۆڕ و لە گۆڕخانە.

٢٨

خاتوو ئەستی نۆرەی هات، کوتی:

قەستەم بەساحێبی شەو و ڕۆژێ

ئەگەر بترازێنم دوگمەی سینگ و بەرۆک و مەمک و بەرکۆژێ[١٦]
شۆق دەبڕمەوە لە مانگ و نامێنێ شۆقی ڕۆژێ.

٢٩

کوتیان: فەرخ گیان، ئێمە هەریەک شتێکمان گوت؛ ئەتۆ چۆنی تێدەگەی؟ فەرخ دەستی کرد بەقسان، کوتی:

نازەنین ئەتۆ قسەت هەوە
سینگ و بەرۆکت گەنجی خەزێنەی خوسرەوە
دەجا سینگ و بەرۆکت بترازێنە، ئەگەر ئازای مردوو زیندوو کەوە.

٣٠

ناز، ئاخر بەوەی کەم ئەگەر بیناهی چاوە
مەمکت دەڵێی هەنارە و خودا بەبێ ناقیسی دایناوە
دەجا برۆت هەڵتەکێنە و هەڵبێنە گۆشەی چاوە
بزانم کێ خەبەر دێنێ؟ بڵێن: حاجی لە ڕێی مەککە گەڕاوە.

ئەمما خاتوون ئەستی ڕاست دەکا. کوتیان: بۆیە وا دەڵێی چومکە ئەستی بەخێوت دەکا. فەرخ پاشی وەی کە وە زمان هاتەوە، خۆی بێ هۆش کردەوە. فەرخ هەستی لە خۆی بڕیبوو.

٣١

ئەوجار بێینەوە سەر باسی وسووی. وسوو هێندەی حەز لە خاتوون ئەستی دەکرد مەگەر خودا بزانێ. هەمیشە چاوی لەدووی خاتوون ئەستی دەگێڕا. چاوی خاتوون ئەستی جەرگی بڕی بوو. ئەوی ڕۆژێ وسوو دیبوونی کە دەچنە باغی. جا بۆ ئەوەی لە گەڕانەوەدا وسوو چاوی بەخاتوون ئەستی بکەوێ، لەسەر بانی ڕاوەستا بوو؛ هاتن بە کووچەیدا. فەرخیش لە سەرڕا خۆی مراندبۆوە، سەری نەدەگرت. کچەکان وسوویان نەناسی. خاتوون ئەستی ڕووی دە وسووی کرد و کوتی:

٣٢

لاوە ئەرێ لاوەکەی لەسەر بانی
خەبەرێکم بۆ بەرە ماڵە باب و باوانی
با هەموو کەس بەو خەبەرەی بزانی
فەرخ وەبن بەرد کەوتووە، ئەو بابانی لە من کردۆتەوە خشتور[١٧] و وێرانی.

٣٣

چومکی ئەمن ئولفەتم بەوە گرتووە
دەنا مەمکی من دەڵێی شەمامەی چوار بێستانە[١٨]
تازە خاڵ خاڵ سوور بووە
چاوم دەڵێی جەللابی[١٩] دەوڵەتانە
نازانێ ڕۆژ درەنگە یا نە زووە
خەبەرێکم بۆ بەرە ماڵە باوانی بڵێ:
فەرخ وەبن کەڵەکە بەرد کەوتووە.

٣٤

ئەرێ لاوە ئەرێ لاوەکەی لە حزووری
کارێکی وام دەگەڵ بکە حاکم دەستووری
جوابێکم لە بۆ بەرە ماڵە باوان و، خەبەرێکم بۆ بدە بەحەرەم
خانە و دیوی ژووری:
ئەوە فەرخ بابانی لە من کردۆتەوە وێران و خشتوری.

٣٥

ئەرێ لاوژە لاوژەکەی بەبێ کار لەسەر ڕێگا ڕاوەستاوە
خەبەرێکم بۆ بەرە ماڵە باوانی، جەرگ و دڵم لە جێگای خۆیدا نەماوە
ئاخر ئەمن چاوم دەڵێی کۆترە، تفەنگچی ساچمەی لێ داوە

بەخودای ئاکارم[٢٠] هیچی لەسەر ڕەنگی خۆی نەماوە
پێم وایە فەرخی مامان هەموو گیانی شکاوە
سەڵای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، کەسم لە ماڵە باوانی نەماوە
چومکە ئامانەتی[٢١] من بوو، لە دەستی مندا بەردی بەسەردا ڕووخاوە.

٣٦

وسوو کوتی:
کیژێ، کیژی کێیە
سەری منت بێتەوە بەقوربانی سەرێیە
ئەی ئەمنت ببمەوە بەقوربانی جووتێک مەمکی زەردە بێیە
گوێ مەدە فەرخ، ئەوە هاتییەوە لەسەر حەوزێیە.

٣٧

کیژێ کیژێ، کیژەکەی دە تەڕلانە
گەردنت دەڵێی بەیداغی ڕۆمییانە[٢٢]
سینگت دەڵێی بازاڕ و دوکانە
کەسێک نەخۆش بێ، بڵێن: دەردی زۆر گرانە
چاوی بە تۆ بکەوێ، بۆی دەبێتە حەکیم و حەتار و لوقمانە
کیژێ، ئەمما شەوە؛ وەختی بانگی خەوتنانە
کوا جوابم دەدەنەوە ئەمن خەبەر بەرم بۆ ماڵە شێخانە؟

٣٨

فەرخ قەیدی ناکا، ڕەبی تۆ بەدوور بی لە دەردێ لە بەڵایە
ئەمنت دەمرمەوە لەبەر بەژنێکە باریک، دەڵێی چووزە بیزایە
سینە و بەرۆکت جووتێک زەر مەمی تێدایە
قیمەتیان تەواو نابێ، مەگەر بۆی بفرۆشی پیرە بەغدایە

وەختێکی تۆ دەڕۆی، گوارە لە گوێت دەکەونە لەنجە و سەمایە
چوون[٢٣]وردە کرمەک و گژنیژی بەقیمەتی تێدایە
ڕەبی ئامانەتت بێ حوسێنی شەهیدی کەربەلایە
ڕەبی پاش تۆ نەژیم ئەمن، بگرم دەردی موفاجایە
نازانم ئەو سیسارکە کەچەڵە چییە دایمە لە کۆڵی تۆ دایە؟

٣٩

شێخ فەرخ وەجواب هات، کوتی:
چۆن ئەتۆی لەسەر بانی ڕاوەستاوی، بانگت دەکەن لاوە؟
خۆ لە من وایە گرتوویانی، دەڵێن: وسوو نەماوە
تەمای ئەوەت هەیە لە خۆت بدینی کام و کاوە؟
ئەوە بەجێگای خۆی کار بەکار بگا[٢٤]، ئێستا خەبەریان نەداوە
وەسێتی خۆت بکە، بەوە کەم بیناهی چاوە
لە سەعاتێکەوە هەتا حەوت سەعات عەمرت ماوە.

٤٠

بابە شەوێ کاربەدەستانی شاری کوتیان: ئێمە وسوومان بەردا، مەسئول دەبین. گرتیان و کوشتیان. جا ئەگەر وسوو کوژرا، شێخان ناردیان لە دووی خاتوو ئەستی؛ کوتیان: فەرخ دەگەڵ خۆت بێنە. جا دواندیان، لێیان پرسی: ئەتۆ چ مەتڵەبێکت هەیە؟ ئەتۆ بەبێ خاتوو ئەستی بۆ هیچ جێگایەک ناچی. چ خەیالاتێکت دە سەری دایە؟

٤١

فەرخ دەڵێ:
تەمەشای مامم کە هەر دەڵێی هیچ عاقڵی لە کەللەیدا نییە
قەستەم بەوەی کەم ئەگەر ئیلاهی و ئەبەدییە
نە لە گوێن کەسە و کەسی لە گوێن نییە

بەمن دەڵێن: عاشقە لە منداڵییەوە، لە توفڵییە
ئەما بەمن دەڵێن: عاشقە و عاشقی ئیلاهییە
ئەمن تا ڕۆژێکی ئەو کەللەم دەچتەوە بن بارستی گڵییە
لە خاتوون ئەستی من دەست هەڵگرتنم نییە
خەڵکی بەمن دەڵێن: بێ قابیلەتی، قابیلەتی تۆ نییە
کارێکی خودا کردی، بە عەبد ڕەدبوونەوەی نییە
بەمنداڵی لانکەی ڕاژاندووم، بۆی کردوومەتەوە لایی لاییە
لەو حەلەوە من عاشقم بەسینگێکی سپی و دوو چاوی بەنگییە
مامە تۆ لە خاتوو ئەستی بپرسە، بزانە ئەو تەگبیر و قسەی چییە
ئەوانەی لەوێ بوون، کوتیان: ڕاست دەکا، عاشقی ئیلاهییە.

٤٢

کوتیان: لە ئەستی بپرسین، بزانین ئەویش بەوی ڕازی دەبێ؟
تەواوی دونیا بەئارەزووی ئەستیوە بوو. ئەستی دەیگوت: مێرد ناکەم. جا بابی بە دزی و بە مەحرەمانە لێی پرسی، کوتی: ئەتۆ مێردی پێ دەکەی یان نا؟

٤٣

خاتوون ئەستی کوتی:
بابە سوواران هەمووی هەو هەوە و گرتوویانە سانە
قەستەم بەوەی کەم ئەگەر بێ شەریکە و بێ مەکانە
خودا فەرخی وا لەبەر دڵی من شیرن کردووە، هێندە لە بەردڵانە
ئەگەر گۆشت لەڕیش بێ، هەمیشە هەر لەسەر نانە[٢٥]
با میر و بەگلەران موشتەریم بن، پادشا و سوڵتانە
با لە دەورەم ببنەوە بەخوازبێنیکەر و بەمیوانە
هەموویان لە فەرخ دەکەمەوە بەقوربانە.

٤٤

چاک لە من حاڵی بە، ئەمن زیاتر دڵی دنیام نییە
ئەمن ئەگەر بژیم ئی فەرخم، ئەگەر بمرم ئەوە دەچمەوە بن
بارستی گڵییە
لە فەرخی مامان زیاتر خۆ من تەمام بە کەس نییە
بۆ خۆم بەخێوم کردووە بە توفڵی و بە منداڵییە
خوداوەندی میری مەزن وای هاویشتوومە بەر جەرگ و بەر دڵییە
لە فەرخ زیاتر لە من وایە کەسی دیکە لە دنیادا نییە
با بدەمێ خەبەری بەڕاستی و بەئەسەحییە.

٤٥

لە دڵی من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە
هاشا لە میر و پادشا و سوڵتانە
ئەمن قایلم بەفەرخۆڵەی مامانە
ئیدی با خەڵکی بڵێ: شوانە، گاوانە، فەقیرە، بێ قابیلەتە، هیچ نەزانە
بۆ من ئەمیرە، پادشایە، سوڵتانە.

ئەگەر بابی وای زانی هات، کوتی: بابە کاری خودای تەعالایە؛ ئەستی زیاتر لە فەرخی ئاوری دەجەرگی بەربووە. جا خاتوون ئەستییان دا بەشێخ فەرخ، لێیان مارە کرد.

٤٦

بەغدا دەبوو شێخێکی قورسی تێدا بێ، گەورەی هەمووان بێ. شێخێک نێوی شێخ ئەنوەر بوو، دایاننابوو بەگەورەیی. شێخ ئەنوەر کوتی: براله دیارە ئەمن چاوی کەشف و کەڕاماتم هەیە، بەڵام ئەمن گەورەیی ئەو عالەمەم پێ ناکرێ. ئەنگۆ تەشتێک شیر هەڵگرن، بچنە شاری لەنگەر زەمین؛ بچنە ماڵە شێخان. واجب بوو لەسەر ئەمن ئەگەر پێو بڵێم. ئەوان شێخ فەرخێکیان هەیە، تازە شەیتانی پێکەنیوە. ئەو نەبێ ئیدارەی ئەو مەملەکەتەم پێ ناکرێ. ئەو دەرەجەی زۆر عالییە.

چەند کەس پیاوی چازان هاتن؛ تەشتێک شیری وشتر، بەگەرمی هەڵیانگرت. هاتن گەیشتنە لەنگەر زەمین. وەختایەکی شیرەکەیان دانا، عەجایب مان؛ دەتگوت شیرەکە تازە لە گووانی وشتر هاتبووە دەرێ، هەڵمی لێ هەڵدەستا. شێخانی لەنگەر زەمین هیچیان تێی نەگەیشتن. نەیانزانی مەتڵەبی شێخ ئەنوەر لە ناردنی ئەو شیرەی چییە، بۆ ئەو شیرەی ناردووە؟

جا ناردیان لە دووی شێخ فەرخی. شێخ فەرخ هات، چاوی بەشیرەکە کەوت؛ کوتی: بچن گوڵێکم بۆ بێنن. گوڵێکیان بۆ هێنا. شێخ فەرخ گوڵەکەی دەنێو شیرەکە هاویشت. بەئەمری خودای تەعالا گوڵەکە شین بۆوە، ڕیشەی داکوتا. فەرخ جێ بەجێ دەمەتڵەبەکە گەیشت، جا دەستی کرد بەگریانێ و کوتی:

٤٧

سواران لە من کەوتوونە هەو هەوێ

ڕۆژ لە من بووە بەتاریکە شەوێ

زیندانە و بەندە، دڵی من ناسرەوێ

ئەوجار ساڵێ جارێک چاوم بەخاتوون ئەستی ناکەوێ[٢٦]

چومکە موقەددەری هەق دەستی ئیلاهییە، لە بەغدایە منیان دەوێ

دڵم لە هێشە و لە ژانە، شەو و ڕۆژ چ بکەم ناسرەوێ

قەلیان قەل کوتووە، کەو دەدەن بە کەوێ.

٤٨

کوتیان: چ باسە؟ فەرخ کوتی: ئەوە گەورەی شێخان لە بەغدایە ناردوویەتی لە دووی من. ئەگەر نەچم کاری بەغدایە سەر ناگرێ؛ دەبێ بڕۆم بۆ بەغدایە. دیارە ئەستی نابێ بەرمە بەغدایە.

شێخ ئەنوەر کوتبووی: شیرەکەی بێننەوە کن من. فەرخ بۆ ئێرە نەبێ، نابێ.

مەعمووری سەلاتینیان هاتن، عەبای شێخایەتی و حوکمی دەوڵەتی و خەلاتی عولەمای ڕەببانی و ئینزیبات و تەدارەکی شێخایەتی و ئەوانەیان بۆ هێنا؛ کوتیان: دەبێ بێیە بەغدایە، خودا لەقای ڕەئیسی شێخانی لەسەر شانی تۆ ناوە.

٤٩

جا ئەو جار فەرخ دەڵێ:

پەنام وەبەر تۆ ئەی خودایە

ئەوەندی زیروح لە ژێر زەمین و لەسەر زەمین دایە

هەموو تۆ ڕوح و ڕزقت پێ کردوونەوە بەخشیش و عەتایە

جەرگی من ئاورە و کوژانەوەی نایە

حوکمم لەسەرە، دەمبەنەوە بۆ کاولە[٢٧] بەغدایە

ئەگەر نەبینم بەژنێکە باریک و کوڵمەیەکە کارەبایە

لە بیرم دەچێ سوبحانەڵڵا سوبحانەڵڵا و نەسرومینەڵڵایە

مەگەر فەرامۆشیم بێ ئەوەی ئەگەر لە دڵی من دایە

چومکە موڕاوەدەی دڵ[٢٨] و هەموو کار لە دەست خودای دایە

خاتوون ئەستی بۆ من شەکرە، ئارامی دڵمە، تاریفی بە زمان نایە.

٥٠

ئەسبابی ئەو وەختیان، هەرچێکی بوو، بۆ تێک نا؛ سازیان کرد. ئەستی وەخت بوو لە تاوان گیانی دەربچێ، کوتی: ئیجازەم بۆ لە بابم وەرگرن، بەڕێی دەکەم. چاوم پێی بکەوێ؛ نەبادا دیدار ئاخرەتی بم، هەتا قیامەت چاوم پێی نەکەوێتەوە.

٥١

جا ئەوە ئەستی دەڵێ:

فەرخ دەیبەن بۆ شێخایەتی، کەمێک مندالە

هەوری عاسمانێ لە من گەواڵ گەواڵە

چاویان کوێر بێ ڕاپۆرتیان بەتۆ دا، زمانیان ببێ لاڵە

تەڵخم بووە ئەحواڵە، ئەو دنیایە بەبێ تۆ لە من تاڵە.

٥٢

خۆ من سینگت بۆ دەکەمەوە بە باغی عەلی شا، دایم و دەرهەم
لێی بکەوە سەیرانی ئەسەحییە
سەری منت ببێتەوە بەقوربانی سەرییە
ئەوە دیارە کاری هەق دەستی ئیلاهی و ئی عاسمانییە
ئەگەر بۆ تۆ هاتووە خەڵاتی شێخییە
خودا ئەتۆ نەکەی خاتوو ئەستی لە پاش بەجێ هێڵی، ببێتەوە بە میراتییە
لە فەرخی مامان زیاتر ئەمن هیچ کەسم قەبووڵ نییە
هەتا ئەو ڕۆژەی سەر دەبەمەوە بن بارستی گڵییە
ڕەبی خوداحافیزت بێ، حافیزت بێ خودای ئەزەلی و ئەبەدییە
زوو زووم قاقەز بۆ بنێرە بە دیانەت و بە یادگارییە
دەنا دڵم ناحەسێتەوە، شەو و ڕۆژ لە تاو تۆ خەو و زیندەگانیم نییە
دیارە بەغدا ڕێگایەکی دوورە، موسافەڕەت کاری من نییە
تۆق و تەلەسم و گوارە و کرمەکت بدەمێ، با لە کنت بن بە یادگارییە
با ئێوارە و سبحەینان بڵێ: ئەوە ئی خاتوون ئەستییە.

٥٣

ئەوە شێخ فەرخ ڕۆیی، بردیان بۆ بەغدایە. لەبەر خەڵک تێ هالان و حیسابی شێخایەتی ڕێی ڕێداری نەبوو. ئەوە کاری بەغدایە سەری گرت. شێخان هەموو لە بەردەستی وی دابوون. چل شێخی دادەنیشت لە مەجلیسدا. هەتا چل شەو فەرخ هیچ هۆشی خاتوو ئەستیی نەبوو. ڕۆژێکی جومعە بوو، بەشێخانی کوت: با بڕۆین بۆ سەیاحەتێ، سەیاحەتێکی سەحرا بکەین.

٥٤

شێخ فەرخ دەڵێ:
دەردم دوو دەردە ئەمن هیچ نیمە چار

با بچینه سەحرا، دنیای سەبزەوار
دورڕ و یاقووتە، تەلای دەستەوشار
لەبەر غوربەتی من نیمە هیچ چار
بەدەستی دڵم من بووم گرفتار
لە بیرم چووە ئامۆزای نازدار.

٥٥

من پەرێشانم، دڵم بووە تەنگ
بچینە سەحرا، دنیای ڕەنگاوڕەنگ
دڵم بریندارە، سەرم دا لە سەنگ
لە بیرم چووە یاری شۆخ و شەنگ.

٥٦

ئەمن غەریبم، دڵ بریندارم
خودایە ئەتۆ پێک بێنی کارم
لە بیرم چووە خۆشەویست و یارم.

٥٧

شەماڵی بەهار، حەکیمی بەدەن
خزمینە[٢٩] توخلا قەت لۆمەم مەکەن
خەیاڵم کردووە مەملەکەت و وەتەن
لە کیسم[٣٠] چووە دەسکی یاسەمەن.

٥٨

وەدەرکەوتن، چوونە سەحرایە. فەرخ کوتی: براله ئەنگۆ دابنیشن، ئەمن غەریبم، دڵم تەنگە، دەڕۆم برێک بەتەنێ بگەڕێم. مێشە بوو، شێخ فەرخ هات بۆ نێو مێشەکە. داعبایەک هەیە ڕەشیشەی پێ دەڵێن، دەنگی زۆر خۆشە، دەخوێنی، دەنێو

چەڵتووکدا دەبێ. شێخ فەرخ چاوی بەدوو ڕەشیشان کەوت، یەکیان نێرە بوو، یەکیان مێوە[٣١]. ڕەشیشە نێرەکە عاشقی ڕەشیشە مێوەکە ببوو، دەیخوێند. ڕەشیشە مێوەکە کوێر بوو. جا چونکە فەرخ شێخ بوو، فەنا فیللا بوو، زمانی هەموو داعبایەکی دەزانی. فەرخ ئەستیی وەبیر هاتەوە، ئاتەشی عیشق زۆری بۆ هێنا؛ بانگی ڕەشیشەکەی کرد، کوتی:

٥٩

ڕەشیشە، ئەی ڕەشیشەی دەنگ زەنوێرە
دایمە دانیشی لە هەلاڵ و بەیبوون، بخۆی سەر گوڵی کەنێرە
هەچی خودا خەلقی کردبێ، بۆ خۆی پێی وایە شێرە
ئەتۆ نەتزانیوە یارەکەت، حەوت ساڵە حەزی لێ دەکەی چاوێکی کوێرە؟

٦٠

ڕەشیشە ئەگەر دەنگت خۆشە، بەعومری باری تەعالوڵڵایە
سبحەینان، وەختی ئێستا تاو هەڵنایە
سەرت گەرمە، دەچیە نێو هەلاڵ و بەیبوون و شلکە کەمایە
دیارە جوابت ناداتەوە، بەدوای قسەی تۆدا نایە
ئەو ساڵ حەوت ساڵە عاشقی، ئەمما یاری تۆ چاوی چەپەی ناقیسێکی تێدایە.

٦١

ئەی جانەوەرێکی ڕەشیشە، ئەگەر خودا ئەتۆی دوروست کردووە
بۆچی جەرگی تۆ وا ئاوری گرتووە؟
نازانی ڕۆژ درەنگە یانە زووە
ئەو دیارە یاری تۆ جوابی تۆی کردووە
ئەوەی تۆ حەزی لێ دەکەی، بۆ تۆ نابێ؛ سەهووە.

٦٢

ڕەشیشەکە گوێی لێ بوو. ئەگەر زەینی دایە، تەمەشای کرد یارەکەی چاوێکی کوێرە. ڕەشیشە دەستی لێ هەڵگرت. فەرخ مەتڵەبی ئەوە بوو عیشقی ئەستیش لە دڵی وی بچێتە دەرێ. شێخ فەرخ هەتا بانگی ئێوارێ مەعتەل بوو؛ جا بەرەو قوبڵە ڕاوەستا، کوتی:

٦٣

خودایە، ئەتۆ کوللو سەبەبێک بنێرە
خەم و پەژارەی من یەکجار زۆرە، هەڵیبژێرە[٣٢]
خاتوو ئەستی، چاوی لە من بۆتە مانگ و ئەستێرە
لەکن من هەڵاڵ و بەیبوون و شلکە شللێرە[٣٣]
دەتۆ بەڕەحمەت سەبوورێک بۆ دڵی من بنێرە.

٦٤

خودایەکی ئەزەلی و ئەبەدییە
ئاورم بەربووە لە جەرگییە
کەمتر ئیختیارم هەیە و ئاگام لە خۆم نییە
سەبوورێکم بدەی، لە دڵم دەرچێ خاتوون ئەستییە.

٦٥

پەنام وەبەر تۆ ئەی خودایە
ئەگەر بەکفلەکونێک عەرز و عاسمانت دانا
ئەلعان ئەمن شێخم، دانیشتووم لە بەغدایە لە نێو شێخانە
نەوەک بڵێن: چلۆن دەبێ دایمە هەر ماتە، پەرێشانە
یان بە یەکجاری خاتوون ئەستیم بۆ ببێ، یان لایبەری لەبەر دڵانە
شێتم، بوومەوە بە دێوانە
غەریبم، هەمیشە ئیشتییام لە گفتوگۆی خاتوون ئەستیی مامانە.

٦٦

شێخ فەرخ خەیاڵاتی لە دڵی دەرنەچوو. کوتی: ئەمن قاقەزێکی بۆ خاتوون ئەستی بنووسم ئەمما بەکێدا بۆی بنێرم؟ چلۆن قاقەز بەڕێ کەم؟ کوتی: وا چاکە ئەمن بەداعبایەکدا بۆی بنێرم.

شێخ فەرخ کوتی: یاران، ئەمن بۆ خۆم بەتەنێ دەچمە شاخی؛ ئەی جێگایەکی چۆڵ، کارێکم هەیە. ئەنگۆ بچنەوە بۆ شاری. فەرخ هەستا ڕۆیی، پشتی دەئاوەدانییە و ڕووی دەکێوی کرد، جا لەوێ پۆلێک سوورە قورینگ بەسەریدا هاتن؛ جا بانگی کردن، کوتی:

٦٧

قورینگێ، قورینگی دەکوێستانان، بەعومری هەق دەستی ئیلاهییە
بۆ من بگەڕێتەوە قورینگێکی سەر باڵ سپییە
چومکە داعبایە، لە دنیایەدا هیچ گوناهی نییە
قاقەزێکم بۆ بەرێ بۆ خاتوون ئەستییە.

٦٨

ئەوە قورینگ سووڕا. وەک تەیارە، هات لە پێش شێخ فەرخی نیشت. شێخ فەرخ قاقەزێکی نووسی؛ جا هەرچی مەتڵەبی دڵی خۆی بوو. قاقەزەکەی دەبن پەڕی قورینگەکەی نا و کوتی: دەبێ ئەوە بەری بۆ لەنگەر زەمینێ، بۆ مەملەکەتی شێخان.

قورینگەکە کوتی: گەورەی شێخان، ئەمن دڕندەم لەسەرە؛ دەترسم قاقەزی تۆم پێ نەچێ. شێخ فەرمووی: چۆن؟ کوتی: ئێمە بۆیە بەپۆل دەڕۆین، قاووقیژ دەکەین، ئەگەر[٣٥] هەڵۆ و شەهێن و سەقر زەفەرمان پێ نەبەن. ئێستاش خەمی خۆم نییە، خەمی قاقەز مانەوەی تۆمە. ئەوەش هیچ، دوو دەرە هەیە، یەکیان دەرەی خاتوو زارایە و یەکیان دەرەی بەکرییە. ئەوانە شەوارە[٣٦] و داو دادەنێنەوە؛ ڕاوکەرن.[٣٧] یەکی بیست عەمەلەیان هەیە، داعبایان دەگرن. کەسبیان ئەوەیەساڵێ.

٦٩

چا شێخ فەرخ بەقورینگەکەی دەڵێ:
بفڕە، بڕۆ، ڕامەمێنە
ئەگە هاتوو گەیشتییەوە بە شەهێنە
ئەو زۆر داعبایەکی مسکێنە
هەتا دەتوانی بفڕە و ئامانێی لەبەر بێنە
بڵێ: قاسیدی شێخ فەرخم، دڵم مەسووتێنە.

٧٠

ئەگە دەگەیەوە بەشمقارە
ئەو زۆر داعبایەکی توند و هارە
ئەگە تۆ بڕۆی، هێند بەغیرەتە، لەبەری قارە
هەتا دەتوانی بفڕە، لەبەری وەپارە.

٧١

ئەگە دەگەیەوە بە هەڵۆیە
ئەو زۆر داعبایەکی توند و تڕۆیە
هەتا دەتوانی بفڕە و لەبەری بڕۆیە
بڵێ: قاسیدی شێخ فەرخم، دەروونم پڕ لە بۆسۆیە
دەنا خواردنی من قابیل بە تۆیە.

٧٢

ئەگە دەگەیەوە بەدەرەی خاتوو زارا
لێت دادەنێنەوە داو و بۆت هەڵدەکەن چرا و شەوارە
چون قیسمەتی ئیلاهییە، ڕەبی خودا نەتکا گرفتارە
بڵێ: قاسیدی شێخ فەرخم و چ بکەم چارم بێچارە

بەڵکو ئەو قاقەزەم بۆ خاتوون ئەستی بۆ بەری. قورینگێ دڵم
بریندارە.

٧٣

ئەگە دەگەیەوە بەدەرەی بەکری
هەتا دەتوانی بفڕە و لەبەری ڕابری
لە خۆت بدە تانوت و هونەر و فکری
ڕەبی عومرت بەسەت ساڵ ڕابری
هەتا زەمانێکی دوور نەمری
پۆڕی بەڵەک(٣٨) لەنگەری باڵت ڕانەگری
بەخودای بەکر زۆر غەواسە، پێم وایە دەتگری.

٧٤

ئەوە هات قورینگ گەیشتە هەڵۆ، گەیشتە دەرەی خاتوو زارا، لە دەرەی بەکری کەوت. پێ وەبوو؛ گرتیان. چەند داعبای دیکەشیان گرتبوو؛ هەر ئەوە نا. جا ئەگەر قورینگەکەیان گرت، لە بن باڵی قاقەزێک وەدەرکەوت. لە قاقەزەکەدا نووسرا بوو:

٧٥

لە دڵێکە من گەڕێ چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە
خاتوون ئەستی، چاوت بەمن بمێنێتەوە بەو کەروێشکەی ئەگەر
دەکەوێتە بەر ڕاوکەران و بەر سینگی سووارانە
نەجاتی دەبێ لە دەستی ئەوانە، دەچێتە بن بەردێک، دەڵێ: وەختی
ئاسوودەیی و حەسانە
بەو کەروێشکە دەڵێن: کەروێشکی گەرمە لانە
مەمکت بەمن بمێنێ بەو هەنارەی ئەگەر دایدەنێن لەسەر دوکانە
چاوت دەڵێی جەللابە، وەختی پیاو کوشتن و پیاو لە تیغدانە
ئەبرۆت دەڵێی تیری کەیک کاوسە، بۆ لە جەرگی منت داوە ئەو پەیکانە؟

ڕێگام یەگجار دووورودرێژە[٣٩]، ناتوانم بێمەوە، لەگەڵت ببمەوە ئاوێزان و ئاملانە ئارامی دڵەکەم ئەوە بۆم ناردی قاقەز، بۆم بنێرە خەبەری بەئەسەحی، دەردم زۆر گرانە.

٧٦

ئەگەر قاقەزەکەی خوێندەوە بەکر، کوتی: ئەوە قاقەزی شێخ فەرخە. زۆر بەئیحتیڕام قورینگی بەڕێ کرد. ئەوێ ڕۆژێ ئەستی هاتبووە باغی بۆ شیوێ؛ ئەگەر تەمەشای کرد، دیتی قورینگێک بەسەر سەریاندا هەڵدەفڕێ و دەسووڕێ.

٧٧

خاتوون ئەستی کوتی:
بەوەی کەم ئەبەدییە
کەس ئاگای لە دڵی کەس نییە
پێم وایە ئەوە قاسیدی شێخ فەرخە، دەنا هیچ کاری دیکەی نییە.

٧٨

بانگی کرد: قورینگێ ئەگەر دەفڕی لە چۆلی، لە بەڕیانە
لە چۆلی دەگریەوە ئیستڕاحەت و دەگریەوە وچانە
خاڵ خاڵی، خوداوەندی میری مەزن نەخشی لەسەر بەدەنی تۆ دانا
ئەگەر قاسیدی وەرە پێشێ، دەنا بفڕە بۆ شاخانە.

٧٩

قورینگێ، دەستی منت بێتەوە بەداوێنی[٤٠]، دەردم یەگجار زۆر کارییە
قورینگی چاو ڕەشی یەک یەک پەڕ لە بەدەنت سپییە
ئەگەر قاسیدی شێخ فەرخی، ئاورم بەربووە لە دڵییە
لە فکر و وەسوەسەی فەرخ زیاتر، ئەمن هیچ کاری دیکەم نییە
جا ئیشەڵڵا دەمدەیەی خەبەری بەڕاستی و بەئەسەحییە.

٨٠

شاپەڕت لەنگ نەبێ، خودا بت دا تۆفیق و نوسرەته
قاقەزی شێخ فەرخ لەکن من زۆر گران و بەقیمەته
دڵی من وەک بەحری پڕشەپۆلە، دایمە جەرگم لەت لەته.

٨١

قورینگێ تۆ باری تەعالوڵڵایه
ئەگەر باڵی خۆت داوێیەوە بن گەواڵی هەوران و خۆت شل
دەکەیەوە بۆ پیرە شوبایە[٤١]
خەبەری ئەسەحیم دەیە، دڵی من برینی تێدایه
چومکی ئەڕواحی من دایم بۆ فەرخ نەخۆش و موفتەلایه
بۆ من دەبێتەوە ئاسوودەیی بەعەمری لائیلاهە ئیللەڵڵایه
داعبا لەنگەری باڵی بەر داوە، ئەستی بۆ لای چوو، نەفڕی، دیتی
قاقەزێکی دەبن هەنگڵ[٤٢] دایه.

٨٢

جا خودایە ئەتۆ ڕەحمەتی خۆت بۆ سەر عەرزی بنێره
خەمی دڵی من پاکی هەڵ ببژێره[٤٣]
ئەوە کێ پێی کوت: فەرخ، ئەتۆ قاقەز بۆ خاتوو ئەستی بنێره؟

٨٣

جا چابوو ئەوڕۆ هاتم بۆ شیو و کوڵی سەر ڕووبار و کانی
قاقەزی شێخ فەرخ بۆ من نۆتەوە بەحەکیم و بەحەتار و بەلوقمانی
بەکەس عیلاجی نەدەهات دەردی موفاجا و دەردی گرانی
ئەوە موعالیجەم بۆ پەیدا بوو، دەگەڵ دەرمانی.

٨٤

خاتوون ئەستی قاقەزەکەی خوێندەوە. بردییەوە ماڵێ. جوابی بۆ نووسییەوە کە: ئەگەر مومکینت دەبێ، سەرێکم بدەوە؛ دەنا وەک فەقێ خەڵووزی ئاورم تێ بەر دەبێ.

٨٥

فەقێ خەڵووزیش بەیتی هەیە، عاشقی کچی پادشای بوو، ئاوری تێبەر بوو، دەعیشقێدا سووتا.

ئەوە جومعە بوو، لە میسرێ مەلایان چوونە دەرێ بۆ سەیاحەتێ. سوختێکیان[٤٤] بوو، کوتیان: وڵات خاوێن بکەوە، ئەتۆ مەیە. کوڕێکی زەریف بوو، سوختەیان بوو. مەلا ڕۆیین[٤٥] بۆ سەیاحەت.

ڕۆژێکی ژنی پادشای دەگەڵ کچەکەی دەچوو بۆ حەمامێ. ئەوانە لە ڕێیە لایان دا چوون بۆ تەمەشاکردنی حوجرەی فەقێیان. کچی پادشای دەتگوت سوڕاحی[٤٦] زێڕییە. فەقێ چاوی بەکچی پادشای کەوت. کچەکە تیرێکی وای لە دڵی دا ئەوی هۆش و مەعنا بێ فەقێ نەیما. هەتا ئێوارێ دیتیان قسە دەپەڕێنێ. لێیان پرسی: بۆچی وات لێ هاتووە؟ کوتی: وەک لە من قەوماوە لە کەس نەقەومێ. عیلاجم نییە و عیلاجم ناکرێ.

ئەوانەی لەوێ بوون و ئاگایان لێ بوو کوتیان: ئەورۆ کچی پادشای دەگەڵ دایکی دەچووە حەمامێ، بۆ تەمەشایە لایان دا حوجرەی فەقێیان. لەوەتی[٤٧] سوختە کچی پادشای دیوە وای لێ هاتووە. زۆریان بەفەقێی گوت، زۆریان نسحەت کرد، کەڵکی نەبوو. کوتی: بەدڵم بلێن.

کار دەوەدا نەما. هاتن، کوتیان: مامۆستا، دەزانی ئەو هەتیوە سەوداسەر بووە؛ دەمرێ. مەلا فەقێی بانگ کرد، کوتی: ڕۆڵە عاقڵت بێ، ئەوە چ باسە، بۆ وا دەکەی؟ کوتی: قوربان هۆشی دنیایەم براوە. قسەی دەپەڕاند هەتیو؛ ئاخر نسحەت هیچ فایدەی نەبوو.

پادشایەکەش زۆر موسوڵمان و بەدین بوو. مەلا کوتی: دەچمە کن پادشای حاڵ و موقەددەری پێ دەڵێم. شەوێ چوار کەسی دەگەڵ خۆی برد و چووە کن پادشای.

کوتی: شەهریار، ئەی قاقان، حاڵ و موقەددەرێکی وا قەوماوە. لە نووکەوە[٤٨] بۆی گێڕاوە. مەلا زۆری مەسەلە بۆ شای هێناوە لە شەریعەت، زۆری قسە بۆ کرد. کوتی: حەکیمێک، عەتارێک، لوقمانێک؟

شا بەزەیی بەفەقێ داهات، جا کوتی: مەلا منداڵی من بۆ دەبێ چووبنە حوجرەی؟ کوتی: قوربان بۆ تەماشایە چوون. جا عەرزی کرد قوربان عیلاجێکی بفەرموون. شا کوتی:

مەلا لە دەرکی خودای شاه و شێخ بێ ئیختیارن

وا لە بەندی بن دیوارن

زۆر فەقیرن، زۆر بێ چارن

پاکی لە ڕێزەی هەژارن

شاه و گەدا و عالەمێ

لە کن وی زۆر نین، دەیدەمێ.

مەلا زۆری پێ خۆشحاڵ بوو. شا هاتەوە ژوورێ، بەژنەکەی کوت: ئەو کچەی دەدەم بەفەقێی، دەیدەمێ بەڵکو خوداوەند لەوەیدا بمبەخشێ. شا، دەستبەجێ بەحوکم، کچەکەی لە فەقێی مارە[٤٩] کرد. ئەگەر لێی مارە کرد، مەلا کوتی: چاکت بۆ هەڵکەوتووە. ئاتەشی عیشق زیاتر بوو لە فەقێیدا؛ ئەگەر هەناسەی هەڵدەکێشا، بڵێسەی لە دەروونی دەهاتە دەرێ. قەراریان دانا ئەوی شەوێ کە بووک دەگوێزنەوە، حەوت کووپە ئاو لەوێ دابنێن؛ ئاوی سارد، ئەو ئاوەی پێ دابکەن. عاشق هەیە دەسووتێ. حەوت گۆزەیان ئاو بۆ دانا، پێی دابکەن.

ژنی شای بەرتیلی دا بەفەقێیەک ئاوەکە بگۆڕێ. فەقێ ئاوەکەی گۆڕی، نەفتی تێ کرد دەگۆزەکان. جا شا حوکمی کرد بەخەرجی خۆی کچی بۆ بگوێزنەوە. دیوێکیان بۆ فەرش کردبوو. ئەمما فەقێ شێت بوو، دێوانە بوو. بابە پادشا بەئیحتیرام کچی خۆی بۆ سوار کرد. لە سێ سەعاتەی شەوێ کچیان بۆ هێنا. کوتیان: فەقێ، شا لوتفی مەرحەمەت کرد، کچی خۆی دا بە تۆ. فەقێ دانیشتبوو، ئاور زیاتر لە جەرگی بەربوو، باوەڕی نەدەکرد، کوتی:

٨٦

نۆشیروان بەفدای سیای ڕەنگت بووە[٥٠]
سەیدەوان بەفدای وجودی سەنگت بووە.

٨٧

نۆشیروان بەفدای سەر پاشنەی کەوشت
سەیدەوان بەفدای بالآی بێ غەوشت.

٨٨

یاران کێ دیتی باران بەکزی[٥١]
لەسەردا باران لە ژێردا سەبزی
دەست بردم پای لیمۆی گوڵندام دا لەرزی.

٨٩

گوڵندام ئاخێس[٥٢] کرد شەدەی بەستەوە
جامی جەوهەر ڕێز گرت بەدەستەوە.

٩٠

بریا گوڵێک بووایەم، دایم لە باغت
یان لامپا بایەم، بۆ شەوچراغت
یان دەرپێ[٥٣] بووایەم پای ئاڵ و واڵت
یان کراس بایەم پەخشان بەبالآت.

٩١

گوڵندام زەردان، گوڵندام زەردان
زەردی گوڵندام، چوون خۆرە زەردان
بەئاوی هەنگور[٥٤] بەمەل[٥٥]پەروەردان.

٩٢

گوڵندام زەردە، گوڵندام زەردە
بەئاوی هەنگور بەمەل پەروەردە
بەڕۆژ بێگانە، شەوێ هامدەردە.

٩٣

کچەکەش بە ناز کوتی: فەقێ، دەڵێی شێت بووی!
کوتی: داخم لەبەر دەردی گران، ژیانم بێ فایدەیە
گوێو لە من بی ئەی برادەران
وەکو من دیم ئەو خونچەیە
وەکو من دیم، کەس نەبینێ
ڕوومەت گوڵی لە پەرژینێ
شۆخ و شەنگ و نازەنینێ
دەرمانی سەر دەرد و برینێ.

٩٤

دڵ لێی عاشقە، هەچ کەس هەیە
عاشق بە تۆن گوڵ و گوڵزار
کە دەپشکون پاییز و بەهار
جووتن دەگەڵ سەر کوڵمەی یار.

٩٥

سوور و سپی، تو توفحەیە(٥٦)
توفحەی وەهام نەدیت لەزیز
عارەق لەسەر کوڵمەی تەمیز
پێم وایە من ناژیم هەرگیز
گوشادی تۆ ماتی مەیە.

٩٦

دەستم دامێنت، دەم بنێ لە کانی
بیکە بەشەربەت بۆ ئاوەدانی.

٩٧

ئیدی ئەگەر وای گوت، ئاورەکەی لە دەروونی هاتە دەرێ؛ نەفتەکەیان پێ داکرد، ئاوری تێ بەربوو، فەقێ بوو بە خەڵووز(٥٧).

٩٨

لەو حاڵە و لەبەر ئەو ئەحواڵە
تەیرم، شکا پەڕ و باڵە
بەگەردوونم بگا ئەحواڵە
یار قەدی دەڵێی شمشاڵە
بۆچمە ئەو ماڵ و حاڵە
هەتا سووتا بوو بەزوخاڵە.

٩٩

ئەوە عومری ئیلاهییە
کارە و ڕەدبوونەوەی نییە
ئەوجار، شۆرەتی فەقێ خەڵووزییە.

١٠٠

شێخ فەرخیش نەیدەتوانی بێتەوە. مەڕ و ماڵێکی زۆریشیان بوو ماڵە شێخان. کابرایەک پەیدا بوو، نێوی شوغاڵ بوو؛ کارداری(٥٨) خەڵکی دەکرد. خاتوو ئەستی دیبوو کابرای ڕووت، وەخت بوو دڵی بۆی بتۆقێ، گیانی بۆی دەرچێ. شێخ داود پێی گوت: دەبێ بێیە کنم بەشوانی، هەچی بتەوێ دەتدەمێ. شوغاڵ کوتی:

١٠١

بەوەی کەم ئەگەر ئەبەدییە
هیچ کەس لە گوێن وی نییە
ئاورم بەربووە لە دڵییە
بەراتم[٥٩] خاتوو ئەستییە
دێمە کنو بەزاوا بەندییە.

١٠٢

کوڕە[٦٠]کوتیان: بەدبەخت ئەوە ئی شێخ فەرخە. کوتی ماره کراوه؟ کوتیان: نا؛ بەڵام شتی وا نابێ. بابە بەمەڕەکەوە هێندە هەراسان و سەخڵەت بوون، هێندە تەنگاو بوون، کوتیان: با ئەستی بدەینێ.

کوتیان: ئەستی مێردی پێ ناکا.

شێخ داود بانگی ئەستی کرد، کوتی: وەکو خەونێک بوو دیتت، تازە شێخ فەرخ نایەتەوە. لەبەرئەو مەڕ و ماڵە مێرد بەشوغاڵ بکە. دەتدەم بەشوغاڵ. کوڕە کوتی: بابە جا چۆن شتی وا دەبێ؟ پاش گفتوگۆیەکی زۆر ئەستی کوتی: ئەگەر مێردیشی پێ بکەم، خۆی لە دەست نانێم. ئەستی بەخۆی دەڵێ:

١٠٣

دەغیلت بم کارێک نەکەی
خەزێنەی خۆت تالان نەکەی.

١٠٤

نەبیە سەر کۆیلەی[٦١] مندالان
سەرزەنیشتی مام و خالان
خەزێنەی خۆت نەکەی تالان.

١٠٥

شێخ داود کوتی: مێردی پێ بکە، با مەڕەکەمان بێ شوان نەمێنێتەوە؛ بەڵام خۆت بەدەستەوە مەدە. کابرا نێوی شوغاڵ بوو. میسر بیست و چوار هەزار ژنی تێدا بوو، پیاو هەزار و حەوت سەد کەس بوو[٦٢]. جا بابە هێنایان لەبەر مەڕەکەی دایانێ. شێخ فەرخ بەو حاڵەی نەزانیوە. بەڵێ کابرا ئەوە دەهات دەستی بۆ بێنێ، خاتوون ئەستی دەیگوت: وەختی نییە. هیچ پێی مەتڵەب نەبوو. شەوێکی شوغاڵ دەستی بۆ سینگ و بەرۆکی هێنا، ئەستی کوتی:

١٠٦

لە جێگای شەهێن و بازان قشقەڵە دەقرێنێ
هەک ڕەبی عەمری ئەستی لە دنیایەدا نەمێنێ
جەرگم کون کونە، لە هەمووی خوێن دەدەڵێنێ
میراتی فەرخۆڵەی مامانە، هەتیوێکی بێ قابیلەت دەستی بۆ دێنێ.

١٠٧

ئەو گوڵە، هەڵاڵە، بەیبوونە، نارنجە غەملیوە
شەماڵ ئێستا مابەینی سینگ و مەمکانی نەدیوە
کوڕە بەدبەخت تۆ چۆن حاڵی بووی؟ گەپە، سووعبەتە، فریوە
ئەوەی ڕادەبرێ جەرگی منی هەموو بڕیوە.

١٠٨

زەمینێکە خۆم دەداوە کوێستانان[٦٣]، سەری کوێستانان تازە ئەوە خاڵ خاڵە
لێی دەفڕن باز و شەهێن و شمقاڕ، خۆیان وە بەر با داوە ڕەشە داڵە[٦٤]
چۆن توخڵاکەی ئەتۆ تەماحت کردووە لە بەژنێکی شمشاڵ و دوو چاوی کاڵە
عاسمان هەوری لە من جار جار پڕە و جار جار گەواڵ گەواڵە
هەک سەڵای گەورە و گرانم لێ ڕابوو، فەرخۆڵەی مامان لە بەغدایە،

فەقیرە، هەژارە، بێ دەسەڵاتە، هەڵبەت دەڵێن: عەبداڵە
نازانن لەکن من شایە، سوڵتانە، بەوم خۆش دەبێ حاڵ و ئەحواڵە.

١٠٩

کوڕە شوانەوێڵە(٦٥) ڕەبی عەمرت نەمێنی
کەس نییە نسحەتت بکا، بڵێ: شەرتان نەشکێنی
ئەتۆ چۆن شەمامە و شەمامە ڕەنگینی فەرخۆڵەی مامان دەژاکێنی؟

١١٠

ئەو شوانە وێڵەکەی هیچ نەزانە
ئەوە قابیلی تۆ نییە، ماڵی پادشاهانە
ئەوە نارنجی فەرخۆڵەی مامانە
نامەوێ ئەتۆ بۆ ماڵە بابی من ببیەوە بە شوانە
قەرار بکەی ئەتۆ لەوەیدا سەر شەرتانە(٦٦):
«دەمەوێ شل و مل و سایە گەردن و شای ژنانە»
ئەوە میراتی فەرخۆڵەی مامانە

١١١

جا مەگەر قورینگ یان باز یان شەهێن یا داعبا ببڕێ لە دنیایە
خەبەرێکم بۆ بەرێ بۆ مەملەکەتەکەی گەرمێنێ(٦٧) و بۆ پیرە بەغدایە
بڵێن: خاتوو ئەستی پێکی هێناوە شەرت و بەقا و وەفایە
چاوەڕێی فەرخۆڵەی مامانم، بۆ دیار نییە؟ بۆ نایە؟
تا سینگی خۆمی بۆ بکەمەوە باڵەخانە(٦٨) و چادر و چیغ و سەرایە
خەزێنەی شاهان، دوڕ و یاقووتی عەبدول حەسەنی تێدایە
لە تۆ زیاتر ڕەبی عومری من بچێتەوە بەزایە
چ بکەم، دوور وەتەنی، خۆ لەبەر تۆ چاوم هەڵنایە

١١٢

ئەستی بە کابرای گوت: کەرامبابگاو نەخەڵەتێی جارێکی دی
دەستم بۆ بێنی. کابراش سەبارەت بەخاتوون ئەستی دڵی نەدەهات مەڕەکەی
بەجێ بێڵێ، حەیوانی بۆ دەگرت و خاتوون ئەستی دەیدۆشی. هەر ئەوەندە
بوو ژن و مێردایەتییان.

ئەستی قاقەزێکی بۆ شێخ فەرخی نووسی، بۆی نووسی:

١١٣

فەرخۆڵەی مامان، سووتاوم، جەرگ بڕاوم
لە خەجاڵەتی و بەحری خەمێدا ماوم
جۆگەلەی بەستووە خوێنی چاوم
خەبەر بزانە: بە ئامانەتی بە مێردیان داوم.

١١٤

ئەگە حەز دەکەی ئەمن خۆشم بێ ئەحواڵە
بەجێ بێڵە میحراب و بەرماڵە(٦٩)
با خۆی بەهیلاک نەدا بەژنێکە باریک و دوو چاوی کاڵە.

١١٥

دەستی منت دامێن بێ لە خۆت بدە تانوت و حونەرێ
بەوەعدەی پازدە شەو لە مزگەوتێ وەرە دەرێ
کوڕە دەمرم، با قەتڵت نەیەتە سەرێ.

١١٦

سبحەینێک بوو، تازە تاو هەڵدەهات، دەیگرت سەری کۆهەساران
لە لایەک تاو بوو، لە لایەک وردە وردە دەبارییەوە باران
شێخ فەرخ دەهاتەوە بۆ مەزڵی خۆی و بۆ ڕێ و شوێنی جاران
قاقەزێکیان دایە، قاقەزی مەغشوش و زەلیل و دڵ بریندارا ن.

١١٧

جا شێخ فەرخ دەپاڕاوە، دەیگوت:

خالق هەر ئەتۆ نادری
ڕەبی هەر ئەتۆ قادری
بێ خەیاڵ و بێ فکری
تۆ عەرز و عاسمان ڕاگری
داتناوە ئاو و ئاگری
خەڵقت کرد موسوڵمان و کافری
ئەوەندی پیاو عەمری ڕابری
ڕەبی تۆ ئیعتیڕازم لێ نەگری.

١١٨

پادشایەکی بێ مەکانی
هەر تۆ کارسازی کارانی
هەر تۆ بەسووڕان دەزانی
بەتۆمان هێناوە ئیمانی
بمانپارێزی لە مەکری شەیتانی
شوکر بۆ پەروەردگاری سوبحانی
تۆ ئاگات هەیە لە دەردی نیانی

١١٩

خالق هەر ئەتۆی سوبحان
ڕەبی هەر ئەتۆی سوبحان
هەر تۆی حاڵبین و حاڵزان
تۆ دادنا(٧٠) عەرز و عاسمان
هەچی موقەدەری تۆ بێ چ بکا بەندەی ماڵ وێران.

١٢٠

خالق هەر ئەتۆی غەفوور
ڕەبی هەر ئەتۆی غەفوور
دنیات دانا جوور بەجوور
بەئەرکان و بەدەستوور
هەر تۆ ئاوەدانت کرد
هەر ئەتۆش دەیکەی خاپوور
ڕەبی بەدوورمان بکەی لە جەهەندەم و ئاوری سوور
ڕەحمەتت یەگجار زۆرە
لێمان نەگری گوناح و قسوور.

١٢١

شوکرانە وەبەر تۆ ئەی ڕەببیە
ئەگەر[٧١] تۆ دوروستت کردووە بەهەشتی باقییە
بەحر و کێو و چۆلی و بەڕییە
دنیا سەرانسەر گا و ماسییە
پێم وایە ئەوە قاقەزی خاتوون ئەستییە.

١٢٢

جا قاقەزەکەی خوێندەوە، نووسرا بوو: هەرچی زووتر بگەڕێوە بۆ لەنگەر زەمین؛ وەرەوە. فەرخ کوتی: دەچمەوە وەتەن. خۆی ساز کرد بگەڕێتەوە. کوتیان: ئەلعانەکە وەختی چوونەوەی نییە. کوتی: ناکرێ دەبێ بگەڕێمەوە، سەرێکی ماڵە مامم بدەمەوە. کورتی ببڕینەوە، فەرخ بەند نەبوو، وەڕێ کەوت بگەڕێتەوە بۆ لەنگەر زەمینێ.

ئەوی ڕۆژێ کە فەرخ وەدەر دەکەوت، ئەستی نەخۆش کەوت. بیست و هەشت سەعاتان دەجێگایدا کەوت. پاش بیست و هەشت سەعاتان خاتوون ئەستی عەمری خولای کرد. فەرخیش ئەوە بەڕێوەیە.

«نێره، بیدۆشه[٧٢]» ئەوە ئی شێخ فەرخە. فەرخ گەیشتە کابرایەکی لە کێوی، کوتی: براله، کەمێکم برسییه؛ ئەتۆ ماڵاتت هەیە؟ کوتی: نێرییەک نەبێ نیمە. فەرخ کوتی: بیدۆشە. کابرا کوتی: نێره. کوتی: بیدۆشە. گونی نێرییەکە بوو بەگووان، شیری دادا. کابرا شیرەکەی دۆشی. فەرخ شەکەمێکی خوارد و هات. فەرخ نیزیک بوو بگاتەوە، ئەوی ڕۆژێ خاتوون ئەستی نێژرا بوو.

دۆمێک لە ڕێیە تووشی شێخ فەرخ بوو، فەرخ لێی پرسی: باس و خەبەر چییە؟ کوتی: کوڕە بۆ سەبر دەڕۆی، قوڕت بەدەمی دادەم! خاتوون ئەستی مردووە، پڵاو و گۆشت بەپێی فیلانە[٧٣]. ڕۆژێ ئەو هەموو گوسفەند و حەیوانە دەکوژنەوە ماڵە شێخان. جا شێخ فەرخ کوتی: برۆ، ڕەببی هەر کەلاش و پێلاو[٧٤] بۆ خەڵکی دوروست کەی و بۆ خۆت هەمیشە پێخاوس[٧٥] بی. شێخ فەرخ لە دۆمەی ڕەد بوو.

ئەوجار شێخ فەرخ تووشی کابرایەک شوانی گاڕان[٧٦] بوو، شێخ فەرخ کوتی: خەڵکی کوێی؟ کوتی: خەڵکی لەنگەر زەمینم. کوتی: خەبەر و باسی لەنگەر زەمینێ چییە؟ کوتی: ماڵت شێوێ برۆ، خاتوون ئەستی مردووە؛ پڵاو و گۆشت بەپێی فیلانە. فەرخ کوتی: یا ڕەببی هەر گەڕیدە بی، قەتیش نەحەسێیەوە و قەتیش نان و دۆی خۆت نەبێ.

پاشان شێخ فەرخ تووشی کابرایەک شوانی مەڕی بوو. شوان شێوەی دەکرد، ئەمما نەیدەناسی. شێخ فەرخ کوتی:

١٢٣

شوانە، شوانە، شوانەکەی لەبەر دڵانە
سەری منت بێتەوە بەقوربانی دەست و گۆچانە
دەست بێنت کردووە لە ملی شەک بەرانە[٧٧]
چ خەبەرە لە شارەکەی لەنگەر زەمین و لە مەجلیسی دە شێخانە؟

١٢٤

شوان کوتی:
وەکو سەماوەر دایمە دڵم لە جۆشە

له کوێستانان دەپشکوتنەوە هەڵاڵ و بەیبوون و گیابەند[٧٨] و خاو
له دەم مێرگوڵانم دەنگوتنەوە[٧٩] وەنەوشە
ئەو ئێوارە ئەگە من مەڕم باداوە و بردمەوە سەر حەوشە
بەمنیان کوت: خاتوون ئەستی نەخۆشە.

١٢٥

ڕەببی نەمێنم، له زمانم کەوێتەوە لۆغە لۆغە و زمانم ببێتەوە لاڵە
بەخوڵای کچان بەمنیان کوت: کەمێک نەخۆشە خاتوو ئەستی، بێ حاڵە
ڕەببی وەبن بارستی گڵی نەکەوێ بەژنێکە باریک و دوو چاوی کاڵە
چومکە ئەو ساڵ حەڤدە ساڵە فەرخۆڵەی مامان له دوای وی عەبداڵە.

١٢٦

شێخ فەرخ دوعای بۆ شوان کرد، کوتی: ڕەببی گرانایی ماندووبوونت بکەوێتە سەر بزنی کەچە[٨٠]؛ ماندوویت بحەسێتەوە. شێخ فەرخ ئەگەر هاتەوە، خەڵک غوربەتییان بۆی هەستا. ماڵە شێخ داودی له شین و گابۆڕ[٨١]یان دا.

١٢٧

کاولەکێ کاولە دنیایە[٨٢]
دنیایەکی بێ وەفایە
بێ شەرتێ بێ قەولێ سەرەخۆرێ بێ بەقایە
نە وەفای لە بۆ کەسە و نە بۆ کەسی وەفایە
وەفای نەدەما نە بۆ حەزرەتی ئادەم نە بۆ دایکە وایە[٨٣]
وەفای نەدەما نە بۆ چیایە نە بۆ گوڵ چیایە
وەفای نەدەما نە بۆ حەزرەتی یوسف نە بۆ زولەیخایە
وەفای نەدەما نە بۆ مەجرومە شێتەی نە بۆ شیرن لەیلایە
وەفای نەدەما نە بۆ حەزرەتی سولەیمان ئەگەر بلقیسایان بۆ دێنا
له خزمەت پادشای باسەفایە

وەفای نەدەما نە بۆ حەزرەتی ئەسکەندەر ئەگەر بەحوکمی
پاڵەوانان خەرجی دەستاند لە ڕۆژێ و لە مانگێ و لە دەریایە
وەفای نەدەما نە بۆ ئیمامی شێر عەلی ئەگەر بەسواری دوڵدوڵی،
بەنووکی زولفەقاری، دەگەڵ کافران دەیگرتەوە جەنگ و جیدایە[٨٤]
وەفای نەدەما نە بۆ خاڵندی بنی وەلی ئەگەر هەژدە لفکەی
بەردەداوە بۆ ڕۆژی خەزایە
خودامان هەر ئەو خودایە
سەردارمان محەممەدە، ئەو خۆشەویستی خودایە
مەرتەبەی لە عەرشییە پێی لە تەختە سەرایە[٨٥]
نووری پڕ بەعەرشییە، شۆقی دەڵێی چرایە.

١٢٨

کوانێ جانی بنی جان
کوانێ جمجمە سوڵتان
کوانێ ئەسحابەی پاک و جوان
کوا بەختەک و نۆشیرەوان
ئەوان دنیایان دەکرد فراوان
لەوانیش شتاق[٨٦] نەمان
کوانێ عومبەری قەیغان[٨٧]
کوانێ عەبوبکر و عوسمان
کوا شێر عەلی شاهی مەردان.

١٢٩

کوا سەعیدی ترش ڕوو
کوانێ جوانی بەئابڕوو.

١٣٠

کوانێ جوانی وەک نەسیم
کوا ئەسحابەی وەک تەمیم.

١٣١

کوانێ عەزرەقی جادوو
ئیفلاتون وەک وی نەبوو.

١٣٢

کوا زەبر بەدەستی وەک ڕۆستەم
کوا بەخشەندەی وەک حەتەم

١٣٣

دڵ خۆش مەکەن بە دنیایە
دنیایەکی حیز و مایە پووچە[٨٨]
سەد ملّکت بێ بە مووچە
عاقیبەتی هەر دەچینە قەبری بەکوچە[٨٩].

١٣٤

قەبری ڕەشی زیندانی
ڕوحم دەترسا لە گیانی

١٣٥

چەند پادشا دەهاتنە سەر ڕووی دنیایە
ئەوانیش هەموو دەچوونەوە باری فەنایە.

١٣٦

ناز، خوشکی ئەستی، کوتی:
کێ بێ لە نۆکەر و لە نۆکەری ئەوێ دونیایە
بۆ ئاغای خۆی پێک بێنێ شەرت و وەفایە
ئەنگۆ نمەک پەروەریشن، کێ نمەکی دەچاوان دایە؟
فەرخۆڵەی مامان هاتۆتەوە لە کاولە بەغدایە
دڵی زۆر لە هێشە، سوکنایی دڵی نایە
بڵێن: بیست و چوار سەعاتە خاتوو ئەستی گرتوویە دەردی موفاجایە
کاری خودای شیرنە، کاری خودای عیلاجی نایە
شوکرانە ببژێرێ و بکاتەوە تەمەننایە.

١٣٧

خودایەکی ساحێب نەخشە
خەتاپۆش و عەتابەخشە.

١٣٨

خالق هەر ئەتۆی ڕەببی
ڕەببی هەر ئەتۆی ڕەببی
دنیات سەرانسەر دانا
بەمیزان و ئەرکانە
عالەم سەراسیمەیە
خەڵک دەبێ دێوانە
هیچ کەس لە سوڕت ناگا
چونکە تۆ دنیات دانا
ئەوانەی باسمان دەکرد
گۆڕیان بردە گۆڕخانە.

١٣٩

عاقیبەتمان هەر مەرگە، بێ عاقڵ و هیچ نەزانین
دەنا دەبوو زیکرێ بکەین هەتاوەکو دەتوانین
چومکێ لێمان مەعلوومە عەبد و بەندەی ڕەحمانین
تا ڕۆژێکی دەمرین هەر بەهەویای ئیمانین
لە کار و ڕێگا و شوێنی تۆ گەلێک ساحێب تاوانین.

١٤٠

قادری قودرەت نوما
بێ دەلیل هەر تۆی خودا.

١٤١

بەهەق و بەدڵ و گیان شەهادەتم پێت هێنا
ئەتۆ مەعموورت کردووە محەممەدەلمستەفا
لەسەر عەبدی بێ عاقڵ دەبێ ڕەهبەری بکا.
سەللی عەلا محەممەد.

١٤٢

پادشای خەڵقەندەی حەننان
پێمان عەتا کەی ئیمان
لە ڕۆژی قیامەتدا نەبین بەدبەخت و سەرگەردان
چومکە ڕەحمەتی تۆ زۆرترە لە ئاوی تەواو بەحران.

١٤٣

چومکی خالقە و ڕەببییە
هەموو عالەم ببەخشێ بۆ ڕوحمی وی هیچ نییە.

مانگ ئەگەر هەڵدێ دەورەی دەگرن ئەستێران

چومکە لە ڕووی عاسمانە، لە ڕووی جوان و جوانمێران(٩٠)

دنیا بە کەس نەماوە، بە دلێر و نەڕڕە شێران

دنیام پاک بۆ تەی کردی، تورکوستان تاکو ئێران

سەت ڕەحمەت بێ لە گوێدێران

بێ بەش بێ شەیتانی کوێری بەدبەختی قەلەندەری ماڵوێران.

پەراوێزەکان

١- دوای نووسینەوەی ئەم بەیتە، لە پەراوێزی نوسخەی ئەسڵیدا، لەسەر ئەم بەندە هەندێ ڕوونکردنەوەم نووسیوە کە پێم وایە ئەگەر لێرەدا بیانخەمە بەرچاو بێ کەڵک نییە:

ئەوەندە ئەسرە تەواوی قسەکان مام ئەحمەی نییە، ئەمما ئەسڵی مەتڵەب تەقریبەن هەر ئەوەندە بوو. مام ئەحمەد زۆر خێرا قسەکانی دەگێڕایەوە، نەدەکرا هەموو قسەکانی بێنمە سەر کاغەز. لەسەریشم ڕانەدەوستا. بەڵام لە بەشی شێعرەکە دا پێم وانییە یەک کەلیمەشم هەڵبواردبێ، وەختی بەیت نووسینەوەی، ئەگر دووبارە بەیتەکەم بۆ مام ئەحمەدی دەخوێندەوە، مام ئەحمەد دووبارە شیعری دیکەی لێ زیاد دەکرد

٢- دەنگوتەوە، ڕابوردووی بەردەوام سێهەم کەسی تاک. ڕابواردووی موتڵەقی ئەم کارە «ئەنگوت»ە. چاوگی ئەم کارە «ئەنگوتن»ە و «ن» لە ئاخری وشەکەدا پاشگری چاوگییە بۆ کاری «ئەنگووتن» مانای جۆراوجۆ و دژواز لێکدەدرێتەوە. ئێستا باسی مانا جۆراوجۆرەکانی ئەم کارە دەکەین:

لە فەرهەنگ خاڵ (جزمی یەکەم، سولەیمانی، چاپخانەی کامەران، ١٩٥٩ ئەنگووتن بەمجۆرە لێکدراوەتەوە:

«هەڵکردنی با بەهێواشی. بای بەیان ئەنگوت.» فەرهەنگی مەهاباد «ئەنگوتن»ی بەم شێوەیە مانا کردۆتەوە: «هبوب الريح. اصابه»

ئاغای عوبەیدڵلا ئەییوبیان لە وتاری « ڕۆژمێری ناوچەی کوردی»دا

نووسیوێتی: «ئەنگوتم بە وێککەوتن وەرگێڕاوە و ئەم جۆرە زاراوەیەکی ئەستێرە ناسی ناوچەییییە. بڕوانە: نشريه دانشكده ادبيات تبريز، شماره دوم، سال شانزدهم، تابستان ١٣٤٣ ،ص ١٨٧ ،ح١.

ئەنگووتن بە پێشگری تێکەڵاوی «تێک= هەڵ» کە دەبێتە تێک هەڵ ئەنگووتن» و بەشێوەی «تێک هەڵەنگوتن» بێژ دەکرێ، بە واتای پێک گەیشتن و وێککەوتن. هەروەتر ئەنگوتن بەپێشگری

سادە «هەڵ» کە دبێتە «هەڵ ئەنگوتن» و بەشێوەی «هەڵەنگوتن» بێژ دەکرێ، بە واتای لاق لە شتێک گیرانە «هەنگاوتن» یان « ئەنگاوتن» کە وێدەچێ کاری تێپەڕی «ئەنگوتن» بێت، بە مانای «بە تیرپێکان»ە «هەنگاوتن» بەپێشگری «هەڵ»یش بەکاردێت:

« ئاڵوەکەی هەڵەنگێوە»

لەفەرهەنگی مهاباددا « گەلاوێژ» وەک ئەستێرەی «شعری»

ناسراوە. مانای «شعری لە المنجد دا بەم شێوەیەیە: «الکلوکب الذی یطلع فی الحوزاء و طلوعه فی شده الحر.»

بەرای من وێدەچێ وشەی «گەلاوێژ» لە «گەرما»و «وێژ» پێکهاتووە و « گەلاوێژ ئەنگووت» واتە فەسڵی گەرما بەسەرهات. چاچونکی هەلاتنی ئەستێرەی شعری لە نیوەی هاویندا هاوکاتە لەگەڵ بە کۆتایی گەیشتنی گەرما، هەر بۆیە لەزمانی کوردیدا بەو ئەستێرە دەگوترێ «گەلاوێژ». دوای ئەوەی ئەم ناوەیان بەم ئەستێرەیە دا، وشەی «ئەنگوت»یش بەرە بەرە ماناکەی گۆرا و بەمانای هەلاتن و سەرهەڵدان بەکار برا شاعیری کورد، ناڵی (١٢١٥-١٢٧٣ه.ق) ئەم کارەی لەشیعرێکی خۆیدا هێناوە:

هەناسەم زولفەکەی لاداو مەیلێکی نەکرد چاوی

نەسیم ئەنگووت و شەو ڕابورد و نەرگیس هەر لە خەو دایە

شاعیرێکی تری کورد، وەفایی (١٨٤٤- ١٩١٤ز) لەشیعری خۆیدا

لەم کارە کەڵکی وەرگرتووە

عەیان بوو پەنجەیی ڕۆژ بەخەتتی ئیستسیوا دا

بەسوبحی سادق ئەنگووت زەنەب لە نێو سەمادا

لەبەیتی «دم دم»یشدا ئەم وشەیە بەکار براوە:

« کەوم بەجووت ئەنگووت لە قسقە پانێ»

بڕوانە: «خانی لەب زێڕین» بەاهتمام جلیل آوف، اکادمی علوم شوو رەی، انستیتوی ملل اسیا، مسکو، سال ١٩٦٧، ص١٩

٣- نوسرەت، لە «نووسین»ەوە هاتووە، بەواتای چارەنووس و سەر ئەنجام.

٤- ئاکار، لەفەرهەنگی مەهاباد دا نەهاتووە، بەلام لەفەرهەنگی مەردوخ بەرگی١ ل١٧، تۆمار کراوە، بەلام مانای لێکنەدراوەتەوە. وێدەچێ «ئاکار» لە وشەی «کار»ەوە وەرگیر بێت و بە واتای ڕەفتار و کردەوەیە.

٥- «حەوتەوانان» و «حەوتەوانە» بەمانای «دب» و بنات النعش» بڕوانە : فەرهەنگ مەهاباد. بنات النعش لەفارسیدا پێ دەڵێن «هفت برادران» بڕوانە: فرهنگ عمید، ٢٩٨١١.

٦- مەمیان، بەپێی بێژکردنی بەیت بێژە. لە ئاخافتندا «مەمکان» دەگوترێ کە تاکەکەی دەبێتە مەمک. مناڵان بە «مەمک» «مەمە»ش دەڵێن.

٧- دایەن، یان تایەن. لە رستەی «دایەن کوتیان»دا «دایەن» بکەر و بەڕواڵەت تاکە بەلام لەڕاستیدا

کۆیە و ئەمە بە کارەکەیدا دەزانین کە کۆیە

٨- لە کوردیدا جگە لە « لەکۆڵ کردن» « لەکۆڵ کردنەوە»شمان هەیە و ماناکەیان پێچەوانەی یەک. فەرهەنگی مەهاباد لە«کۆڵ بوونەوە» و « لەکۆڵ کردنەوە بە «التخلص»و «التخلیص» لێکداوەتەوە .

بڕوانە: فەرهەنگی مەهاباد،ل ٤٨٨

« کۆڵەکە» کە بەمانای ستونی دارینە لە « کۆڵ»ەوە

وەرگیراوە، چونکی لە ژێر «کاریتە» دایە

٩- ئەم کۆپلە جوانەی بەیتی بەناو بانگی « مەم و زین» لە زمان مام ئەحمەدی لوتفی- دەکرێ پێناسەیەکی باشی «بەکر شەیتان» بێت «بەکر شەیتان» لەم سۆنگەیەوە هێندە ناسراو و بەناو بانگە کە بۆتە سیفەتی مرۆڤی خراپ و دووزمان و ئاوری ژێر کا .

١٠- زەر کورتیلە کراوی «زەرد»ە. لەناوی بەیتی «قەر و گوڵەزەر»یش زەر کورت کراوەتەوە.

١١- ئاورینگ، بە واتای درەوشاوە، پێکهاتووە لە واژەی « ئاور» و پاشگری «ینگ» لە وشەی «بێژینگ» یشدا ئەم پاشگرە بەدی دەکرێ:

١٢- رندوو، هەمان رنووە. لەڕندو، دا «دو» و لە «رنو»دا «و» پاشگرن. بەراوردی بکەن لەگەڵ «دو» لە «ئاور دوو» بەسووتەمەنی دەگوترێ و « بەهاروو»ش گەنمی باش و جوانی بەهاران. ریشەی ئەم وشانە «رن» لە چاوگی «رنین»ەوە وەرگیراوە، بە واتای ڕووشاندن. بەفر کاتێک هەرەس دێنێ، ریگای بەر پێ خۆی دەڕنێ و خاپووری دەکات، هەر بۆیە بە هەرەسی بەفر ڕندوو واتە ڕووشێنەر. دەبێ ئەمەش بڵێین کە زۆربەی وشە کوردییەکان خاوەنی پاشگرن.

١٣- عەشیرەتەکانی بڵباس ئەم وشەیە بە شێوەی «مەزڵ» بێژدەکەن.

١٤- واتە ئەی خودا، تۆ بێ مەنزڵ و بێ مەکانی.

١٥- سەپان، واتە دروێنەکەر. ئەم وشەیە لە فەرهەنگی مەهابادیشدا هاتووە.

لە کوردیدا قسەیەکی نەستەق هەیە دەڵێن: «داسی لەسەپانی خۆی دەشارێتەوە.» مەبەست ئەوەیە لەبەر نەزانی بە پێچەوانەی بەرژەوەندی خۆی دەجووڵێتەوە. بەراوردی بکەن سەپان لەگەڵ «شبان»

١٦- بەر کۆز، یان بەر کۆژە، وێدەچێ ناوی جلوبەرگێک بێت کە لەوانەیە هێشتاش لە نێو عەشیرەتەکانی بڵباسدا باوی مابێت. فەرهەنگی مەهاباد ئەم وشەیەی تۆمار نەکردووە. وشەی «بەرکوت»یش لەم فەررهەنگەدا نەهاتووە. «بەرکوت» ئەو هێندە خەڵەو خەرمانەیە کە بەر لەمە ئامادەکردنی خەرمان و هەڵگرتنەوەی، لە خەرمانی جیا دەکەنەوە و هەڵی دەگرن. هەروەتر بەو خواردنەی کە بەر لە کاتی دیاریکراو بخورێت دەڵێن «بەر کوت» «بەر» دژی پشتە. "بەر و پشت ئەتڵەس" واتە کەسێک کە هەم باوکی هەم دایکی سەیید بن. جیا لەمە « بەر» لە کوردیدا ماناگەلی تریشی هەیە و لەسەرەتای زۆر وشەی تێکەڵاودا دەبینرێت، وەک:

«بەرۆک»، «بەرهەڵبێنە»، «بەر چاوکە» (ئەو تاڵە موو یان چەرمانەی کە بە نێو چاوانی ئەسپ

یان کەرەوە هەڵدەواسرێ بۆ ئەوەی وڵاغ کاتێک دەیانجوولێنێتەوە بتوانێ مێش و مەگەز لە دەمو چاوی خۆی دوور بکاتەوە). «بەرامبەر» «بەران»، «بەرماو»
«بەر» ئەگەر بەر لە کار بێت پێشگرە، وەکو «بەر» لە کاری «بەردانەوە»دا
١٧- خشتور، واتە وێران و خاپوور. ئەم وشەیە لە فەرهەنگی مەهاباد دا تۆمار کراوە.
١٨- چواور بێستان: ئەو بێستانەی کە لە بەستێنی چەمدا بەرهەمی دێنن بە « چواور بێستان: «بێستانی خیزی» یان بێستانەی چۆمی»یش
دەڵێن. بۆ من روون نییە کە وشەی «چواور لە چوار بێستان»-دا بۆچی هاتووە.
١٩- جەللاب، بێژکردنی عامیانەی وشەی جەللادە.
٢٠- بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٤
٢١- مەبەست ئەوەیە کە لە لای من ئەمانەتە، نەک ئەوەی چاوەدێری من بوو، چون لە کوردیدا «ئامانەتت بێ» واتە ئاگات لێ بێ و چاوەدێری بکە.
٢٢- مەبەست لە «رۆمیان» تورکەکانی عوسمانییە.
٢٣-«چون» زیادییە. بەڵام وشەی «کرمەک کە بێژکردنێکی تری «کرمۆکە»یە وێدەچێ لێرە دا لە خۆڕاو بەبێ هۆ بە کار براوە. «کرمەک» و «کرمۆکە» هەرتک لە فەرهەنگی مەهاباد دا تۆمار کراون و مانای هەر تکیان یەک شتە. لە فەرهەنگی ناو براودا «کرمەک» بەم شێوەیە لێکدراوەتەوە: «حلی ذهبی خاص بالنساء»
وەک لێم کۆڵیوەتەوە، مانای وردی «کرمەک» بەم جۆرەیە « جۆرە زەڕو زیوەرێک کە لە زێڕ یان زیو سازکراوە وەک شریتێک بە ژێر چەنگەدا دێت و دوو جەمسەرەکەی بەکڵاوەکە پەیوەست دەبن بڕوانە: سەرەتای میهر و وەفا
«کرمک» و «کرمۆک» وشە گەلێکی تێگەڵاون کە لە « کرم» و پاشگری «ek» و «oke» پێکهاتوون پاشگری «ek» لە فارسیدا هەیە، وەک «مردک»، «پشمک»، «چشمک». پاشگری «oke» لە هەندێ وشەی تریشدا بەدی دەکرێن، وەک: «بزنۆکە» و «مەڕۆکە» دەنگ و بێژی «کرموک» لەشکڵ و شێوەکەیەوە وەرگیراوە.
٢٤- ئەم رێکەوەندە، ناحەز و نەشیاوە و وەک هەڕەشە گوتراوە. بەراووردی بکەن لەگەڵ رستەی جوانی «کەنگر و ماست بە وەعدەی خۆی». ئەمەیان قسەیەکی نەستەقە و هەمیشە بەم شێوەیە بە کار دێت. مانای ئەم دوو قسەیە لە یەک نیزیکن.
٢٥- ئەم دەستەواژەیە قسەیەکی نەستەقە، ماناکەی ئەمەیە کە لەهەر حاڵدا مرۆڤ ناتوانێ دەسبەرداری خزم و کەس و کاری بێت و ڕوویان لێ وەرگێڕێ.
٢٦- ئەم رێکەوەندە قسەیەکی نەستەقە. بەراوردی بکەن لەگەڵ: «کبوتر با کبوتر باز با باز» لە فارسیدا.
٢٧- کاول، واتە کەلاوە و وێرانە. کەلاوە لە «کەل» و پاشگری «ئاوە» پێکهاتووە. «کەل» لە فەرهەنگی مەهابادا بە واتای: نیوەچڵ، نوقسان و... هاتووە وێدە چێ «کاول» جێگورکێ کراوی «کەلاوە»

بێت لە بەیت و حەیراندا زۆرجار وشەی «کاول» بەر لە ناوی شار و ئاوەدانی دێت و دەخوێندرێتەوە «کاولە»

٢٨- موراوەدەی دڵ، مەبەست لێی دڵداری و عاشقێنی کردنە.

٢٩- خزمینە: ئەی کەسوکار! بانگدان هەر کاتێک لە حاڵەتی کۆ دا بێت لەبری «ان» پاشگری «نییە» بەناو زیاد دەکرێ، وەکو «کورینە»، «کچینە»

٣٠- کیس، هەمان کیسەیە، جاری وایە کیس بەقیس دەخوێندرێتەوە، بە ڕای من وشەی «کیسەڵ» یش لە «کیس» و پاشگری «مەڵ» پێکهاتووە. کیسەڵ بەواتای «بەردی پشت» بە «کیس کردن» واتە هەڵمسانی پووک.

٣١- مێو، هەمان مێیە. بەرای من «مێو» (دەرەختی مێو» لە «مێ» واتە مادە وەرگیراوە، وەک چۆن لە زاراوەی خوانساریی فارسەکاندا بەم درەختە دەڵێن «مێ»، بێ ئەوەی هیچ چەشنە پاشگرێکی پێ زیاد بکەن بڕوان فرهنگ معین، ٤٤١٣/٤

٢٢- هەڵی بژێرە: لە چاوگی هەڵ بژاردن کاری ئەمر پێدان و حوکم کردنە

٣٣- شلێر، الیکل الملک. بڕوانە کتێبی «کۆلکە زێرینە»، ل١٦٨، کۆکراوەی گیوی موکریانی

٣٤- دە، بۆ پێداگرتنەو بەر لە کاری ئەمر دێت

٣٥- ئەگەر، لێرەدا بە واتای «تا»یە

٣٦- شەوارە راوی شەوانە ئەم وشەیە لە «شەو» و پاشگری «ارە» پێکهاتووە.

٣٧- ڕاوکەرن، ڕاوچین «an» لە ئاخری وشەدا ئامێری «ئیسناد» بۆ سێهەم کەسی کۆیە.

٣٨- پۆڕ، بە فارسی دەبێتە دراج. بڕانە ناوی باڵندەکان لە زاراوەکانی کوردیدا، ل ٥٠، کۆکراوەی محەمەد کەیوان پور موکری. بەڵەک: ڕەش وسپی،

٣٩- درێژ، بەفارسی دراز

٤٠- داوین، هەمان دامێن یان «دامن»ی فارسی

٤١- شوبا، هەمان «شیبایە، نەرمەبا»

٤٢- هەنگڵ، لە فەرهەنگی مەهاباد دا بەم چەشنە لێکدراوەتەوە: عروە، کتف خاصره

٤٣- بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٣٢

٤٤- سوختە: ئەو کەسەی تازە کەوتبێتە بەر خوێندن بەتایبەتی وەک زاراوەیەکی تایبەت بە سیستمی خوێندنی مەلا و فەقێیان. لە فەرهەنگی معین (١٩٤٦/٢)دا بەمانای «طلب علم» هاتووە و لە وڵاتی عوسمانی برەوی هەیە.

٤٥- ڕوین، هەمان ڕۆیشتن (royistin)

٤٦- سۆراح، ئەم وشەیە پێدەچێت کە لە ئەسڵدا «صراحی» و یان شکڵی گۆڕاوی «صورت» بووبێت.

٤٧- لەوەتی: لەو کاتەوەی «وەت» شێوەی گۆڕاوی «وەخت»ە.

٤٨- لە نووکەوە: واتە لە سەرەتاوە

٤٩- مارە: هەمان «مهر»ی فارسییە. های ساكنی وشەگەلی فارسی و عارەبی، لەهاوتا كوردییەكەیاندا دەبێتە ئەلف، وەكو: مهر (مارە)، پهلوان (پاڵەوان)، فهم (فام)، شهر (شار، سهم (سام) تهران (تاران)، پهن (پان) زاهرا (زارا)

٥٠- لەبەشی شێعری بەیتی «فەقێ خەڵوزی» جێ پەنجەی زاراوەی هەورامی بە ئاشكرایی دەبینرێ، هەر بۆیە وێدەچێ ئەم شێعرە لە ئەسڵدا ئی ئەو دەڤەرە بێت. بەیت بێژ دەیگوت ئەو چیرۆك پەنجاو چەند ساڵ پێشتر لە مەلایەكی كرماشانی بیستووە. جا چونكی بەیت بێژ ئاشنایەتیەكی ئەو تۆی لەگەڵ زاراوەی هەورامیدا نەبووە، نەیتوانیوە بەشە شیعرییەكانی ئەم چیرۆكە باش لەبەر بكات، هەر بۆیە زۆربەی رستەكانی لەڕو لاواز و ون و تەم مژاوییە.

٥١- كز، واتە لە ڕولاواز بەڵام لێرەدا هیچ ماناو مەبەستێك بەدەستەوە نادات.

٥٢- ئاختیس، هەمان ئاخێز، واتە: بزووتن، بزاڤ

٥٣- دەرپێ، هەمان ئاواڵ كراسە كە تایبەتە بە ژنان

٥٤- هەنگور، هەمان ترێ همزە» سەرەتای وشە گەلی فارسی، لە هاوتا كوردییەكانیاندا دەبێتە «ه» وەكو: انار (هەنار)، انگور (هەنگور)، ابر (هەور)، ایوان (هەیوان)

٥٥- مەل، یان مر: مریشك. لە كوردیدا بە مریشكی ماڵی دەڵێن « مریشك» واتە مەلی ویشكایی و لەبەرامبەریدا «مراو»یە بە واتای مەلی ئاوی.

٥٦- توفحە: جێگۆركێ پێكراوی «تحفە»یە.

٥٧- خەڵووز، واتە رەژی.

٥٨- كاردار، واتە بەكرێ گیراو.

٥٩- بەڕات، واتە هەقدەست.

٦٠- كوڕە واتە ئەی كوڕ! تارادەیەك مانای سزا و پێداگریشی تێدایە.

٦١- سەر كۆیلە، سەركۆنەكراو. لە فەرهەنگی مەهاباد دا «سەر كۆیلە» تۆمار نەكراوە بەڵام «سەر كۆنە» هاتووە.

٦٢- مەبەست ئەوەیە ژمارەی پیاوان كەم و ژمارەی ژنان زۆر بوو. بە وتەیەكی تر هەڵبژاردن و هێنانی ژن بۆ پیاو كارێكی سانابوو.

٦٣- ئەم رستە جوان و قەشەنگە شكڵ و فۆرمێكی تایبەتی هەیە و شێوازێكی جیا لە شێوازی گفتگۆ هەیە.

٦٤- داڵ باڵندەیەكی لاشە خۆر، عقاب، فرهنگ معین٢/١٦٨٦

٦٥- شوانە وێڵە: شوان لە فەرهەنگی مەهاباد دا «شوانە وێڵە» بە واتای «جاهل» هاتووە. لەباری پاشگرەوە، بەراوردی بكەن لەگەڵ «دانە وێڵە»

٦٦- سەرشەرتانە، بەڵێن، قەرارداد، شەرت

٦٧- گەرمێن، گەرمەسێر، جاری واشە مەبەست خاكی عێراق.

٦٨- باڵەخانە، باڵە هەمان باڵایە، واتە بینا، ساختومان

٦٩- بەرماڵ، پێکهاتوو لە «بەر» و «ماڵ »یش لە چاوگی «ماڵین»ەوە وەگیراوە.

٧٠-« دادنا »، واتە خولقاندت، دروستت کرد

٧١-ئەگەر، لێرەدا زیادییە، مەگین ئەوەی وەک ئاوەڵکاری پێداگرتن چاوی لێ بکەین

٧٢- نێرە، بیدۆشە، قسەی نەستەقە. ئاژەڵی نێر بۆ دۆشین نابێ حوکمی ئاژەڵی نێر دۆشین دەلیلی نەزانی و تێنەگەیشتووییە.

٧٣- بەپێی فیلانە، واتە کەڵێ زۆرە.

٧٤- پێڵاو، کەوش، پێکهاتوو لە «پێ» و پاشگری «ڵاو»

٧٥- پێ خاوس، واتە پێ پەتی، پێ خوواسیش بێژ دەکرێ

٧٦- شوانی گاڕان، واتە گاوان

٧٧- شەک بەران، بە بەرانی دوو ساڵە دەڵێن.

٧٨- گیابەند و خاو: ناوی دووگیای بۆ نخۆشی کێوییە

٧٩- بڕوانە پەراوێزی ژمار ٣٥.

٨٠- لە پەراوێزی نوسخەی سەرەکیدا، لەسەر ئەم رستانە چەند روونکردنەوەیەکم نووسیوە، بەم چەشنە:

لەمام ئەحمەدیم پرسی: ئەو قسەیە مەعنای چییە؟ گوتی: بزنی شاخ کەچ جۆرێک دەنوێ کە ماندوو وە بەر چاو دێ لە وەختی نووستنێ دا دەناڵێنێ و چاک ماندوویی خۆی دەحەسێنێتەوە شێخ فەرخ بە شوانی دەڵێ: ماندوو بوونی تۆ بۆ وی بچێ، ئەتۆ بحەسێیەوە وەکو وی.

٨١- گابۆڕ، واتە شین، «شیوەن» ناڵەو ڕۆ ڕۆ ئەم وشەیە لە «گا» و «بۆر» -دەنگی مانگا- پێکهاتووە.

٨٢- هەندێ لە بەیت بێژان ئەم رستەیە بەم شێوەیە بێژ دەکەن:

«کەونەکێ کەونێ دونیایە»، کەون، واتە کۆن.

٨٣- دایکە وا، دایکە حەوا، وێدەچێ «وا » پاشماوەی وشەی «وا » بێت.

٨٤- جیدا، واتە شەڕ و پێکدادان، بە فارسی «جیدال»

٨٥- تەختە سەرا، تحت الثرا

٨٦-شتاق: هیچ کام.ش= چ، هیچ. تاق= تاک

٨٧- قەیغان، لەڕاستیدا نازانم ئەم وشەیە بەچ مانایەکە بەڵام دیارە وەک ئاوەڵناوێکی باش بەکار براوە.

٨٨- واتە ئاوەدان بێت.

٨٩- بەمانای بەرتەسک و سنووردار هاتووە.

٩٠- ئەم دێڕە جوانە بەڵام لەباری ناوەرۆکەوە کزە.

# پێڕست